

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **کوردی تورکیا**


- نووسینی: ئیبراهیم داقووقی
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: هیمەت عەزیز کاکەیی
- پێداچوونەوە: جەلیل کاکەوەیس
- تایپ: نووسینگەی هیوا
- هەڵەچن: هەرێم رێبوار
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
- نرخ: ٥٠٠٠
- چاپی یەکەم: دەزگای موکریانی ٢٠١٢
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: رۆژهەڵات (هەولێر)
- لە بەرێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٦٠)ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە.

زنجیرەی کتێب (٦٢٤)





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## پێشکەشە :

ـ وەکوو وەفایەك بە: ڕۆحی پاکی نووسەری ئەم بابەتە ئیبراهیم داقووقی

ـ بە: هەموو لێکۆڵەرەوانی مێژووی کورد و کوردستان

ـ بە خانەوادەکەم

## بەرایی

ئەم کتێبە، یەکێکە لەبایەخدارترین و دەوڵەمەندترین ئەو کتێبانەی لەبارەی مێژووی کورد لەتورکیا بەتایبەتی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بەگشتی کەلەدواین دەیەی هەزارەی دووەم و سەرەتای دەیەی هەوەڵی هەزارەی سێیەم لەلایەن نووسەرێکی پێشکەوتووخوازی بەرەگەز تورکمان خوالێخۆشبوو دکتۆر ئیبراهیم داقووقییەوە هاتۆتە بەرهەم. داقووقی، وەك لەبەرایی کتێبەکەیدا دەڵێت، هەوڵ و کۆششێکی زۆری داوە بۆ دۆزینەوەی ئەو دیکیۆمێنت و بەڵگەنامە عوسمانی و تورکیانە کەیارمەتییان داوە بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم لێکۆڵینەوەیە. نووسەر بەشێوەیەکی بابەتی و زانستییانە و دوور لەهەر دەمارێکی رەگەزی لەکێشەی رەوای گەلی کورد لەتورکیا کۆڵیویەتەوە و ژیرانە دەستنیشانی ئەو دەرد و مەینەتییانەی کردووە کەهەردوو گەلی تورك و کورد لەم وڵاتە لەسۆنگەی سیاسەتی عەسکەرتارییەت و رەگەزپەرستی و توندرۆیی ناوەندە تورانیزمییەکانە وەبەدەستیانەوە دەناڵێنن و بەتوندی و بەپشتبەستن بەبەڵگەی مێژوویی ئەو رەفتارە شۆڤێنیستیانەی دەرهەق بەگەلی کورد لەم وڵاتە پیادەکراوە رەتکردۆتەوە و زۆر بەگەشبینییەوە دەڕوانێتە ئایندەی کورد لەتورکیا و پێی وایە باشترین ڕێگا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەم وڵاتەدا چارەسەری ئاشتییانە و لێکتر حاڵیبوونە. لەسەر بنەمای دامەزراندنی فیدراڵی تورك- کورد، کەئەویش زۆر نزیکە و بەهەوڵ و تەقەلای هزرڤان و غەمخۆرانی هەردوو گەلی تورك و کورد و لەسای هەل و مەرج و سیستەمی نوێی جیهانی و گوشاری یەکێتی ئەوروپاو رای گشتی لەتورکیا و هەموو جیهان دێتە دی بە تەمای خوا.

(وەرگێڕ)

# پێشەکی

هەر لەمنداڵییەوە، ئازایەتی و راستگۆیی و ئەمەك و وەفاداری و جلوبەرگی پاك و پۆشتە و جیاوازی برا کوردەکانم بەدڵ بوو، نەخوازە ئەو دەمەی دەهاتنە دوکانەکەی باوکم بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ماڵەوەیان، بەڵکو هەندێك لەئاغاکانی هۆزانی کاکەیی و داودە و تاڵەبانیی دانیشتووی گوندەکانی دەوروبەری شارۆچکەی داقوق، سەردانی (حەمەبەقاڵ)ی باوکمیان دەکرد و هەرچییەکیان پێویست بایە، بەقەرز لێیان دەکڕی، ژمارەیەکیش لەو ئاغایانە شەوی شەممەیان لەماڵەکەی ئێمە وەسەردەبرد، بۆ ئەوەی سەرلەبەیانی زوو بتوانن سەردانی دایەرەکانی دەوڵەت لەقەزای داقوق (تاوغ) بکەن، منیش کەئەوکاتە هێشتا لەقۆناغی سەرەتایی ساڵانی بەرایی خوێندنمدا بووم، گوێم بۆ باس و بەسەرهات و حەکایەتە دوور و درێژەکانیان لەگەڵ باوکم، هەڵدەخست و بەمەعشەرەت و دانیشتن و شەوچەرەکانیان شاد و کەیفساز دەبووم.

بەڵام، ئەم وێنا شیرینەم بەلاوە رەوییەوە، کاتێك کەسێکی شەڕانگێز (شەهاب)ی جووتیارە دراوسێ و ئازاکەی خەڵکی شارەکەمی کوشت و لاشەکەی بەرۆژی نیوەڕۆ فڕێ دایە ناو ئاوی رۆخانەوە و بەرپرسە حکوومییەکانیش لەهەمبەر ئەم تاوانە قێزەون و بڵحەی کەلەساڵی ١٩٤٦ روویدا، کڕ و بێدەنگ بوون.

جا، ئەم رووداوە بۆگەنە لەناخەوە هەژاندمی و شۆڕشێکی توندی لەهەناومدا لەدژی دەرەبەگ و ستەم و زۆرداری هەڵایساند، وەلێ دەمبینی ئەو کوردە سادە و رەش و رووتانەی شارەکەم قوربانیی دەستی ئەو جەور و ستەمەن، بۆیە بوومە هاوبەشی سۆز و غەم و خواستەکانیان. کە لە تورکیاش، هەلی مانەوەم وەك دیپلۆماتکارێك و دوایەش وەك قوتابی دکتۆرا بۆ ماوەی پتر لە (٦) ساڵ بۆ رەخسا، توانیم ئەو دیکیۆمێنت و بەڵگەنامە و سەرچاوە

و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامانە بدۆزمەوە کەیارمەتیم دەدەن بۆ لێکۆڵینەوە لەکۆمەڵگەی تورکی لەرووی سیاسی و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و ڕۆشـنبیرییەوە.. تەنانـەت لەوانەیـە زێـدەڕۆییم نەکردبێ ئەگەر بێژم من یەکەمین نووسەرم لە جیهـانی عارەبیـدا کەئـەو بەڵگەنامانـەم لایـە دەربارەی تورکیا و کتێبخانە تایبەتییەکەم پێوەیان دەوڵەمەنـدە، سـەرەڕای بـوونی کاسـێتی دەنگ و وێنە گەلی فۆتۆگرافیش.

ئەم کتێبە، بەشێکیش لەو بەڵگەنامە عوسمانی و تورکیانە لەخۆ دەگرێت کە لەو کتێبانەی لەبارەی کورد بەگشتی و کوردی تورکیا بەتایبەتی دانراون، ئاماژەیـان پـێ نـەدراوە. یـاخود ناویان نەهاتووە.

کورد- وەك هەموو گەلانی ناوچەکە- لە کەونارترین چاخەکانی مێژووەوە، لە سێگۆشـەی (هەکاری)دا بوونیان هەبووە و هیچ بەڵگەنامەیـەك نـەیتوانیوە نـامۆبوونی کـورد لـە وڵاتـی ئەنادۆڵ بسەلمێنێ، بەڵکو سەرچاوە کۆنەکان ئاماژەیان داوە کە ئەوان (واتە: کورد) دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بوون و وەکو بابلی و ئاشوورییەکان و ئەوانیتر، خاوەنی هەرێم و شار و خوداوەنـد و پاشاگەلی تایبەت بە خۆیان بووگن.

جا ئەگەر بیرۆکەی (نەمریی) بە لای فیرعەونەکانی میسرەوە گوزارە بێت لە هەڵکشان لـە زەوییەوە بە ڕێگەی بونیادنانی هەرەمەکان و هەرسێ ماکی، کاهین و پادشـا و خوداوەنـدەوە، ئەوا ئەم بیرۆکەیە بە لای کوردەوە- وەکو گەلانی وڵاتی دوو ڕووبارەکە و ئەنادۆڵ- بەرجەسـتە لە پیرۆز ڕاگرتنی زەوی دەکات بە ڕێگەی هەر چوار ماکی: زەوی، شار، کاهین (سەرۆکی هـۆز یان کەسایەتی پایەبەرز)، (پادشا) یان (خوداوەند)، دەبینین (کوردا) یان (کورتا) ناوی هەرێم و شارێك، پاشان ناوی پاشـایەك یـان کەسـایەتییەکی پایەبـەرز و نـاودار بـووە، ویسـتوویەتی کوردەکان یەکبخات، هەروا ناوی خوداوەندی کوردەکانیش بووە، وەك ئەو ئاشـوورییانەی کـە ناوی خۆیان لە ناوی (ئاشوور)ی شارەکەیانەوە وەرگرتووە، لە هەمان کاتیش ناوی پاشـاکانیان (ئاشوور پانیپال...هتد) و ناوی خوداوەندەکەشیان بووە.

ئەگەرچی، گەلی کورد بەهۆی هەلومەرجی هەرێمی و ژیاری هـەلی ئـەوەی بـۆ نەڕەخسـا دەوڵەتێك یان ئیمپراتۆرییەتێك بە ناوی خۆیەوە لە ناوچەکە دابمەزرێنێ، وەلێ تـوانی بـەر لـە نزیکەی ٣٠٠٠ سێ هەزار ساڵ لەمەوپێش قەوارەی نەتەوەیی و زمانی تایبەت بە خۆی و ئەو فۆلکلۆرەی بپارێزێ کە باس لە قارەمانێتی و سەروەری و دیـرۆك و نەبەردییـەکانی دەکـات. بەڵام مێژووی نوێی کورد لە دەوڵەتی عوسمانی و تورکیای هاوچەرخ بە درێـژی (١٥٠) سـاڵی

رابوردوو بە خوێن و دەربەدەری و ئازار و سرِینەوەی پێناسە نەتەوەییەکەی تۆمارکراوە. لێ، پیاوە دانا و هۆشمەندەکانی تورکیا کە پێکهاتوون لە دەستەبژێری خاوەن هزری پێشکەوتووخوازی ئەم ولاتە، ئەمرۆ بە بانگەشەکردنیان بۆ دانپێنان بە مافە نەتەوەیی و سیاسییەکانی گەلی کورد لە تورکیا هەولْ دەدەن لاپەرەی رابوردووی پرِ ئێش و ئازاری ژیانی هەردوو گەلی تورك و کورد لە ولاتی ئەنادۆلْ، دابخەن و کۆتایی بە مەینەتییەکانیان بێنن. ئەنجومەنی ئەوروپییش مەرجی ئەوەی بۆ تورکیا دانا، کە پێویستە کێشەی کورد لە ولاتەکەیدا بە رێگاچارەی ئاشتییانەی دیموکراتی چارەسەر بکات ئەگەر بە راستی دەیەوێت بێتە رِیزی یەکێتی ئەوروپاوە"، سەرەرای ئەمە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش. (عەبدوللا ئوجالان)ی رابەری پارتی کرێکارانی کوردستانی بەو مەرجە رادەستی ئەنکەرە کرد کە نەکوژرێ و بدرێتە دادگایەکی عادیلانە لە تورکیا بۆ ئەوەی پارتەکەی لە خەباتی چەکدارییەوە بگوازێتەوە بەرەو خەباتی سیاسی ئاشتییانە، وەك رێگا خۆشکردنێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە شێوەیەکی ئاشتییانە و لە چوارچێوەی فیدریالیزمییەکی تورکی- کوردی لە پێناو دامەزراندنی دەولەتێکی تورکیایی ئەوروپی دیموکراتی خاوەن دامەزراوە گەلێکی دەستووری بروای هەبێت بە مافی مرۆڤ و کەرامەتی هاولاتییان لە هەر شوێنێکی ئەم ولاتە دوور لە ستەم و زۆرداری و وەسایەتی دەولەت. کتێبی (کوردەکانی تورکیا) تۆمارگەیەکی دەولەمەندە لەبارەی مێژووی کوردەوە لەو رۆژگارەوەی ئاشوورییەکان بە ناوی (کوردۆ)وە ئاشنایان بوون، تاوەکو ئەم رۆژگارەمان لە لێکۆلینەوەی دیکیۆمێنتاری ئارکیۆلۆژی و مێژووییدا، ئومێدەوارم بەشدارییەکی سادە و خاکەراییانەی کردبێ بۆ تیشکخستنەسەر کێشەی گەلی کورد لە تورکیا بە تایبەتی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیش بەگشتی.

ڤیەننا ١٥-٤-٢٠٠١

ئیبراهیم ئەلیاس داقووقی

# بەشی یەکەم

# کوردو پەیوەندیی نێوان دۆڵی دوو رووبارەکەو وڵاتی ئەنادۆڵ و ئێران

# دەروازە

زۆربەی ئەو توێژینەوانەی لە بارەی دەوڵەتی عوسمانییەوە کراون ، بەپلەی یەکەم جەختیان کردۆتە سەر لایەنی مێژوویی‌و سەربازی، بۆیە لێکۆڵینەوە ئەتنۆگرافییە عوسمانییەکان تاوەکو ئەم ڕۆژگارەمان بێ ئەوەی کەسێك مشووریان بخوات، هەروا ماونەتەوە، ئەمەش لەبەر کەمیی‌و دەگمەنیی ئەو سەرچاوانە لەلایەك‌و لەلایەکی تریشەوە، زۆرێك لەو سەرچاوانەی پەیوەستن بە کۆمەڵە ئەتنیکییەکانەوە، لە ئەرشیفی سەرۆکایەتی وەزیران یان لە تۆمارەکانی تاپۆو فەرمانە سوڵتانییە ڕۆژانەکاندا، تەقەتکراون و پارێزراون.

لێرەشەوە، گەیشتن بەو سەرچاوانە، یان وێنەگرتنیان، یاخود وردبینی کردنیان، کارێکی ئاسان نییە، یەکەم لەبەر ئەو ماوە زۆرەی پێویستە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەو دووەمیش لەبەر زۆریی ئەو ناوانەی لەو کۆمەڵە نەتەوەو کەمایەتییانە نراون کە دانیشتوانی ویلایەتە عوسمانییەکانن بە هۆی فرەیی نووسەرو کۆپیکارانی ناوی ئەو هۆزو خێڵانە. بۆنموونە: کورد وەك کۆمەڵێکی ئەتنیکی، چەندین ناویان لێ نراوە، وەك: کورد، کوردی، کوردلی، کوردلەر، کوردلەر مورتانا، کورد مەحمودلو، کورد قانلی، کورد محەمەدلی، کورد مەهماتلی، کوردجی، قەوجە کورد، قەرەجە کوردلو، قەرە کوردلو، کوچك کورد، مەهماتلی، تورکمان ئەکرادی ، کرمانج.

ئەم (١٧) ناوانەی کە تایبەت بە کوردەوە نراون، دەبنە ئاستەنگ لەپێش بەئەنجامگەیاندنی توێژینەوە گەلی تایبەت بە هۆزو عەشیرەتەکانیان. سەرەڕای پەرت‌و بڵاویی زانیاریی تایبەت لەبارەیانەوەو دابەشبوونی زانیارییەکانی تایبەت بەوان بەسەر چەندین سەرچاوە کە لەناوچە و شوێنەیلی جیاجیا لەهەموو وڵاتی تورکیا پارێزراون.

ژمارەی ئەو خێڵانەی لەو رووبەرە فراوانە نیشتەجێ بوون کە لەچیاکانی (وەهران) لەجەزایرەوە بگرە تا دەگاتە لەوەڕگاکانی قەتیف‌و ئیحساو لە(بولکان)یشەوە بەرەو (الربع الخالی) درێژ بۆتەوە[ئەم رووبەرانەش ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانییان پێك دەهێنا]، دەگەیشتە (٧٢٣٠) خێڵ‌و عەشیرەت‌و کۆمەڵەی ئەتنی‌و هەموویان دابەش بووبوون بەسەر ئەو رووبەرە پان‌و بەرینانە، جیاوازیی نێوانیشیان تەنها بریتی بوو لەپلەی پێشکەوتنی ژیاری‌و شێوازی گوزەران‌و ژیانی کۆمەڵایەتی‌و زمان.

بەش بەحاڵی ئەو خێڵو عەشیرەتانەی لە سەرچاوە عوسمانییەکاندا ناویان هاتووە، بریتی بوون لەخێڵو عەشیرەتەکانی: تورکو تورکمانو عارەبو فارسو چەرکەسو تەتارو بەربەرو قەرەجو...هتد. ژمارەی خێڵو هۆزە کوردەکانیش لەناو دەوڵەتی عوسمانی، گەیشتبووە (٣٨٩) خێڵو عەشیرەتو دابەش بووبوون بە سەر ناوچەکانی تورکیای ئێستاو عێراقو سوریاو لوبنان.

ئەگەر چاوێك بە لیستی خێڵو عەشیرەتە کوردییەکاندا بگێڕین، دەبینین هەندێکیان ناوی سەرۆکەکانیان هەڵگرتووە، وەك: مووسابەگ، مەحموودی، بایەزید، نیعمەت، رەجیلو، شێخ داود، شێخ حەسەنلو، میکایلان...هتد. ژمارەیەکیش لە ناوی خێڵەکان بە ناوی ئەو گوندو شارانەوە هاتوون کە خێڵە کۆچەرییەکان تێیدا نیشتەجێ بوون، پاش ئەوەی بە تەواوی دەستیان لە ژیانی کۆچەری هەڵگرتووەو لەو شوێنانە جێگیربوون، وەك: (شێخانو شارەبانو ئەمران) لەعێراقو (مەحموودلیو ئولووسو گەرگەرو سروج) لەتورکیا.

لەبەر گرنگیی توێژینەوە لە سەر بابەتی کورد لەتورکیا، پێویستە بەر لە هەموو شتێك، یەکەمجار سەرچاوەکانی توێژینەوە ئەتنۆگرافییەکانی ویلایەتە عارەبییەکان لە سەردەمی عوسمانی بزانین، پاشانیش لێکۆڵینەوە لە سەر کورد وەك کەمایەتییەك لە کۆماری تورکیای هاوچەرخ بکەین. ڕەنگە مرۆ وای بە خەیاڵدا بێ: توێژینەوەی ئەتنۆگرافی بە مانا فەرهەنگییەکەی بە واتای لێکۆڵینەوە لەخوو و نەریتی ڕەگەزەکانو چەشنی گوزەرانیان بێت، وەلێ چەمکی نوێ سەبارەت بەم لێکۆڵینەوەیە، جەخت لەوە دەکات: ئەم لێکۆڵینەوەیە پێویستە کۆمەڵەی مرۆیی لە لانکەوە بگرە تاوەکو ناو گۆڕ بگرێتەوە. لێرەشەوە ئاسۆی لێکۆڵینەوەکان زیاتر پەرەی سەندو ڕێبازو پرۆگرامەکانی باسکردنیشی فرەبیەکی زۆریان بەخۆوە بینی، ئەمەش ئەو مەسەلەیە بوو لێکۆڵەرەوانی تورك لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە ئاوڕیان لێدایەوە، کاتێك بە گرنگیپێدانەوە روویان کردە لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر لە دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٩٠٨)ەوە. توێژینەوەکانی (ئەگناتیۆس کونوش)ی زانای فەرەنساش لەم بوارەدا بە پێشەنگ دەژمێردرێ.

بەڵام بەرپابوونی کوودەتای عوسمانیو هاتنە سەر دەسەڵاتی حیزبی ئیتیحادو تەرەقیو ئەو ڕووداوانەی لەگەڵیدا هاتنو دوایەش چوونی دەوڵەتی عوسمانی شان بە شانی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵەمان بۆ شەڕی یەکەمی جیهانی، وایانکرد ئەو لێکۆڵینەوە ئەتنۆگرافییانە رابگیرێنو پاشانیش تاوەکو دامەزراندنی کۆماری تورکیای نوێ لە ساڵی **١٩٢٣** چاویان لێ بپۆشرێ.

بۆیە لێتوێژینەوەو گەڕان بەدوای سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوە لە سەر کۆمەڵە ئەتنییەکانی دانیشتووی ویلایەتە عوسمانییەکان تەنها لەو دیکیۆمێنتو بەڵگەنامە فەرمییانە خۆیان بینییەوە کە

کۆماری تورکیا ریزبەندی کردن و لە دەزگایەکی ئەمنیـدا ئەرشـیفی کـردن و پاراسـتنی کـە ئـەویش (ئەرشیفی سەرۆکایەتیی وەزیران)ەو لە ئەستانە دەرگای والآیـە بـۆ هـەموو توێـژەرو لێکۆڵـەرێك لـە هەموو سووچێکی جیهان.

لـە دەرەنجـامی توێژینەوەکەمانـدا لـە میانـەی (١٥)سـاڵی رابـوردوو، توانیمـان سەرچـاوەکانی توێژینەوەی ویلایەتە عەرەبییەکان لە سەردەمی عوسمـانی لـە ڕووی کـارگێڕیو سیاسـیو ئـابووریو کۆمەلآیەتیو هزریو پیشەییەوە، لەم خالآنەی لای پایین چڕ بکەینەوە:

١- ئەرشیفی سـەرۆکایەتی ئەنجومـەنی وەزیـران، تیـادا هـەموو بەڵگەنامـەو دیکیـۆمێنتێکی تایبـەت بـە ئیمپراتۆرییـەتی عوسمـانی لـە ڕۆژی دامەزراندنییـەوە تـا رووخـانی لـە سـاڵی ١٩١٨ پاراستووە.

٢- تۆمارگاکانی ئەرك و پەراوێزەکانی ئەو تۆمارگایانە.

٣- تۆمارگاکانی ئەرکە سەربازییەکان.

٤- تۆمارگاکانی سکالآ سەربازییەکان.

٥- تۆمارگاکانی تابوورو کاداسترۆ.

٦- تۆمارگاکانی نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان.

٧- تۆمارگاکانی دارایی.

٨-تۆمارگەی عەشیرەتو خێڵو کۆمەڵە عوسمانییەکان.

٩- ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی.

١٠- ئینسکلۆپیدیای تورکی.

١١-نووسراوەکانی مێژوو و رووداوەکانی عوسمانی.

١٢- فەرهەنگی تورکی، شەمسەدین سامی.

١٣- کتێبی هەوڵەکانی نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان لە دەوڵەتی عوسمانی، جـەنگیز ئورهونلـو. ئەستەمووڵ ,١٩٦٣

١٤- کتێبی هۆزە نیشتەنییەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی، جەودەت تورکای، ئەستەمووڵ ,١٩٧٩

١٥- ئەو توێژینەوە فۆلکلۆرییانەی کە لەمیانەی ساڵەکانی ١٩٠٨-١٩١٤ دەرچوون.

١٦- راپۆرتی لێژنەکانی داڕشتنی سنوور لە نێوان دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی ئێران.

١٧- توێژینەوەکانی دێرینەشناسـیو مێـژوویيو زمانـەوانیی تایبـەت بـە دەوڵـەتی عوسمـانیو دەوڵەتەکانی ناوچەکە.

مێژووناسەکان، چ ڕەگەزشناس یان مێژووشناسی قەومو میللەتەکان، یان لێکۆڵەرەوانی بنەچەبن، لەو ڕۆژەوەی بە تۆمارکردنی مێژوو ئاشنابوون تاوەکو ئەم ڕۆژگارەمان، ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەر ڕەچەڵەكو نژادی کورد بەشێوەیەك، ئێستاشی لەگەڵدا بێت بۆچوونێکی یەکلاکەرەوەیان دەرنەبڕیوە سەبارەت بەم مەسەلەیە. ئێمە پێمان وایە هۆکارو سەبەبکاری ئەم جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەو شوێنەوارە مێژوویی‌و جوگرافی‌و ئەتنۆگرافییانەی کە بە ڕێگەیانەوە زاناکان دەتوانن ڕایەکی یەکلاکەرەوە لەبارەی بنەچەی کوردەوە دەربخەن.

ئەگەرچی کتێبە مێژووییەکان ئەو بەڵگەو دیکیۆمێنتە زانستییانەیان بۆ نەپاراستووین، بە گوێرەیان بتوانین ڕایەك لەویدی بە باشتر وەربگرین، بەڵام مێژووناسانی هاوچەرخ فرە تیۆری‌و گریمانەیان دەربارەی ڕەسەنی کورد هێناوەتەوە. ئەوان سەلماندنەکانیان لەناوە مێژووییەکان لەو ناوچانەی کە قەومو هۆزانی کەونارا تیا نیشتەنی بوونە یان لە ناو گەلی ئەو نەتەوانەی لە دەربڕینەدا لەگەڵ واژەی کوردو کوردان ڕێكو گونجاون، وەرگرتووە. بەڵام ئەو زانا بیانییانەی، لە مێژووی کوردیان کۆڵیوەتەوە، کۆکن لە سەر ئەوەی کورد لەنەتەوە هیندۆ- ئەوروپییەکانە، واتا سامی نەژاد نین. بۆیە بە ماكو ریشە لە عارەب یان لە تورکەوە نەهاتوونەتە خوارێ. لێ ژمارەیەك لە زانایان بە ڕەچەڵەك، کورد دەبەنەوە بۆ سەر ڕەگەزی فارس یان ئاشووری، یان ئەرمەن، یان میدییەکان. کەچی ژمارەیەکی دیکەشیان پێیان وایە، کورد گەلێکی ڕەسەنە، دیرۆکی پڕ قارەمانییەتی خۆی هەیە و داستانو ئەفسانە کۆنەکانی دەیگێڕنەوە کە دەماودەم تاوەکو ئیمڕۆ لەنێو خەڵکی دا، دەگوترێنەوە. میدیای کوردو سەرکردەکانی هزری سیاسی‌و دیدڤانانی بزوتنەوەی نیشتمانی‌و کاروانی نەتەوەیی کوردیش، مەیلی ئەم بۆچوونە دەکەنو بگرە لایەنگریشی دەکەنو پشتیشی پێ دەبەستن، چونکە- بە دیدی ئەوان- لەڕووی توێژینەوەی زانستی‌و گێڕانەوەی مێژوویی چەسپاو، لەوانیتر هەم بەهێزترو هەم جێگیرترە، ئەمەش لەدانراوو بڵاوکراوەو وانەو نووسینە ڕۆژنامەوانی‌و لێتوێژینەوە ئەتنۆگرافییەکانیاندا، ڕەنگی داوەتەوە.

لەپێناو زانینی نەژادو ڕەچەڵەکی کوردو دیاریکردنی لانكو ناوچەکانی دانشتنیان، پێویستە لە مێژووی گەلانی دانیشتووی ناوچەکەو ئەو گەلانەی هاتوونەتە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك لە چەرخە کۆنەکانەوە تا دەگاتە چەرخی ئێستا بکۆڵدرێتەوە بە ڕێگەی ئەو توێژینەوە دێرینشناسی‌و مێژوویی‌و ئەتنۆگرافی‌و زمانەوانییانەی کە باسیان لەمەڕ ئەو گەلانەو ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و پێوەندییە سیاسییەکانیانەوە کردووە، بۆیە ئێمەش لەدوو توێی ئەم سێ باسەی لای خوارەوە، لەم بابەتە دەپێچینەوە:

# باسی یەکەم

## پێوەندییەکانی نێوان وڵاتی دووروبار (عێراق) و ئێرانو وڵاتی ئەنادۆڵ

ئاسیای بچووكو وڵاتی نێوان دوو رووبارەکە لـە هـەردوو رووی ئـارکیۆلۆژیو مێژووییـەوە، تایبەتمەندیی گرنگییەکی گـەورەیان بـە لاوەیـە بـۆ رۆشـنکردنەوەی ڕاسـتی ئـەو توێژینەوانـەو رەواندنەوەی ئەو تەمو مژانەی بە سەریانەوەن. ئەوە بوو لەدەرەنجامی دۆزینـەوە ئارکیۆلۆژیـەکان لە لەئەنادۆڵ، پاشماوەی مرۆڤی نیاندارتاڵ دۆزرایەوە. کاتێك گواستنەوە لەچەرخی بەردینی کـۆن بەرەو ژیارییە نوێیەکان رووی دا، کۆی هەموویان نێوی لێ نرا ئەپیپالیتیك (Epipaleethicl). ژیاریی ئەنتالیا (باشووری رۆژئاوای ئەنادۆڵ) بە نێوی (بلوبای Belbuase)ەوەیە، وەلێ ژیـاریی چیاکانی زاگرۆس پێی دەڵێن زەرزی، ئەوەش لەنێوان ٢٠٠٠٠-١٦٠٠٠ ساڵ پێش لـەدایکبوونی حەزرەتی عیسـایە(١/٩٤). شـوێنەوارگەلی ژیارییـە لیفالۆرانییـەکانیش بـە ڕوونـی لەشـوێنی شانەدەرو زەرزیو هەزارمێرد لەعێراقی باکوور، دۆزرانەوە (١/١١٩).

دەبینین لە ئەشـکەوتی شـانەدەر لـە(باکووری عێـراق)[١]، پاشمـاوەی مرۆڤـی نیانـدارتاڵ دۆزرایـەوە، پاشمـاوەی (٤) ژیـاریی پێشـکەوتووی پلـە بـە پلـە دۆزرانـەوە، دێرینتیرینیـان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەروبەندی چـەرخی بـەردینی کـۆن، لێـرەدا مـاوەی دوایـن، جیـاوازیی پیشەسازییەکی ناوخۆیی تایبەتی پێوە بوو، (سۆلیکی) بـە شارسـتانییەتی برادۆسـتی نـاوی دەبات، ئەمەش وەك ئاماژەیەکە بۆ چیاکانی برادۆست کە ئەشکەوتی شانەدەریان لێیە.

ئەمە، سەرەڕای دۆزینەوەی ئەو پاشماوانەی لە پیشەسازیی دواین دەچن لە شوێنەکانی تری عێراقی باکوور(کوردستان)، لەوانە ئەشکەوتی زەرزی لە ناوچەی سلێمانیو ئەشـکەوتی بـالی کـورا لەرۆژهـەڵاتی چەمچـەماڵو ئەشـکەوتی کێوانیـان لـە ناوچـەی رەوانـدز (١/١٢٠). لەسەروبەندی چەرخی بەردینی ناوین، واتا نزیکەی (١٣٠٠٠) هـەزار سـاڵ پێشـتر، هەنـدێك لەناوچەکانی ئاسیای بچووك بە جیاوازیی لەگەڵ ئەوانیتر، ئەشکەوتگەلێکی لێ بوون، نەخشو

---

١- میللەتی کورد لە بری باکوری کوردستان کوردستان بە کار دەهێنن.(وەرگێڕ)

نیگاریان لەسەر هەڵکەندراوە، مرۆی ئەو سەردەمە تێیاندا نیشتەجێ بوونە، نەخش‌و نیگارەکان خەسڵەتی هەست‌و چێژێکی هونەرییانەی بەرزیان پێوەیە، وەك ئەو نموونانەی لەناوچەی ئەنتالیاو بالدبای دۆزراونەتەوە (١٨/٢).لە چاخی بەردینی کۆنی نوێ، ئاسیای بچووك خەسڵەتی هەوەڵین نموونەکانی سەقامگیریی کشتوکاڵی پێشکەوتووی، لە نیشتەنیی (چەتاڵ هویوگ)ی پێوە بووە کە ڕەنجی دۆزینەوەیان دەگەڕێتەوە بۆ پرۆفیسۆر دکتۆر جیمس میللەرت. چەتاڵ هویوگ لە ڕووی ژیارییەوە بەو شوێنە دادەنرێ کە زیاتر پێوەندیی هەبووە بە شوێنگەلی ژیارییە دراوسێیەکان، بە تایبەت ژیاریی گوندەکانی (باکووری عێراق-کوردستان) لەماوەی نێوان هەزارەی حەوتەم‌و هەزارەی شەشەمی پێش زایین (٣/٤٠٠).

وێڕای جیاوازیی گەورەی نێوان ژیاریی دۆڵی دوو رووبارەکەو ژیارییە دێرینەکانی ئاسیای بچووك، لەوێدا هۆکارێکی هاوبەش لەنێوانیان بووە، پاڵی داوە بە بوونی ناوچەگەلی کشتوکاڵی‌و سەرچاوەیلی کانزا ناسراوەکانی ئەو چاخە، بەشێوەیەك بازرگانی نێوان وڵاتی ئەنادۆڵ‌و وڵاتی دوو رووبارەکە گەشەی سەندووەو بازرگانەکان زیوو مس‌و ئاسن‌و بەردی سلسیان لەدەستپێکی سەدەی (١٣) هەمی پێش زایینەوە، هاوردووە. لێرەدا دۆزینەوەی ئارکیۆلۆژی ئەوە دەسەڵمێنێ کە ئەم ناوچانە لەدەورانی گردوکۆی خۆراکەوە گواستوویانەتەوە بەرەو وەبەرهەمهێنانی خۆراك، پاشان پلانڕێژییان بەرەو قۆناغێکی شارستانی کردووە، دەرەنجام پەلکێشی کردوون بەرەو فێربوونی هونەرگەلی کشتوکاڵی‌و ئاژەڵداری‌و هەواربەندبوون لەشوێنەیلی نیشتەنیدا بەشێوەی کۆمەڵەکیگەلی تاکی. ئەم قۆناغانە پلەبەپلە پەرەیان سەندووەو لە سەرەتای هەزارەی نۆیەمی پێش زایین لەناوچەکانی فەلەستین بەدەر کەوتوون‌و لەئاسیای بچووك‌و کوردستانی عێراقیش لەدەستپێکی هەزارەی حەوتەمی پێش زایین سەریان هەڵداوە (٦٥/٤).

بە واتەی شوێنەوارناسان، دەکرێ ناوچەی وەرچەرخانی ئابووری لەشوێنێکی سەخت حەشار بدەین، لەو ناوچەیەی لەبانی ئەنادۆڵ‌و ناوینەکانی ئاسیاو قەفقازو بەرزاییەکانی فەلەستین‌و (باکووری عێراق-کوردستان) درێژبۆتەوە، ئەمە ئەو نیشتمانە سروشتیەیە کە مرۆڤ لە چاخی بەردینی کۆنی نوێ، ڕووەك‌و ئاژەڵی تێدا پەروەردەو ماڵی کردو پاشماوەکانیان لەقەدپاڵەکانی چیاکانی زاگرۆس‌و برادۆست دۆزرانەوە، لەوانەشە لایەنەکانی بەرزی رۆژهەلات (ئێران)و لێژاییەکانی لای باکووری چیاکانی هیندکوش بێت (١٩٢/٦).

سروشتی ئەو شوێنەوارانەی لە وڵاتی ئـەنادۆڵ دۆزراونەتـەوە، بـە تایبـەت ئاسـەوارەکانی ناوچەی (ئالاجاهویوگ) کە نزیکەی (٥٠) کیلۆمـەتر کەوتۆتـە باشـووری رۆژهـەڵاتی شـاری قۆنیەو مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ دەستپێکی هەزارەی حەوتەمی پێش زایین، ئـەوەمان پێشـان دەدەن کە دانیشتوانی ئەم ناوچـەیە لێـرەدا چـەند کاروچـالاکییەکی ژیارییـان بـە تـەرحێکی نەگونجاو لەگەڵ ئەم کەونارا زەمەنییە، پیادە کردووە, دەبینین پاشماوەکانی مرۆڤ لەم شوێنەدا، وەك نــەقشو نیگــاری ســەر دیــوارو هەڵکەنــدراوی زەقو زۆپ، لەئاســتێکی تــەکنیکی پێشکەوتوودان لەبارەی کارودەسکردی وەك کاروپیشەی چنینو داروکانزاکان، سەرەڕای ئاسـتی هزری پێشکەوتوو و دیاری دیاردەکانی ئـایینی. ئـەوەش دەبیـنین کـە مـرۆڤ لەپەرەسـەندنی ساختمانو شارڕۆناندا، وەپلەیەکی باش گەیشتووە بە تایبەت توانیویـەتی جیهانـە ئـابووریو کشتوکاڵییەکەی پەرەپێبدات (١٨٤/١)، بە ئەندازەیەك ئاسیای بچووك بووبوە یەکەم سەرچاوە لەدابەشکردنی کانزاکان بەسەر هەموو گەلە ژیارییـەکانی رۆژهـەڵاتی کـەونارای نزیـك. ئـەو کانزایانە بە تایبەت بەرەو سوریاو عێراقو دەریای ئیجە دەنێردران. لەدەرەنجامی ئـەم بزاڤـە، سامانی ناوخۆ زیادیان کردو ئەمە بووە هـۆی فراژووبـوونو گەشـەکردنی ئـابووریی چـەندین ناوچەو شارەکانی ئاسیای بچووك، وەك: ئالاکاو عەلی شارو کول تەپـە (٧٤/٤). لەکاتێکـدا ئەو کۆمەڵانەی لەمەڵبەندە نیشتەنییەکاندا لەهـەردوو رۆژهـەڵاتی کـەونارای نزیـكو نـاوین لەدوای سەروبەندی کۆنە چەرخی بەردینی نـوێو پێشـتری نیشـتەجێ بووبـوون، لەسـەر راوو شکارو ئاژەڵـداریو ژیـانی ناسـەقامگیری دەژیـان (٤٠١/٣). پرۆفیسـۆر دکتـۆر میللـەرت Mellaart دەڵێت: گڵێنە رەنگاورەنگەکانی ئەرزرۆم، بە تایبـەت هـی ناوچـەکانی (کـازار)و (کوزەل ئوفا) لەناوچەی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات، دیسا ئەوانەی (عەلی شـار)و (ئالاجـاهویوك)و (بەیوگ کوللوچك) لەئەنادۆڵی نـاوینو لە(تـەروادە)و تەنانـەت ئەوانـەش کـە لە(حاجیلـەر) دۆزرانەوە، هەموویان بەڵگـەن لەسـەر یەکێتییـەکی ژیـاریی جیـاوازی پیشەسـازی گڵێنـەی نەخشێنراوی رەنگاورەنگ، نەخوازە بە هەردوو رەنگی سپیو سوور، ئەو شارسـتانێتیە کـاری کردبووە سەر ناوچەکانی دەوروبەریشی.

شـایەنی گوتنـە ئـەم کلتـوورەی کـە تایبەتـە بـە پیشەسـازی گڵێنـەو پەرەسـەندنی یەکـە نەخشێنراوەکانی بەرەو ئاستی ئەندازیاری، بە پەرەسەندنێکی نێوخۆیی دەژمێردرێ و کاریگەرییەکـەی پەلی هاویشتووە بەرەو ورمێو قـەفقاز لەرۆژهـەڵاتو گەیشـتۆتە مەڵاتیـەش لـەرۆژئاوا. لەلایـەکی

دیکەوە، ڕوویەکی تری ئەم کلتووره بەربلاوە لەئاسیای بچووك، بەرجەستەیە لەسازکردنی ئەوزارو ئامێرگەلی بەردینو ئەو پیشەسازییە کشتوکاڵییانەی لەوێ گەشەیان کردبوو. (٢٠/٥).

گوندی (زاوی چەمی) نزیك ئەشکەوتی (شانەدەر) لەسلێمانی بە کۆنترین نیشتەیی گوندیی لە(باکووری عێراق-کوردستان)، دادەنرێ کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی کۆنە بەردینی ناوین (هەزارەی دەیەمی پێش زایین)، یەکەمین گوندیشە لەچەشنی خۆی لەجیهاندا (١٨٤/٦).

لێتوێژەری فەرەنسی (پۆل کالێری) جەخت لەوە دەکات کە هەوارگەی (چەرموو)ی کشتوکاڵی بە یەکەمین نیشتەیی ژیاری دەژمێردرێ لەناوچەی کوردستانو بەشی باکووری جزیرەو مێژووی دەگەڕێتەوە بەرەو (٦٥٠٠ ساڵ پێش زایین)، لەوڕا هەزارەی شەشەمی پێش زایین ماوەیەکی دیاری کردووە بۆ وەرچەرخانی گەورەی ژیاری تیادا، چونکە لەم ماوەیەدا کۆمەڵە دانیشتوانەکانی ناوچە شاخاوییەکانو نیشتەنییە سەرەتاییەکان گواستییانەوە بەرەو پێدەشتەکان، بەمەش کشتوکاڵ پەرەی سەند (٣٩٣/٣).

دۆزینەوەی ئارکیۆلۆژی روونی کردۆتەوە (ئەریدۆ) کۆنترین شوێنەیلی نیشتەنی بووە لەدەشتی لیتەنیی باشووری عێراق، شارەکە لەسەڵماندنی پاشایانی سۆمەردا باسی لەوە کردووە کە هەوەڵێن ئەو پێنج شارانە بووە کە چەند نەوەیەك لەپادشاکان لەسەروبەندی چەرخی پێش لافاو، حوکمڕانییان تیاکردووە (٢٢٣/٦). دەشێ بگوترێ لەبەشەکانی ناوینو باشووری عێراق، شارە مێژووییە بەناوبانگەکان لەسەر پاشماوەگەلو داروپەردووی چەند گوندێکی سەروبەندی کۆیلایەتی،دامەزران، وەك: شارەکانی ئوور، ئەریدۆ، لەگش، نفر، وەرکا، لەم شارانەدا یەکەمین روخساری ژیاری دۆڵی دوو رووبارەکە بەدەر کەوت لەو چەرخەی ناومان لێنا چەرخی (نیمچە نووسین) واتا: سەرەتای تۆمارکردن بە نووسینی وێنەکی، کە ئەویش دەکاتە سەروبەندی نێوان (٣٥٠٠-٢٨٠٠ پێش زایین) کە دوایین قۆناغی چەرخی وەرکاو جەمدەت نەسرو یەکەمین قۆناغی چەرخی بەرەبەیانی زنجیرەکانە، واتە چەرخی گەشەکردنی ژیاریی دۆڵی دوو رووبارەکەو فراژووبوونیو دەرکەوتنی دیارترین روخسارەکانی (نووسینی مێخی)و هەروا ئەو کۆڵەگانەی کە بە هەندێ پەرەسەندنو گۆڕانکاریو گۆڕین تا چەرخە مێژووییەکانی دواتر بەردەوام بوو، جیاوازیی ئەم چەرخە لەوەدایە زمانو کلتووری سۆمەری تێدا باڵادەستو ئەو نەوانەش حوکمڕانییان تێدا کرد، بەزۆری نەوەگەلی سۆمەری بوون (٢٥٢/٦).

لەهەمان ماوەدا (هەزارەی سێیەمی پێش زایین) کە حوکمڕانەکانی یان پادشاکانی لەکۆشكو تەلاردا دەژیانو ئابوورییەکەشی پشتی بەستبوو بە (ئالاجاهویوگ)و ناوچەکانی ناوەڕاستو باکووری ئەنادۆڵ تا دەگاتە تەروادە لەباکووری رۆژئاواو زرێباری ئاپولیۆن لەنزیك دۆراك کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ (٢٣٠٠-٢٢٠٠ پێش زایین) (١٧/٨)، لەوڕا وڵاتی ئەنادۆڵ لەسەرەتاکانی چاخی برونزیی دووەم (٢٦٠٠-٢٣٠٠ پ.ز) بووە خاوەن پێگەیەکی ژیاریی پێشکەوتوو، ئەوکات، هەم سەرچاوەگەلی زەرووری ئابوورییەکانی چاخی برونزیو هەم تەکنیکی تایبەت بە چۆنییەتی وەبەرهێنانی ئابوورییەکانیشی پێ بوون، توانیشی پێوەندییەکانی ببەستێ لەگەڵ وڵاتی (ئوور) لەباشووری وڵاتی دوو رووبارەکەو لەگەڵ فیرعەنەکانی میسریش. بازرگانەکانیش کە لەلایەن پادشاکانی ئەکادەوە رەوانە دەکران، لەدەوروبەری ساڵی ٢٣٠٠ پ.ز دەهاتن بۆ شاری (پورۆشاندا)کە بە مەزەندەی زیاتر دەکەوتە دەشتی قۆنیە لەباشووری زرێباری (ملح). ئەو بازرگانییە لەباکووری وڵاتی دوو رووبارەکەو لەوڵاتی ئەنادۆڵەوە، رێگای کاروانەکانیان دەگرتە بەر، کە بەسەر ئەو رێگایانەوە (نارام سین)ی پادشای ئەکاد قەڵاو قوللەگەلێکی بونیات نابوو، کە زۆرێك لەشوێنەوارەکانی ئەنادۆڵ لەکەلاوەکانیاندا، نەخوازە لەو شوێنەی پێی دەڵێن (تەپە بەراك) دۆزرانەوە (١٨/٨)، بەڵام رووخانو تێکدانی ئیمپراتۆرییەتی ئەکادی بە رێگەی هێرشەکانی نەتەوە غەیرە یۆنانییەکانەوە، بووە هۆی پچڕانی ئەم بازرگانییە. وەلێ ژمارەیەکی زۆر لەبازرگانانی ئاشووری لەدەروبەری ساڵی ١٩٠٤ پ.ز لەچەندین شاری ئەنادۆڵ هەبوون، بە تایبەت لەشاری گانیشو لەوێ چەند مەڵبەندێکی بازرگانییان دامەزراندبوو. لەو پارچە گڵینانەی کە لەم شارە دۆزراونەتەوە، دەزانین ئاشوورییەکان زێڕو مسو قورقوشمیان لەئەنادۆڵەوە بۆ وڵاتی دوو رووبارەکە گواستۆتەوەو لەوێشەوە خوریو جلو بەرگو کەلو پەلی چنراویان بۆ ئەنادۆڵ هێناوە (١٩/٨). ئەو پارچە گڵینییانە بە کۆنترین ئەو نووسراوە بزمارییە ئاشوورییانە دادەنرێن کە دۆزراونەتەوەو رۆشنایی دەخەنە سەر کۆمەڵە نیشتەنیە هەوەڵینەکانی وڵاتی ئەنادۆڵ تاوەکو بەر لە هەزارەی دووەمی پێش زایین. ئەگەر چیش پارچە گڵینییەکان بریتین لەنامەگەلی مامەڵەو پسوولەی بازرگانی، بەڵام چەند زانیارییەکی وردوگرنگیان تێدان لەبارەی واقیعی کۆمەڵایەتیو یاسایی ئەو کۆمەڵانەوە (٤١/٢).

سەرهەڵدانی ئاشوورییەکان لەدەستپێکی هەزارەی سێیەمی پێش زایین لە باکووری عێراقو جێگیربوونیان لەشوێنی (سوبارییەکان Subir ) دانیشتوانی رەسەنی وڵاتەکە ئەوانەی کە لە دێر زەمانەوەو بەر لە هاتنی ئاشوورییانی سامی نەژاد لەبەشەکانی رۆژهەڵاتو باکووری چۆمی

دیجلـه نیشـتەنی بـوونو هـەروا لـەناوبردنی چـەند کۆمـەڵێکیان لـە لایـەن ئاشـوورییەکانەوەو هەڵبڕینیان بەرەو دامێنی چیاکانو ناوچە شـاخاوییەکانی دەوروبـەر، وێـڕای تێکـەڵاوبوونی ئـەو دوایان لەگەڵیاندا، بەشێوەیەك کە توانییان مەملەکەتەکەیان لەبەشی باکووری رۆژهەڵاتی عێراق دابمەزرێنن (٦/٤٧٢)، ئەمە بووە بناغەی دارشتنی سەردەمێکی نوێ لەوڵاتی دوو رووبارەکـە و لەهەزارەی دووەمی پێش زایینەوە بەچەرخی ئاشووری ناوزەد کرا هەرچەندە وڵاتی ئاشوور چـووە چاخی ئەکادییەوە کە دوای چاخی بەرەبەیانی نەوەکان هات لەچوارچـێوەی سیاسـیو کلتـووریی ئیمپراتۆرییەتی ئەکادی ٢٣٧١-٢٣٣٠ پ.ز لەوڕا، ئاشوورییەکانیش وەك سامییەکانی تر بـەو زمانە سامییە رۆژهەڵاتییە داخاوتن کە پێی دەگوترا زمانی ئەکادی پاش ئەوە (ئەکادی دایـك) لەدەستپێکی هەزارەی دووەمی پێش زایین بوو بە دوو لقەوە: ئاشووریو بابلی (٦/٤٧٤).

هەر لەسەرەتای ساڵی (٢٣٧٠ پ.ز) سارگۆنی ئەکادی توانیی ناوچە سـۆمەرییەکان، بـە ناوچەی عـیلامیشەوە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوەو لـە لەشکرکشـیەکانیدا گەیشـتە ناوچـەکانی فوراتی سەروو و شاری ماری (گردی حەریر لەنزیك ئەلبوکەمال)ی داگیرکردو دای بەسەر چەند بەشێکی سووریای باکوورو گەیشتە ناوچـەکانی چـیای تـۆرۆس، بـە واتـەی گێڕانەوەیـەکیش توانیویەتی بگاتە ناوجەرگەی ئەنادۆڵو باشووری خۆرئاوای قەیسەریش کە شـاری (کـانیش)ی لێبوو بۆ فریاکەوتنی ئەو بازرگانە ئاشوورییانەی کە شیابوون چەند مۆڵگەیـەکی تایبـەت بـە خۆیان لەم ناوچانە بدۆزنەوە (٤/٨٣) کە بازاڕێکی گـەورەی ئاشـوورییەکان بـوو، ئـەو کـات (کانیش) بووبووە مەڵبەندێك بۆ هەناردنی کەلو پەلە ئاشووریو ئەکادییەکان، لەوێ بازرگانە ئەکادییەکان هەناردەکانیان هەواڵەی شاری ئاشوور دەکردو لێرەش بە مـۆری ئاشـووری مـۆر دەکـران بـۆ ئـەوەی فرۆتنیـان لەشـارەکانی وڵاتـی ئـەنادۆڵ ئاسـان بـێ(٣/٣١٩). لەسەردەمی شا نرام - سین-ی کوڕی سارگۆنی ئەکادی یان نەوەکەی، نزیکەی (٢٠) پادشا کە حوکمیان رەوا بوو بەسەر ئەو شارانەی لەئاسیای بچووکەوە تا کەنداوی عـەرەب داکشـابوون، پەیمانێکی پتەویان لەنێو خۆیاندا بەست لەدژی شـا نـرام- سـین، بـەڵام نـرام- سـین، بەسـەر هەموویاندا سەرکەوت، لەوڕا ئەو بەڵگە مێژووییانە دۆزرانـەوە کـە سـەرکەوتنەکانی لەسـەر تۆمار کراون، لەنێوانیشیاندا نەقشی سەر بەردێك لـەنزیك دیاربـەکر دۆزرایـەوەو نەقشـێکی دیکەش لەناوچەیەك دۆزرایەوە بە لای باشووری شاری سلێمانییەوەیەو جـەخت دەکاتـە سـەر گەیشتنی ئەم شا ئەکادییە بەو ناوچانە (٤/٨٤).

نرام- سين هەولّيدا دەسەلاّتی لەدەڤەرەکانی رۆژهەلاّت‌و باکووری رۆژهەلاّتی سەرزەمینی ولاّتی بە پیتی دوو رووبارەکە بچەسپێنیّ‌و کۆمەلّێك شوێنەواری بە نەمری تۆمار کرد لەبارەی لەشکرکێشی‌و سەرکەوتنە سەربازییەکانییەوە بەسەر هۆزو قەومەکانی ئەو ناوچانە، لەوانە ئەو قەومەی بە چەند شێوازێك ناوی هاتووە، وەك: لولویو، لولو،لولوموو.

لەهەوالّ‌و بەسەرهاتی لەشکرکێشییە جەنگییەکانی پادشایانی زنجیرەی ئەکادی‌و لەشکرکێشی پادشاکانی ئاشوور بۆ سەر ئەو هۆزانە، دیارە مەلّبەندی گردبوونەوەیان لە دەشتی شارەزوور بووەو بەلای باشووریشیانەوە گۆتییەکان بوون. نووسراوەی (نەقشی سەرکەتن= مسلە النصر) سەرکەوتنی پادشای ئەکادی بەسەر پادشای (لولوبو) کە ناوی (ساتۆنی) بووە، تۆمار کردووە. دواجار ئەو (لولوبو)یيانە لەمەلّبەندەکەی خۆیانەوە بەرەو لایەنەکانی رۆژهەلاّت‌و رۆژاوا بلاّوبوونەتەوە، وەك دەڤەری زەهاو لەنزیك (سەرپێلّ زەهاو)، لێرەش نەخشێکی چیایی دۆزرایەوە کە وێنەی پادشای (لولوبو)و نووسینێکیشی لەسەر هەلّکەندراوە، ناوی بە (ئانو- بابینی) بە خەتی بزماری‌و بە زمانی ئەکادی دەبات (٣٦٩/٦).

وێڕای ئەو چارەنووسە تراژیدییە نادیارەی شا (نرام- سین)، لولوبیەکان بە یەگجارەکی خۆیان نەدا بەدەست ئەم شا ئەکادییەوە، گۆتییەکانیش (٢٢٣٠-٢١٢٠پ.ز) کە لەهۆزەکانی چیای زاگرۆسی هاوسنووری عێراقی رۆژهەلاّت بوون لەگەلّ ولاّتی ئێران، هەر وایانکرد. بەتەواوی نازانریّ ئایا ئەمانە لەهۆزە هیندۆ- ئەوروپیەکان بوون یان نەء، چونکە هیچ بەلّگەو سەنەدێکی نووسراویان بە زمانی خۆیان بەجیّ نەهێشتووە تەنها ناوی پادشاکانیان نەبیّ لەچەسپاندنی پادشا سۆمەرییەکاندا، زێدی دانیشتنیشیان ئەوا دراوسێی لولوبیەکان بوون بەرەو باشوور، واتا باشووری ناوچەی شارەزوورو ناوچە شاخاوییەکانی لای باشووری زێی خواروو (٣٧٣/٦) کە لەدواییشدا ئەمانە توانییان دەولّەتی ئەکادی بڕوخێنن. گێڕانەوەیەکی دواتری ئەم ماوەیە باس لەوە دەکات، گۆتییەکان بۆ ئەم مەرامە، دووجار لەناوچە شاخاوییەکانیانەوە هاتوونەتە خواریّ، جاری یەکەم ئەوە بوو لەچیاکانی تۆرۆسەوە هەلّمەتیان هێناو هەرچی کۆسپ‌و تەگەرەیەکی پێش شالاّوەکەیان هەبوو تەختیان کرد لەپێناو گەیشتنیان بەکەنداوی عەرەب. نرام- سین لەدەستپێکی حوکمڕانییەکەیدا هەولّی دا بەرپەرچی ئەم هێرشە بداتەوەو توانیی دووبارە شانشینییەکەی راست بکاتەوە، بەلاّم دوایی، لەدووەم جاردا کۆنترۆلّی خۆی لەسەریان لەدەست دا.

بۆیە لاوازبوونی ئەم جارەی لەبەرامبەر گۆتییەکان بووە هـۆی زڕانـدنی نـاوی‌و پاشـانیش نەمانی شۆڕەتی وەك پادشایەك (٨٤/٤). وەلێ دەسـەڵاتی گۆتییـەکان- لـەدوای لـەناوبردنی ئەکادییەکان- گشتگیرو سەرتاسەری نـەبوو ئەگەرچـی حوکمەکـەیان بـۆ مـاوەی ١١٠ سـاڵ درێژەی کێشا، لەو ماوەیەدا (٢١) پادشـا فـەرمانڕەواییان کـرد، نـەیانتوانی زاڵ بـن بەسـەر هەموو بەشەکانی وڵاتی ئەکاد، ئەوە بوو (ئوتۆ- حیگال) پادشای سۆمەرییەکان کە لەزنجیرەی سێیەمی پادشایانی ئوورِ بوو (٢١١٢-٢٠٠٤) دەریکـردن‌و لەسـەردەمی (تریقـان)ی دوایـین پادشایان کە تەنها رۆژێك حوکمی کرد، وڵاتی لەچنگیان قوتار کرد، ئـەوانیش -گۆتییـەکان- بەرەو ناوچەکانی باکووری عێراق بە تایبـەت ناوچـەی کـەرکووك پاشەکشـەیان کـردو بـەڕای زۆرینەوە (ئارابخا) -کەرکووکی ئیستا- یان کردە مەڵبەندی خۆیان (٦/٣٧٨).

فەرمانڕەواکانی عیلام لەسەردەمی زنجیرە حوکمڕانەکانی پـاش زنجـیرەی یەکـەمی ئـوورِ، بوونە خاوەن دەسەڵاتی وڵاتی سۆمەر، لێرەدا ئەو زنجیرەیەی لەپاش زنجـیرەی ئـوورِ دەسـەڵاتی گرتە دەست، مەڵبەندی حوکمڕانییەکەیان لەماوەی ٢٠١٧-١٧٩٤ لەشاری وان بـوو. لـەپاش زنجیرەی (کیش)یش بنەی نەوەگەلێکی حوکمڕان لەشاری هەمازی کە یەکێك بوو لەشـارەکانی عیلام، حوکمڕانیان کرد، بەڵام (ئانیمۆندی) پادشای شاری (ئەدب) گردێکە ئێستا پێی دەڵـێن (سۆمەری لوکال) چەندین لەشکرکێشی ئەنجامداو لەشکرکێشییەکانی پەلیان هاویشت بـەرەو چیاکانی عیلام‌و دەڤەرەکانی باکووری رۆژهەڵاتی عێراق (٦/٣١٠).

دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠ پ.ز) دەستپێکی گەشەسەندنی شانشینی (ماری) بوو، دەسەڵاتی ئەم مەملەکەتە بە درێژی چۆمی فورات‌و خاپوور پـەلی هاویشـتبوو، بـە تایبـەت لەسـەردەمی پادشاکەی یان فەرمانڕەواکەی کە ناوی (نحدن- لم) بوو (٦/٤١٨)، ئەمـە ئـەو ماوەیـە بـوو کـە لەمیانەیدا مۆڵگە بازرگانیە ئاشوورییەکان لەوڵاتی ئـەنادۆڵ لەسـەردەمی (ئیریشـمی یەکـەمی پادشای ئاشوور ١٩٤١-١٩٠٢ پ.ز) پەرەیان سەند، وەك (گانیش)و ئەو شـوێنە ئاسـەوارییەی پێی دەڵێن (عەلیشار)و لەشوێنی پایتەختی حیپیهکان (حاتووشا) (٦/٤٨٠).

دۆزینەوەی ئـارکیۆلۆژی لەشـاری ((مـاری)) (ئێسـتا پێـی دەڵـێن تـەل حەریر=لـەنزیك ئەلبوکەماڵە)، کۆمەڵێك لەپەیکەری فەرمانڕەواو کەسایەتیی دیاری، دۆزییەوە کە روخسـارو شێوازی پەیکەر تاشییەکەیان وا پیشان دەدەن، ئیی (چـاخی بەرەبـەیانی زنجیرەکـان) بـن بـە تایبەت قۆناغی سێیەمی. لەناو ئەو پەیکەرانـە ئـەو پادشـایەی کـە نـاوی (لمـاکی مـاری)و

ئیکۆشـــەمگان Iku- shamgan، لەکەســـایەتییەکانیش: (ئـــەبخ- ئیـــل)و (ئـــادی نـــارم) (٣١١/٦).

هاوکات لەگەڵ کۆمەڵە نیشتەنییە ئاشوورییەکان لەوڵاتی ئەنادۆڵ، کۆچگەلی قەومو هۆزە هیندۆ- ئەروپییەکان بەرەو ئەنادۆڵ روویداو بەمانەیان گوت (حیپیهکان).

بـــەڵام دانیشـــتوانی ڕەســـەنی ئـــەنادۆڵ لەقـــەومو هـــۆزە هینـــدۆ- ئەوروپییـــەکان نـــەبوون. لێتوێژەرەکان حیپیهکانیان -واتە هۆزە هینـدۆ- ئەوروپییـــەکان- لـــەوڵاتی ئـــەنادۆڵ بـــە پێـــی کۆچەکانو مانەوەیان، دابەش کردوون بەسـەر سـێ چـینەوە، کۆنترینیـان ئـەو هـۆزەی نـاوی (لویون= Luwin) بووەو بە ڕای زۆرینە هاوچەرخی نیشتەنییە ئاشوورییەکان بوونە، وەك لەو نـاوە ناسـراوانەی سـەر پارچـە بسـمارییەکان دەردەکـەوێ کـە لەبازرگانـە ئاشـوورییەکانەوە گەیشتوونو ئەوانەی ژیاریی چاخی برونزیان تێکدا کە هۆزە رەسەنەکان - واتـە خاتییـەکان- بەسـەرییەوە بـوون. پـاش ئەمانـە پالییـەکان Palaic هـاتنو ئـەنجا نیسـییەکان Nesite. لویونییەکان لەناوچە کەناراوییەکان دادەنیشتن، پالییەکان یـان گالییـەکانیش لەبەرزاییـەکانی ئەم هەرێمـە. چـەند سـەدەیەك دواتـر، نیسـییەکان توانییـان نـاوینی ئـەنادۆڵ -رۆژهـەڵاتی ئەنکەرە- داگیر بکەن، ئەمەش ئەو وڵاتەیە کە دانیشتوانە رەسەنەکەی پێیان دەگوت (خاتی)و ئەم ناوەیان بەکار بردو دوای ئەوەش بە -حیپیهکان- ناویان دەرکرد - (٤٨٢/٦).

(ماك کوین) پێی وایە رەسەنی (نیسییەکان) دەگەڕێتەوە بۆ (کـانیش)، واژەی (نـیش)یش لە(Knesh)ەوە گۆڕاوەو لەگەڵ خستنە پاڵی (as)ی لاتینی، ناوەکە بۆتە (نیســاس Nesas) واتە (نیسییەکان). لەدەوروبەی ساڵی ١٧٥٠پ.ز پادشایەکی گـەورەیان بـۆ پەیـدا بـوو، بـە بنەچـە خـەڵکی ناوچـەی کۆسـارا Kussara- نزیکـی دیـوریگی ئێسـتا- بـوو و(حـاتوش Hattush)ی کردە پایتەختی خۆیو بەبۆنەی سەرکەوتنەکانییەوە، لەم شارە ئاهەنگی سازدا، ناوی خۆیشی لە(ئانیتا Anita)وە گۆڕی بـۆ (حاتوسـیلیس)و شانشـینی نـوێی حیپیهکـانی دامەزرانـد (٢١/٨) کـە بـە زمانێـك داخـاوتن لەگـەڵ هـەردوو خێزانـی زمانـە هینـدۆ ئەوروپییەکانو سامییەکان، جیاواز بـوو و لـەڕووی ژیارییـەوە راسـتەوخۆ یـان ناراسـتەوخۆ کاریگەریان کردە سەر ژیاری تەڕوادەو مەسینیا لەئەنادۆڵو لەپێشخستنی کلتـووری نـاوەوەی ئەنادۆڵ بەشداربوون، جگـە لـەوەش پـەرەیان بـە کلتـووری ژیـاریی دۆڵـی دوو رووبارەکـە دا (٢١/٥).

له پاش مەرگی شا (حاتوسیلیس)، (مۆریسیلیس)ی نەوەکەی دەسەڵاتی پادشایەتی گرتـە دەست. مۆریسیلیس مرخی خۆش کردبوو دەست بگرێ بەسـەر بـاکووری سـوریا، بـەڵام لـەم بیرۆکەیەی پەشیمان بۆوە، چونکە شاری (حەڵەب) بە هێـزو لەوپـەڕی بـاکوور بـوو، نـەدەکرا بخرێتە ژێر رکێفی حیپیهکانەوە. له باشووریش شاری بابل لاواز بوو، بەڵام هاوپەیمانی حەڵەب بوو.

شاری (ماری)، ناوی نەماو لەوێ هێزێکـی نـوێ سـەری هەڵـدا بـەناوی مەملەکـەتی (عانە-Hana)ەوە، عانـە، وەك بابـلو حەڵـەب لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئامووریيـەکان نـەبوو. مۆریسیلیس دوای ئەوەی توانیی تەنگو چەڵەمەی رێگا بازرگانییەکان بە سیاسەت چارەسەر بکاتو پەیمانێك لەگەڵ شاری (عانە) ببەستێ، ئەوجا لەساڵی ١٥٩٥ تـوانیی چـنگ لەسـەر شان، لەئەنادۆڵەوە هەڵمەت بێنێو شاری حەڵەب وێران بکات. له ئاکامی ئـەم کـارەدا رێگـا بازرگانییەکانی باکووری رۆژهەڵاتو ناوچـەی فـوراتی نـاوین -کـە لـەو سـەروبەندە رێگـای نێونەتەوەیی بوون- کەوتنە ژێـر دەسـەڵاتی ئـەم پادشـایەوە. بەمـەش حاتوسـیلیس خەونـە کۆنەکەی وەدی هێنا. بەڵام هاوپەیمانەکانی لە شاری عانە بـەرەو بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتنی گەورەتر پاڵیان پێوەنا، بۆیە ئەمجارەیان روویکردە (بابل)و زنجیرەی حوکمڕانی حامورابی لـەناو برد، بەم سـەرکەوتنەش حیپیهکـان بوونـە هێزێکـی گـەورەی باڵادەسـت بەسـەر دۆڵـی دوو رووبارەکەو وڵاتـی ئـەنادۆڵو بـاکووری سـووریا پـاش ئـەوەی دەوڵـەتی بابلییـان رووخانـدو گەنجینەکانیان وەتالان بردو سپاردیانن بەلای هاوپەیمانەکانیانەوە لە شانشینی عانە (٤٣/٨).

لەسەدەی (١٥)ی پێش زایین، لە وڵاتی سەرووی دوو رووبارەکە، ئەو وڵاتەی ئاشوورییەکان پێیان دەگوت (خانیکاڵبات)و زۆرینەی دانیشتوانەکەی لە هۆزەکانی حووریو چەند چـینێکی ئەروسـتوکراتییانەی ئـاری نـژاد رابەرایـەتی دەکـردنو پایتەختەکـەیان شـاری شـوکنی (Washukani) بوو، دەوڵەتی میتانی توانیی دەسەڵاتی بسەپێنێ بەسەر وڵاتی ئاشوور، ئەم وڵاتە هەروا لەژێر ئەم دەسەڵاتە مایەوە، ئەگەرچی چەند پادشاو فەرمانڕەوایەك تێیـدا سـەری هەڵدا، بەڵام هەموویان لەو سەروبەندە تاریکەی مێژووی ئاشـوور، لاوازو ملکەچـی دەوڵـەتی میتانی بوون، تا ئەو دەمەی پادشای ئاشووری بەناوبانگ (ئاشوورئۆبالت) توانیی کۆتایی بەم رەوشە ناهەموارە بێنێت. ئاشوور-ئۆبالت لەساڵی ١٣٦٥پ.ز هاتە سەر تـەختی پادشـایەتی (٤٨٥/٦)، لەدوای خۆیشی چەند پادشایەکی بەهێز هاتنە سەر تەخت لەنێوانیاندا بە تایبەت (شێلمە نەسری یەکەم ١٢٧٤-١٢٤٥پ.ز) بوو. ئەم پادشایە بـە لەشکرکێشـییەکانی بـەرەو

دەرەوەی وڵاتو پتەوکردنی قەوارەی دەوڵەتی ئاشوور بەرێگەی لەشکرکردنە سەر دەڤەرەکانی باکوورو باکووری رۆژهەڵات، بە تایبەتی بۆ سەر گۆتییەکان، ناوبانگی دەرکردو بۆ یەکەمین جاریش لەشکرێکی ناردە سەر وڵاتی ئەرمینیا (ئۆرارتۆ)و نیشتمانی حۆرییەکانو چەند دەڤەرێك لەوڵاتی سەرووی نێوان دوو رووبارەکە (خانیکالبات)ی داگیر کرد، دوای ئەمەش پایەختێکی نوێی بۆ شانشینیەکەی دامەزراند ببێتە پایتەختە سەربازییەکەیو ناوی لێنا: کالحۆ یان (کالخۆ، کە ئەمەش واژەی (کالح)ەو لەتەوراتدا هاتووە)و پاشماوەکانی، ئێستا بە (نەمروود) ناسراوەو بە دووری نزیکەی (٢٢) میل لەباشووری شاری مووسڵەوەیە (٤٨٨/٦).

لەو سەروبەندەشدا، (کاشییەکان) یان (کشییەکان)، لاوازبوونی دەسەڵاتیان لە(بابل) بە هەل زانیو داگیریان کردو تیادا زنجیرەی سێیەمی بابلیان دامەزراند کە بۆماوەی نزیکەی چوار سەدە (١٥٩٥-١١٦٢پ.ز) درێژەی کێشا. ناوی ئەو قەومو هۆزە نوێیانە لەواژەی (کشو)ی بابلییەوە هاتووە کە بە وردی نازانرێ رەگی لەچییەوە وەرگیراوە، رەنگ بێت لەم زمانەدا بە مانای هێزو زەبرو توانا هاتبێ، لەوانەشە لەناوی خواوەندی نەتەوەیی کشییەکانەوە وەرگیرابێت. جگە لەوە رەچەڵەكو نژادی کشییەکان بە تەواوی نەزانراوە، بەڵام ئەو نیشتمانەی لێوەی کۆچیان کردووە بەرای زۆرینە دوور نییە شوێنێك بووبێت لە بەشە ناوینەکانی چیاکانی زاگرۆس لەو (شوێنەی کە نێوان عێراقو ئێران جیا دەکاتەوە) لەوانەشە لەو ناوچەیە دیاری بکرێ کە بە وڵاتی لوور ناسراوە، واتە: (لورستان) لەدەڤەرەکانی باشووری ئێران. بە لای باکووریشیانەوە چەند هۆزێکی چیانشینی تر دراوسێیان بوونە، وەك: گۆتیو لولوییەکان، زۆریش رێی تێ دەچێ ئەو خێڵە چیانشینانە بن کە لە سەرچاوە کلاسیکییەکاندا بە (قۆسای) ناویان هاتووە (Kossaio) (٤٤٧/٧). مێژوناسی ناوداری تورك ئەحمەد رەفیق دانەری کتێبی (مێژووی عوسمانی) لە باسەکانی دەربارەی میللەتەکانی کەونارای ناوچەی جزیرەو عێراق دەڵێت: ((رەگەزێکی ئاریی هیندۆ-ئەورووپی بە قاسۆ یان کاشۆ ناسراوە لای ناوچەی رۆژهەڵاتی دیجلە نیشتەجێ بوونو هاوچەرخی سۆمەریو ئەکادییەکان بوون، ئیمرۆ بە کورد ناسراون)).

چونکە (کشی)یەکان لەپاش فەرمانڕەواییەکەیان لەعێراق، شتێکی تۆمارکراویان بە زمانە نەتەوەییەکەیان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو بابلییان کردبووە زمانی خۆیان، بۆیە ئەستەمە بتوانین لەرووی زمانەوانییەوە بە رەسەنی نەتەوایەتییان ئاشنا بینو هەموو ئەوەی لەم لایەنەوە مەزەندە دەکرێ ئەوەیە: چەند کۆمەڵێکی جەنگاوەری ئەرستوکراتی لەئارییەکان، واتە: هۆزە

هیندۆ-ئەوروپییەکان فەرمانڕەواییان کردووە بەسەر ئـەو (کشـی)یانەو لـەرووی سـەربازییەوە ڕێکیان خستوونو بەرەو لەشکرکێشیو شەڕو شۆڕ سەرکردایەتییان کردوون.

لاوازیی سەری کردە جەستەی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری، لە دەرەنجامی شالاوی کشـکییەکانو هێرشەکانیان بۆسەر ئاشوورییەکان لە ناوچەکانی باکووری ئاسـیای بچـووکەوە (ئـەو کشـکییانە بەوتەی زۆرینە ئەو هۆزە ئیفریجییانـەن کـە لـە سەرچـاوە کلاسـیکییەکاندا، ناویـان هـاتووە)، هۆیەکی تری لاوازبوونی ئاشووری، ئەو خێڵە ئارامییانەی کە بە درێژی فوراتی سەروو نیشتەجێ بوون، دەستیان کرد بە پەڕینەوە لەم رووبارەو رووبانکردە تـەخووبی ولاّتـی ئاشـوور، لەلایـەکی تریشەوە ولاّتی بابل لاوازیی ئاشوورییەکانی قۆزتەوە بۆ فراوانبوونو درێژکردنـەوەی سـنوورەکەی لەسەرحیسابی دەوڵەتی ئاشووری بەرەو باکوور تا دەگاتە نزیك زێی خواروو. بەلاّم هێـزو توانـای پادشای نوێی ئاشوورییەکان (تەجلاتبلێزەری یەکەم ١١١٥-١٠٧٧پ.ز) بەروونی بە دیارکـەوت لەبەرەنگاربوونەوەی لەو مەترسییانەو زاڵبوونی بە سەریاندا، بەمەشەوە دڵی ئـاوی نـەخواردەوە، بەڵکو رەوشەکەی بەتەواوی گۆڕی لەهەڵوێستی بەرگریکردنـەوە بـەرەو هێـرش بـردنو لەشـکری گەورەی کشییەکانی تێکشکاندو کوشتارێکی زۆری لەنێوانیاندا نایەوەو هێرشی گواستەوە بەرەو ناو ماڵو حاڵیانو پاشان بەرەو ئەرمینیا بەڕی کەوتو پەیکەرێکی خـۆی لەناوچـەی دەریاچـەی (وان) دانا، لەشکرێکیشی توانیی بگاتە قووڵایی کێوەکانی زاگـرۆس بـەرەو ئـەو هەرێمـەی بـە (میسری) ناوی هاتووە. هەروا لەشکرەکانی توانییان خێڵەکانی ئارامی بەرەو پشـتەوەی چـۆمی فورات هەڵبڕنو تا ناو مۆڵگەکانیان لەبیابانەکانی شام بە تایبـەت لەتـەدمور راو بنـێن، جگـە لەوەش گورزێکی گەورەی کێشا بە ولاّتی بابل لەسەردەمی پادشاکەی (مەردخ نادن ئـاخی) کـە لەپاش نەبوخەد نەسری یەکەم هاتە سەر تەختی بابل (٦/٤٩٠).

غەمی ئیمپراتۆرییەتی حپی لەم سەروبەندە، ئەوەبوو دەستی بگرێ بەسەر ئەو رێگـەو ڕێ رەوانەی دەگەنە شارە ژیارییەکانی دەروبەری خۆی بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشە سەربازیو ئابوورییەکان لەگەڵیانو مسۆگەرکردنی پێویستییە ئابوورییەکانی لەو ژیارییانە.

شاری (حاتوشا)ی پایتەختی (حپی)یەکان لەناوچەیەکی شاخاوی بەردەلاّن بوو، بەلاّم بەلای باکوورییەوە شارەکە دەیڕوانییە سەر دەشتاییەکی بەپیتی ئەو زەویوزارە کشـتوکاڵییانەی کـە پێداویستییەکانی حپییەکانی لەبەروبوومی کشتوکاڵی بە تایبەت لەگەنمەشامی دابین دەکـرد. بەلاّم ئەم زەویو زارانە هەمیشە دەکەوتنە بەر شالاّوی هێرشەکانی (گاسگا Gasga)ییەکانی دانیشتووی تەپۆڵکەکانی لای باکووری زەوییەکان.

جا، بۆ رێگرتن لەهێرشە ساڵانەکانی گاسگاییەکان بۆسەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکان، دەبوو هەندێ هێڵی بەرگری دابمەزرێنن بە تایبەت لە مەڵبەندی سەرەکی ئەو ناوچەیەی پێی دەگوترا (هاکپیس Hakpis) رەنگ بێ جێگاکەی لە(ئەماسیە)ی ئێستا بووبێت، لەوڕا هێڵی پۆستەو پێوەندییەکان بەسەر ئەم شارەدا تێدەپەڕین بەسەر چەند شارێکی وەك (هانهان Hanhana)و (هاتنا Hatna) شوێنەکانی ئێستای هەردوو شاری موزیفونو گوموشحاجی کە بەلای ئەو پێچە سەختەوە بوو لەناوچەی (هالی Nerik Haly)ی بەرامبەر بە شوێنی کارگی و دەکەوێتە لای رۆژهەڵاتی هاکپیس ئەو دەروازە سنوورییەی کە بە رێڕەوێکی تەنگەبەردا دەڕوات لەناوچەی یەشیل ئیرماق بەرەو غازی ئورای شوێنی ئێستای شاری (تورهال Tu-rhal) لەباشووری شاری (ئەماسیە)ی ئێستا. لێرەشەوە ئەم رێڕەوە بەردەوام دەبێت تا دەگاتە بەرزاییەکانی هایس لەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری سیواس Sivasو زارا Zara لەباکووری دێوریگی، لێرە گاسگاییەکان ناو بەناو لەرووبارەکە بەرەو کانیش دەپەڕینەوە بە نیازی دابڕینی حیپیهکان لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (٩٢/٨).

سنووری مەملەکەتی (گاسگا)ییەکان بەلای تەپۆڵکەکانی ناوچەی (زارا)وە کۆتایی پێ دەهات، لێرەشەوە سنووری مەملەکەتی ئازی هایاسا -ئەرزەنجانی ئێستا- دەستپێدەکرد کە دەستی گرتبوو بەسەر عەمبارە کانزاکاندا لە باکووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. حیپیهکان نەیانتوانی ئەم مەملەکەتە داگیربکەن، بەڵکو تەنها توانیبوویان دەست بگرن بە سەر هێڵی سنوور لەسەرووی (هایس)ەوە بەرەو چۆمی فورات. لەوڕا، لەپشتی ئەم هێڵەوە دەوڵەتۆکەیەکی ناوبەین هەبوو لە نێوان گاسگاییەکانو حیپیهکان بەناوی هەرێمی سەروو Uper Land دەناسرا. ئەم هەرێمە شاری (ساموحا Samuha)ی لێبوو ئەو پێگە ئایینیو کارگێڕییەی کە ژمارەیەك لەزانایانی شاری (هایس)و زاناکانی تری ناوچەکانی فورات دایانمەزراندبوو، چونکە ئەگەر بڕۆخیبایە، ئەوا هەر لەرێگەی سیواسەوە (پێگەی کۆنی حیپیه مارسانیتیەکان) تاوەکو زەوییە کاکی بە کاکییەکانی لای مەڵاتیە (پێگەی کۆنی حیپیه تکاراماکان) دەکەوتنە بەر هێرشو پەلاماری دوژمنان. چونکە ئەم رێگا گرنگە بەلای حیپیهکانەوە کە بەرەو باکووری سووریا دەچوو هەر لە سەردەمی شا (مورسیلیسی یەکەم)ەوە تاوەکو سەردەمی شا (سوبیلولیوماس) تاکە رێگای پێوەندی بوو لەگەڵ هەرێمەکانی دەوروبەر (٩٣/٨).

مەملەکەتی ئاسۆ (Isuwa) کە کاتی خۆی لەنزیك شاری عەزیز یان (ئازیغ)ی ئێستا بوو، لەشاری مەڵاتیەوە لای خۆرئاواو بەسەر چۆمی فوراتدا بەرەو رۆژهەڵات درێژ دەبۆوەو

لەقەڵەمڕەویــدا ناوچــەی (ئارگــانی مــادن)ی Maden Ergani لــەخۆ گرتبــوو، لــەرووی سەرچاوەیلی مسەوە دەوڵەمەندترین ناوچەکانی ئەنادۆڵو بگرە هــەموو رۆژهــەڵاتی نــاوینیش بوو، لەوێ ئەم سەرچاوانە ئاتاژو پێویستییەکانی سوپای حپی لەم کانزا بەنرخە، دابین دەکرد.

شوێنو پێگەی ئەم مەملەکەتەو بوونی کانزا بەنرخەکەی لەنێوان هەردوو هێزی گــەورەی: حپیــیو میتانییــەکان Mitanni کــە دەوڵەتەکــەیان لەهــەردوو شــاری ئێســتای (ئۆرفــاو دیاربەکر)ەوە بەرەو پانتایی رۆژهەڵات، هەڵکەوتبوو..

ئەمە وایکرد ئەو دوو هێزە چاوی تەماحی تێ ببڕن، بۆیە بووبووە گۆڕەپانی بگرەو بــەردەو ململانێــی هــەردوو لایــان، تــا ئــەو دەمــەی (ســوبلۆلیۆس)ی پادشــای حپییهکــان تــوانیی بەیەگجارەکی لەساڵی ١٢٦٥پ.ز بیخاتە پاڵ مەملەکەتەکەی (٩٤/٤).

هەرچی رێگا سەرەکییەکەی تر بوو، ئەوا نێوان ئەم شوێنانەی بەیەکەوە دەبەست: کــانیش (شاری قەیسەری ئێستا)و لەرێ رەوەکانی تۆرۆس بە دەروازەی سیلیســیادا (کــولاك بوغــازی kulekbogazi ئێستا)ی بەناوبانگو بە دەشتی قرمانی خواروو بەرەو سلیفکەو پاشان بەرەو مەرسینو بە چیاکانی (تۆرۆس)دا دەگەیشتە ئەدەنــەو ئــەنجا دەریــای ســپی ناوەڕاســت، یــان لەدەروازەی سیلیسیاوە کەمێك بەرەو رۆژهەڵات بە رێگای سەرەکی بەرەو سوریاو پاشان وڵاتی نێوان دوو رووبارەکە (٧٧/٩).

بەڵام رێگای باکوور بە مەملەکەتی کیزوادنا Kizwadna درێژ دەبۆوە کە پایتەختەکــەی شاری کومانی Kumeni بوو نزیك شــاری (عەلیشــاری ئێســتا)، لێــرە، لــەرۆژئاواوە بــەرەو مەملەکەتی ئەرزاوا Arzawa لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست، دەکشا.

پــاش ئــەوەی (حپی)یــەکان دەســتیان گــرت بەســەر وڵاتــی (کیزوادنــا)، جــۆرە سیاســەتێکی سەرکەوتووانەیان بەکار برد لەهەڵسو کەوتو مامەڵەکردنیان لەگــەڵ هــەموو ئــەو دەوڵەتۆکانــەی کەوتبوونە سەر ئەم رێگایەوە بە ئامانجی پاراستنی لەهێرشو پەلامارەکانی مەملەکــەتی ئــارزاوا، بەمەش سنووری دەوڵەتی (حپی)یەکان بەم جۆرە درێــژ دەبــۆوە: لــەدەریای ســپی ناوینــەوە بــەرەو باشوور تاوەکو وڵاتی گاسگا لەباکوور، لەوڵاتی میتانییەکانیشەوە (نزیك هــەردوو شــاری ئێســتای (ئۆرفەو دیاربەکر)و رووباری فورات لەرۆژهەڵات بەرەو لێواری رۆژئاوای دەشــتی قۆنیــە لــەرۆژئاوا (٩٥/٨).

عیلامییەکان، کە پایتەختەکەیان (سووسە) بوو و لەهۆزەکانی هیندۆ-ئەوروپایی نەبوون، لە کــۆنترین چــەرخە مێژووییەکانــەوە لەهــەرێمی خۆزســتان (ناوچــەی ئــەهواز) دادەنیشــتنو

شارستانێتیەکیان پێکهێنا بە بناغەو رەچەڵەك لەژیاریی دۆڵی دوو رووبارەکە وەرگیرابوو. لەو سەروبەندە، واتە لەدەوروبەری هەزارەی یەکەمی پێش زایین، خێڵێکی بەرەگەز ئێرانیی دیکە لەبەشەکانی باکووری رۆژهەلاّتی ئێران لەگەڵیان دەژیانو پایتەختەکەیان ئەکباتان (هەمەدانی ئێستا) بوو، لەورا سەنحاریب لەساڵی ٦٩٦پ.ز لەشکرێکی گەورەی کردە سەریان (٩١/٦).

لەناوەوڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لەنێوان فارسەکاندا بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا سەری هەڵدا، ئەم بنەماڵەیە (هاخەمانشی) دامەزراندبوو و لەمەوە زنجیرە حوکمڕانی ئەخمینی کەوتەوە. کۆرشی یەکەم (٦٤٠-٦٠٠پ.ز) توانیی سەربەخۆیی لەکلکایەتی میدییەکان وەدەست بێنێ، وەلێ دووبارە دانی نا بەسەروەری شا(کیاکسار) لەو سەروبەندەی کە سوپاکانی گەیشتنە کەرکووك (ئارابخا)، لەپاشانیش گەیشتە شاری ئاشوور کە لەسەر دەستی ئەوان ساڵی ٦١٢پ.ز رووخا. شای (بابل)یش (نەبوبلاسەر) لەگەڵ شای میدیا (کیاکسار) لای شوورەکانی شاری ئاشوور بەیەکتر گەیشتنو لەوێ رێککەوتننامەیەکی هاوپەیمانیو دۆستایەتییان لەنێویاندا بەست (٥٢٧/٦).

فارسە ئەخمینییەکان لەسەردەمی کۆرشی دووەم (٥٨٨-٥٣٠پ.ز) کە نازناوی کۆرشی گەورەی لێنرا بوو، توانیی پایتەختی میدییەکان (ئەکباتان) داگیربکات، بەمەش فارسە ئەخمینییەکان یەکلایەنە حوکمڕانیی ولاّتی ئێرانیان گرتە دەست. کۆرشی گەورە توانیی ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن دامەزرێنێ هەر لەتخووبی هیندستانەوە تاوەکو ولاّتی بابل (کە لەسەردەستی ئەوان ساڵی ٥٣٩پ.ز رووخا)و لەولاّتی ئاشوورو کیلیکیاو کەبادۆکیاشەوە (کە ئەم دوو ولاّتەش ناوچەکانی رۆژهەلاّتی ولاّتی ئەنادۆڵی دەگرتەخۆ) تا دەگەیشتە دەریای ئیجە، درێژ دەبۆوە (٥٧٧/٦).

رەنگە، دیارترین دیاردەی ئابووری جیاوازی چەرخی ئەخمینی: بەکارهێنانی پارەی سکەدار بووبێت، هەروا کردنی دیناری ئاڵتوون (داری) کە بەرامبەر بە (٢٠) شیقلای لەزیوە بە بنەمای مامەڵەی بازرگانیو چەند بانکێکی تایبەتیش بەدەر کەوتن سەرڕای بانقەکانی پەرستگاکان.

تۆمارگاکانی ئەو بانقانە لەشاری (نفر) دۆزرانەوە، لەشاری (وەرکا)ش لقیان هەبووە، هەروا بانقەکان کێڵگەی گەورەی کشتوکاڵیو تۆڕی راوەماسیو مالاّتو رەهنگەلی عاردوبەرەو زەویو زاری زۆریان بەلاوە بووە (٥٨٣/٦).

میری فارس (کۆرشی بچووك) فەرمانڕەوای ویلایەتی (لیدیا) لەولاّتی ئەنەدۆڵ، جێگری شا (ئەرتەحششتای دووەم ٤٠٤-٣٥٩پ.ز)ی برای بوو، میری ناوبراو هەوڵی کوشتنی (شا)ی دابوو، بەلاّم لێی بووریو لە ئاسیای بچووك بە فەرمانڕەوا دایمەزراند، وەلێ لێبوردنی شا

نەبووە ڕێگر لەپێش تەماحی لەپێناو سەندنی تەختی پاشایەتی لەبراکەی لەئاسیای بچووك.
میر،بۆ جێبەجێکردنی نیازەکەی لەشکرێکی پێکەوەنا زۆربەی لەو کرێگرتە گریکانە بوو کە لەمێژوودا بەناوی (لەشکرکێشی ١٠هەزار گریکی) ناسراوەو بەناوی زەینەفۆنەوە هاوبەندە، (زەینەفۆن) ئەو سەرکردەیە بوو کە سەربازەکانی لەشکرەکە دوای پاشەکشەیان لەوڵاتی بابلو شکانی لەشکرەکەی کۆرشی بچووكو کوشتنی، بە سەرکردەی خۆیان دایان نا. (زەینەفۆن ٤٣٠-٣٥٥پ.ز) لەکاتی گەڕانەوەی ئەو گریکانە بۆ وڵاتەکەیان، زانیاریگەلێکی گرنگی لەسەر ئەو شوێنو ناوچانە تۆمار کرد کە پێدا تێپەڕیو دیسان چەند لایەنێکی گرنگیشی تۆمار کرد لەمەڕ بارو گوزەرانی وڵات لەئاخرو ئۆخری سەردەمی فارسە ئەخمینییەکان بە تایبەت لەعێراقی باکوور (٥٨١/٦)و ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، لەوڕا گەیشتبووە وڵاتی ئەو کاردۆخییانەی کە بە درێژی ئەو (٧) ڕۆژەی بە وڵاتەکەیاندا تێپەڕی هێرشو پەلاماریان کردۆتەسەری (١٤٠/١١)و زەینەفۆن ئەوانەی بە شۆڕەسواری زۆر بەهێزو ئازا ناو بردوون.

زۆربەی مێژوونووسانی کوردو ژمارەیەك لەلێکۆڵەرەکان، پێیان وایە کاردۆخییەکان کوردەکانی ئێستان، ئەوانەی کە لەو سەروبەندەی باس کرا، لەو ناوچانە نیشتەجێ بوونە (١٧). سەردەمی فارسە ئەخمینییەکان لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك، بەماوەی لەشکرکێشییەکەی ئەسکەندەری گەورە (٣٥٦-٣٢٣پ.ز) بەرەو ڕۆژهەڵاتو عێراق کۆتایی پێهات، ئەسکەندەر لەشکرەکەی بەسەر دەردەنیل (بوسفۆر)دا گواستەوەو لەشەڕی ڕووباری (گرانیق) ساڵی ٣٣٤پ.ز ڕووبەڕووی هەوەڵین سوپای فارسەکان بۆوە. لەپاشان ڕووبەڕووی دارای سێیەم، خودی پاشای ئەخمینییەکان لەشەڕی دووەم، بۆوە کە لە(ئیسۆس) ڕوویداو تێدا لەشکری فارس تێكو پێك شکا. بەڵام ئەسکەندەری ماکدۆنی لەو نوشوستیو هەڵاتنەی تووشی دارا هات، وە دووی نەکەوت، بەڵکو ڕوویکردە میسرو سوریاو داگیری کردن (٣٣٢-٣٣١پ.ز). لەپاشان بەرەو عێراق وەڕێ کەوت بۆ دەستبەسەراگرتنی ناوجەرگەی ئیمپراتۆرییەتی فارس (٥٨٩/٦).

دارا،(٣٣٨-٣٣٠پ.ز)، لەدەشتی هەولێر لەشکرێکی گەورەو گرانی کۆکردبۆوە ژمارەی هەزار هەزار (واتە: ملیۆنێك) شەڕکەر بوو، پێکهاتبوو لە: فارسو میدیو بابلیو سۆمەریو ئەرمەنو کەبادۆكو بەڵخیو سەغدو ئەرخەزیو ساکیو هیندی. ئەسکەندەری ماکدۆنی بە (٧) هەزار سوارەو (٤٠) هەزار پیادەوە بەرەنگاری ئەم حەشامەتە تێکەڵەو ناپۆشتەو

هەمەرەگەزە بۆوەو بە کارامەیی لەشەڕی (کواکمیلا)، توانیی بەهۆی جیاوازی چەكو تفاقەکانیو لێهاتوویییو ئازایەتییەکەیەوە لەماوەی یەك رۆژدا لەشکرەکەی دارا پەرتەوازەو تەفروتوونا بکاتو پاشماوەی لەشکرەکەی لەو ناوچەیە بڵاوەیان کردو تێکەڵ بە قەومو هۆزەکانی دانیشتووی ئەوێ بوون، ئەم شەڕە (ئەربیلا)شی پێ دەگوترێ وەك ئاماژەیەك بۆ شاری ((ئەربیل)) ساڵی ٣٣١پ.ز (٧/١٢)، ئەوە بوو (دارا) بەرەو (ئەکباتان=هەمەدان) پایەتەختە دوورە دەستەکەی هەڵات، ئەسکەندەر تاوەکو وڵاتی فارس بە دوای کەوت، دای بەسەر (سووسە)داو پاشان بەرەو پایتەختی گەورە (برسیبولیس) ملی ناو (٤) مانگ لێرەدا لەشکری مۆڵ داو دوایەش درێژەی بە راوەدوونانی دارا داو گەیشتە شاری ئەکباتان، کە لەشکرەکەی گەیشتە دەوروبەری ئەو شارە، داراو دەستەو تاقمەکەیان دەسگیرکردو کوشتیان (٦/٥٩٠).

ئەسکەندەر لەوڵاتی بەختو سەغدو ئەودوای هەرێمەکانی ئەودیوی رووبارو ناوینەکانی ئاسیا، درێژەی بە لەشکرکێشییەکانی داو لەکاتی گەڕانەوەیدا بە وڵاتی (سەند)دا تێپەڕیو لەپاشان هیندستانی داگیر کرد، کە گەیشتە رووباری (گانج)یش، وەیزانی ئەوە ئەوپەڕی جیهانە، بۆیە سەرلەنوێ بایداوە بەرەو (سووسە) بۆ ئەوەی دەسبکات بە داڕشتنی پلانو پرۆژەکانی لەپێناو دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێك یاخود دەوڵەتێکی جیهانی هەموو نەتەوەو گەلان لەخۆ بگرێو بەبرایەتی لەسایەیدا بژین، بناغەی پلانەکەشی بەوە دانا (ستاتیرا)ی کچی دارای لەخۆ مارە کردو ژمارەیەکی زۆریش لەسەرکردەو سەربازەکانی، ژنانی فارسیان هێنا، جگە لەوەش ئەسکەندەر پلانی داڕشت بۆ بنیاتنانی هاتوچۆی دەریایی نێوان رووباری سەندو دیجلەو فوراتو نۆکەندی سوێس. لەپاشان بەرەو بابل گەڕایەوە، پاش ئەوەی کە لەساڵی ٣٣١پ.ز داگیری کردبوو دووبارە چاکسازیو نوێکردنەوەی تێدا کرد بۆئەوەی ببێتە پایتەختی دووەمی دەوڵەتە جیهانییەکەی لەپاش ئەسکەندەرییە کە لەوڵاتی میسر بونیادی نا.. لەکاتێکدا ئەسکەندەر ئامادەکاری دەکرد بۆ ئەوەی لەشکر بکاتە سەر دوورگەی عەرەب، نەخۆشی لەرزوتا بەرۆکی گرتو لەکۆشکی (نەبوخەدنەسر) لە١٣ی حوزەیرانی ساڵی ٣٢٣پ.ز مرد. ئەو یەك دوو سەدەیەی پاش مردنەکەشی بە چاخی (هیلینیستی) ناسرا لەم چاخەدا شارستانێتیەکی تێکەڵە لەژیارییەکانی رۆژهەڵاتی کۆن و ژیاریی یۆنان باو بوو (٦/٥٩١).

ئەو دەمەی ئەسکەندەری ماکدۆنی کۆچی دوایی کرد، لەوێدا کەسێکی وانەبوو شوێنی بگرێتەوە، بۆیە ناکۆکی کەوتە نێوان سەرکردە بەناوبانگەکانیو پاش ماوەیەکی دوورو درێژ

لەشـەڕو شـۆڕی نێوانیـان کـە نزیکـەی (٤٢) سـاڵی خایانـد، سـێ کـەس لـەو سـەرکردانە ئیمپراتۆرییەتە پانو بەرینەکەیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد، یەکـەمیان: سـلۆقس بـوو کـە (وڵاتی بابلو ئاشوورو سوریاو ئێرانو بەشەکانی خۆرهـەڵاتی ئاسـیای بچـووك)ی بەرکـەوت، خودی ئەم سەرکردەیەش بوو سەردەمی سلوقی لەعێراق دامەزراندو پاشانیش ئیمپراتۆرییەتی سلوقی کە لەهیندوستانەوە تا سنووری میسرو لەدەریای رەشیشەوە بەرەو دوورگەی عـەرەب، درێژ دەبۆوە. لەدوای ساڵی ٣١٢پ.ز. دووهەمین سەرکردەشیان پـاتلیمۆس ئـەوا پادشـایەتی میسری بەرکەوتو لەوێ مەملەکەتی پەتلیسەکان، یان پەتلیمـەکانی دامەزرانـد. سـێهەمین سەرکردەشیان (ئەنتیکۆس)، بووە فەرمانڕەوای ئاسیای بچووك (هەرێمی فریجیا) (٥٩٢/٦).

دوای پادشا سلووقیە ماکدۆنییەکان، جڵەوی حوکمڕانیی عێراق لەنیوەی سەدەی دووەمی پـێش زایین، کەوتە دەست پادشا فورپیە ئێرانییەکانو حوکمڕانییان لەعێراق نزیکەی ٣٥٠ سـاڵ بـەردەوام بوو (١٣٨-٢٢٧ز). فورپییەکان بە بنەچە دەچنەوە سەر هـۆزە هینـدۆ-ئەوروپییـەکان لەئاسـیاو بەخزمایەتی دەگەنە ئەکشۆزییەکان یان سکاییەکان Scythians، نیشتمانەکەشیان لەو پێدەشـتانە بوو کە لەنێوان دەریای قەزوینو دەریای ئارالْ داکشابوو و بەسوارچاکیو جـەنگ ناسـرابوون. نـاوی فورپی یان پارپی لەناوی ئەو هەرێمەوە هاتووە کە دواجا لەئێران دەسـتیان بەسـەردا گـرتو پێیـان دەگوت (پارتوا) -نزیکەی هـەموو هـەرێمی خۆراسـان-. فارپییەکـان بـەناوی ئەشـگانی یـاخود ئەشکانیشەوە ناسراون، بەر لەوەش لەم وڵاتەی کە بە ناوییانەوە نراوە، نازانرێ زمانە رەسـەنەکەیان چی بووە، بەڵام بە زاراوەیەکی ئێرانی کۆن کە پێی بێژن (پەهلەوی) داخـاوتن. پەهلـەوی لـەزمانی ئەشـکانی فارسـی ساسـانییەوە نزیکـەو هـەردوو زاراوەکـەش لـەزمانی کـەونارای فارسـەکانە. فورپییەکان رەنووسی ئارامییـان بـەکار بـردووە بـۆ نووسـینی زمانەکـەیانو لـەوێ ڕا لەناوچـەی کێوەکانی هەورامانو لەدەوروبەری هەڵەبجە، چەند دەقێکی فورپییانە دۆزراونەتەوە (٦٠٠/٦).

فارسە ساسانییەکان (٢٢٧ز-٦٣٧ز) لەپاش فورپییەکان، حوکمڕانیی عێراقیان گرتە دەست تا ئەو دەمەی لەشکری عەرەبی ئیسلامی هات. دوای ئەوەی فارسەکان (فورپیو ساسـانییەکان) کە بۆماوەی نزیکـەی ٨٠٠ سـاڵ فـەرمانڕەوایی عێراقیـان کـرد، چـەندین ئاسـەواری ژیـاریو ئابووریو کۆمەڵایەتییان تیا بەجێ هێشت. فارسەکان بەوە بەناوبانگ بـوون زۆر پابەنـدبوون بـە کلتـووری هلنسـتیو لێبـوردەیی ئـایینیو دانـانی چـەندین سیسـتمی کـارگێڕیو ئـابووریو کۆمەڵایەتی، ئەوان بنەماگـەلی سیسـتمی فیـودالیزم (دەرەبەگایـەتی)و فـەرمانڕەوایی خێزانـە ئەرستوکراتییەکانیان چەسپاند. ئەو بەڵگەنامانەش لەدۆرایۆریس (نزیـك شارۆچـکەی سـاڵحیەی

سووریا) دۆزرانەوە، ئاماژە دەکەن کە خودی فورپییەکان بوون پۆلیسی تایبەتیان دامەزراند بۆ پاراستنی ئاسایشی ڕێگا بازرگانییەکانو سوودیان لەدەزگای پۆستەی بەردەوامو دامەزراندنی وێستگەی تایبەت بە گۆڕینی ئەسپو وڵاخ وەرگرت بۆ زامنکردنی خێرایی گالیسکەکانو بونیاتنانی ماڵ (خان)ی تایبەت بۆ حەواندنەوەی بازرگانەکان لەشارە بازرگانییەکاندا و لەدەرەنجامی ئەم کارانەیان ژیانی ئابووری گەشەی سەندو سامانی زۆر کەڵەکە بوونو بازرگانی دەرەکی فراوانییەکی باشی بەخۆوە بینی بەسەر زۆربەی ئەو ڕێگا بازرگانییە جیهانییە بەناوبانگانەی کە نێوان کیشوەری ئاسیاو جیهانی ڕۆژئاوای بەیەکەوە دەبەست، بەشێوەیەك ئێرانو عێراق بوونە دوو مەڵبەندی گەورەی بازرگانی نێونەتەوەیی لەنێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا (٦٠٤/٦).

دوای هاتنی لەشکری عەرەبی ئیسلامی بەرەو عێراقو وڵاتی فارس، ئایینی ئیسلام لەنێوان ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەهەر چوار تیرە و شێوەزاریەوە (کرمانجو گۆرانو لوڕو کەڵوڕ) لەسەر دەستی هەردوو سەحابە (عزرەی کوڕی قەیسو عیاز کوڕی غەنەم) بڵاوبۆوە (٣٢٥/١٨). کورد قوربانییەکی زۆری دا لەپێناو ئایینی ئیسلامو پابەندبوونی بەم ئایینە، وێڕای ئەوە خەباتێکی خوێناوی سەختی کردووە بۆ پاراستنی ئازادیو سەربەخۆیی خۆی لەسەروبەندی هەردوو ساڵەکانی ٨٨٨و ٩٠٥ز، هەرچەند سەربەخۆیی ناوخۆی خۆی پاراستووە. پاشان ئێرانییەکان دەستیان گرت بەسەر کرماشانو دەروبەریو خستیانە پاڵ وڵاتەکەیان، بەڵام بەشی هەرە گەورەی کوردستان لەنێوان ئەو میرنشینە کوردییانە دابەش بوو بوو کە جاروبار قەوارەی نەتەوەییو هەندێ جاریش سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو ئەگەرچی هەندێ لەدەوڵەتە گەورەکانی ناوچەکە دەستیان گرتبوو بەسەریاندا.

## باسی دووەم

## ڕەچەڵەكو نیشتمانی كورد

لەدوای سەدەی شەشەمی پێش زایین وڵاتی كۆنی رۆژهەڵاتی نزیك،بە تایبەت دۆڵی دوو ڕووبارەكەو ئێرانو وڵاتی ئەنادۆڵ، بووبوونە تێكەڵەیەك لەدانیشتوان بەهۆی ئەو شەڕو شۆڕە وێرانكارییانەی لەنێوان دەوڵەتەكانی فارسو دۆڵی دوو ڕووبارەكە لەلایەكو لەنێوان ئەمیانو نێوان وڵاتی ئەنادۆڵ لەلایەكی ترەوە، ڕوویاندا. بۆ ئەم شەڕانە دەبوو ئەو دەوڵەتانە سوپاو لەشكر لەهەموو نەتەوەو ڕەگەزێك لە ویلایەتەكانیانو ویلایەتە دوورە دەستەكانی ژێر دەسەڵاتیان كۆبكەنەوەو فرەجار لەهەردوو باری سەركەوتن یاخود ژێركەوتندا پاشماوەیان لەنێو دانیشتوانی دەوڵەتەكەی تر بڵاودەبوونەوەو تێكەڵیان دەبوونو لەدەرەنجامی پێوەندییە كۆمەڵایەتیو ئابوورییەكان ناچار دەبوون لەوێ نیشتەجێ بن.

بۆ نموونە: ئەگەر چاوێك بگێڕین بە دۆڵی دوو ڕووبارەكە لەپاش سەدەی شەشەمی پێش زایین، لەوێ دا ئاریو عەرەبی خزمانی بابلی لەدانیشتوانی ڕەسەنمان بەرچاو دەكەوێ، سەرڕای پاشماوەی سۆمەریو ئەكادیو ئاشوورییەكان، چەند توخمێكی نوێیش هاتوونەتە نێو وڵاتەكە، وەك: عیبرانیو میسریو سوریایی، تەنانەت چەند كۆمەڵێكی یۆنانیش.

تێكەڵبوونی دانیشتوانەكە لەسەردەمی فارسە ئەخمینییەكانەوە بە بەردەوامی پەرەی سەند بەهۆی سروشتی پێكهاتەی ئیمپراتۆرییەتی فارسو سوپاكانییەوە (٦/٥٨٤)، دەبینی سوپاكەی دارای سێیەم (٣٣٨-٣٣٠پ.ز) كە پێكهاتبوو لەملیۆنێك شەڕكەرو لەشەڕی كواكمیلای نزیك هەولێر ساڵی ٣٣١پ.ز ڕووبەڕووی سوپاكەی ئەسكەندەری ماكدۆنی بۆوە، تێكەڵەیەكی فرە ڕەگەز بوو لەفارسو میدیو بابلیو ئەرمەنیو كبادۆكیو بەلخیو سەغدو ئەرخزیو ساكیو هیندی،ئەوە بوو ئەسكەندەر توانیی لەماوەی تەنها یەك ڕۆژدا تێكیان بشكێنێو لەو ناوچەیە پەرتەوازە بنو تێكەڵ بە هۆزو قەومەكانی ئەو شوێنە بن (٦/٤٦٠).

لەولاتی ئەنادۆڵیش، ئەم تێکەڵبوونە توندو بەهێزتر بـوو، لـەئاکامی کۆچـی هـۆزو نەتـەوە جیاجیاکانەوە بۆ ئێرەو هەروا بەهۆی ئەو شەڕو شۆڕە زۆرانەی لەسەر خاکەکـەی روویانـدا، ئـەم ولاتە سەرڕای دانیشتوانە رەسـەنەکەی لـەرۆمو گریـكو میتـانیو کشی(قاسـو)و نیسـییەکان، چەندین هۆزو نژادی رۆژهەلاتیو رۆژئاوایی تێـدا نیشـتەجێ بـوون، وەك: ئاشـووریو ئـەکادیو فارسو حپیو حۆریو سلوقیو سۆباریو گـۆتی (قـوتی)و میـدیو ئـارامیو لـوینو لولـوبیو مشکی (فریجی)و میسریو ئەخمینیو فورپیو ساسانیو رووسو بولقانو ئەوانیتر لەدانیشـتوانی شارەکانی ئەنادۆڵ یان نزیکی، وەك: گاسگا، ئورشو، ئـەرزاوا، کسـارا، مـیرا، کـانیش، کیرتـا، حەڵەب، عانە.

ئەگەر چیش، کۆی ئەو گەلو رەگەزانـەی کـە لـەولاتی دوو رووبارەکـەو ئێـرانو ئـەنادۆڵ نیشـتەجێ بـوون، زیـاتر لـە(٥٠) نەتـەوە بـوو، ئـەوا ژمـارەی ئـەو زمانـە فەرمییانـەی لەدەوڵەتەکانی ناوچەکەو ئیمپراتۆرییەتەکەیان بەکار دەبرا لەژمارەی پەنجەکانی دەستێك بـەو لاوە تێنەدەپەڕی، کە پێکهاتووە لەکۆمەڵەی زمانە سامیو هیرۆگلیفـیو هینـدۆ-ئـەوروپیو ئورالە تائییەکان، چونکە چەند ئەو گەلو رەگەزانەی کـە دەوڵـەتێك یـان ئیمپراتۆرییـەتێکی گەورەیان لێ پێکدێ، زیاد بکەنو پەرەبسێنن، ئەوەندەش پێویستە زمانێکی هاوبەش هـەبێت وەکو زمانی فەرمی بۆ لێکتر حاڵیبوون لەنێوان ئەو گەلانە لەبەر فرەیی زمانو زاراوەکانیـان، ئەمـەش هـەمان ئـەو کـارە بـوو ئیمپراتۆرییەتـە فرەگـەلو رەگـەزەکانی رۆژهـەلاتی نزیـك ئەنجامیاندا. لەوڕا، ئیمپراتۆرییەتەکانی بابلو ئەکادو ئاشووری، زمانی ئەکادیو بەڕێنووسـی بزمارییان کردنە زمانی فـەرمی خۆیـان، لەکاتێکـدا ئیمپراتۆرییـەتی حپـی زمـانی هینـدو ئەوروپییان کردە زمانی فەرمی لەولاتی ئەنادۆڵو ناوچەکانی سەر بەم ولاتە. بەلام پادشـاکانی ئیمپراتۆرییەتی فارس زمانی ئارامییان کـردە زمـانی فـەرمی ئیمپراتۆرییەتەکـەیان کـە لـە سەروبەندی ئەوانداو شان بەشانی زمانی فارسی کۆنو زمانی بابلی بە تایبەت لە ولاتی بابـل گەشـەی سـەندو (وەك زمـانی نووسـین لـەوێ بـەردەوام بـوو) (٥٨٥/٦). بـەش بـەحاڵی (هیرۆگلیفی)یش ئەوا زمـانی ئیمپراتۆرییـەتی میسـرو ولاتـەکانی دەوروبـەری بـوو. لـەوڕا، زاراوەکانی تایبەت بە حپییەکانو دانیشـتوانەکان لـەولاتی ئـەنادۆڵ بینـرا، پێیـان دەگـوت (هیرۆگلیفی حپی) (٢٤/٨).

هەرچەندە بەڵگەنامە کەمە سەرەتاییە ناکامڵەکانی سەر بە هەزارەی دووەمی پێش زایـین -کە لەمیانەیدا شارستانییەت پێشکەوت- لەو پارچە گڵێنە دۆزراوانەی لەهەر یەك لەسووسە

Susaو سیالك Sialk لەنزیك كاشان(ئێران) دۆزرانەوە، ئاماژە دەدەن بە رەگی عیلامی نووسینی وێنەكی Picto graphic هاوچەرخی سەردەمی جەمدەت نەسر لەماوەی سۆمەری (دەوروبەری ٢٩٠٠پ.ز)، ئەوا ئەو پارچە گڵینە سۆمەرییانەی كە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاكانی٣١٠٠پ.ز دەریانخست كە نووسینی عیلامی لەو نووسینە سۆمەرییەوە وەرگیراوە كە لە دەوروبەری ساڵی ٢٥٠٠ پ.زگۆڕاوە بۆ جۆرێك نووسین لە شێوەی چەند هێڵێك كە دەكرێ بخوێنرێنەوە. ئەم شێوازە نووسینە لە كۆتایی سەدەی بیستوسێی پێش زایین نەماو لەوێ ئەو خەتە بزمارییە ئەكادییە جێی گرتەوە كە عیلامییەكان لە سەروبەندی هەردوو سەدەی بیستوپێنج و بیستوچواری پێش زایین بەكاریان بردووە لە دەرەنجامی كاریگەرییە سیاسیو كلتوورییە سۆمەرییەكان لەسەریان (٩/ج١٧/٦٥٤).

ماوەی هەزارەی دووەمی پێش زایین،خەسڵەتی دوو دیاردەی زەقی لەخۆگرتبوو، یەكەمیان: گەیشتنی داگیركارە هیندۆ-ئەوروپاییەكان لەناوچەكانی باكوورەوە بەسەر بسفور (تەنگەی دەردەنیل) یان قەفقازیا بەرەو رۆژهەڵاتی نزیك. دووهەمیشیان: داهێنانی خەتی بزماری لەولاتی دوو رووبارەكە (٩/ج١/١٦٤). لەسەرووی ئەو داگیركارانەوەحیپیهكان بوون كە لەفەڵەستین دادەنیشتنو زێدیان (بئرالسبع) بوو (٣٦/٢٨)، پاشان لەگەڵ عیبرانییەكاندا تێكچوونو ئەمانیش حیپیهكانیان بەرەو ناوچەكانی سووریا هەڵبڕی، لێرەدا رەعم سیسی دووەم لەسەدەی نۆزدەهەمی پێش زایین لەشكرێكی گەورەی لەدژیان ئامادە كردو شەڕ لەنێوان حیپیو فیرعەونیەكان لەشاری (قادش)ی سوریا قەوما، دوای ئەمەش پەیمانێك لەنێوانیاندا بەسترا، دەقی پەیمانەكە لەسەر دیوارەكانی پەرستگەی (كەرنەك) تۆماركرا (٩/ج١١/٥٥٠). وادیارە دوای ئەم شەڕە چوونەتە ولاتی ئەنادۆڵو شاری (حاتوشا)یان كردۆتە پایتەختی خۆیانو لەگەڵ خاتیو نیسییەكان دانیشتوانی رەسەنی ئەنادۆڵ تێكەڵ بوونو لەئاسیای بچووك مەملەكەتێكیان بۆخۆ دامەزراندو زۆری پێ نەچوو بووە ئیمپراتۆرییەتێكی گەورە (١٩٠٠-١٢٠٠پ.ز).

خەتی بزماری ئەنادۆڵی كە لەخەتی بزماری سۆمەرییەوە وەرگیراوە، بە رێگەی ئەو (حۆری)یانەوە گەیشتۆتە (حپی)یەكان كە بەلێشاو لەناوچەی باكووری رۆژهەڵاتەوە داویانە بەسەر سنوورەكانی رۆژهەڵاتی ولاتی ئەنادۆڵو سنوورەكانی باكووری ولاتی دوو رووبارەكە.

(حۆری)یەکانیش وەکو ئەو (کاشی)یانەی کە -دواجار- بابلیان داگیرکرد، بە زمانێك داخاوتن خزمایەتییەکی نادیاری هەبووە لەگەڵ زمانی (خالّدی) (سەدەی ٩ی پێش زایین) کە باکگراوندی نزیکی ئەو زمانە هیندۆ ئەوروپییە ئەرمەنییەیە لەناوچەی دەریاچەی (وان) باوبوو و بەخزمایەتییەك دەگاتە کۆمەڵەی زمانە قەفقازییەکان (٩/ج١/٨٦٤).

عیلامامییەکانی دانیشتووی ئێران، لەهۆزە هیندییە-ئەوروپاییەکان نەبوون، چونکە زمانەکەیان لەو زمانە ئۆراڵ تائییە نەناسراوانە بوو کە نەپێوەندیی بەزمانە کۆنەکانەوە هەیەو نەش پوختەی زمانە نوێیەکانە، بۆیە هەموو بەڵگەنامە عیلامییەکان بەسێ زمان نووسرابوون: عیلامی، فارسی کۆنو ئەکادی (٩/ج/١٠٧). لێرەش لەگەڵ ئەو میدییانەی دراوسێیان بوون، لەرووی رەچەڵەكو کالتوورەوە جیاوازن میدییەکان لە گەلانی هیندۆ-ئەوروپایی بوونو زمانەکەشیان زۆر لەزمانی کوردیو زمانی پەهلەوی دەچوو کە هەردوو ئەم زمانەش سەر بە خێزانی زمانە هیندۆ-ئەوروپاییەکانن (١٠٩/٢٧).

یەکەمین ئاماژە بەهەردوو هۆزە ئێرانییەکە: فارسی مەجووسی Persua و میدیMedes لەهەواڵەکانی پادشای ئاشووری (شیلمەنەسری سێیەم) ساڵی (٨٣٥پ.ز)و دواتری هاتووە، ئەو دەمەی سوپاکانی ئاشووری پێوەندییان کرد بە کۆمەڵێك هۆزی ئێرانییەوە لەنێویاندا ئەو دوو هۆزە بوون، لەپاشان ئەو هەواڵانە لەسەرچاوە ئاشوورییە جیاجیاکاندا (٣٥٠٠پ.ز-٧٥ز) زیادیان کرد.

خەتی بزماری بە درێژی (٤)هەزار ساڵ (٩/ج١٧/٧٥م) وەك ئامرازێك بۆ نووسین لەژیارییەکانی دۆڵی دوو رووبارەکەو گەلانی دراوسێ: ئێرانیو ئەنادۆڵی، بەردەوام بوو. بەڵام ئەکادییە سامییەکان هەندێ گۆڕانکارییان بەسەر سیستمی ئەو خەتە بزمارییەدا هێنا کە لەبناغەدا بۆ نووسینی زمانێك پەیدا بوو زمانی ئەکادی نەبوو، بەڵکو زمانی سۆمەری بوو. ئەمە واپێویستی کرد هەندێ گۆڕانکاری لەسەر بکرێ تاوەکو بگونجێ بۆ ئەدای نووسینی زمانی ئەکادی کە ئەمیشیان کاریگەری لەسەر بوو لەدەرەنجامی نووسینی بە خەتی بزماریو هەندێك لەدەنگەکانی لەنووسین بزر بوون بە تایبەت پیتەکانی گەروو و دەنگە سامییەکانی تری وەك: (چ.ڤ.ع.ح) لەبەر نەبوونی هێماگەلی بزماری تایبەت ئەدایان بکەن. هەر لەسەردەمی ئەکادیشەوە دیاردەیەکی زمانەوانی لەسیستمی خەتی بزماری سەری هەڵدا، ئەویش: ئەو ئیشارانەی کرابوونە رەمز (واتە ئەو ئیشارانەی جێی رەمز دەگرنەوە) بۆ دەربڕین لەواژەی سۆمەری، لەزمانی ئەکادی بە مانای واژەکانی ئەم زمانە دەخوێنرانەوە- ئەمەش پێویستی بە

دانانی فەرهەنگ بوو بە تایبەتی لەسەروبەندی بابلی کۆن (هــەزارەی دووەمــی پــێش زایــین) بــۆ لێکدانەوەی ئیشارە بزمارییەکان بە ماناکانیان لەواژەو بەهاگەلی ئەکادیدا (٣٥٦/٦).

زمانو کلتووری ئەکادی لەوڵاتی دوو رووبارەکەو دەوروبەری تــاوەکو هــەزارەی دووەمــی پــێش زایین زاڵ بوو، ئــەو دەمــەی زاراوە ئاشــووریو بابلییــەکان لــەو زمانــە دایکــەوە، ســەریان هەڵــدا (٤٧٦/٦). لەویَ ئەم زمانە بووە زمانی فەرمی ئیمپراتۆرییەتەکانی بــابلیو ئــەکادیو ئاشــووریو ئەو وڵاتانەی هاتبوونە نێو قەوارە کارگێڕیو سیاسییەکانیانەوە، دەبینی لــەئاکامی لەشکرکێشــییە دەرەکییەکانی ئەکادییەکان بە ســەرکردایەتی ســارگۆنی ئــەکادی دامەزرێنــەری زنجــیرەی ئــەکادی (٢٣٧١-٢٣١٦پ.ز)و خەلیفەکانی دوای خــۆی کــە ناودارترینیــان (نــرام-ســین)ی نەوەکــەی بــوو (٢٢٩١-٢٢٥٥پ.ز)، ئیمپراتۆرییــەتێکی پــانو بــەرین پێکهــات زۆربــەی بەشــەکانی (هــلال الخصیب)و وڵاتی (عیلام)و بەشەکانی رۆژهەڵاتی ئاســیای بچــووك تــا کــەنارەکانی دەریــای ســپی ناوەراستی لەخۆ گرتبوو، نووسراوە مێژووییەکانی ئەو ســەروبەندانەی دوای چــاخی ئــەکادی باســی داگیرکردنی هەرێمی کەبدۆکیە لەرۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵمان بۆ دەگێڕنەوە لەلایەن سارگۆنی ئەکادییــەوە بە ئامانجی فریاکەوتنی نشینگەیەکی بازرگانە ئەکادییەکان کە بۆ بازرگانیی خــوریو مــس لــەوێ دامەزرابوو.

دۆزینەوەی شوێنەواریش لەناوچــەی خــاپوورو لایــەکانی جزیــرەی ســەروو، بــوونی چــەند نشینگەیەکیان لەچاخی ئەکادی لەو شوێنانە سەڵماندووە (٣٥٧/٦).

سارگۆن پاش ئەوەی دەستی گرت بەســەر وڵاتــانی بــەناوبانگی ئاشــووری، وەك نەینــەواو ئاشوورو هەروا بەسەر وڵاتی عیلامو ئەنادۆڵ،ئــەنجا ئــاوڕی لەرێکخســتنی ســەربازی دایــەوە، بەمــەش یەکــەمین کــەس بــوو سیســتمی ســوپایەکی ئامــادەو بــەردەوامی دامەزرانــدو گۆڕانکارییەکی بنەڕەتیی هێنا بەسەر شێوازەکانی شەڕو چەك، بێگومان ئەمە یەکێك بوو لەو کۆمەڵە هۆکارانەی یارمەتییان دا بتوانێت بەسەر (لۆکال زاکیزی) دۆژمنی دا ســەربکەوێت (٣٥٤/٦)، لەوانەشە سارگۆن سیستمی (کــوردۆ Qurdu)ی لەئاشــوورییەکانەوە وەرگرتبــێ، ئەویش بریتییە لەو یەکــە بەهێزانــەی دەکــرێ بــە (پاســەوانی تایبــەت) وەســپ بکــرێ، کــە پێکهاتوون لەو یەکە جەنگاوەرانەی بەرپرسن لەسەلامەتیی خودی شای ئاشووریو لەو کەسانە دەستنیشان کراون متمانەیان پێ دەکرێو بەتەواوی پشتیان پێ دەبەسترێو هەر کاتێك سوپای ئاشوور بۆ جەنگ بجوولێت، ئەو پاسەوانانە بەتەنیشتی (شا)وە دەڕۆن (٢٥٦/٢٠).

زمـانی سـامیی ئـەکادی لـەدوای لەشکرکێشـییەکانی سـارگۆنی ئـەکادی لەدەوروبـەری هەزارەی دووەمی پێش زایین، بووە زمانی فەرمی ئیمپراتۆرییەتە پانو بەرینەکە بـە تایبـەت پاش ئەوەی (نرام-سین) سەڵتەنەتی دەوڵەتی ئەکادی لەناوچەکانی باکوورو باکووری رۆژهەڵاتی وڵاتی دوو رووبارەکە چەسپاند، لەوێ ئەو هۆزە چیاییە بەهێزو توندانـە نیشـتەجێ بـوون کـە هاوسنووری دەشتاییە بە پیتەکانی دۆڵی دوو رووبارەکە بـوون (٣٦٩/٦)، لەکاتێکـدا زمـانی پادشایانی کاشی Kassite لە زمانە هیندییە ئەوروپییەکان بوو لەگەڵ بوونی پێوەندییەکی بە کۆمەڵەی زمانە قەفقازییەکانەوە (٩/ج٦٩٣/١٧) کە رەنگ بێت ئورارتی کۆن بووبێت.

لەهەمان ئەم سـەروبەندەش حیپیهکـان لـەوڵاتی ئـەنادۆڵ (١٩٠٠-١٢٠٠پ.ز) سـەریان هەڵداو زمانەکەیان لە کۆمەڵەی زمانە هیندییە- ئەوروپاییـەکان بـوو و ئیمپراتۆرییـەتێکی گەورەیان دامەزراندو ئـەم زمانـەیان کـردە زمـانی فـەرمی ئیمپراتۆرییەتەکـەیان (٢٢/٨)و نووسینی بزمارییان لەوڵاتی دوو رووبارەکە وەرگرتو لەزمانی دیبلۆماسیو بەسـتنی پـەیمانو ئاڵوگۆڕ کردنی پەیام لەگـەڵ بیانییـەکان، بـەکاریان هێنـا. لـەرووی گرنگیشـەوە نووسـینی هیرۆگلیفی پاش نووسینی بزماری دێت لە وڵاتی ئەنادۆڵو مێژووی بەکاربردنی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی (١٥٠٠-١١٨٠پ.ز)، لەوێ بە تایبەت بۆ نەقشی سەر بـەرد نـەخوازە لەناوچـەکانی رۆژئاوای ئەنادۆڵ بەکار دەبرا (٤٢/٢)، بە شێوەیەك بووە نووسینێکی نوێ کە (ماك کوین)ی شوێنەوارناس نێوی لێنا (هیرۆگلیفی حیپی) وەك جیاوازییەك لەنێوان ئەم نووسینەو نووسـینی (هیرۆگلیفی میسری) کە لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠پ.ز لە کیلیکیا بەکار دەبرا (٢٤/٨).

وێڕای ئەوە(حیپی)یە کۆنەکان، واتە: خاتییەکان دانیشتوانی رەسەنی ئەنادۆڵی نـاوین، بـە زمانێك داخاوتن جیاوازی هەبوو لەگەڵ خێزانی زمانە هیندۆ-ئەوروپییەکان لە لایەكو لەگـەڵ خێزانی زمانە سامییەکانیش لە لایەکی ترەوە، کەچی (نیشی)یەکان کە لقێك بوون لە لقەکانی (حیپی)یە کۆنەکانو لە هەمان ناوچەی وڵاتـی ئـەنادۆڵ نیشـتەجێ بـوون، بەشـێوەزارێکی تـر داخاوتن پێیان دەگوت (نیسـی)و لـەو شـێوەزارە هیندییـە ئەوروپیانـە بـوو کـە ژمارەیـەك لە(حیپی)یەکان پێی داخاوتن لەکاتی هاتنیان بەرەو وڵاتی ئـەنادۆڵ، لەپاشـان ئـەم شـێوەزارە لەگەڵ زاراوە (حیپی)یە کۆنەکە تێکەڵ بوو (٤٢/٢).

لەوێ ڕا، لەوڵاتی ئەنادۆڵ، زمانێکی دیکـەش هـەبوو پێیـان دەگـوت (ئاهسـو Ahsu)، وادیارە زمانێکی باو بووە لە باشووری رۆژهەڵاتی ئـەنادۆڵ، چـەند پارچـە گڵێنەیـەکیش بـەم زمانە لە ناوچەی(کول تەپە-کانیش) دۆزراونەتەوە (٤٣/٢) رەنـگ بـێ زمـانی مەملەکـەتی

ئیسوا Isuwa بووبێت کە لە مەلاتیەوە بەرەو رۆژئاواو بەسەر فورات بەرەو رۆژهەلات درێژ دەبۆوەو سەرزەمینەکەی (ئەرغانی مادن Ergani Maden)ی نزیك(مرعش)ی ئێستا کە بە کانزای مس دەوڵەمەندە، لەخۆ دەگرت (٨/٩٤).

بەش بەحاڵی زمانی(حۆری)یش، ئەوە زمانی کۆمەڵێك لەدانیشتوانی ولاتی ئەنادۆڵ بوو، پێیانیان دەگوت (حورییەکان). لانکی رەسەنیان لەو ناوچە شاخاوییە بووە کە نیوە بازنەیەکی پێکهێناوە، لەچیاکانی تۆرۆس لەنزیك کەرکەمیشەوە بەرەو دەوروبەری زرێباری (وان)درێژبۆتەوە، لەوانەشە ئەم قەومە بەرەو باشوور تاوەکو زێی سەروو داکشابن، لێرەش لوولووبیەکان بەلای رۆژهەلاتەوە(شارەزوور) دراوسێیان بوونە، ئەم هۆزە لەناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی بەر لەزایین سەریان هەڵداوەو پادشاکانی دەوڵەتی ئەکادی پێوەندییان لەگەڵ کردوون، لەوڕا ئەوان دەوڵەتۆکەیەکیان لەسەرووی دۆڵی دیجلەو فوراتەوە هەبووەو شاری(نوزی)- یۆرغان تەپەی نزیك کەرکووك- یان کردۆتە مەڵبەندی خۆیانو ناوی کۆنی شارەکەیان (گاسەرGasur)یان گۆڕیوە بۆ(نوزی) یان(نوزو). لە دەوروبەری سەدەی (پانزدەهەمی پێش زایین)یش لەباکووری دۆڵی نێوان دوو رووبارەکە، شانشینییەك سەری هەڵدا، زۆربەی دانیشتوانەکەی لە(حۆرییەکان) بوو، بەلام چینە حوکمڕانەکانی لەئوروستوکراتییە ئارییەکان بوونو مەڵبەندی شانشینییەکەش لە دۆڵی خاپوورو بلیخ بوو. ئاشوورییەکان بەم شانشینییەیان گوتووە (خانیکالْبات Khanigalbat)، بە (نەهارین) یان(نەهاریا)ش ناوبراوە، لەدەقە هاوچەرخەکانیش بەناوی مەملەکەتی (میتانی Mitanni) ناسراوە،بەلام شوێنو پایەیەکی گرنگی ئەوتۆیان بەدەر نەکەوت، تەنها لەسەدەی پانزدەهەمی پێش زاییندا نەبێ، ئەو دەمەی یەکێك لەپادشاکانیان بەناوی (شوشتار)ەوە، ولاتی ئاشووری داگیر کرد (٦/٧٩).

حورییەکان دەوڵەتێکی گەورەیان دامەزراند لەسەرزەمینێکی جوگرافی شێوە لاکێشە لەسەرووی چۆمی دیجلەوە تاوەکو دەریای سپی ناوەڕاست درێژ دەبۆوەو بە شارەکانی (کەرکەمیشو ئیمارو حەڵەبو کیرتا Kirta) تێدەپەڕی، لەوێ دا پادشایەك لە پادشایانی حۆری بەم ناوەوە هەبووە (١٣/١٤٧)، دەقە ئارکیۆلۆژییەکانی شاری (ماری)یش دەڵێن (کوردا Kurda) شارێك بووە لە نزیکی کەرکەمیش لە باکووری سووریا، پاشان وەکو هەرێمێك لەگەڵ کەرکەمیشو ئیمار (نزیکی حەلەب) ناوی هاتووە (١٤/١٥٧).

بەپێی گوتەی (دانێل ئارنۆ)ی پسپۆر لە بواری زمانە مێژووییەکان، لەدەقە بزمارییەکانو سەبارەت بە رووداوەکانی نێوان هەردوو ساڵی (١٥٥٠-١٣٥٠پ.ز) ئەمە هاتووە کە (کیرتا)

کەسێك بووە لەو پیاوە شکۆدارانەی کە چاکەی یەکخستنی ریزەکانی (حۆری)و بڵاوکردنەوەی رۆحی نەتەوەیی لەنێوانیاندا، بۆ سەر دەستی ئەو دەگەڕێتەوە (١١١/١٤).

لەو زمانە (حوری)یەی کە هەندێکی بەخەتی بزماری تۆمار کراوە، دیارە ئەوان (واتە:حورییەکان لەرووی زمانەوانییەوە نە لە رەگەزی سامیو نە لەرەگەزی هیندیبە-ئەروپییەکانیش بوون. بۆیە لێکۆڵەرەوانی مێژوو نەیانتوانیوە بیانبەنەوە سەر یەکێك لە هۆزە ناسراوە مێژووییەکان، ئەوە نەبێت زاراوەی نەناسراوی (Asianic)یان بەسەر دابڕیوە (٧٨/٦). دێرینەشناسی بەریتانیایی پرۆفیسۆر (جیمس میللەر) پێی وایە زمانی حوری لەزمانە لکێنراوەکانە (Aggtautinante) کە بڕێکی زۆر لەپاشگر بەکاردێنێ. زمانی ئورارتییەکان (زمانی باپیرە گەورەکانی ئەرمەن) پێوەندیی هەیە بەو زمانە (حوری)یەوە کە بە تایبەت لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لەنێوان هەردوو سەدەی نۆیەمو شەشەمی پێش زایین وەك زمانی فەرمی دەوڵەتی ئۆرارتی بەکاربراوە، بە تەواویش لەناوچەی دەریاچەی (وان)ی ئێستا (٤٣/٢).

لەوی ڕا، زمانێکی تر لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بەکاربراوە، ئەویش زمانی (سوباری)یە کە لە زمانە هیندۆ-ئەوروپییەکان نەبوو، بەڵکو زمانێکی نەناسراو بوو.

سوبارییەکان لەو هۆزە چیانشینانە بوون کە لەقۆڵەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵو باکووری نێوان دوو رووبارەکە لە ناوچەی جزیرەی سەروو و رۆژهەڵاتی چۆمی دیجلە دادەنیشتن. ناوچەی باکووری عێراقیش کە وڵاتی (ئاشوور)یشیان پێ دەگوت، لەچوارچێوەی نیشتمانی ئەواندا بوو، ئەمە پێش ئەوەی ئاشوورییە سامی نەژادەکان لە هەزارەی سێهەمی بەر لەزایین بۆ ئەوێ کۆچ بکەنو بەشی هەرە زۆری سۆبارییەکان بەرەو ناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە، هەڵبڕن. وەلێ، بێگومان توخمێکی زۆریان چوونە ناو پێکهاتەی نەتەوەیی ئاشوورییەکانەوە، دیسان چەندین کاریگەری زمانەوانیو ژیاریش تێکەڵ بە کلتووری ئاشوورییەکان بوون، وەك: خواوەندو کۆمەڵێك رێو رەسمی ئایینیو ناوی ژمارەیەك شارو شوێنو مەڵبەند (٧٧/٦).

لەسەروبەندی پادشاکەیان (ئاکۆم کاکریما ١٦٠٢-١٥٨٥پ.ز) کشییەکان لەشکریان کردە سەر بابلو لەساڵی ١٥٩٥پ.ز داگیریان کردو توانییان فەرمانڕەوایی دۆڵی دوو رووبارەکە- لە مەملەکەتی وڵاتەکە نەك (دەوڵەتۆکەی شارەکان) بکەنو نیمچە سەقامگیرییەك باڵی بەسەر ئەو ناوچانەدا کێشا، ئەگەرچی کشییەکان کەمایەتییەکی حوکمڕان بوون بە بەراورد لەگەڵ زۆرینەی دانیشتوانی وڵاتەکە، بۆیە ژیاری ئەو وڵاتە بەسەریاندا زاڵو تێکەڵاوی بوونو لەنێو

بۆتەکەیـدا قـاڵبی کـردن‌و زمـان‌و کلتـووری گشـتی وڵاتیـان وەرگـرت‌و نـاوی خوداوەنـدو پادشاکانیان‌و هەندێ واژەی وەرگێڕاویان نەبێ چی تریان بۆ بەجێ نەهێشتووین (٦/ ٤٥٠).

بەش بەحاڵی ئەو گۆتییانەش کەوا زنجیرەی ئەکادییان لەناو برد، ئەوا لەهۆزەکانی چیاکانی زاگرۆس بوون بەلای سنوورەکانی رۆژهەڵاتی عێراق لەگـەڵ ئێرانـدا، بەڕاسـتی نـازانرێ ئایـا لەهۆزە هیندییە-ئەوروپییەکان بوون یان نەء، چونکە سـەنەدو بەڵگەنامـەی نووسـراویان بـە زمانەکـەیان لـەدوای خۆیـان بـەجێ نەهێشـتووە، بۆیـە بێجگـە لـەناوی پادشـاکانیان کـە لەچەسپاندنی پادشایانی سۆمەردا هـاتووە، شـتێك لـەبارەی زمانەکەیانـەوە نەزانراوە،زێـدی نیشتەجێ بوونیشیان، ئەوا دراوسێی لولووبیەکان بوونە بەرەو باشوور، واتا: باشووری ناوچـەی شارەزوور سەرەڕای ناوچە شاخاوییەکان لە باشووری زێی خواروو.

ناوی گۆتییەکان بە بەردەوامی لەنەبەردییە تۆمارکراوەکانی ژیاریی دۆڵـی دوو رووبارەکـە تاوەکو سەروبەندەکانی دواتر هاتووە. نەوەکانی ئەم گۆتییانە بـەناوی (قوتـو) لەپەیامـەکانی شاری ((ماری)) (هەزارەی دووەمی پێش زایین) هاتووەو لەباس‌و هەواڵەکانی لەشکرکێشـییە جەنگییەکانی ئاشوورییەکانیشدا زۆر ئاماژەیان پێیان داوە، دواجار بەرەو قۆڵەکانی بـاکووری عێراق پاشەکشەیان کردووە بە تایبەت بەرەو ناوچەی کەرکووك‌و شاری (ئارابخا واتە کەرکووك) یان کردۆتە مەڵبەندی خۆیان (٦/٣٧٤). لەم بارەیەشەوە، پێویستە بگوترێ ئەو چـیایەی کـە کەشتییەکەی (نووح) لەسەری گیرساوەتەوە، لەباشووری شاری (وان)ی ئێستا لەوڵاتی ئـەنادۆڵ بووەو قورئانی پیرۆزیش بەناوی (جودی) باسی کردووەو نزیکە لەناوی (گۆتی)یەوە.

ئەگەر بگوازینەوە بەرەو روونکردنەوەی کاریگەریی زمانەوانی‌و کلتـووریی فـارس بەسـەر وڵاتی دوو رووبارەکەو ئـەنادۆڵ، پێویسـتە هەقیقـەتێکی مێـژوویی گرنگمـان لـەیاد نەچـێ، ئەویش: هەموو ئەو قەوم‌و هۆزە فارسانەی لەدەستپێکی (هەزارەی یەکەمی پ.ز)ەوە لەئێران‌و لەو بەشەی پێیان دەگوت وڵاتی فارس، واتا لەبەشی باشووری خۆرئاوای ئێران نیشتەجێ بوون کەئەویش وڵاتـی ئـەو فارسـە ئەخمینیانـەبوو کـە لـەهۆزە هیندییـە-ئەوروپاییـەکان بـوون، عیلامییەکانیش کە لەهۆزە هیندییـە-ئەوروپاییـەکان نـەبوون دراوسـێی ئـەوان‌و لەهـەرێمی خۆزستان (ئەهوازی ئێستا) نیشتەجێ بوون، وەلێ (میدییـەکان) لەهـەمان ئـەو سـەروبەندە، لەبەشـەکانی بـاکووری رۆژئـاوای ئێـران دادەنیشـتن‌و پایتەختەکـەیان ئـەکباتان (هەمـەدانی ئێستا)و لەهۆزە هیندۆ-ئەوروپاییەکان بوون... بۆیە دەڵێین: هەموو ئەم هـۆزو قەومـە ئـاری نەژادانەی کە ململانێ‌و بگرەو بەردەیان لەنێواندا بوو بۆ ئـەوەی هەریەکـەو بۆخـۆی جڵـەوی

سەروەریو دەسەلات -کە هەوەڵین جار لەدەستی میدییەکان بوو- بگرێتە دەست، هەموویان زۆر شتیان لەژیارییەکانی دۆڵی دوو رووبارەکە وەرگرت، بە تایبەت لەژیاریی ئاشوورییەکانو لەبوارەکانی رێکخستنی کارگێڕیو سەربازیو هونەری کە پوختەیەکیان لەخۆ دەگرت لەماریفەتو کلتوورو هونەرگەلی سۆمەریو ئەکادیو بابلیو حیپیەکان، هەر چەندە گۆڕانی نەتەوەییو زمانەوانی لەعێراق بەرەو سامیزم زاڵ بوو بەسەر مۆرکی ئەو سۆمەرییانەی کە رووداو گەلی لێکۆڵینەوە ئارکیۆلۆژییەکان ئاماژە دەدەن ئەوانیش لەرووی سیاسییەوە لەهۆزە سامییەکەیان بوون پاش ئەوەی سامییەکان یەکلایەنە حوکمڕانی عێراقیان کردو تیادا زمانە سامییەکان بۆ نزیکەی (١٥) سەدە زاڵ بوو هەر لەرووخانی زنجیرەی سێیەمی ئورەوە (دەوروبەری ٢٠٠٤پ.ز) تاوەکو رووخانی دەوڵەتی کلدانی لەسەر دەستی فارسە ئەخمینییەکان لەساڵی ٥٣٩پ.ز (٤٣٥/٦).

ئاشوورییەکان، لەدەوروبەری ساڵی ١١٦٨ یان١١٦٢پ.ز کشییەکانیان لەناو بردبوو، ئەنجا دەوڵەتی کلدانی لەبابل سەری هەڵدا، دامەزرێنەرانی ئەم دەوڵەتە لەو ئارامییانە بوون کە توانییان چەندین دەوڵەتۆکەو میرنشینی لەبەشەکانی باشووری عێراق لەسەدەی یانزدەی زایینیەوە دابمەزرێنن، بەلام نەیانتوانی دەوڵەتێکی گەورە بۆخۆیان بنیات بنێن، بەهۆی فشاری عیلامیو ئاشوورییەکان لەسەریانو گەمارۆدانی دەوڵەتۆکەکانیان نەبا پەرەبسێننو پەل بهاون. هەرچەندە ئارامییەکان لەرووی سیاسییەوە سەرنەکەوتن، وەلێ کلتوورە زمانەوانیو رۆشنبیرییەکەیان لەرووی گەورەیی قەبارەکەیەوە لەپێشی کلتووری زۆرێك لەگەلانی کۆنی رۆژهەلاتی نزیکەوە بوو، چونکە زمانەکەیان بەشێوەیەکی بەرفراوانو سەرسوڕهێن پەرەی سەند بەبێ ئەوە دەسەلاتێکی سیاسی پشتگیری ئەو پەرەسەندنە بکات و شان بەشانی زمانە کۆنەکان تاوەکو رۆژگاری ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری بوو بووە زمانی نوسین و زمانی ئاخاوتن، لەپاشانیش لەهەموو شوێنێکی ئیمپراتۆرییەتی فارسە ئەخمینییەکان هەر لەتخووبی هیندستانەوە بگرە تاوەکو ولاتی حەبەشە، هەمان رۆڵی گێرا. ئەرمەنیو فارسو هیندییەکانیش، نووسینەکانیان لەنووسینی ئارامییەوە وەرگرت -کە رەچەڵەكو ماکی نووسینی عەرەبییە- لەنێوان هەردوو سەدەی شەشەمو چوارەمی پێش زایین (٤٩٦/٦).

ئیمپراتۆرییەتی فارسە ئەخمینییەکان، نزیکەی (٢٠٠) ساڵ (٥٣٩-٣٣١پ.ز) فەرمانڕەوایی گەلانی رۆژهەلاتی نزیکی کرد، لەو ماوە زەمەنەدا ناوچەکە گەلێ راپەڕینو شۆڕشی سەختو پشێوی گەورەو پیلانگێڕیو شەڕو شۆڕی بەخۆوە دی لەنێوان دەوڵەتەکانیدا.

دەبینی پاش ئەوەی لیدیەو فریجیە (مشکییەکان)و ئەیۆنیە کە بریتی بوون (لەشارو نیشتەنییە یۆنانییە کەناراوییەکان لەرۆژئاوای ئەنادۆڵ) بوون هەروا کەبادۆکیەو کیلیکیە (لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ) (ویلایەتەکانی لە٥-٩)، پاش ئەوەی بوونە بەشێك لە(٢٠) ویلایەتەکەی پادشای فارس دارای یەکەم (٥٢٠-٤٨٦پ.ز)، لەمیسریش شۆڕشێکی سەرتاسەری هەڵایسا، دیسان یەکێك لەرابەرانی بابل شۆڕشێکی توندی بەرپاکرد، لەمیانەیدا حاکمی بەرەگەز فارسی بابل کوژرا، وەلێ (ئەحشۆیرش ٤٨٦-٤٦٥پ.ز) بەو پەڕی توندو تیژیو بێ بەزەییانەوە شۆڕشەکەی دامرکاندو شۆڕشگێڕانی چ بە ئازارو ئەشکەنجەو چ بە کوشتن لەناو برد، لەپاشان شەڕی لەدژی یۆنان دەستپێکردو لەشکرێکی گەورەو گرانی کردە سەرو دەستیگرت بەسەر (ئەسینا)دا، بەڵام بەرخودانی ئەسپارتەکانو تێکشکاندنی هێزە دەریاییەکەی لەلایەن خودی ئەو ئەسپارتانەوە، بوونە هۆی ورە بەردانی پادشای فارس، سەرەنجامیش بەخۆیو لەشکرە پیادەکەیەوە بەرەو دوا بوونەوە (٦/٥٧٨).

ئەگەرچی بارودۆخی ئیمپراتۆرییەتی فارسی ئەخمینی، دوای ئەم رووداوانە رووی لەئاڵۆزی کرد، وەلێ تەشەنەکردنی لاوازیی لەجەستەی دەوڵەتو فەرمانڕەواکانی (بەپادشاو میرانییانەوە)و پیلانگێڕیو ناکۆکی لەنێوان حاکیمانی بنەماڵەی حوکمڕان، لە هۆکارەکانی داڕووخانی بارودۆخەکە بوو، بە تایبەت ناکۆکی نێوان میری فارس (کۆرشی بچووك) کە لەویلایەتەکانی ئاسیای بچووك لەجیاتی براکەی شا (ئەرتەحششتا)ی دووەم حوکمڕان بوو، لەگەڵیدا تێکچوو، ئەوە بوو زەینەفۆن لەشکرکشییەکەی ئەنجام دا کە لەمێژوودا بەناوی (لەشکرکشی دە هەزار گریکییەکە) ناسرا، زەینەفۆن بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا ناوی وڵاتی کوردی بە (کاردۆخی)و (کورد)یشی بەناوی (کاردۆخییەکان) بردووە،ئەمە لەو دەمەی کە لەشکرەکەی شکاو بەخۆیو ئەو کرێگرتە گریکانەوە لەپاش تێکشکانی لەشکرەکەی کۆرشی بچووكو کوشتنی، ساڵی (٤٠١پ.ز) لەوڵاتی (بابل)ەوەو بەسەر ناوچەی کوردستانو تا دەگاتە ئەنادۆڵ بەرەو دوا بۆوە. زەینەفۆن لەبارەی وڵاتی کوردەوە باس دەکاتو دەڵێ: هەموو بەندییەکان —ئەو فارسانەی لەگەڵ خۆیاندا بردیان- ئامادە کران بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیان سەبارەت بە وردەکارییەکانی هەموو ناوچەکانی دەوروبەر ئەو سەربازگەیەی تێدا باروبنەیان خست. بەندییەکان تاکیدیان کرد ئەو هەرێمەی بەلای باشوورەوەیە دەگاتە رێگەی بابلو میدیاو هەمان ئەو رێگەیەشە لێوەی هاتوون —واتە زەینەفۆنو سەربازەکانی- بەڵام رێگاکەی لای رۆژهەڵات دەگاتە (سوسە)و (ئەکباتان) ئەمەش ئەو ناوچەیەیە کە وەکو هاوینەهەوار

وابوو بەلای پادشاکانی سۆمەرەوە. جا ئەگەر کەسێك توانیی لەرووبار (واتە: دیجلە) بپەڕێتەوەو روویکردە خۆرئاوا، ئەوە ڕێگاکە دەگاتە لیدیاو ئەیۆنیا. هەرچی ڕێگای باکووریشە بە چیاکاندا، ئەوە بەرەو کاردۆخی Carduchi دەڕوات. بەندییەکان زیاتر لەسەری رۆیشتن‌و گوتیان: ئەو کاردۆخییانەی لەناوچە شاخاوییەکان دەژین جەنگاوەری ئازاو بەهێزن‌و گوێڕایەڵی شا نین. سوپای شاهەنشاهی فارس کە لە(١٢٠) هەزار شەڕکەر پێکهاتبوو هەوڵیدا بە وڵاتەکەیاندا تێپەڕێ بەڵام تاکە سەربازێکیشی لەم لەشکرکێشییە نەگەڕایەوە لەبەر سروشتی سەخت‌و دژواری ئەم ناوچەیەی کە سوپای فارس دەبوو بەسەریدا تێپەڕێ. ئەو کاتەی مەرزوبانی فارسیش (Satrap) ڕێککەوتننامەییەکی لەگەڵیاندا بەست بۆیان دەرکەوت پێوەندی هاوبەش هەیە لەنێوان خۆیان‌و کاردۆخییەکاندا. پاش ئەوەی ژەنراڵەکان -واتە: سەرکردەکانی ئەو بەکرێگیراوە گریکییانەی زەینەفۆنیان کردە رابەری خۆیان- گوێیان لەم وەڵامانە بوو، ژمارەیەکیان لەو بەندییانە هەڵبژارد کە گوتیان شارەزای ڕێگاکەین‌و بێ ئەوە بۆ ئەو قۆڵەی رووی تێدەکەن ئاگاداریان بکەن تاوەکو لەو ڕێگایەی پێدا دەگەڕێنەوە لەتەکیاندا بن. ئەوان نیازیان وابوو بە شاخ‌و داخەکاندا، بدەن بەسەر وڵاتی کاردۆخییەکاندا، چونکە بە گوتەی بەندییەکان دەکرێ بگەنە ئەرمینیا —بەو کەژوکێوانەی کاردۆخییەکان تیا نیشتەجێن- کە شا ئۆرانتاس حوکمڕانی دەکات، لەوێشەوە —بەندییەکان گوتیان- ئاسانە بەرەو شوێنی مەبەست پێشڕەوی بکرێت (١٢٧/١١).

نووسەری خەڵکی سووریا (مونزیر مووسڵی)، بە دڵنیاییەوە دەڵێت: ئەو خێڵ‌و هۆزە کوردانەی لەدەریاچەی (وان)ەوە تا (بۆتان) پەرەیان سەندو پەلیان هاویشت، توانییان لەسەدەی چوارەمی پێش زایین میرنشینییەکی کوردی بەناوی (مەکهورت)ەوە بۆ خۆیان دابمەزرێنن (١٠٨/٢٧). مینۆرسکی بە دواداچوونی سەبارەت بەم باسە مێژووییە دەکات چونکە کورد لەو ناوچەیە هەبووەو بە دڵنیاییەوە دەڵێت: هاتنی کورد بۆ کوردستان لەدەوروبەری (١٠٠٠)ی پێش زایین بووە، ئەو گووتییانەش کە وڵاتەکەیان لەناوچەی رۆژئاوای زرێباری (وان)و خۆرهەڵاتی چۆمی دیجلە بوو، ئەوانە باپیرە گەورەکانی کوردی ئێستان‌و هەر ئەوانەن کە سەرکردەو فەیلەسووفی یۆنان (گەزنەفۆن)چاوی پێیان کەوت‌و پێوەندیی لەگەڵیاندا کرد (١١٨/٢٧).

کۆمەڵێك لەقەواڵەو سەنەدی بازرگانی‌و ئابووری سەروبەندی (سلۆقییەکان)و بێجگە لەژمارەیەك لەدەقی کۆن‌و دەقی تایبەت بە نوقڵانەو پێشهاتی دوانەیی زمان (سۆمەری‌و بابلی)و کۆمەڵێك نووسینی مێژوویی پێمان گەیشتوون، لەنێویاندا دوو خشتە بەناوی پادشاکان‌و چەند

دەقێکیش لەم سەردەمە یان کەمێك پێشتری بەدەر کەوتوون (٥٩٤/٦). دەستکەوتی گرنگی کلتووری سلۆقییەکان: دانانی بنەماگەلی فەلسەفەی هیلنیستیەتو بڵاوکردنەوەی بووە لەسەر ئاستێکی بەربڵاو سەرڕای پشتبەستن بە خەتی ئارامیو زمانی ئارامی.

دوابەدوای پادشا سلۆقییە مەقدۆنییەکان، پادشا ئێرانییە فورپهکان، حوکمی عێراقیان گرتە دەست (١٢٦پ.ز-٢٢٧ز)، ئەمانە هەر لەساڵی (٢٤٧پ.ز)ەوە فەرمانڕەوایی ئێرانیان دەکرد، پاشانیش ساسانییەکان (٢٢٧پ.ز-٦٣٧ز) بەمەش فەرمانڕەوایی فارسەکان لە وڵاتی دۆڵی دوو ڕووبارەکەو وڵاتی ئەنادۆڵ، نزیکەی (٨) هەشت سەدە تاوەکو سەردەمی هاتنی لەشکری عەرەبی-ئیسلامی، درێژەی کێشا.

ئەگەرچی، فارسە فورپییهکان لەگەلانی هیندۆ-ئەوروپییەکانی ئاسیانو بە پێوەندیی خزمایەتی دەگەنە ڕووسە ئەشکۆزییەکان یان سکیتییەکان، وەلێ لێکۆڵینەوە مێژووییەکان دەسەلمێنن کە گەلانی ئاریایی لەدەستپێکی (سەدەی دەیەمی پێش زایین)ەوە دەستیان داوەتە ڕەوکردن بەرەو ئێرانو لەباشووری ڕووسیاوە هاتوونەتە ئەو وڵاتە، بەو شێوەیە کە هۆزو قەومە سەرەکییەکانی ئێران لەسەروبەندی ئەخمینییەکاندا پێکهاتوون لە: فارسو میدیو پارپیو ئاریانو دارانجو ئەرخەزیو باختەریو سەغدو خوارزمی، ئەمانە ئەو قەومو هۆزانە بوون کە چەندین پشتو وەچەیان لێ جوێ بۆوەو ئیدی بە زاراوەگەلی ئێرانی جیاجیا داخاوتن (٩/ج١٧/٦٥٣).

ئەگەر چاوێك بە کوردستانی ئێستاو پێناسەی ئەو قەومانەی تیا نیشتەجێ بوون یاخود کۆچیان بۆی کرد یان داگیریان کرد، بگێڕین.. هەمیسان ئەگەر لەزمانەکانیانو کلتوورو هاتنیان بۆ ئەم ناوچەیە بکۆڵینەوە کە سەرزەمینێکی لاکێشەیی پێك دێناو هەر لەدەریاچەی (ورمێ)وە لەئێران لەرۆژهەڵات دەکشا بەرەو دەشتی قۆنیە لەتورکیا لای ڕۆژئاواو لەدەریاچەی وانیشەوە لای باکوور بەرەو شارەزوور لەعێراق بەلای باشوور. دەبینین دابەش بوونەتە سەر سێ جۆر تیرەو هۆز:

جۆری یەکەم/ ئەو تیرانە دەگرێتەوە کە لەهەزارەی دووەمی پێش زایینەوە -بۆ نموونە: حیپیهکان- هاتوونەتە ناوچەکە بەرەو وڵاتی ئەنادۆڵ کۆچیان کردووە، یان میدییە هیندۆ-ئێرانیو فارسەکان لە جوڵانەوەیەکی فراوانی هۆزە هیندۆ-ئەوروپییەکان لەباشووری روسیاوە لە ئاسیا بەرەو ناوچە شاخاوییەکان لەباکووری ئێران کۆچیان کردووە (٩/ج١٧/٦٥٣)، یانیش ئەو هۆزانەی لەناوچەکە هەواربەند بوون پاش ئەو شەڕو شۆڕانەی تیادا بەردەوام بوو، وەك: عیلامیو ئاشووریو ئەکادیو ئارامیو فارسو سلۆقیو ..هتد.

جۆری دووەم/ بریتی بوو لەو هۆزە هیندۆ-ئەوروپیانەی کە لە کۆتایی سەدەی هــەژدەمینی پێش زایین هاتنە ناوچەکەو وەکو حوکمڕانی ئەرستوکراتی خۆیان بەســەر هــۆزە کاشــییەکانی نــاوخۆدا ســەپاند. کۆمــەڵێکی تــریش کــە خواوەنــدە ئارییــەکانی وەك (میپــرا Mithraو ڤارونا Varunaو ئیندرا Indra) یان دەپەرست، لەسەدەی شانزدەهەمی پێش زایین توانییــان سەربکەون بەسەر (حورییەکان)ی دانیشتووی باکووری دۆڵی دوو رووبارەکە (٩/ج١٧/٦٥٣) و پاڵیان بە کاشیو حورییەکانەوە نا بەرەو لەشکرکێشیو دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتەکان.

جۆری سێهەمیشیان/ ئەو هۆزو تیرە کۆنانە دەگرێتەوە کە لەهــەر دوو هــەزارەی ســێیەمو دووەمی پێش زایینەوە لانکی رەسەنیان ئەم ناوچــەیە بــووە. دەبیــنین گووتییــەکان لەدامێنــە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس نیشتەجێ بوونەو ناوچەکەیان تاوەکو ســلێمانی درێــژ دەبــۆوە، وەلــێ لولووبیەکان لەسەرزەمینی شارەزوور دادەنیشتن، عیلامییەکانیش دەستیان گرتبــوو بــە ســەر دەشتی سووسەو ناوچەی گردو تەپۆلکەکانی دەوروبەری. کاشی (قاســو یــان کاشــۆ)یەکانیش بــەلای بــاکووری رۆژهــەڵاتی عیلامییەکانــەوە نیشــتەجێ بــوون (٩/ج١٧/٦٥٣).هەرچــی سۆبارییەکانیش بوون (باپیرە گەورەکانی ئاشــوور)لەنێوان دوو رووبارەکــە لەناوچــەی جزیــرەی سەروو و خۆرهەڵاتی دیجلە دادەنیشتن، بەڵام حورییەکان کە شانشینی میتانی یــان شانشــینی خانیکاڵبات یان شانشینی نەهاریناییان دامەزراند، ئەوا نیشتمانەکەیان لەو ناوچە شاخاوییەدا بوو کە نیوە بازنەیەکی پێك دەهێنا لــە چــیاکانی تۆرۆســی نزیــك گەرگــەمیش (جەرابلوســی سوریا)وە بەرەو دەریاچەی (وان) لەباکووری رۆژهەڵاتی تورکیا (٦/٧٨).

سەرەڕای ئەو هۆزو تیرە گەورانە، لەوێ دا، چــەند هــۆزێکی بچــووك بچــووك یــان چــەند خێڵێکی ناوچەیی هەبوون، توانییان لە سەروبەندی هەردوو هــەزارەی دووەمو یەکــەمی پــێش زایین ژمارەیەك لەدەوڵەتۆکەی شارەکان دابمەزرێنن، بەڵام ئەو دەوڵەتۆکانە نــەیانتوانی گەشــە بکەنو پەرەبسێنن لەبەر فشارو ئابلۆوقەی ئەو هۆزو قەومە گەورانە.. نموونەی ئەو دەوڵەتۆکە شــارانەش: کۆســارا Kussaraو نیســا Nisaو کــانیش Kaneshو کارگــەمیش Car-chemishو کومانی Kummaniو کیرتاKirtaو نوزی Nuziو ئاراپخا Arapkahوئالالاخ Alalakhو حەڵەب Helpaو هتد..

هەرچۆنێك بێت،ئەوەی لەرووی مێژووییەوە چەسپاوو حاشــاهەڵنەگرە، کــورد لــەو شــوێنە نیشتەجێ بوون کــە دەوڵــەتی میــدیا لەســەدەی حەوتــەمی پــێش زایــین لەســەری دامــەزراو لەسەرزەمینێکی نێوان دەریــای قــەزوین لــەباکوورو کەنــداوی عــەرەب لەباشــوورو لــەنێوان

باختەران لەئێران لەرۆژهەلاتو رووباری قزیل ئیرماق (نزیکی قەیسەری ئێستا لەتورکیا لەرۆژئاوا درێژ دەبۆوە. بەم تەرحە زۆربەی کوردستانی ئیمرۆ لەخاكو قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە لەمێژینەیە بوو، کە (کورش)ی پادشای فارسەکان لە(٥٥٠پ.ز) توانیی لەناوی بباتو خاکەکەی بلکێنێ بە دەوڵەتەکەیەوە، هەر لەو سەردەمەشەوە کورد بوونە بەشێك لەو ئیمپراتۆریەتەی (کۆرش)ی فارسی دامەزرێنەری زنجیرەی ئەخمینیە فارسەکان، بنیاتی ناو کوردیش وەکو فارسەکان باوەڕیان بە ئایینی زەردەشت هێنا (٤/١٠).

سەردەمی فارسە فورپییهکان لەعێراق جیاوازیی هەلایسانی جەنگو شەڕو شۆڕێکی زۆری لەخۆ گرتبوو، سەرەتا لەگەڵ سلۆقییەکانو پاشان لەگەڵ رۆمانو باکووری عێراق بووبووە گۆڕەپانی زۆرێك لەو شەڕانەی لەنێوان فورپییهکانو رۆمانەکان قەوما، لەهەواڵ و دیرۆکەکانیاندا دەرکەوتنی ژمارەیەك لەشارە گرنگەکان بوو لەسەر سنوورەکان لەباکووری نێوان دۆڵی دوو رووبارەکە، وەك: ئەنتاکیە، حەڕان، نەسیبین (٦٠١/٦).

لەناوەڕاستی سەدەی دووەمی بەر لەزایین، واتە سەروبەندی فەرمانڕەوایی فورپییهکان لەعێراق، حورییەکان لەئاراپخا (کەرکووکی ئێستا) بڵاوبوونەوەو لە رووبەرە شێوە لاکێشەیەکی جوگرافیدا گەیشتنە دەریای سپی ناوەراست بە کارگامیشدا (جەرابلس لەسوریا)و ئیمار (مەسکەنە)و حەڵەبو کیرتاش (Kirta)دا (١٣/١٤٧).

دەقە دۆزراوەکانی شاری ماری (تەپۆلکەی حەریری نزیك ئەلبوکەمال) باس لەوە دەکەن کوردا Kurda شارێك بووە لەنزیك کارگامیش، پاشانیش وەك هەرێمێك لەگەڵ کارگامیشو ئیمار (لەنزیك حەڵەب) ناوی هاتووە (١٥٦/١٤).

بە پشتبەستن بە (دانێل ئارنۆ)ی توێژەرو پسپۆری زمانە کۆنەکان، دەڵێت: لەدەقە بزمارییەکانو رووداوەکانی دەوڵەتی میتانی نێوان هەردوو ساڵی (١٥٥٠-١٣٥٠پ.ز) هاتووە: کیرتا Kirta یەکێك بووە لەو پیاوە ناودارو پایە بەرزانەی کە کاری یەکخستنی ریزەکانی حورییەکان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، چونکە هەستێکی نەتەوەیی لەنێویاندا خولڤاندو بووبووە وێردی سەر زمانیان لەهەمبەر شکستیو پاشاکشەی حیپیهکان (٢٢/١٥).

وەك زانراوە هەندێك لەناوەکان بەناوی پادشاکانیشەوە لەم ماوەیەدا بەدەر کەوتوون: شاران Sarranو ئابان Abban کە لەحەڵەب تا دەگاتە ئاموك، جێگیر بوون. ئەم ناوچەیە یان ئەم هەرێمە پێی دەگوترا موگیش Mugis، پێشتر ئەم ناوەیان لەپایتەختێکی کۆنی هەرێمەکە نابوو، وەك زانراوە میتانییەکان لەسەردەمی پادشاکەیان ئیدریمی Idrimiی

کوڕی (ئیلیم ئیلیما Ilim Ilima، فەرمانڕەوایی ناوچەکەیان کردبوو، لەوڕا ئیدریمی گەیشتبووە پلەیەکی پێشکەوتوو لەرووی ناوبانگی نەتەوەییو دەسەڵات لەنێو پادشا میتانییەکانداو بەشداریی کردبوو لە پاکتاوکردنی پاشماوەی حیپیەکان لەشارەکانی حورییەکانو ئاراپخا (کەرکوك) لەو سەروبەندە بووبووە مەڵبەندێك لەمەڵبەندەکانی دەسەڵاتی پڕ سەنگو پایەو کاریگەری بەرەو رۆژهەڵات هەتا عیلام (١١٢/١٤).

شوێنەوارناسی عێراق (تەها باقر) زیاتر پێی وایە: لانکی رەسەنی حورییەکان ئەو ناوچە شاخاوییە بێت کە نیوە بازنەیەك پێکدێنێ لەچیاکانی تۆروسەوە لەنزیك کارگامیش (جەرابولسی ئێستا) تاوەکو نزیکەی دەریاچەی (وان) درێژ دەبێتەوە، لەوانەشە حورییەکان بەرەو باشوور تاوەکو زێی سەروو کە بەلای رۆژهەڵاتەوە لەناوچەی شارەزوور لۆلۆبییەکان دراوسێیان بوون، پەلیان هاویشتبێ. دەرکەوتنیشیان لەمێژوودا لەهەزارەی سێیەمی پێش زایین بووەو دەوڵەتۆکەیەکیشیان لەسەرووی دۆڵی دیجلەو فوراتەوە هەبووە، بەڵام گرنگییەکی سیاسی ئەوتۆیان لێ بەدەر نەکەوتووە تەنها لەسەدەی پانزدەهەمی پێش زایین نەبێت،ئەو دەمە، تەنها ناویان لەتەوراتدا هاتووە (٧٨/٦).

لەزمانەکەیان کە چەند دەقێکی بە خەتی بزماری نووسراوە، وادەردەکەوێت ئەوان لەرووی زمانەوانییەوە نە لەسامییەکانو نە لەهۆزە هیندۆ-ئەوروپییەکانن، بۆیە توێژەرەوان نەیانتوانیوە بیانبەنەوە سەر یەکێك لەهۆزە مێژووییە ناسراوەکان، ئەوە نەبێ بە زاراوەی نادیاری (ئاسیاییەکان) ناویان بردوون. بەڵام زمانی ئورارتی (زمانی ئەرمەنی کۆن) نزیکترین ئەو زمانە ناسراوانەیە لەزمانەکەیانەوە.

حورییەکان لەچارەکی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین لەچەند شوێنێکی (هلال الخصیب) بڵاوبوونەوە، بە تایبەت لەباکووری سووریا. ماوەیەك دواتر کە بە نزیکەی سەدەیەك مەزەندە دەکرێ، دەبینی حورییەکان لەباکووری عێراقدانو مەڵبەندەکەیان لەشارە دێرینەکەی [(نوزی) -یۆرغان تەپەی نزیك کەرکووکە]، دیسان ئەم حورییانە زۆرینەی دانیشتوانی هەردوو شانشینی (خانیکالّباتو میتانی)یان پێك دێنا، ئەم دوو شانشینەش لەباکووری نێوان دوو رووبارەکە سەریان هەڵدا (٧٩/٦).

دێرینە شناسی عێراقی دکتۆر (وەلید الجادر) بە زۆری پێی وایە، کوردەکانی ئێستای عێراق لەپاشماوەی ئەو حورییانەن کە لەناوچەکانی باکووری عێراق نیشتەجێ بوون (١٦)، ئەمەش هەمان بۆچوونە کە شوێنەوارناسی عێراقی خوالێخۆشبوو تەها باقری مامۆستای

باسی کردووەو  زیاتر لەو بڕوایەدایە کوردەکانی ئیمرۆ لەگووتیو لۆلۆبییەکان بن کە دراوسێی حورییەکان بوونو لەناوچەکانی ژوورووی عێراقو بەشە شاخاوییەکانی دادەنیشتن (٧٦/٦).

جا، ئەگەر ئەم ڕاستیە ئاسەواریو زمانەوانییانەی کە جەختیان کردۆتە سەر ئەوەی کە لەوێدا لەو سەروبەندە مێژووییەدا لەم ناوچەیە، نەتەوەیەك نەبووە بە ناوی (کورد) یان (کوردەکان)ەوە، هەروا بە رەهایی ئاماژەشیان بە کۆچکردنیان نەداوە بەرەو ئەم ناوچەیە لەو چاخە مێژووییە کۆنەدا، ئەوا پرسیارێکی زەق خۆی هەڵدەقورتێنێ: کەوا بوو کوردەکان لەکوێوە هاتوونەتە ئەم ناوچەیە؟!

ئێمە، پێمان وایە کورد گەلێکی رەسەنو دێرینن، لەکۆنەوە لەو چوارگۆشەیە نیشتەجێ بوونە کە دەکەوێتە نێوان چیاکانی زاگرۆسەوە بەلای رۆژهەڵات تاوەکو هەرێمی کارگارمیش (خاڵی بەیەکگەیشتنی سنووری (عێراق-ئێران-تورکیا- سووریای) نزیك جەرابولسی ئێستا) لای رۆژئاوا، لەسنووری شانشینی (ئیسو Isuwa)شەوە لای باکوور (نزیك مەلاتییەی ئێستا) تاوەکو دەشتی شارەزوور بەلای باشوور، ئەو چوارگۆشەیەی کە لەمێژووی کۆندا پێیان دەگوت (وڵاتی سەرووی نێوان دوو رووبارەکە)، زۆریش رێ تێدەچێ شاری (کیرتا) (١٣/١٤٧) کە رەنگ بێت نزیکی یان لەشوێنی شاری (هەکاری)ی ئێستا یان هەرێمی کوردا Kurda بووبێت (١٤/١٥٦) لانكو نیشتمانی کورد بێت، کە بە پێی سەرچاوە مێژووییە جیاجیاو زۆرەکان بە پیاوانی نەبەردو دلێر ناویان هاتووە (٦/٤٥٠)، (٩/ج١٧/٦٥٣)، (١١/١٢٧)، (١٤/١١١)، (٢٠/٢٥٦)،و ئەوانە بوونە کە دوورنییە ئاشوورییەکان پشتیان پێ بەستوون لەدامەزراندنی ئەو رێکخستنە سەربازییەیان کە بە نێوی کوردۆ (Qurdu) بووەو پێکهاتووە لەو یەکە سەربازییە بەهێزو دلێرانەی بەرپرس بوون لەسەلامەتی شەخسی پادشای ئاشووریو بەتەنیشتییەوە دەڕۆیشتن کاتێك لەشکری ئاشووری بەرەو شەڕ دەجووڵا (٢٠/٢٥٦)، رەنگ بێت هەر خۆیشیان ئەو کۆمەڵە ئاری نژادییانە بووبن کە پێکهاتبوون لەو هۆزە هیندۆ-ئەوروپییانەی رابەری (کیشو حوورییەکان) بوون لەلەشکرکێشییەکانیاندا لەوڵاتی دوو رووبارەکەو وڵاتی ئەنادۆڵ (٩/ج١٧/٦٥٣).

لەبەر ئەوەی زۆربەی هۆزە کۆنەکانی دانیشتووی باکووری وڵاتی دوو رووبارەکە (کوردستانی ئێستا)، زمانە رەسەنەکەیان گۆڕیبوو چ لەدەرەنجامی لەبیرچوونەوەیان یان تێکەڵاوبوونیان بووبێت لەگەڵ گەلانی گەورەی باڵادەست کە لەوێ زمانی سامی لە نێو

هەموو گەلانی ناوچەکە بلاوبوو و فورپییهکانیش بە یەکێك لەزاراوە کۆنە ئێرانییەکان داخاوتن پێیان دەگوت (پەهلوك)و لەفارسی ساسانییەوە (پارسیك) نزیك بوو و خەتی ئارامیشیان بۆ نووسینی زمانەکەیان بەکار دەبرد (٦٠٠/٦)، وەلێ ئەو کوردانەی کە کلتووری نەتەوەیی خۆیان پاراستو لەناو گەلانی تری دانیشتووی ناوچەکە نەتوانەوە، باپیرانیشیان بە زمانێك قسەیان دەکرد لەزمانی (ئۆرارتی)یەوە نزیك بوو و زمانی فارسی کاری تێکردبوون کەوا بە درێژایی (٨) سەدە لەولاتی دوو رووبارەکە زمانێکی باو بوو. لێرەدا دەکرێ بێژین کورد قەومێکی نامۆ نین لەناوچەکە، بەڵکو لەوەتەی لەمێژوودا ناسراونو لەهەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە دانیشتوانی ئێرە بوون ئەو دەمەی پادشایانی ئاشوور پیاوە جەربەزەو تیرهاوێژە کارامەکانی ئەم نەتەوەیەیان کردە پاسەوانی خۆیان لەتیپێکی تایبەتدا پێیان دەگوتن (کوردۆ) تا زەینەفۆن (کاردۆخیا)ی شانشینیانی لەساڵی (٤٠٢پ.ز) دۆزییەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمانەش چەندین ناویان لێ نراوە، لێرەدا مێژووناسی عوسمانی (ئەحمەد رەفیق) جەخت لەوە دەکات کە (کاشییەکان) رەچەڵەکی کوردن، لەکاتێکدا زانای گەورەی کورد ئەمین زەکی پێی وایە (گووتییەکان) باپیرە گەورەکانی کوردی ئێستان، کەچی شوێنەوارناسی عێراقی خوالێخۆشبوو تەها باقر پێی وایە کوردی ئەم رۆژگارە رەنگە لە(لۆلۆییەکان)بن، هەرچی دێرینەناسی عێراقیشە خوالێخۆشبوو (وەلید جادر) زیاتر لەو بڕوایەدایە کە کوردانی ئێستا لەپاشماوەی (حورییەکان) بن. لێرەشدا، ئێمە پێمان وایە: کوردو کاردۆخیاو کیرتاو لۆلۆییو قاسوو کاشوو گووتیو حوریو میتانیو خانیکالبّاتو ئەرزاواو جوودی، ناوی خێڵە نیشتەجێیەکانی ناوچەکەن لەدێر زەمانەوە کە لەسەرزەمینەکەیدا دەوڵەتۆکەی جیاجیایان دامەزراندووە یان رابەرایەتی ژمارەیەك گەلانی نامۆی سەر ئەم خاکەیان کردووە کە ناویان لەگەڵ ناوەکانی ئەو خێڵە کوردییانە هاتووە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا ناسرابوون (بەراوردی ئەو ناوانە بکە لەگەڵ ناوەکانی ئەم خێڵانە: جودیکانلو، موتکی، قالخانلو، بالابان، بیلکانو، بلبّاس، حالیکان، خانی، میللی کوردان، لۆلۆ، بابان، زروکان..هتد).

رەنگە (کیرتا) یان (کوردا) یەکێك لەخواوەندەکانی کورد بووبێت لەسەردەمی میدییەکان یان کشی یان حورییەکان، وەك ئەوە چۆن شارێك بووە لەنزیك کارگامیش (جەرابولس لەباکووری سووریا)و ناوی پادشایەکیش بووە لەپادشایانی حورییەکان، سەرڕای ئەوە هەرێمێکیش بووە لەگەڵ کارگامیشو ئیماد (نزیکی حەڵەب) باس کراوە، جگەلەوە

ناوی یەکێك لەو پیاوە خانەدانو پایە بەرزانە بووە کە کردەوەی چاکەی یەکخستنی ریزی حورییەکانو بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی لەناویاندا بۆ ئەو دەگەڕێتەوە (١١١/١٤)و ئەو کوردانەش لەو هەرێمە نیشتەجێ بووبوون، ناوی خۆیان لەناوی ئەو خواوەندەوە، وەرگرتووە.

ئەم گریمانەیەمان کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، واتە: (کیرتا)یان (کوردا) ناوی خواوەندێکی کوردەکانو نیشتمانیان بووبێتو ناوی خۆیان لێوەی وەرگرتبێ، جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە زۆربەی گەلانی رۆژهەڵاتی کۆنی نزیك لەچەرخەکانی پێش مێژوو بە ناوی ئەو هەرێمەوە ناسراون کە دوایین جار تیا نیشتەجێ بوون. واتە: ناوەکە پاشگرە بۆ نیشتەنییەکە (٦/٦٤)و لەناوی خواوەندێك یان شارێك یان شوێنێکی جوگرافی یان کەسایەتییەکی پایە بەرزەوە وەرگیراوە، وەك: (کاهین یان پادشا) بۆ نموونە (کشی)یەکان ناوی خۆیان لەناوی (کشو)ی خواوەندەکەیانەوە وەرگرتووە (٦/٤٥٠). ئاشوورییەکانیش، (ئاشوور) ناوی خواوەندو پایتەختەکەیانو وڵاتو پادشاکانیشیان (ئاشووردان، ئاشوور بانیپالو ئەوانیتر) بووە.

وەلێ، بابلیو ئەکادیو موئابیو حیسیوفورپییەکان، ناوەکانیان بەناوی ئەو شارانەوە هەڵگرتووە کە وەك مەڵبەند یان پێتەختەکانیان بوون.

وادیارە، شاری (کیرتا) یان هەرێمی (کوردا) ئەمەندە بچووك بووە، سەرچاوە مێژووییە کۆنەکان بیریان لەناوهێنانی هەردوو ناوەکە نەکردۆتەوە، بەڵکو لەوانەشە پشتگوێخستنی ناوهێنانی ئەوە بێت: هەرێمەکانی (کوردا) هەمیشە لەسەرچاوە کۆنەکاندا شان بەشانی کارگامیش (١١١/١٤)و لەچوارچێوەی ناوچەی کارگامیش ناویان باس دەکرا، هەر لەبەر ئەم خاڵەش سەرچاوەکان خۆیان لەقەرەی ناوهێنانیان نەداوە وێڕای ئەو هەموو رووداوە گەورەو شەڕو شۆڕە نەبڕاوانەی کە لەنێوان ئیمپراتۆرییەتە رۆژهەڵاتییەکان لەناوچەی کارگامیشو لەنزیك ئەو شارە لەسەروبەندی سەدەی شانزدەهەمی پێش زایین، قەوماون. بۆنموونە: پادشای (حیسی)یەکان مورسیلیوس، بەرێگایەوە لەوڵاتی ئەنادۆڵەوە بەرەو داگیرکردنی وڵاتی بابل لەساڵی (١٥٩٥پ.ز) (٨/٤٢) توانیی دەستبگرێ بەسەر ئەم ناوچەیەو شاری (حەڵەب)یش وێران بکات. نەوەکەشی پادشای حیسی (سوپیلولیوماس Supplilumas) توانی سووریا هەمووی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوەو کوڕێکی لەسەر تەخت بە پادشا لە(حەڵەب)و کوڕەکەی دیکەشی بەمیر بەسەر کارگامیشی کێبڕکاری حەڵەب، دابنێ (٨/٩٤).

لەسەردەمی حوکمڕانی فیرعەونی میسریش تەحۆتەمس (١٥٠٦-١٤٦١پ.ز)، دەوڵەتی میسری نوێ هیکسۆسەکانی لەمیسر بەرەو سووریا ڕەتاندو پاشانیش بە بەرپاکردنی شەڕێك کەوتە ڕاوەدوونانیانو دەوڵەتە بچووکەکانی شارەکانی لەفەلەستینو سووریا تاوەکو قادش داگیرکردو لەوێشەوە بەرەو شاری کارگامیش ملی ناو لەڕووباری فورات پەڕییەوە بەرەو شانشینی حورییەکان لەدەوڵەتی میتانی (٩/ج٨/٣٦). بەڵام میتانییەکان لەسەردەمی پادشاکەیان ئیدریمی (Idrimi) گەڕانەوە بەرەو ناوچەکە بەئامانجی ریشەکێشکردنی پاشماوەی (حپی)یەکان لەشارە حورییەکانداو ئاراپخا (کەرکوك) بووە مەڵبەندێك لەمەڵبەندەکانی حوکمی خاوەن پایەو کاریگەریو سەنگو بەها لەڕۆژهەڵاتەوە تاوەکو عیلام، وەك چۆن لەو دەقە بزمارییانەدا هاتووە کە تایبەتن بە ڕووداوەکانی دەوڵەتی میتانی لەمیانەی (١٥٥٠-١٣٥٠پ.ز) (١١/٨).

سەرباری ئەو ڕووداوە خوێناوییانە، ئەگەر کۆمەڵێك فاکتەری دیکەیان بخەینە پاڵ، وەك: هێرشو لەشکرکێشی هۆزە ئارامییەکان لەوڵاتی شامەوە بۆسەر وڵاتی ئاشوورو ڕەوی چەند کۆمەڵە هۆزێکی هیندو-ئەوروپایی تر بۆ ناوچەکە لەباشووری ڕووسیاو وڵاتی ئەنادۆڵەوە لەپاش سەدەی شانزدەهەمی پێش زایین (٩/ج١٧/٦٥٣) کە لەو دەمە کارگامیش پێگەیەکی ستراتیژیی گرنگی هەبوو وەك وێستگەیەك بۆ پەڕینەوەی کاروانی بازرگانی لەنێوان سووریاو وڵاتی دوو ڕووبارەکەو ئەنادۆڵ بە تایبەت دوای ئەوەی لەسەردەمی پادشای (حیسی)یەکان (سویسلولیوماس) بووە دەوڵەتێکی ناوبەینو بێلایەن لەنێوان هەرسێ دەوڵەتی کێبڕکار، ئاشووریو میتانیو میسری (٩/ج٤/٨٨٧)، ئەوا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە دانیشتوانی ناوچەی کارگامیش –بەهەرێمی کورداشەوە- چەند فشارێکی سەربازیو مرۆییو ئابوورییان لەسەر بووەو ئەمە بۆتە هۆی کۆچکردنی ژمارەیەك لەهۆزەکانی ناوچەکە،دووریش نییە کورد یەکێك بووبن لەو هۆزانەی لەوێوە کۆچیان کردبێت بەرەو ناوچە شاخاوییەکان بۆ خۆپاراستن لەو شەڕو شۆڕە خوێناوییانە. ڕەنگ بێت فشار خستنە سەر دانیشتوانو بەکاربردنی زەبرو زەنگو ترساندنیان لەلایەن میتانییەکانەوە بەهۆی ڕاوەدوونانی (حپی)یەکان لەشارە حورییەکان بە ئامانجی لەناوبردنیان، کاریگەریی بووبێت بۆ هەڵکەندنی کورد لەهەرێمی (کوردا)وە -کە گریمانەمان کرد لەوێ بوونیان بووبێت- بەرەو ئەو ناوچە شاخاوییانەی کەزەینەفۆن لەوێ بینییانیو ناوی (کاردۆخی) بەسەر وڵاتەکەیاندا چەسپاند کە لەناوە کۆنەکەیانەوە (کوردا) نزیکە یان لێوەی وەرگیراوە، ئەمە لەسەروبەندی

سەدەی پێنجەمی پێش زایین بوو (١٧٢/١١)، نەخوازە ڕەوی هۆزەکانو گۆڕینی ناوچەکانی دانیشتنیان لەرۆژهەلاتی کەونارا لەو سەردەمانەدا، مەسەلەیەکی باوبوو.

بەلام لێرەدا پرسیارێك بە خەیالدا دێ: ئەگەر مەسەلەکە وابێت، بۆچی کورد شوێنەوارێکیان بەجێ نەهێشتووە نیشانە بێت بۆ پێناسەی نەتەوەیی و نیشتمانەکەیان وەك نەتەوەکانی دیکەی رۆژهەلاتی کۆن؟!

وەلامی پرسیارەکە، بەم شێوەیە دەدەینەوە: کورد چ لەدامەزراندنی یەکە پاسەوانییەکانی(کوردۆ)ی تایبەت بە پادشا ئاشوورییەکان، یان لەرابەرایەتیکردنی کاشیو حورییەکاندا، کەمایەتییەکی نەتەوەیی جەنگاوەرو شەڕکەر بوون، کاتێك خاكو واری خۆیان لەهەرێمی (کوردا) بەجێ هێشتو -ئێستا پێی دەلێن قوردی (کوردی)و دەکەوێتە رۆژهەلاتی جزیرەی ئیبن عومەر (١٨٣/٣٤)- لەناوچە شاخاوییەکاندا نیشتەجێ بوون، جۆرێك لەگۆشەگیرییان بەسەر خۆیاندا سەپاند هەلی بۆیان نەڕەخساند پێوەندی بە کلتوورەکانی ترەوە بکەنو تێکەلاویان بن، بەهۆی سەرقالبوونیان بە بەرگریکردن لەولاتەکەیانو پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان لەو ناوچە شاخاوییە سەختانەدا کە یارمەتی دان گوێڕایەلی پادشای (١٢٧/١١) فارسە ئەخمینییەکان کۆرشی گەورە نەبن (٥٥٨-٥٣٠پ.ز) کەوا جیهانی وڕوکاس کردبوو و ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەی دامەزراندبوو لەسنووری هیندستانەوە بەرەو دەریای ئیجەو بەسەر ولاتی دوو رووبارەکەو ئەنادۆلدا درێژ بووبووەوە. ئەو گۆشەگیرییە یارمەتی کوردی دا هاورەگەزیی خۆیانو تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانیان بپارێزن لەبەر شانازیکردن بەخۆیانو زالبوونی هەستی نەتەوەیی نێوانیان لەلایەكو لەلایەکی تریشەوە لەبەر یەکگرتوویی و پەرتەوازە نەبوونیان لەناوچەکانی تر. لێرەشەوە گۆشەگیریو هاورەگەزیی کوردەکان وایانکرد کۆمەلگەی لادێیی ناوچەیی پێك بێت -بە پێی پۆلێنکردنی دوالیزمی کۆمەلناسی بەراوردکاری، واتە ئەنپرۆپۆلوجیای کۆمەلایەتی- کەوا (رید فێلد) روخسارە چەشنییەکانی بە(٥) پێنج خەسلەت دیاری کردووە، جیاوازیی ئەو کۆمەلگەیە دەردەخات ئەوانیش ئەمانەن (٢١/١٠٠): گۆشەگیری، هاورەگەزی، کاملبوونی کلتووری، قودسییەت (پیرۆزی)، دەستەجەمعی، کە پالی داوە بە چەشنە رەوشتییە لادێییو عورفو نەرێتە خێلەکییەکانو کلتووری بچووکی رۆشنبیری کە سەرۆکی هۆز یان عەشیرەت وەك ئەو باوکە رۆحیو رابەرە کارگێڕییەیە، لەناو کەسانی عەشیرەتەکەی دەسەلاتی رەوایە. ئەم دامەزراوەییە وەك خۆی ماوەتەوە کە بەرجەستە

دەکات لەخەسڵەتی بنـەڕتی ژیـانی سیاسـیو ئـابووریو کۆمەڵایـەتیی کـورد، ئەگەرچـی لەماوەی دواییـدا مـەیلێکی ئاشـکرا بـە لایانـەوە سـەری هەڵـداوە بـەرەو سـەقامگیریی کشتوکاڵیو شارستانیبوون (٢٢١/٢٩)، بۆیـە ئـەم کۆمەڵگەیـە پێچـەوانەی کۆمەڵگـەی ژیارییـە -ئـەویش جەمسـەری دووەمـە لـەو پۆلینـە دوالیزمییـەی بـاس کـرا- کـە ئـەم خەسڵەتانەی هەیە: قەبارەی گەورەو چڕیی بـەرزی دانیشـتوانو ناهاورەگـەزیو جیـاوازیو پێوەندییە رەسمیو عیلمانیو تاکە کەسییەکانو لێکترازانی کۆمەڵایەتیو کلتووری گەورەی رۆشنبیری کە دەوڵەتەکانی حوریو کشیو گووتی گوزارەیان لەو کۆمەڵگە ژیارییـە دەکـرد لەو سەروبەندە مێژووییەی کوردستان تیادا لەژێر دەسەڵاتی یەکێك لەو دەوڵەتانە بـوو کـە ئیمپراتۆرییەتەکانی بنیات ناو پێوەندیگەلی بەرفراوانی رۆناو لەرووی کلتووریو ژیارییــەوە کاریگەریی کردە سەر رەوتی رووداوەکان لەناوچـەی رۆژهـەڵاتی نزیـكو دیـرۆكو هـەواڵو کاروباری ژیانی تۆمار کرد، ئەگەرچـی لـەبارەی زمانـەکانی یـاخود ئایـا چ زمانگـەلێکی کردۆتە زمانی نووسین زانیارییەکی ئەوتۆمان نییە، چونکە تایبەتمەندییـەکانی کۆمەڵگـەی گەورە -واتە: کۆمەڵگەی ژیاری- دادەڕژێنە نـاو کۆمەڵگـەی بچـووکتر یـانی کۆمەڵگـەی لادێ، هەرچەندە بە پێناسە سەر بەیەك ژیارین (١٢٣/٢١).

بەو شێوەیە کورد لەژێر کاریگەریی شارستانییەتی هەموو ئەو دەوڵەتانـە مانـەوە کـە دەسەڵاتیان سـەپاندبوو بەسـەر ناوچـەکەیاندا یـا وڵاتەکـەیانیان داگـیر کردبـوو و بـەهۆی گۆشەگیرییان یان فشارو نارەحەتی ئەو دەوڵەتانەی لەسەریان بووە، نەیانتوانیوە کاریگـەری بکەنە سەر دراوسێیەکانیانو دیرۆكو کاروباری ژیانی خۆیان تۆمار بکەن، ئەگەرچی زمانی تایبەت بەخۆیان هەبوو.

ئێمـە لەحاڵێکـدا پشـتگیری لـەئاریابوونی کـورد دەکـەین، وەلـێ گومانمـان هەیـە لەمیدیبوونیان -واتە میدی بن- چونکە وێکچوونی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی میـدی — وەك دوو زمان لەکۆمەڵەی زمانە هیندۆ-ئەوروپییـەکان (١٠٩/٢٧)، بەڵگەیـەکی لاوازەو توێژینەوە زانستییە نوێیەکان دانی پێـدا نـانێن، چـونکە کۆڵەگـەی کۆمەڵایـەتیی قـەومو هۆزەکان تەنها لەسەر زمان بونیـاد نـەنراوە، بـەڵکو لەسـەر چـەندین پرنسـیپی ئـایینیو ئـەخلاقیو مـافو پیشـەییو ئـابووریو هونـەری -سـەرڕای زمـانیش- بنیـات نـراوەو هەریەکەیان دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی پێکدێنێ کە بەشێوەیەکی هاوئاهەنگ لـەبونیادی کۆمەڵایەتیی نەتەوەیی پێوەندار کار دەکات (١٨٥/٢٢). بەڵام بزربوونی کاتی یەکێك لـەو

پرنسیپانە لەبنەمای کۆمەڵایەتی هەر نەتەوەیەك پێناسەکەی لێ ناسێنێتەوە، یانیش رۆڵە ژیارییەکەی هەڵناوەشێنێتەوە. بۆنموونە ئەگەرچی (کشی)یەکان بە بەراورد لەگەڵ زۆرینەی دانیشتوانی وڵات کەمایەتییەکی حوکمڕان بوونو زمانی بابلییان کردبووە زمانی فەرمیی خۆیانو ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەیان دامەزراندبوو، بەڵام لەدوای حوکمڕانییان لەعێراقدا نووسراویان بە زمانە نەتەوەییەکەی خۆیان بەجێ نەهێشتووە، چونکە شارستانییەتی دۆڵی دوو رووبارەکە بەسەریاندا زاڵ بوو و لەبۆتەکەیدا توابوونەوە (٤٥٠/٦). بوونی زمانی سۆمەریو عیلامیو حوریو توورکیش لەکۆمەڵەی زمانە ئۆراڵ تائییەکان (زمانە لکێنراوەکان)، ئەوە ناگەیەنێت رەچەڵەکی سۆمەرییەکان تورك بن، لەهەمان کات مانای واش نییە حوریو تورکەکان ئامۆزای یەکتر بن، هەروا ئەوەش ناگەیەنێت عیلامیو تورکەکان بچنەوە سەر یەك رەگو ریشە. جگە لەوەش قسەکردنی فارسو ئەڵمانو فەرەنسییەکان بە زمانێك کە ئەویش زمانی هیندۆ-ئەوروپاییە، نەتەوەییبوونی ئەو سێ گەلە ناسڕێتەوە کە پێی داخێون،چونکە نەتەوەکان بە پێناسەو ئازادیو کارو خەبات پێدەگەنو گەشە دەکەنو بە ناهاورەگەزیو ژێر دەستەییو زوڵمو زۆرداریش لەناو دەچن. لێرەشەوە، لەجیهانی ئەمڕۆدا نەتەوەیەکی خاوێنی سەد دەرسەد نییە لەرووی ئەتنیکییەوە.. تەنانەت ئەو نەتەوانەش کەوا بەدەر دەکەون هاورەگەزن، زۆرێك لەتوخمە ئەتنییە دواکەوتووەکان لەدەرەنجامی ئینتیماکردن یان کۆچو کۆچبارو داگیرکاریو شەڕو شۆڕ، هاتوونەتە نێو پێکهاتەکەیانەوە. بەنموونە ئەو فەرەنسییانەی کەئێستا وەك نەتەوەیەکی هاورەگەز دەبینرێن، لەچاخە مێژووییەکانداو لەئاکامی لەشکرکێشیو شەڕو شۆڕ، یان رەوکردن تێکەڵاوی نزیکەی (٦٠) شەست رەگەز لەهۆزو نەتەوەکانی تر بوونە، وەك: جەرمەن،فەرەنگ، ئاوەر، هۆن، ساکسۆن، گال، لیگۆر، نورمان، ئەندال، بۆرگۆندیو عەرەب و ئەوانیتر، کە بە هەموویانەوە لەم رۆژگارەماندا گەلی فەرەنسییان پێکهێناوە (٣٩٨/١٣). ناوی هەندێ لەنەتەوەکانیش لەچەرخە مێژووییەکاندا گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە، بەنموونە: لەتەوراتدا ناوی ئەو (مشکی)یانەی لەوڵاتی ئەنادۆڵ دادەنیشتن بەناوی (فریجی)یەوە هاتووە (٥٠٠/٦)، چینییەکانیش بە تورکەکانیان گوتووە (توك-یو) (١٩/٢٤)، کەچی تەورات ناوی عوس (Ous)ی لێناون (٢٥/٦٩).

لێرەدا، دەکرێ بڵێین: ئەم گۆڕانکاریو گۆڕینە لە ناوی قەومو نەتەوەکانو ئینتیمابوونی هەندێکیان بۆ ئەویتر، یان وەرگرتنی قەومێك زمانی قەومەکەی تر، یاخود وێکچوونی

زمانی قەومو هۆزەکان، یان بەجێنەهێشتنی شوێنەواری نووسراو لە لایەن نەتەوەیەك لەنەتەوە کۆنەکان، خەسڵەتی نەتەوەییبوونیان لەسەر دانامالێ‌و بەڵگەیەکیش بە دەستەوە نادات بۆ لابردنی بوونی نەتەوەیی لە سەر هیچ شوێنێکی جوگرافی کە ئەو نەتەوەیە لە چاخە مێژووییە کۆنەکاندا تیا نیشتەجێ بووە، بەڵام ئێمە دەتوانین -لەلایەکی ترەوە- جەخت بکەینە سەر گرنگیی زمان لە بونیادی کۆمەڵایەتی وەك ئامرازێك بۆ لێکحاڵیبوونی هاوبەش، بە تایبەت پاش ئەوەی ئەو زمانە زاڵ دەبێ لە دەرەنجامی سەروەریی قەومەکەی یان نەتەوەکەی لەسەروبەندێك لە سەروبەندەکانی مێژوودا. بەنموونە: زمانی سامی بە هەموو لقەکانییەوە: بابلی‌و ئەکادی‌و ئاشووری‌و کەنعانی‌و فینیقی‌و ئارامی..هتد، لە وڵاتی دوو رووبارەکەدا زاڵ بوو، دوای ئەوە هۆزە سامییەکان بەشێوەیەکی یەکلایەنە بە درێژیی (١٥)پانزە سەدە حوکمڕانیی عێراقیان کرد، واتە لەرووخانی زنجیرەی سێیەمی ئوورەوە لە دەوروبەری (٢٠٠٤پ.ز) تاوەکو رووخانی دەوڵەتی کلدانی لە لایەن فارسە ئەخمینییەکانەوە لە ساڵی (٥٣٩پ.ز).

زمانی (فارسی)یش، بەهەموو زاراوەکانییەوە: ئەخمینی‌و فورپی‌و ساسانی لە وڵاتی دوو رووبارەکە بەبێ بڕانەوە بۆ ماوەی (٨٠٠) ساڵ (١٢٦پ.ز-٦٣٩ز) زال بوو لەو سەروبەندانەی فارسە فورپی‌و ساسانییەکان تاوەکو هاتنی لەشکری ئیسلام حوکمی عێراقیان گرتبووە دەست. کەچی زمانی تورکی لە دۆڵی دوو رووبارەکە بۆ ماوەی (٤٠٠) ساڵ لەرۆژگاری حوکمڕانیی عوسمانییەکاندا، زمانێکی زاڵ بوو.

لێتوێژینەوە لە مێژووی قەومو گەلانی دواکەوتوو، یاریدەمان دەدات لە رەگو ریشە سەرەکییەکانی کلتووری مرۆڤایەتی تێبگەین‌و وێنەو روخساری راستەقینەی کۆمەڵگە لە رابوردوو بە هەموو تایبەتمەندی‌و بنەما ژیارییەکەیەوە بخەینە بەرچاو بۆ فامکردنی ئێستای مرۆڤ و خواستە رەواکانی‌و مەیلی کۆمەڵایەتیی هاوبەندبوونی بە کۆمەڵە مرۆڤێکەوە بۆ پێکهاتنی ئەو گەلو نەتەوەیەی، شانازی بە ئینتیمابوونی پێوەی دەکاتو لە پێناو ئێستای‌و دوارۆژیدا تێدەکۆشێ‌و قوربانی دەداتو جەخت لە سەر بوونو وجوودی دەکات. بەنموونە ئەگەر پێناسەی زانای ئیتالی (باشکال مانشینی) مامۆستای یاسای نێونەتەوەیی لە زانکۆی تۆرینتۆ، وەربگرین کە دەڵێت: ((نەتەوە کۆمەڵگەیەکی مرۆیی سروشتییە، لەسەر یەکێتی خاكو رەچەڵەكو نەریتو زمان بونیاد نراوەو بەجۆرێکی تەواوو بە کاملی ئامێتەی ژیانو هۆشی کۆمەڵایەتی بووە)) (١٢٨/٢٦)، ئەوا دەبینین کورد نەتەوەیەکی بەهێزی

ئازادی سەربەخۆیان پێکهێناوە، تایبەتمەندیی نەتەوەیی‌و بنەمای ژیاری‌و ویست‌و خواستی خۆیان هەن بۆ بونیادنانی داهاتووی گەش‌و پڕشنگداریان، بۆیە کورد ئاتاچی بەوە نییە لە رووی نەژادییەوە ببڕێتەوە بۆسەر قەوم‌و هۆزەکانی تر.

جا، وەك چۆن هۆزە عەرەب‌و عیبری‌و ئەکادی (بابلی‌و ئاشووری)و ئارامی‌و کەنعانییەکان ئامۆزای یەکترو سەر بەیەك رەگ‌و ریشەن کە ئەویش (سامی)یەو بە زاراوەگەلێکی هەمەجۆر داخێون کە لە زمانی (سامی)ی دایك بوونەتەوەو لە دوورگەی عەرەب‌و دەوروبەری دادەنیشتن (٦٥/٦)، ئەوا گووتی‌و لۆلۆیی‌و کاشانی‌و میدی‌و فارس‌و کوردیش بە ئامۆزای یەکترو بەیەك رەگ‌و ماکی نەتەوەیی دەژمێردرێن، چونکە بەپێناسە سەر بەرەگەزی ئارین‌و زمانیان بریتییە لە چەندین زاراوە کە لە کۆمەڵی زمانە هیندۆ-ئەوروپییەکان بوونەتەوە، ئەو کۆمەڵە زمانەش وەك زمانی دایکە بۆ زاراوەکانی ئەو قەوم‌و نەتەوانەی لە کۆنترین چەرخە مێژووییەکاندا لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوون.

# باسی سێههم
## جوگرافیای کوردستان

تاوهکو رۆژگاری عهباسییهکان، یهکهیهکی تایبهت نهبوو به ناوی کوردستان (وڵاتی کورد)، ئهو کات وڵاتی کورد بهشێك بوو له ئازهربایجان، یان ئهرمینیا، یان ههرێمی (جزیرهی ئیبن عومهر) له سهرووی نێوان دوو رووبارهکه. ئیبن حهوقهل له نهخشهکهیدا (صوره الْرج= وێنهی زهوی)، ئاماژهی به کوردستان به ناوی (مصايف الاكراد)، واته: هاوینه ههوارهکانی کوردان، داوهو جهختی لهوه کردووه که چیاکان کوێستانیانه. زانای زمانهوانی تورکیش (مهحموود کهشغهری) کتێبه گرنگهکهی (دیوانی زمانهکانی تورك)ی له ساڵی ٤٤٦ك دانا، تیادا بۆ یهکهمین جار له نهخشهکهیدا لهمهڕ گۆی زهمینو دانیشتوانییهوه، ئاماژهی به خاکی کورد داوهو له میانهیدا وڵاتی کوردی وهك یهکهیهکی کارگێڕیی تایبهت، روون کردۆتهوه (٢٨/٣٠).

ههرچی واژهی (کوردستان)یشه، ئهوه سهلجووقیهکان له ناوهڕاستی سهدهی شهشهمی کۆچی بهرامبهر به وڵاتی کورد بهکاریان بردووه، ئهو دهمهی سوڵتان سهنجهر وڵاتهکانی لای رۆژئاوای ههرێمی چیاکان که پێشتر سهر بهناوچهی کرماشان بوونو لێك دابڕی و کردنی بهناوچهیهکی سهربهخۆ و له ساڵی ٥٥٦ کۆچی ناوی لێنان کوردستان (١٩٢/٣١).

(شهمسهدین سامی) دانهری کتێبی (فهرههنگی تورکی) دهڵێت: کوردستان بریتییه لهو خاکانهی کهوتوونهته ههردوو لایهکهی سنووری ئێران لهگهڵ دهوڵهتی عوسمانی که دهکهوێته رۆژههڵاتو باکووری (جزیرهی ئیبن عومهر)و لهمهملهکهتهکانی دهوڵهتی عوسمانین (١١٥٧/٣٦).

وێڕای فرهیی راوبۆچوونی رۆژههڵاتناسانو گهڕیدهو لێکۆڵهرهوانی کوردیش له بارهی نهخشهی کوردستانهوه، بهڵام ژمارهیهکیش له نێویاندا پێیان وایه کوردستان دهکهوێته کیشوهری ئاسیا له نێوان ههردوو هێڵی پانی ٣٣-٤٠ پلهو له نێوان ههردوو هێڵی درێژی ٣٧-٤٠ پله. واته به گوێرهی زاراوه نێو دهوڵهتییه باوهکان، به بهشێك لهناوچهی رۆژههڵاتی ناوین دادهنرێ (٤٥/٢٧)و ههرێمی کوردستانیش دهکهوێته سهر بانی گهورهی ئهنادۆڵ که

بەستراوە بەو (بانە ئێرانییەی) کە کێوەکانی زاگرۆس لای باکوور رازاندوویەتییەوەو بەرەو باشوور تاوەکو دامێنەکانی دوورگەی عەرەب شۆڕ دەبێتەوە.

کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، لەم چوار ویلایەتانەی لای خوارەوە دادەنیشتن:

١- ویلایەتی هەکاری، بریتی بوو لە لیواکانی هەکاریو ماردینو وانو بۆتان (جزیرەی ئیبن عومەر).

٢- ویلایەتی کوردستان، پێکهاتبوو لەلیواکانی دەرسیم (تۆنجەلی ئێستا)و موشو دیاربەکر.

٣- ویلایەتی مووسڵ، بریتی بوو لە لیواکانی مووسڵو رەواندز (پاش لابردنی ویلایەتی شارەزوور کە ئەم شوێنانەی لە خۆگرتبوو: کۆیسەنجەق، رەواندز، هەولێر، سلێمانی)و بە ناوە تازەکەیەوە ناوبرا.[٢]

٤- ویلایەتی بەغدا، لیواکانی: (بەغداو خانەقینو بەسرە)ی دەگرتە خۆ.

بەڵام نیشتمانی جوگرافیی کورد لە دەوڵەتی عوسمانی، ئەو ناوچەیەی دەگرتەوە کە دەکەوێتە نێوان چیاکانی زاگرۆس لای رۆژهەڵاتو شاری ئەنکەرە لای رۆژئاواو نێوان شاری وان لای باکوورو شاری بەسرە لە باشوورو تا دەگاتە هێڵی سنووری ئێستای نێوان عێراقو ئێران.

بەمەش ناوچەی کوردستان لەو نەخشەیەوە نزیکە کەمیجەر لونگریك لە مارك سایکس وەریگرتووە و رێکی خستووەو کۆمەڵەی گەلانیش لە ساڵی ١٩٣٠ پشتگیری کردووە، پرۆفیسۆر (مینورسکی)یش لە کۆتایی کتێبەکەی (کورد..) وەك پاشکۆیەك دایناوەو لەبەغدا پاش وەرگێڕانی ، لەساڵی ١٩٦٨ لەچاپ دراوە.

زانای کورد محەمەد ئەمین زەکی دەڵێت سنووری کوردستان لە چیاکانی ئاراراتەوە لە باکوور دەست پێدەکات کە لەوێ کوردو کەرج تێکەڵاونو لای باشووریش بەغدایە کە کوردو عەرەب تێکەڵاونو لە رۆژهەڵاتیشەوە چیاکانی زاگرۆسو سنووری ئێرانە، لەرۆژئاوایشەوە ئەو هێڵەیە کە لە نێوان قارس درێژ بۆتەوەو بە ئەرزرۆمو ئەرزەنجانو دەرسیمو خەرپوتدا تێدەپەڕێ تا دەگاتە دیاربەکر لێرەش کورد لەگەڵ تورکو ئەرمەنیو عەرەب تێکەڵاوە(٩/١٠)، کەچی گەڕیدەی عوسمانی ئولیا چەلەبی کە بە هەموو وڵاتی کورددا گەڕاوە لە ساڵی ١٠٦٥ك-

---

٢- ویلایەتی موسڵ شاری کەرکوك مەڵبەندەکەیەتی و لەم لێکۆڵینەوەیە وە دەرنراوە.(وەرگێر و پێداچۆرەوە)

١٦٥٤ز جەختی لە سەر ئەوە کردووە کە سنووری کوردستانی باکوور لــە وڵاتی(ئــەرزڕۆم)ەوە دەستپێدەکاتو تاوەکو بەسرە کۆتایی پێ دێو بە شارەکانی وانو هەکاریو جزیرەو ئامێـدیو دەرتەنگ تێدەپەڕێ کە درێژییەکەی دەگاتە(٧٠) قۆناغو پانییەکەشی لەمە کەمترە(٧٥/٢٣).

کاتێك پەیمانی(برست لیتۆفیسك) لە١٦ی ئاداری ساڵی ١٩٢١ لە نێوان تورکو رووسەکان مۆرکرا، بەشی هەرە گەورەی ویلایەتەکانی: لوڕستانو کرماشانو ئەردەڵانو ئازەربایجان بە لای ئێرانییەکانەوە مایەوە، بەڵام بەشێکی زۆری کوردەکانی قەفقاس گواسـترایەوە بـۆ تورکـەکان سەرڕای کوردەکانی ئەنادۆڵ، ئەمە لەکاتێکدا بەشێکی گەورەی کوردی ویلایەتی مووسـڵ بـە لای حکوومەتی عێراق مایەوە(١٢/٣٤).

بەپێی ئەم زانیارییانە، دەکرێ بڵێین: نەخشەی کوردستان لەنەخشەی ئــەفریقیا یــان بـاڵۆن دەچێت. لایە پانەکەی لە نێوان دەریاچەی ورمێ لە رۆژهەڵات جێگیر دەبــێو بەشـاری(وان)دا تێدەپەڕێ پاشان بەرەو باکوور هەڵدەکشــێ بــەرەو ئــەرزڕۆمو ئــەنجا ئــەرزەنجانو بــەرەو شــاری عەزیزان(ئیلازیخ)شۆڕ دەبێتەوەو لای رۆژئاواو لە شــاری دیاربــەکر لەشـێوەی چوارگۆشــەیەك کۆتایی پێ دێ، پاشان لای باکوور تەنگ دەبێتەوە کە ئەرزڕۆم لــەخۆدەگرێو شــۆڕ دەبێتــەوە بەرەو موشو بدلیسو سعردو هەکاریو بە سلێمانی ئەنجا بەهەولێردا تێدەپەڕێو لەپاشان بــەم لاو ئەو لای سنووری عێراق-ئێران شۆڕ دەبێتەوە بۆ ئەوەی خانەقینو بەدرە لەبەشــی عێــراقو شارەکانی کــۆهـ و مــاکۆو لوڕســتان لەبەشــی ئێــران بگرێتــەخۆو تــا دەگاتــە شــاری کــووت لەعێراق.ئەم ناوچە جوگرافییە پانو بەرینە دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی پــانی ٣٤-٤٠ پلــە لای باکوورو هەردوو هێڵی درێژی ٣٨-٤٨ پلە لای رۆژهەڵات.

بە پشتبەستن بەم نەخشەیەی باسمان کرد، ژمارەی کورد لە دەوڵەتی عوسمانیدا پێش ئەوەی بڕووخێــت نزیکــەی دوو ملیــون کــورد بــووە(١٨/٣٢). بــەش بــە حــاڵی رووبــەری گشــتی کوردستانیش بە خەملاندن دەگاتە(٤١٠) هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە دابەش کراوەتــە ســەر سێ بەشی سەرەکی ناسراو، ئەوانیش: کوردستانی تورکیــا رووبەرەکــەی نزیکــەی ١٦٥/١٠٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیەو بــە گــەورەترینو فــراوانترین بەشــەکان دادەنــرێ، دوای ئــەم بەشــە

باشووری کوردستان (عێراق) دێتو رووبەرەکەی ١٣٠/٣٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، دواییش ڕۆژهەلاتی کوردستانی (ئێران) دێت کە رووبەرەکەی ١١٤/٦٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە[٣].

بێگومان ئەم ژمارانە وردو دیققەت نین، چونکە تا ئێستاش پرۆسێسێکی رووپێوی ورد بۆ کوردستانی ئێستا نەکراوە کە دوورییەکانی سنوورەکەی لەنێوان ١٢٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە بە درێژیو نێوان ٣٠٠-٧٥٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە بەپانی. بەلام وێڕای ئەوە دەکرێ جەخت بکەینە سەر ئەوەی کە کوردستانی ئێستا بریتییە لەدوورگەیەکی وشکانی لەدەوروبەریدا پێنج دەوڵەت هەن: عێراقو تورکیاو سووریاو ئێرانو ئەرمینیاو لەناوچەی عەرەبییەوە نزیکترە تا وەك ناوچەکانی تر(٤٦/٢٧)، خاکەکەشی پێکهاتووە لەشاخو داخو هەردەو بانو سەرچاوە سەرەکییەکانی رووبارەکان لەناوچەی عەرەبیو سەرچاوەی هەندێ لەکانزاکانەو خاکەکەی بۆ کشتوکاڵیو لەوەڕگا فرە سازگارە.

لەدەرەنجامی لێتوێژینەوەمان سەبارەت بە عەشیرەتو هۆزە کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی، توانیمان بەرێگەی لێکۆڵینەوە لەئەرشیفی دەوڵەتی عوسمانیو تۆمارگاکانی تاپۆو فەرمانە کارگێڕییەکانی تایبەت بە نیشتەجێکردنی ئەو عەشیرەتو هۆزانەی دابەش بووبوونە سەر ویلایەتە عەرەبییەکانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی تاوەکو شەڕی جیهانی یەکەم،(٣٩١) هۆزو عەشیرەت ریزبەند بکەین، وا لەخوارەوەش خشتەیەك دەخەینە پێش چاو لەبارەی ناوی هۆزەکانو ناوچەکانی دانیشتنیان:

٣- رۆژئاوای کوردستان (کوردستانی سوریا) لە باگووری سوریا لە نێوان ئەسکەندەرۆنەو حەڵەبدا کوردێکی زۆر هەن، ژمارەیان تائێستا بەتەواوی دیاری نەکراوە، لە ویلایەتی باشووری قەفقازیش کورد یەکجار زۆرەو.. زۆربەی زۆری هۆزەکانی لای خۆراسانو سەجستان لەرۆژهەلاتی ئێران کوردی پەتین و تەنانەت لەئەفغانستان وبلۆجستانیش بەزۆری کوردی رەوەندیان تێدایە، بێجگە لەوەش لە هەموو ئەوروپا و ئەمریکا و ئوستراليا و کیشوەرەکانی تری جیهان ئەمڕۆ کوردێکی یەکجار زۆر بلاوبوونەتەوە. (وەرگێر)

## خێڵە کوردییەکانی دەوڵەتی عوسمانی(٤/٢١-٤١)

به پێی ئەلفو بێی کوردی ریزبەند کراون

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ١ | عبدالحیئۆغلۆ | دیاربەکر، مەلاتیا |
| ٢ | ئادا مانلو | ئەنکەرە، رقە، ئەرزروم، دیاربەکر، قەرا حەسار، قارس، کەرتی گیلدیر، کلیس، مرعش، عێنتاب |
| ٣ | ئاقچە ئورنلو | رقە، مرعش |
| ٤ | ئالوجەلو | رقە، مەلاتیا |
| ٥ | عەزیزلو | مرعش، کەرتی ئەدەنە، رقە |
| ٦ | بابیریم | مەلاتیا |
| ٧ | بادنلی جیموکانلی | قەزای یەنگیجە، کمولجینە |
| ٨ | بازکوری | رقە، بەتلیس، دیاربەکر، ماردین |
| ٩ | بامران | ماردین، رقە، کەرتی دیاربەکر |
| ١٠ | بهاءالدینلو | بازکوری —ناوەکەی تری ئەم خێڵەیە |
| ١١ | بیخانلو | کەرتی دیاربەکر، رقە، روها(ئۆرفە)، مەلاتیا، رقە |
| ١٢ | جاکسور | مەلاتیا، کەرتی دیاربەکر |
| ١٣ | جانبەغلو | رقە، ئەرکانی(کەرتی دیاربەکر) |
| ١٤ | جمالەدین لو | قەزای تەرجیل، رزکان باشووری ماردین، بەتلیس، دیاربەکر، ماردین، ئەرزروم |
| ١٥ | جاروکانلو | کلیس، ئەنتاکیا، حەڵەب، ئەرزنجان، ئەرزروم، عینتاب، رقە، مرعش |
| ١٦ | جیکانلی | قەزای سیورەك(دیاربەکر)، قەزای گەرگەر(مەلاتیا)، رقە، مەلاتیا |
| ١٧ | جودیکانلو | قەزای مرعش، قەزای حەسەن مەنسور، مەلاتیا |
| ١٨ | جاریکانلو | جارکانلو |
| ١٩ | چیغدم | کەرتی دیاربەکر |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٢٠ | دالیانلو | قەزای مرعش، قەزای حەسەن مەنسور، قەزای رقە |
| ٢١ | دیدانلی | قەزای سروج، دیاربەکر |
| ٢٢ | دیلانلی | دیلانلو |
| ٢٣ | دیلەران | قەزای سروج، دیاربەکر |
| ٢٤ | دودانلو | قەزای سروج، روها، رقە، ماردین |
| ٢٥ | دوکتوکانلو | قەزای سروج، روها |
| ٢٦ | دودیکان | کەرتی دیاربەکر، ماردین قەزای ئەرکانی، رزکان سویو، ماردین قەزای رقە، بدلیس |
| ٢٧ | دویارلو | قەزای کلیس |
| ٢٨ | دودوك | قۆنیا، ئەنکەرە، قەیسەرییە، سیواس |
| ٢٩ | غازیانلو | قەزای کلیس |
| ٣٠ | حاجی مستەفا | مەلاتیا، رقە |
| ٣١ | خالقانلو | مرعش، قەلای مەنسور، مەلاتیا |
| ٣٢ | حەمزە قانلو | قەڵای مەنسور، مەلاتیا |
| ٣٣ | ئیبراهیم خاصوغلو | مەلاتیا، رقە |
| ٣٤ | هەردی | مەلاتیا، قەزای خەربوت(کەرتی دیاربەکر) |
| ٣٥ | ئینتولو | قەزای کلیس، ئەدەنە قارامان، حەڵەب، قەزای سیس، ئەدەنە، مرعش |
| ٣٦ | حاجی ئیزدین ئوغلو | مەلاتیا، رقە |
| ٣٧ | عزالدین ئوغللاری | قەزای شوری، مەلاتیا |
| ٣٨ | قەڵغانی | قەزای چەرکەس |
| ٣٩ | قاراجورلو | ئەرزروم، چار سانجاق، دیاربەکر، قەزای کیبان |
| ٤٠ | قاروناك ئوغللاری | مەلاتیا، رقە |
| ٤١ | قارتا لوغلو هاللو | کەرتی ئەرزروم، مەلاتیا |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ٤٢ | کاسیکانلو | دیاربەکر، ماردین، رقە، قەزای ئەرکانی، مرعش، قـەڵای مەنسور، مەلاتیا، رزکان، سویو-ماردین |
| ٤٣ | قایوقان | سیواس |
| ٤٤ | کەللر | قەزای کلیس، قیرشەهر، ئەدەنە، قەزای سیس-ئەدەنە |
| ٤٥ | کلومەر | مەلاتیا،رقە |
| ٤٦ | کەنعانلو | قەزای سروج |
| ٤٧ | موکرمانلو | قەزای سیوەرەگ دیاربەکر، قەزای گەرگەر، رقە، مەلاتیا |
| ٤٨ | مامەران= مامەریان | کەرتی رقە |
| ٤٩ | ملوکانلو | قەزای مرعش،قەزای قەلای مەنسور، قەزای قەحتا(مەلاتیا) |
| ٥٠ | ئوخیان=ئوخیانلو | روها، سروج، کەرتی دیاربەکر |
| ٥١ | ئوسان | قەزای قەلای مەنسور |
| ٥٢ | عوسمان=عوسمانلو | مەلاتیا، رقە، بەهسنی(مەلاتیا)، قەلای مەنسور |
| ٥٣ | ئیـــبراهیم عومـــەر ئۆغلو | مەلاتیا، رقە |
| ٥٤ | عومەر کانلو | دیاربەکر، ماردین، رقە، ئەرکانی، رەزکان سویەر |
| ٥٥ | ئالو=ئالان | مەلاتیا، رقە |
| ٥٦ | سەرکونانلو | ئەنتاکیا، کلیس، عینتاب، مرعش |
| ٥٧ | سەندیقان | دیاربــەکر، مــاردین، رقــە، ئــەرزروم، ئــەرکانی، کــەرتی گیلدیر، قــارس، ســیواس، قیرشــەهر، نەوشــەهر، رزکــان، سویو(ماردین) |
| ٥٨ | سنگان | دیاربەکر، مــاردین، رقــە، ئــەرزروم، ئــەرکانی، گیلـدیر، قارحي، سیواس، قیرشەهر، نەوشەهر، رزکان سویو. |
| ٥٩ | شدادي-شدادفەر | رقە، قەزای سروج |
| ٦٠ | شیخان | رقە، ســروج،دیاربەکر، قــەزای ســیوەرەك، مــاردین، قــەزای موسل. |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٦١ | شیخلو | قەزای کلیس، ئەدەنە، قەزای سیس، کەرتی ئەدەنە |
| ٦٢ | محمد شوعەیب ئوغلو | مەلاتیا، رقە |
| ٦٣ | تەریقانلو | مرعش، دیاربەکر، مەلاتیا، بهسنی، قەلای مەنسور |
| ٦٤ | تلوغواو حسو | مەلاتیا، رقە |
| ٦٥ | وامران | ماردین، رقە، ئەرکانی، رزکان، سویەر |
| ٦٦ | وەلی ئۆغلو | کلیس، ئەدەنە، سیس |
| ٦٧ | زاعفر انلو | قەراحەساری رۆژهەڵات، قەزای ئالوئاباد |
| ٦٨ | زاروارلو | سروج، دیاربەکر، رقە |
| ٦٩ | زەر | مەلاتیا |
| ٧٠ | زەردیوئانلوا | رقە، روها |
| ٧١ | ئاغیان | رقە |
| ٧٢ | ئاهی(ئاخی) | گالیبولو،حەلەب، کلیس، مرعش |
| ٧٣ | ئاقو | رقە، موسڵ، کەرکوك |
| ٧٤ | ئالجول | جوروم، سامسون، قیرشەهر، یوزغات، سیواس |
| ٧٥ | ئالیوانر | ویلایەتی هەکاری |
| ٧٦ | عەلی خان | سعرت، قۆنیا |
| ٧٧ | عەلجول | جوروم، سامسون، قیرشەهر، یوزغات، سیواس |
| ٧٨ | ئامیکی | کلیس، رقە، حەلەب، مرعش، ئەدەنە ئەنتاکیا، عینتاب |
| ٧٩ | عەباسان(ئاباسان) | ناوچەی دەرسیم |
| ٨٠ | عنتانلو | ویلایەتی ئەنکەرە |
| ٨١ | ئاسا | قەزای کارزان(سعرت) |
| ٨٢ | ئاتمانلو(ئاتمالو) | قەیسەری، رقە، مەلاتیا، مرعش، عەرەبگیر، کەیبان، سیواس، تەرابزون |
| ٨٣ | ئازان | سعرت |
| ٨٤ | ئازاروانلو | ویلایەتی وان. |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٨٥ | بادوکان | دیاربەکر، ئەرزروم، قارس، ئاخیسکا، رقە. |
| ٨٦ | بادیللو | جروم، ئەدەنە، سیواس، دیاربەکر، ئەرزروم، مرعش، قارس، رقە، ئەدرنە، غالیبولو، حەران، ساروخان، ئایدین، تەرابلسی شام، روها، سامسون، ئەرزنجان، یەق حەسار، کیشان، ماردین، ئەنکەرە، قەرە حەساری رۆژهەلات. |
| ٨٧ | بابان | سلێمانی، ماردین، روها. |
| ٨٨ | بادینان(بهدینان) | ماردین، ئامێدی. |
| ٨٩ | بادوکی | دیاربەکر، رقە، سیواس، قەراحەساری رۆژهەلات، ئەماسیا، تۆقات، ئەرزروم، قارس، جیلدیر. |
| ٩٠ | بەختیار | قەزای دەرسیم، قۆنیا. |
| ٩١ | بارگیری | ئەرزروم، قارس، سیواس، گیلدیر. |
| ٩٢ | بالان | ئەدرنە، قارس، مرعش، مەلاتیا، قۆنیا، یەنی شەهر، سیواس، قارەمان، رقە، خەربوت، نغبولو. |
| ٩٣ | بالانی | قەزای عەزیز، ماردین. |
| ٩٤ | بالوجو | قانگیری، گوقات، سیواس، دوروم، ئەماسیا، عەرەبگیر، کیبان، مەلاتیا. |
| ٩٥ | بامران | رقە، ماردین. |
| ٩٦ | بارانلو | رقە، ئەرزروم، قارس، گیلدیر. |
| ٩٧ | باریجکان | خەربوت، کیبان، رقە، ئەرزروم، قارس، ئاخیسکا،مەلاتیا، سیواس، مرعش، دیاربەکر، قەرەحەساری رۆژهەلات، گیلدیر، عەرەبگیر، ئەماسیا، توقات، دیاربەکر. |
| ٩٨ | باریسکان | ئەرزروم، قارس، ئاخسکا، گیلدیر |
| ٩٩ | باساك | ئەرزروم، قارس، رقە، گیلدیر. |
| ١٠٠ | باسکی | رقە، ماردین، دیاربەکر، ئەرزروم |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ١٠١ | بایەزید | دیاربەکر، مرعش، سیواس، قیرشەهر. |
| ١٠٢ | بایخانلو | رقە، سروج، روها، (ئورفا) |
| ١٠٣ | بازوکی | رقە، روها، ئەرزروم، قارس، گیلدیر، قارەمان، سیواس، مەلاتیا، مرعش |
| ١٠٤ | بێگانە | ویلایەتی وان |
| ١٠٥ | بەغلی | ویلایەتی سیواس |
| ١٠٦ | بەهرەمگی | رقە، ماردین، دیاربەکر |
| ١٠٧ | بیکاری | ویلایەتی ماردین |
| ١٠٨ | بەکران | دیاربەکر، مرعش |
| ١٠٩ | بلیکانلو | سیواس، مرعش، رقە، قارس، گیلدیر، ئەرزروم، دیاربەکر |
| ١١٠ | بەرازی | رقە، سروج، روها، ماردین، ئەرزروم، مەلاز کورد، دیاربەکر، حەلەب، شام |
| ١١١ | برجکانلو | مەلاتیا |
| ١١٢ | برەکتلو | دیاربەکر، قەلای مەنسور، مەلاتیا، نەغەدە |
| ١١٣ | بریفکان | دیاربەکر، ئەرزروم، رقە، سیواس |
| ١١٤ | بەرتقی | کەرتی دیاربەکر |
| ١١٥ | براون | ماردین، رقە، کەرتی دیاربەکر |
| ١١٦ | بەشیك ئوبا | قەزای پیرامیك |
| ١١٧ | پیلانالی | رقە، ماردین، دیاربەکر |
| ١١٨ | پیرانوغڵو | رقە، ماردین، دیاربەکر |
| ١١٩ | بزگوری | موسڵ، نەسیبین، رقە، دیاربەکر |
| ١٢٠ | بلباس | رقە، موسڵ، کەرکوك،بەغدا، شارەزوور، نیغبولو |
| ١٢١ | بینانشین | قەزای هەکاری (کەرتی وان) |
| ١٢٢ | پینگان | رقە، ماردین، ئەرزروم، سیواس، قارس، گیلدیر، قەزای تریب |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ١٢٣ | پیروش | کەرتی دیاربەکر |
| ١٢٤ | بیزانی | قەزای سروج |
| ١٢٥ | بیزەکی | کەرتی ئەرزروم، رقە |
| ١٢٦ | بیزەکی گەیلان | رقە، مەلاتیا، ئەرزروم، روها، مرعش، سیوەرەگ |
| ١٢٧ | بیزەکی حەران | رقە |
| ١٢٨ | بیزەکی میمتان | رقە، مرعش |
| ١٢٩ | بیزەکی ریشوان | رقە، مرعش، روها، سیوەرەك |
| ١٣٠ | بورهان | کەرتی دیاربەکر |
| ١٣١ | پوستکان | کەرتی مرعش |
| ١٣٢ | بوزان | دیاربەکر، روها، تەرابلسی شام، رقە، ماردین، قەزای ئەدرەمیت. |
| ١٣٣ | بوزجالو | کەرتی تەفلیس، کەرتی گیلدیر. |
| ١٣٤ | بوسکیران | قەزای شیرو (مەلاتیا) |
| ١٣٥ | بزورگ | قەزای ئەردەهان |
| ١٣٦ | جاویکی گەورە | قەزای کلیس |
| ١٣٧ | جاویکلو | نزیك ئەرزنجان |
| ١٣٨ | جیکو | مەلاتیا |
| ١٣٩ | جەلالی | قەزای بایەزید (ئەرزروم) |
| ١٤٠ | حەمدانلو | ویلایەتی وان |
| ١٤١ | جانان بیزکی | رقە |
| ١٤٢ | جەویدی | عینتاب، قەزای کلیس |
| ١٤٣ | جەیران | ویلایەتی بەدلیس قەزای موش، حەڵەب، کلیس، قەراحەساری رۆژهەڵات |
| ١٤٤ | جولبولو | مەلاتیا |
| ١٤٥ | جورکانلو | قەزای بوزوك، رقە، مەلاتیا |

| ناوچەی نیشتەجێبوون | ناوی خێڵ | ژمارە |
|---|---|---|
| قەزای بوزوك | جوریشكان | ١٤٦ |
| قەزای قاشن حەلەب، كليس | داغلو | ١٤٧ |
| ويلايەتی شارەزوور | داودی | ١٤٨ |
| قەزای ئيجەل، مەلاتيا | دلياجانلو | ١٤٩ |
| مرعش، ئالبوستان، عينتاب، حەلەب، موسل، قەزای سلاحيه | دليكانلو | ١٥٠ |
| رقە، عينتاب، بيرەجك | دەلیو دەلی ئوغلۆ | ١٥١ |
| رقە، موسل، ماردين، روها، كەرتی دياربەكر، ناحيەی جاباكجور | دەركەزين | ١٥٢ |
| رقە، عينتاب، مرعش، هەولێر، سلێمانی، كەركووك | دزەيی | ١٥٣ |
| رقە، عينتاب، مرعش، ناحيەی ئيكا (ويلايەتی وان) | دەشتی | ١٥٤ |
| كەرتی دياربەكر | دەستكان | ١٥٥ |
| سروج، رقە، ماردين، موسل، بيرەجيك، روها | دينابی (دينای) | ١٥٦ |
| مەلاتيا، خەربوت، عەرەبگير، رقە، مرعش، كيبان، قەزای گەرگەر (مەلاتيا) | دريجبان | ١٥٧ |
| قەزای قەلای مەنسور، مرعش، كليس | دەريكانلو | ١٥٨ |
| ئەرزنجان، كليس، قەزای كيفی، ئەرزروم، عينتاب، ئەنتاكيا، قەزای دەرسيم، كوماه (ئەرزروم) جميشكەزيك، عەرەبگير، خەربوت، مەلاتيا. | دەرسبەلو | ١٥٩ |
| ئەرزنجان، كليس، كيفی، ئەرزروم، ئەنتاكيا، خەربوت، چارسانجاق، جميشكەزيك (دياربەكر) | ديسيملو | ١٦٠ |
| رقە | ديوانلو | ١٦١ |
| مرعش، ئەدەنە | ديوانوغلو | ١٦٢ |
| ماردين، رقە، عەرەبگير | ديفری | ١٦٣ |
| جميشكەزيك (دياربەكر) | دوجيك | ١٦٤ |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ١٦٥ | دودیك | ویلایەتی موسڵ |
| ١٦٦ | دۆسکی | ویلایەتی موسڵ، قەزای هەکاری |
| ١٦٧ | دوشی | رقە، عینتاب، موسڵ |
| ١٦٨ | دودولکان | ماردین، دیاربەکر، کەنگەری |
| ١٦٩ | دوزیاك | ئەرزروم، کماە، جمیشکەزیك |
| ١٧٠ | دوسەرلو | حەلەب، کلیس، ئەدەنە، عینتاب، ئەنتاکیا |
| ١٧١ | میلی | رقە، دیاربەکر |
| ١٧٢ | ئەرتوشی (ئەتروشی) | ویلایەتی وان، بەتلیس، ویلایەتی موسڵ |
| ١٧٣ | ئەسەندەلی | حەلەب، کلیس، مرعش |
| ١٧٤ | ئەسمەنان | رقە، ماردین |
| ١٧٥ | ێشتی | رقە، حەسەن کیف (دیاربەکر) موسل، دیاربەکر |
| ١٧٦ | عەزیز | قەزای سیوەرەك (دیاربەکر) |
| ١٧٧ | فلاکی | قەزای دەرسیم |
| ١٧٨ | فەلانی | قەزای دەرسیم |
| ١٧٩ | فەرهاد ئوشاغی | قەزای دەرسیم |
| ١٨٠ | فتنەئوشاقلاری | مەلاتیا |
| ١٨١ | کەدهنلو | مەلاتیا، ئەرزروم، چارسەنجاق، |
| ١٨٢ | کەییکلو | مەلاتیا، ئەنکەرە، ئەدەنە، ئەرزروم، رقە، عینتاب، سیواس، بورسە، کوتاهیە |
| ١٨٣ | کەزەران | کەرتی دیاربەکر |
| ١٨٤ | کیکی (کیکیك) | ماردین، دیاربەکر، سیواس، ئەماسیا، ئەرکتفی، رقە، مەلاتیا، قەزای چەرمیك، ئەرزروم، مانفەری، قاستامونی، قارس، گیلدیر، ئەدەنە، مرعش |
| ١٨٥ | کوجەکی | قەیسەری، سیواس، مرعش |
| ١٨٦ | کورس | ماردین |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ١٨٧ | کەڵهور | سلێمانی، کەرکووك، ناوچەکانی دیالین کرماشان |
| ١٨٨ | حاجابانلو | قۆنیا، ئەنکەرە، رقە، دیاربەکر، قیرشەهر، موجور، حاجی. |
| ١٨٩ | حاجاوانلو | بەکتاش، سیواس، تارها، ئەرزروم، کلکید، شیران، قراحسار |
| ١٩٠ | حاجی | رقە، عینتاب، بیرەجیك |
| ١٩١ | حاجکی | قەزای کلیس |
| ١٩٢ | حادەم | کلیس، مرعش |
| ١٩٣ | حەق ویردی | مەلاتیا |
| ١٩٤ | حالانلو | دیاربەکر |
| ١٩٥ | حالیکان | سیواس، دیاربەکر، مەلاتیا، مرعش، قۆنیا، گیلدیر، قارس، ئەرزروم، رقە، نەغەدە |
| ١٩٦ | حلیلان | ویلایەتی وان |
| ١٩٧ | حاماتلو | قەزای کوتاهیە، رقە، ئەرززوم |
| ١٩٨ | خانی | کەرتی دیاربەکر |
| ١٩٩ | خەرتوس | قەزای هەکاری |
| ٢٠٠ | حەرتوشیش | قەزای هەکاری |
| ٢٠١ | حەزینان | رقە دیاربەکر، روها ئیجەل، ماردین، رزکان، قەزای بالو دیاربەکر، قارس، ئەرزروم، جیلدیر |
| ٢٠٢ | خاسکان | مەلاتیا، رقە |
| ٢٠٣ | خەتمایل | قەزای ئەنکەرە |
| ٢٠٤ | خەتمان | رقە، ئەدرنە، مالقارا، ئورەشە، ئەبساله (غالیبولو) |
| ٢٠٥ | حەیدەران | هەکاری، وان، قەزای بایەزید |
| ٢٠٦ | هەمەوەند | ویلایەتی موسڵ، سلێمانی |
| ٢٠٧ | هەردی | خەربوت، کیسبان، ئەنکەرە، قانغەری، بلوئادین، مەلاتیا، کوتاهیە، ئاماسیا، رقە، ئەرزروم، قارجی، گیلدیر، قەرەحەسار، قەزای شوری |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ٢٠٨ | خیان | دیاربەکر، رقە، روها |
| ٢٠٩ | حەجوان | رقە، ئەرزروم، قەرەحەساری رۆژهەڵات، ماردین |
| ٢١٠ | خوجان | ویلایەتی ئەرزروم |
| ٢١١ | خوشناو | قەزای رەواندز |
| ٢١٢ | خوشتیوان | کلیس، حەلەب |
| ٢١٣ | هرمزگان | قەزای کلیس |
| ٢١٤ | حسینەك | کلیس، قەزای زولقەدەریە |
| ٢١٥ | هویدا | دیاربەکر، جزیرە، مەلاتیا، مرعش، عینتاب، کلیس، رقە، ماردین، حەلەب |
| ٢١٦ | عمادو | ویلایەتی دیاربەکر |
| ٢١٧ | عزولی (ئیزولی) | مەلاتیا، سیواس، رقە، ماردین، دیاربەکر،ئەرزروم |
| ٢١٨ | کالیرو | دیاربەکر، هەردو قەزای ئەرکانیو چارسانجاق. |
| ٢١٩ | قارەبالی | ئەرزروم، کماە، دیاربەکر، قۆجە عەلی (ئارنیك) |
| ٢٢٠ | قارەجور | دیاربەکرو قەزاکانی |
| ٢٢١ | قاراچادرلو | قانغەری، قمتامونی، ویلایەتی شارەزوور، بەغدا |
| ٢٢٢ | کارائولوس | دیاربەکر، ئەرزروم |
| ٢٢٣ | کاوی (کارلو) | مەلاتیا، سیواس، جوروم، ئاماسیا، رقە، دیاربەکر،قیرشەهر، بوروك، توقا |
| ٢٢٤ | کلەجوری | رقە، دیاربەکر، حەران، مەلاتیا، کماە، سیواس، دیوریغی، مرعش |
| ٢٢٥ | گەرگەر | مەلاتیەز |
| ٢٢٦ | کەرکوتی | کتاهیە، کلیس |
| ٢٢٧ | گیرەجوز | رقە، مەلاتیا |
| ٢٢٨ | قیلجلو | مرعش، رقە، مەلاتیا |
| ٢٢٩ | قیران | سیواس، ئایدین، دیاربەکر، کەرتی وان |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٢٣٠ | قیزیل قویونلو | نەوشەهر، رقە، قەزای بارجینلی |
| ٢٣١ | قوجگیری | سیواس، رومیلی، دریبم، کەرتی بوزوق |
| ٢٣٢ | قوییانلو | ویلایەتی ئەنکەرە |
| ٢٣٣ | قویون محمدلو | قەرەحەساری رۆژهەڵات، سیواس |
| ٢٣٤ | قویون ئوغونی | مرعش، رقە، سیواس، مەلاتیا، خەربوت، عەرەبگیر، جمیشکەزیك، دیاربەکر، کیبان |
| ٢٣٥ | کومورکاوس | مەلاتیا، قەزای قەحتە، قەزای قەلای مەنسور |
| ٢٣٦ | کۆسکان | کەرتی دیاربەکر |
| ٢٣٧ | گونبەتیك | رقە، مەلاتیا، عەرەبگیر |
| ٢٣٨ | گلوکان | رقە، دیاربەکر |
| ٢٣٩ | لەك | قارەمان، قۆنیا، ئاسکی شەهر، نەغدە، قەیسەری، مرعش، جوروم، قیرشەهر، چوقورئوا، ئەدەنە، کفری، کەرکووك |
| ٢٤٠ | لەکوانیك | کەرتی مرعش، کەرتی ئەدەنە |
| ٢٤١ | مەجدان | قەزای کلیس |
| ٢٤٢ | مەهان | کەرتی ئەرزروم، مەلازکورد، قەزای ئەدرانوس، قەزای کیفی |
| ٢٤٣ | مەحمودی | مەلاتیا، عەرەبگیر، دیاربەکر، وان، قەزای تەیمورحەسار |
| ٢٤٤ | مەقسودی | کماه، مەلاتیەهەن ئایدین، جورلو، سیواس |
| ٢٤٥ | مالیکانی | رقە، مەلاتیا، قەزای قەحتە |
| ٢٤٦ | مالوکی | رقە، سیواس، قەرەحەساری رۆژهەڵات، ئاماسیا، توقات |
| ٢٤٧ | مالولو | رقە، ماردین |
| ٢٤٨ | مامان | کەرتی دیاربەکر |
| ٢٤٩ | مامات | رقە، دیاربەکر، موش، وان |
| ٢٥٠ | مامەکی | موش، قەزای حەسەن کیف، دیاربەکر |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ٢٥١ | ماموس | قەزای قەرەدەسنی، موسڵ |
| ٢٥٢ | مانیکی | ئەرزروم، دیاربەکر |
| ٢٥٣ | مایروباوی | کەرتی رقە |
| ٢٥٤ | ملکشان (مەلکشاه) | سعرت، سینوب، قەمتامونی، وان |
| ٢٥٥ | مەنگور | قەزای سلێمانی، ویلایەتی موسڵ |
| ٢٥٦ | مەرویسی | ئەرزرومو دەوروبەری، دیاربەکر، رقە، ماردین، مەلاتیا، ئیجەل، کنغەری، قارس، قەزای جەرکەس، ئاسکی شەهر |
| ٢٥٧ | مەریکان | مەلاتیا، رقە |
| ٢٥٨ | مەریشان | قەزای کلیس |
| ٢٥٩ | میکاییلان (جاف) | رقە، ماردین، ئەنکەرە، خەربوت، ئەدەنە، جەرکەس، قەزای عەزیز |
| ٢٦٠ | میلان | هەکاری، قەزای جانیك، قەزای مەحمودیە |
| ٢٦١ | میللی | ئەرزروم، دیاربەکر، جمیشکەزیك، ئاماسیا، ئارغونی، تەکە، حامد سیواس، ماردین، قیرشەهر، جوروم، جران، مرعش، بوزوق، توقات، شیران، ئەرزنجان، ئەرزروم، رقە، کەرکووك، ئەم هۆزە لەخێڵە کۆچەرییەکانی (ئولوس)ە، لەهەندێ لەو شوێنانەی ئاماژەمان پێدان، پێیان دەڵێن: میللی ئاسیبان، میللی مەحمود، میللی کوردان، میللی کاولی، میللی عەبدی، میللی تەزکوران، میللی بچووك |
| ٢٦٢ | میرمیران | رقە، علانیە، قەزای تیرە، کویسنجاق (ویلایەتی موسڵ)، دیاربەکر، قەزای قوڵپ |
| ٢٦٣ | مەیسوری | قەزای عەقرە (موسڵ) |
| ٢٦٤ | مودان | رقە، ئەرزروم، قارسن قوج حەسار، ئاقسەرای، جیلدیر، سیواس، ئەنکەرە، قارەمان، قوجەعەلی،بیغا، رومیلی، قەزای قارەس |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ٢٦٥ | موسان | کەرتی دیاربەکر، لازقیە |
| ٢٦٦ | موجویان | رقە، ماردین |
| ٢٦٧ | مودیکی | بەتلیس، موش، وان |
| ٢٦٨ | موکری (موکریانی) | ماردین، قەزای سەغد، کایس، دیاربەکر، هەکاری، موسڵ، بەغدا، بەسرە |
| ٢٦٩ | مورزی | دیاربەکر، موسڵ |
| ٢٧٠ | موس بەگ | کلیس، حەلەب، رقە، ئەدرنە، ئایدین، ئەنکەرە، مرعش، بورسە، رقە، ئەرغونی، دیاربەکر، مەلاتیە |
| ٢٧١ | موسیکان | رقە، ئەرغونی، دیاربەکر، مەلاتیە |
| ٢٧٢ | موسلحلی | رقە، جوروم، قیرشەهر |
| ٢٧٣ | موسایانلو | رقە، دیاربەکر، ئەرزروم |
| ٢٧٤ | موتکی | بەتلیس، موش، وان |
| ٢٧٥ | نەرمیکان | کیبان، عەزیز، ئەبلازیخ |
| ٢٧٦ | نعمەت | رقە، دیاربەکر |
| ٢٧٧ | ئاوانلو | ئەرزروم، قوروچای، کماە، جمیشکەزیك |
| ٢٧٨ | ئوماهیان | ئەنکەرە، سیواس |
| ٢٧٩ | ئومار | قەزای فلیبە، کلیس، دیاربەکر |
| ٢٨٠ | ئوماران | قەزای شوری، مەلاتیە، رقە، سیواس، حەلەب، مرعش، عینتاب، دیوریغی، کنج، مود |
| ٢٨١ | ئومشیلی | ئایدینن ساروخان، ئاقشەهر، قەرەحەسار |
| ٢٨٢ | ئوکسوز | کلیس، عینتاب، دیاربەکر، ئاقشەهر، قەزای خاس کویی |
| ٢٨٣ | بایجکان | خەربوت، مرعش |
| ٢٨٤ | بەروان | رقە، ئەرزروم، ماردین |
| ٢٨٥ | بەرواری | ویلایەتی موسڵ |
| ٢٨٦ | بوستکان (بوستاکان) | کەرتی مرعش |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٢٨٧ | یورانکو | قەزای کەرزان سعرت |
| ٢٨٨ | یوسکانلو | کەرتی رقە |
| ٢٨٩ | یوسکیلان | قەزای قەحتە، مەلاتیە، عەزیز |
| ٢٩٠ | بوسکیران | |
| ٢٩١ | راجکوتان | قەزای کارزانن سعرت |
| ٢٩٢ | رەجیلو (ئەفشار) | رقە، زامانتی، مرعش، قەیسەریە، زولقەدەریە |
| ٢٩٣ | رەسیدان | قەرەحەساری رۆژهەڵات |
| ٢٩٤ | رەشی | رقە، رهان حەلەب، کلیس، دیاربەکر، عینتاب |
| ٢٩٥ | رەکوتان | دەوروبەری موش، دیاربەکر |
| ٢٩٦ | رەزکی | دیاربەکر |
| ٢٩٧ | ریشان | رقە، ئەرزروم، دیاربەکر، ماردین، مەلاتیە |
| ٢٩٨ | ریشی | رقە، روها، حەڵەب، کلیس، عینتاب، دیاربەکر |
| ٢٩٩ | ریشوان | مەلاتیە، ئەنکەرە، رقە، حەلەب، عینتاب، قیرشەهر، قەستەمونی، مرعش، قەلای مەنسور، نزیب پیرە، جیك سیوەرەگ، دیاربەکر، سیواس، بوزوك، |
| ٣٠٠ | ریزی | رقە، موسڵ، ویلایەتی شارەزوور، قەلای مەنسور، مەلاتیە، قەزای بەهشتی |
| ٣٠١ | روتان | ویلایەتی عەزیز، رقە، قەحتە، گەرگەر، مەلاتیە |
| ٣٠٢ | روزی | قەزای سلێمانی، کەرتی کەرکوك |
| ٣٠٣ | روزەکی | ئەرزروم، قەزای حنیس |
| ٣٠٤ | سەراج | توقان، کوتاهیە، عەلانیە |
| ٣٠٥ | صیفان (سیفان) | ئەنکەرە، هایمان، کلیس، جەرکەس، بوزوك، قۆنیا، قیرشەهر |
| ٣٠٦ | سەبیکان | دیاربەکر، رقە، وان |
| ٣٠٧ | سەگبان | قەزای ئیزنیك |
| ٣٠٨ | یەکنلو | رقە، دیاربەکر، ئەرزروم، قەزای تکە |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٣٠٩ | سەلبدان | کەرتی دیاربەکر |
| ٣١٠ | سەرکشان | کەرتی دیاربەکر |
| ٣١١ | سەید وەند | جوروم، خوداوەنکار،سەمسون |
| ٣١٢ | سیبکس | ئەرزروم، مەلازکورد، رقە |
| ٣١٣ | سەیدان | رقە، ئارغونی، دیاربەکر |
| ٣١٤ | سیلوان | دیاربەکر، مەلازکورد، ماردین، رقە |
| ٣١٥ | سین | کەرتی کەرکووك |
| ٣١٦ | سنجان | کوتاهیە، ئەنکەرە، ماردین، رقە |
| ٣١٧ | سیندیکان | کەرتی رقە |
| ٣١٨ | سنەمیلوو | مرعش، قەزای بوستان |
| ٣١٩ | سیبکانی | دەرسیم، ئەرزنجان |
| ٣٢٠ | سیسکان | دیاربەکر،رقە |
| ٣٢١ | سیوەرەگ | رقە، دیاربەکر |
| ٣٢٢ | سیسانلو | کەرتی ئەرزروم |
| ٣٢٣ | سولاق | قەزای تکهن مرعش، کلیس |
| ٣٢٤ | سوفیانلو | کەرتی ئەنکەرە |
| ٣٢٥ | سروح | دیاربەکر، رقە، پیرەجیك |
| ٣٢٦ | سحورکان | رقە، دیاربەکر، ماردین |
| ٣٢٧ | سورجوجی | ئامەد (دیاربەکر) قەزای بالون رقە، ماردین، کەرتی موسڵ، ئەرزروم، کەرتی دیاربەکر |
| ٣٢٨ | شەعبانلو | رقە، مەلاتیە |
| ٣٢٩ | شکاك (شکاکیان) | کلیس، دیاربەکر، ئەرزروم، هوزات، موسڵ، حەڵەب، گیلدیر، حسن کیف، ئاقسەرای، قارس، وان، هەکاری، رقە، ئارغونی |
| ٣٣٠ | ساماق | رقە، مەلاتیە، عەرەبگیر |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٣٣١ | شامالُلو | رقە، مەلاتیە، عەرەبگیر |
| ٣٣٢ | شاتیبان | کەرتی دیاربەکر |
| ٣٣٣ | شاقی (شاقیلو) | ئەرزروم، رقە، کلیس، حەڵەب، قەزای کیغی، لایەکانی روباری فورات، هەکاری، وان |
| ٣٣٤ | شەدادان | ناوچەی شام |
| ٣٣٥ | شەفاعەتلو | سیواس و دەوروبەری، قەزای دیوریغی |
| ٣٣٦ | شارەبان | قەزای خوراسان (ویلایەتی بەغدا) |
| ٣٣٧ | شەهرکان | رقە، ماردین |
| ٣٣٨ | شەمسیکی | قەزای هەکاری |
| ٣٣٩ | شیدان، شادان | ویلایەتی وان، ئەرزروم، هەکاری |
| ٣٤٠ | شیخان | ماردین، رقە، دیاربەکر، موسڵ، تەرابلسی شام و دەوروبەری، ئەنکەرە، مرعش، روها |
| ٣٤١ | شیخ کویان | کەرتی دیاربەکر |
| ٣٤٢ | شیخ بزینی | کوتاهیە، جوروم، دیاربەکر، هایمانا (نزیکی ئەنکەرە)، ماردین، رقە، ئەنکەرە، ئەرزروم، قوجەعەلی، قارەمان، کنغری، بوزوك، قەستەمونی |
| ٣٤٣ | شیخ داودان | ناوچەی دیاربەکر |
| ٣٤٤ | شیخ حەسەنلو | کماە، ئەرزنجان، دیاربەکر، عەرەبگیر، چمیشکەزیك، کیغی، قەزای پالو، ئەرزروم، مەلاتیە |
| ٣٤٥ | شیروان شیخی | ویلایەتی وان |
| ٣٤٦ | شرینان | ئەرزروم، قەزای کیغی |
| ٣٤٧ | شهورکان | رقە، ماردین، عەرەبگیر |
| ٣٤٨ | شکوران | قەزای کلیس |
| ٣٤٩ | ناکوری | قەزای مەحمودی (هەکاری)، وان، ناوچەکانی هەکاری و قەزای بایەزید |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
| --- | --- | --- |
| ٣٥٠ | تاڵەبانی | ویلایەتی شارەزوور |
| ٣٥١ | تەریقانلو | مرعش، مەلاتیە |
| ٣٥٢ | تیرجانلو | کەرتی رقە |
| ٣٥٣ | تیربیری | بەتلیس، سیوەرەگ، جزیرەی ئیبن عومەر، ماردین |
| ٣٥٤ | تیرجان | کەرتی رقە |
| ٣٥٥ | تیریدی | بەتلیس، سیوەرەگ، دیاربەکر، جزیرە ئیبن عومەر، ماردین، وان |
| ٣٥٦ | تیرکان | ئەرکانی، ئەنکەرە، مەلاتیە، قۆنیا، مرعش، قیرشەهر، ئاماسیا، سیواس، جەرکەس، کوتاهیە، رقە، ئەرزروم، قەرەحەساری رۆژهەڵات |
| ٣٥٧ | تیروکان | قەزای جیاکجور (دیاربەکر) |
| ٣٥٨ | توبوزلو | قەزای دریبم، قەزای ویزە |
| ٣٥٩ | توراجلو | دیاربەکر، رقە، ماردین |
| ٣٦٠ | تورکانلو | رقە، ئەرزروم، ئەنکەرە |
| ٣٦١ | کوهبەنیلو | کەرتی ئەرزروم |
| ٣٦٢ | عنوانلو | قەرەحەسار، سیوری حەسار، ئەنکەرە |
| ٣٦٣ | ئولوس | ئەرزروم، دیاربەکر، بۆلو، رقە، قەزای بالو، قەزای کیغی، کەرتی قارس |
| ٣٦٤ | ئومەران(ئاوامرانکو) | مەلاتیە، رقە، دیاربەکر، بوزوك، مرعش، قەزای شوری |
| ٣٦٥ | وامەران | رقە، ماردین |
| ٣٦٦ | ویساوی | دیاربەکر، قەزای چەرمیك |
| ٣٦٧ | ویزەلو | قەزای ئەربیلی شارەزوور |
| ٣٦٨ | ویسبانلو | ئەرزنجان، ئەرزروم |
| ٣٦٩ | بیکانە | چیای شەنگار، ویلایەتی موسڵ، کەرتی وان، بەتلیس |
| ٣٧٠ | بیلوەنیك | مەلازکورد، دیاربەکر |

| ژماره | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٣٧١ | زاغفەرانلو | مەلاتیە، قەلای مەنسور، ماردین، ئەرزروم، سیواس |
| ٣٧٢ | زاخوران | کەرتی دیاربەکر، سیواس، رقە، ئەردەهان |
| ٣٧٣ | زازا | کەرتی دیاربەکر |
| ٣٧٤ | زەروکان | رقە، قەلای مەنسور، مەلاتیە ئاقرای، دیاربەکر، ئەرزروم، ماردین، قەحتە |
| ٣٧٥ | زەرکی | دیاربەکر، ئەرزروم، ماردین، موش، بەتلیس، رقە، قەزای ئارکەنی |
| ٣٧٦ | زێدی | قەزای خۆشاب (وان) |
| ٣٧٧ | زیوە (زیوەلو) | ئەنکەرە،خەربوت، دیاربەکر، جوروم، بوزوك، ئاماسیا، رقە، جەرکەس، قارس، مەلاتیە، گیلدیر، سیواس، ئەرزروم، قەرەحەساری رۆژهەلأت، توقات، چەرمیك، قەزای موت، ئیحەل |
| ٣٧٨ | زەند | هەمەدان (ئێران)، کەرتی شارەزوور |
| ٣٧٩ | زیرکانلو | کەرتی ئەرزروم، ماردین |
| ٣٨٠ | زیباری | دیاربەکر، رقە، سیواس، کنغەری، قارس، بایەزید، ساوور، ماردین، ئەرزروم، چەرمیك، |
| ٣٨١ | زیلان | دیاربەکر، رقە، سیواس، کنغری، قارس، بایەزید، ساوور، ماردین، ئەرزروم |
| ٣٨٢ | مزوری | دیاربەکر، قەزای عەقرە، شارەزوور |
| ٣٨٣ | لولوبان | هەکاری، دیاربەکر |
| ٣٨٤ | شیخ یونان | دیاربەکر، ئەرزنجان |
| ٣٨٥ | جین (جینان) | سیواس، قەرەحەساری رۆژهەلأت |
| ٣٨٦ | قرابال | دیاربەکر، قەزای کیبان، ئەرزروم، چارسنجاق |
| ٣٨٧ | ئاشبان | دیاربەکر، سروج، روها |
| ٣٨٨ | شەمس بیکی | قەزای هەکاری، دیاربەکر، ماردین |

| ژمارە | ناوی خێڵ | ناوچەی نیشتەجێبوون |
|---|---|---|
| ٣٨٩ | کاکایی =کاکەیی | ئەرزنجان، دەرسیم، کەرکوك |
| ٣٩٠ | جانپولاد | ماردین، رقە، چیای لوبنان |
| ٣٩١ | قادری | دیاربەکر، ماردین، هەکاری، سلێمانی |

ئەگەرچی هەولێر –پایتەختی ئوتۆنۆمی لەکوردستانی عێراق –کۆنترین ئەو شارە کوردییانەیە کە بونیادنانی قەلآ دێرینەکەی دەگێڕنەوە بۆ سەردەستی سارگۆنی ئەکادی لە سالّی (٢٣٥٠پ.ز) ولە شوێنەوارە بابلیو ئاشوورییەکاندا بە ناوی (ئەرپا-ئیلۆ) واتا: شاری چوار خواوەندەکان، ناسراوەو هەروا بەوە ناوبانگە مەلبەندێکی گرنگ بووە بۆ پەرەستنی خوداوەند عەشتار (٥٧/٢٧) و لەنزیکییەوەش سالّی (٣٣١پ.ز) شەڕی کواکمیلا لەنێوان ئەسکەندەری ماکدۆنیو داریۆشی پادشای فارس روویداوە، بەلآم شارەکانی دیاربەکرو خەربوتو بۆتان (جزیرەی ئیبن عومەر)بە لانکی نەتەوەی کورد دەژمێردرێ. چونکە لێرەوە بلآوەیان کردو لێرەش بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد (بنەمالّەی بەدرخانییەکان) لەکۆتایی سەدەی رابوردوو، سەری هەلّدا (٨٨/٢٧)

لەرووی دانیشتوانیشەوە، ئەوا کوردستانی گەورە بە هەرسێ بەشەکەیەوە ژمارەی دانیشتوانی دەگاتە نزیکەی (٢٤)ملیون کەس، نیوەیان لەکوردستانی تورکیا دەژین. جا، ئەگەر مینورسکی کاتی خۆی ئاماژەی بەوە داوە کە ئەرمەن (٦٠-٧٠٪) دانیشتوانی خاکی دەوروبەری دەریاچەی وان پێکدێنن (١٧/٢) کە ئەسلّەن ناوچەیەکە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن، ئەوا بە هەقیقەت کوردەکان (٦٥٪)ی دانیشتوانی ویلایەتە کوردییەکانیان پێکدێنا لەدەولّەتی عوسمانیدا، بەلّکو خودی مستەفا کەمال ئەتاتورك لە بەرواری ١٦ی کانوونی دووەم واتا ماوەیەکی کەم بەرلەوەی کۆماری تورکیا جاڕ بدرێ، ئاماژەی بە بوونی هۆزە کوردییەکان داوە لەویلایەتی (قۆنیا)ی نزیك ئەنکەرەی پایتەخت (١٠/١٠). وێڕای ئەو هەولّە زۆرانەی حکوومەتەکانی عوسمانی پیادەیان کرد بۆ بە تورك کردنی نەتەوەی کورد، بەلآم ژمارەی نوێنەرانی کورد لەیەکەمین ئەنجومەنی نیشتمانی تورکیا کە لەسەروبەندی شەڕی رزگاریخوازی بەسترا (٢٣) نوێنەر بوو لەکۆی ١٢٣ نوێنەرەکەی ئەو ئەنجومەنە (٢٨٥/٣٨)، واتا نزیکەی (١٧٪) ئەمەش نزیکەی هەمان رێژەی ژمارەی کورد پێکدێنێ لە بەرامبەر تورکەکانی دەولّەتی عوسمانی لەکاتی رووخانیدا. خەملآندنەکانی دەزگای ئاماری دەولّەت باسیان لەوە

کردووە کە ژمارەی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆل- ئەمەش ئەو ناوچەیە دەگرێتەوە کەمایەتیی کورد تیا نیشتەجێیە-لە میانەی ساڵانی ١٩٩٠ بۆ ٢٠٠٥بە ڕێژەی ٧٦٪ زیاد دەکات، چونکە ژمارەی دانیشتوان لەو (٨) ویلایەتە کوردییانەی حوکمی عورفی دەیانگرێتەوە، ئەو کاتە دەبێتە ٧٥٧٥٠٠٠ حەوت ملیۆن و پێنج سەد و حەفتاو پێنج هەزار کەس (١٩/٣٧). پێشتر ژمارەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٥ نزیکەی ٤٣٠٣٥٦٧ کەس بوون کە بریتی بوو لە ویلایەتەکانی: سعرت، دیاربەکر، ئەرزنجان، ئاگری، هەکاری، مرعش، ئەرزروم، وان، بەرزترین ڕێژەی زیاد بوونەکە ئەم ڕاپۆرتە تۆماری کردبوو کە پسپۆڕانی تورك‌و ژاپۆن لەدەزگای پلانی تورکیا DPT ئامادەیان کرد سەبارەت بە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، ویلایەتی سعرت بوو، لێرە ئەم زیادبوونە لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٥ دەگاتە ٩٤,٤٪ (١٩/٣٧).

ئەگەر ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوانی کورد وەربگرین کە دەکاتە لە ٣٥٪ ئەوا ژمارەی کوردەکانی ئەم ڕۆژگارە لە تورکیا بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٩٠ کە تێدا ژمارەی دانیشتوانی تورکیا (٥٦) ملیۆنە، دەگاتە نزیکەی (١٢)دوانزە ملیۆن و دابەشبوونەتە سەر (٢٠) ویلایەتی تورکی لە کۆی (٨١) ویلایەت، لەوێ کوردەکان زۆرینەی دانیشتوان پێکدێنن نزیکەی (٥٥-٨٠٪) لە ویلایەتەکانی هەکاری، سعرت، ماردین، شەرناخ، باتمان، موش، دیاربەکرو بەتلیس. هەروا کوردەکان (٤٠-٦٠٪)ی ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتەکانی وان‌و تونجەلی (دەرسیمی پێشو) و ئازیغ(عەزیزی پێشو)و ئادی یامان‌و مرعش‌و ئورفەو بنگۆل پێکدێن‌و نزیکەی (٢٠-٤٠٪)یش لە ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتەکانی: سیواس‌و قارس‌و ئەرزنجان‌و غازی عێناب پێکدێن، جگەلەوەی کەمایەتییەکی مامناوەندی پێکدێنن لە ویلایەتەکانی ئەستەمۆڵ‌و ئەنکەرە و قۆنیا.

## سەرچاوەكانی بەشی یەكەم


١- د.تقی دةباغ د.وليد الجادر: عصور قبل التاريخ. مطبعة جامعة بغداد ١٩٨٣

2- Mellaart, J: Catal Huyuk, a Neolithic Town in Anatolia, London 1967

٣- د.ولdد الجادر:نظرات فی مباحث و مؤلفات، مجلة سومر. الجزءالاولء الثانی،المجلد ٢٦ بغداد ١٩٧٠

٤- وليد الجادر، دراسة فی حضارة العراقء الشرق الاوسطء الادنی القديمة، مجلة الاقلام، العدد السادس السنة الثامنة ,١٩٧٢

5- L’avt au Pays De Hittites: 16000 A 600 Av. J- C- Paris 1964

٦- طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة الجزء الاول، مطبعة الحوادث بغداد ١٩٧٣.

7- Hurriyet gazetesi,8-8-1989

8- J.G.Macqueen: The Hitties. Thames and Hudson, London 1975.

9- Encyciopaedia Britannica –U.S.A 1966.

١٠- ابراهيم الداقوقی: فنون الأدب الشعبي التركماني، مطبعة الزمان- بغداد ١٩٦٢.

11- Xenophen, The Persain Expedition, Transllated by: Rex Warner, Penguin Classics, England 1965.

١٢- ابراهيم الداقوقی: فنون الأدب الشعبي التركماني بغداد ١٩٦٢.

13- Paul Garelli: Le proche- Orient Asiatique-Paris 1965.

14- D: Arnoud: Le proche-Orient Asiatique-Paris 1970 14 D: Arnoud: Le proche-Orient-41 Asiatique-Paris.

15- Robert Kuper: Le Nomandes en Mesopotamia au Temps de Rois de mari, Paris-1975.

١٦- لەگفتوگۆیەكمدا لەگەڵ دكتۆر وەلید الجادر دەربارەی سەرچاوە فەرەنسییەكانی ئەم بەشە كە هەندێ وردەكاریم هێنایەوە سەبارەت بە حورییەكانو ناوی ناوچەكانی نیشتەجێبوونیانو ژمارەیەك لەپادشاكانیان.

١٧- بنۆڕە باسو لێكۆڵینەوەكانی بەڕێزان: محەمەد ئەمین زەكی، رەفیق حیلمی، عەبدوالرحمان قاسملو، د.كەمال مەزهەر، د.عەزیز ولحاج، د.عەبدولسەتار تاهیر شەریفو ئەوانیتر.

١٨- البلاذري، فتوح البلدان، مكتبة الهلال بيروت ١٩٨٣.

١٩- ول ديوارنن، قصة الحضارة، الجزء الثالث، مطبعة بيروت ١٩٥٦.

٢٠- جورج كونتينو: الحياة اليومية في بلاد بابل و آشور، ترجمة سليم طة التكريني و برهان عبدالتكريني، دار الرشيد بغداد ,١٩٧٩

٢١- د.علاء جاسم البياتي: علم الاجتماع بين النظرية و التطبيق: دار التربية، بغداد ١٩٧٥.

٢٢- ملی تتبعلەر مەجموعەسی، بیرنجی جلد، ئەستەموڵ، مەتبەعە عامیرە ,١٣٣١

٢٣- م.ساگع: ئەتنوگرافیا، عیلم ئەقوام، ئەستەموڵ ١٣٢٧ مەتبەعە عامیرە.

٢٤- هەروا (توك-یو) یەكێكە لەبەشەكانی داستانە نەتەوەییە ناسراوەكان لەئەدەبی كۆنی توركیدا.

بۆ زانیاری زیاتر: بڕوانە: الداقوقي، فنون الأدب الشعبي التركماني لاپەڕە ١٩و دواتری.

٢٥- زیا ئویغوز: ریشەكانی زایۆنیزم، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی ئیبراهیم داقوقی بەغدا ,١٩٦٦

٢٦- دراسات في المجتمع العربي، دانەری كۆمەڵێك لەمامۆستایانی كۆلێژەكانی ئادابو ئابووریو زانستە سیاسییەكان لەزانكۆی قاهیرە، چاپی دووەم ١٩٦١-١٩٦٢.

٢٧- منذر الموصلي: عرب و اكراد، بيروت ,١٩٨٦

٢٨-كتێبی پیرۆز (سەروبەندی كۆن) بەیروت ١٩٥١ سفری تەكوین سەحاح ٢٣، ژمارە,١٩٠٣

29- Walters, Laquear: Communsm and Nationalism in The Middle east,2 Ed. London 1957.

٣٠- محمود الكشغري: ديوان لغات الترك، ج١، ئەستەمبولَ ١٣٣٣

٣١- كی لسترنط، بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة بشير فرنسيسء كوركيس عواد بتغدا ,١٩٥٤

٣٢- مينور سكي: الاكراد..ملاحظات و انطباعات، ترجمة د.معروف خزنةدار بغداد ,١٩٦٨

٣٣- ئوليا ضةلةبى سياحة تنامةسى، ج٤ ئةستةمبول ١٣١٤

٣٤- محمد امين زكى: خلاصة تاريخ الكرد ء كردستان، ترجمة محمد على عونى، ج١، چـاپى دووەم، بەغدا ١٩٦١وكتاب شريف پاشا: تقرير حدود مەتبەعە عاميرە ئەستەموڵ ,١٢٨٦

35- det Turkay: Osmanli Devietinde Oymak Asiret Ve Cemaatiar.1st 1979.

٣٦- شمس الدين سامى: قاموسى توركى، ئەستەموڵ ١٣١٧ ك

37- Hurriyet gazetesi, 8-1-1990

38- Nuri Dersimi, Beyrut 1950.

کوردی دانیشتووی ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، لەبەرەبەیانی مێژووەوە خەڵکی رەسەنی وڵاتەکەنو تیادا ناوچە شاخاوییەکانیان لە هەرێمی (کوردا) کردنە نیشتمانی خۆیان لە کاتێکدا شاری (کیرتا) مەڵبەندی ئەوان بوو، لێرەشەوە لەگەڵ تورکەکانی دانیشتووی پێدەشتەکان ئاسیای ناوینو بیابانەکانی نێوان دەریای خەزەر-قەزوین-و چیاکانی تای لە باکووری چین، جیاوازییان هەیە.

چینییەکان دیرۆكو بەسەرهاتو رووداوەکانیان لەدێر زەمانەوە ساڵی (٢٨٠٠ پ.ز) تۆمار کردووە، لە نووسراوەکانیاندا گوتوویانە، هۆزەکانی (شان یۆنگ) — لەو سەروبەندە- لەو ناوچەیە دادەنیشتن کە لە هێڵی ئورتوس لە باکوورەوە تاوەکو چۆمی (ئیرتیش) بەرەو باشوور درێژبۆتەوەو پێیانیان دەگوت (تا-تان Ta-Tan)، ئەمانە باپیرە گەورەکانی ئەو (توکیۆ- Tukyo)یانە بوون کە بە لای دۆڵی رووباری (ئورخۆن)ەوەو رێك بەلای لقێکی ئەم رووبارە کە پێیان دەگوت (قۆن) نیشتەجێ بوونو سنوورەکەی لە رۆژهەڵاتەوە (مەنشوریا)یەو لە باکوورەوە زرێباری (بایقال)و لە خۆرئاواوە کەرتی (ووسون)و لە باشووریشەوە وڵاتی چینو ماچین بوو (٣١/١)، (توکیۆ)یش ئەو ناوەیە چینییەکان، لەسەرچاوە چینییە کلاسیکییەکاندا بە تورکەکانیان گوتووە.

لەبەر ئەوەی تورکەکان لەگەڵ مەرومالاتەکانیان بەلای دامێنەکانی چیاکانی (تای)یەوە دەگوزەرانو لێرە دەوارە رەشەکانیان بەسەر کەناری رووبارەکانەوە هەڵدەداو ژیانێکی کۆچەرییان بە دوای لەوەڕگاو سەوزیو ئاودا بەسەر دەبرد، بۆیە لەتۆمارە چینییەکاندا بەناوی (شان یۆنگ)ەوە ناویان هاتووە، واتا دانیشتوانی هەردەو بانەکان، چونکە مێگەل و مالاتو ئەسپو ماینەکانیان، گوزارشتیان لەژیانو ماڵ سامانیان دەکرد، لەسەر شیرو ماستو پەنیرو گۆشتیان دەژیانو پێستو خوریو مەرەزیان بۆ جلو پۆشاکی خۆیان بەکاردەبردو لەشیری ماینەکانیان شەرابێکیان دروست دەرکرد، پێیان دەگوت (قومێز)، هەر لەمناڵێشەوە مناڵەکانیان لەسەر سوارچاکیو شەڕ، رادەهێنان (٣٢/١).

ئەگەرچی تورکەکان لە ساڵی (٢٣٥٧پ.ز)ەوە لەو دەمەی (یائو-Yao) بووە یەکەمین ئیمپراتۆری ناوچەی (جۆنگ- قوئو)ی چینی ، لەشێوەی هۆزگەلی پەرتوبلاو دەژیان، بەلام هەر لە ساڵی (٢٢٠٥پ.ز)ەوە لەسەردەمی زنجیرەی حوکمڕانی (هیا- Hia)دا دەستیان کرد بە داگیرکردنی وڵاتی چین. کە زنجیرەی (شانگ-Chang)یش ساڵی (١٧٦٦پ.ز) هاتنەسەر تەخت، (شۆن-گۆئی) توانی هۆزەکانی تورك یەکبخاتو دەست بەسەر (چین)دا بگرێ. لێ هەرچەندە چینییەکان تورکەکانیان لە چینو ماچین دەرکرد، کەچی ئەوان- واتا تورکەکان-، بە درێژی ئەو سەروبەندانەی زنجیرەی (شانگ) حوکمڕانیی ئەو وڵاتەیان گرتبووە دەست کە (٦٤٤) ساڵی خایاند، لەسەر پەلامارو هێرشو داگیرکردنیان بۆ چین، بەردەوام بوون. بەلام (وو-وانگWou Wang)ی دامەزرێنەری زنجیرەی بەهێزی (چی-ئو

Tcheo)، هەر بەوە نەوەستا لە ساڵی (١١٢٢پ.ز) سنوورێك بۆ داگیرکارییەکانی تورکـان دابنێـت، بەڵکو هێنانییە ژێر رکێفی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەکەیەوە، لێ ئەوان هەمیسان لەساڵی (١٠٧٩پ.ز) سەربەخۆییان وەرگرتەوەو جارێکی تر دەستیان دایە هێرشبردنو داگیرکردنـی چـین، ئەمـەش وایکـرد خەڵکی چین بیر لە بونیاتنانی شوورەی مەزنی چین بکەنەوە کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (شە-هوانگ تیە)ی زنجیرەی (تسین) تەواویان کرد (٣٣/١).

لەسەروبەندی زنجیرەی (هان) (٢٠٢پ.ز-٢٥ز) تۆمارگە چینییەکان ناوی تورکانیان بە (هیونگ-نو) بردووە، دەڵێن ئەمانە پێکهاتوون لـەهۆزەکانی (هـۆن-قـۆن)و (هـۆن-تیـە)و (هـۆ-یـەن). لـەم بارەیەشەوە، مێژووناس (عەلائەدین جوەینی) کە سەردانی ناوچەکانی تـورکی کـردووە، بـە جەختـەوە دەڵێت: بە تورکانی دانیشتووی باکووری چین، دەڵێن: (قۆن). ئەمە لەکاتێکدا (مەحموود کەشـغەری)ی زمانناسی تورك جەختی کردووە کە (قۆن) لە زمانی تورکی ئەرغۆ بە واتای (مەڕ) دێت، یانی (قۆیۆن) بە تورکی ئۆغۆزی (٣٢/٢)، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ واژەی (هۆینگ-نو) کە چینییەکان بە تورکانیان گوتووە، واتە: قۆینلو، یانی مەڕدارەکان یان خاوەت مەڕەکان، ئەمەش ئەو زاراوەیە بوو کە تورکـەکان لەو سەروبەندانە لەنێوان خۆیاندا بەکاریان دەبردو پاشماوەکانی هۆزانی (ئۆغۆز)یش لەکاتی پێکهێنـانی هەردوو حکوومەتی (ئاق قۆینلو)و (قەرە قۆینلو) لـە(١٤٠١-١٥٠٨ز) ئـەم دەسـتەواژەیان هێنایـە عێراقەوە.

ئەگەرچی سەرچاوە کلاسیکییە چینییەکان لە ساڵی (٢١٠پ.ز) دەڵێن گرنگترین هۆزەکانی تـورك بریتی بوون لە: هۆنو تۆکیۆو ئویغورو ئوغوزو قارلوقو قانایو قـەپچاقو قرغیـزو رابـەرێکی قائـان یان(خاقان) سەرکردایەتیی کردوون پێی گوتراوە (تـانزۆ Tanju)، ئـەو کەسـەی کـە پلـەی یەکـەمی دەسەڵاتی لەدەوڵەتدا بەدەستەوەیە، لەوێ (مەتە Meta) تانزۆی تورکەکان-خاقانی گەورەیان بوو لـەو سەروبەندەدا، بە پلەی دووەمیش ژنەکەی هاتووە کە پێیان گوتووە (یـەن Chi-Yen)، جێگرەکەشـی لەپاش خۆی، خاقان کە بە ژیانەوەیە، دایدەنێتو ناوی (هیەن-ڤانگ Hiean Vang)ە، لەو دەمـەدا خاقانی مەزنیان (تیومان Teo Man) بووە کە کردەوەی رێکخستنی قەوارەی سەرەکی دەوڵەت بە پێی سیستەمی سەربازی یەکێك بووە لەو کردەوە چاکانەی کە بۆ سەردەمی ئەو دەگەڕێتەوە. بۆ نموونە: شار دەکرێ بە چەند بەشێکەوە: سەنتەر، لای ڕاست، لای چەپ. سیستەمی سەربازیش هەر بەوجۆرە بـوو: دڵ، لای ڕاست، لای چەپ (٣٧/١).

بەڵام مەحموود کەشغەری لە ساڵی ٤٦٦کۆچی، دەڵێـت: تورکـەکان لـە بنەچـەدا بیسـت هـۆزن، هەموویان دەچنەوە سەر تورك کوڕی یافپ کوڕی (نووح)ی پێغەمبەر (د.خ)و ئەوان لە پایـەی کـوڕانی

(رۆم)ی کوڕی (عیصۆ)ی کوڕی (ئیسحاق)ی کوڕی (ئیبراهیم)ن (د.خ) (٢٧/٢). ئەم هۆزانە بە ریزبەندی لای ((رۆم))ەوە بەرەو خۆرهەڵات بە جاهیلیو ئیسلامییانەوە، ئەمانەن: بچنك، قەفجان، ئوغوز، یەماك، بشغرت، یسمل، قای، یباقۆ، تەتار، قەرقز- ئەمانە نزیکی چینن- لەپاشان، ئەم هۆزانە دێن: جوکل، تەخسی، ئەغراق، چرق، چەمل، ئیغۆر، تینکت، خەتای، ئەفغاچ -ئەم هۆزانەش ناوەندن لەنێوان باشوورو باکوور- کەسایەتیگەلێکی حوکمڕانی گەورە سەرکردایەتیی ئەم عێلانەیان کردووە، وەك ئەو کەسایەتییانەی لە ئامێزی گەلانی خێڵە باوکسالارییەکان پەروەردەو گەورە بوون کە فرەجار ناو بەناو لە مێژووی ئەو ناوچانە بەرچاومان دەکەون. کاتێکیش ئەم هۆزانە بە لێشاو لەدامێنی چیاکانی (تیان-شان)ەوە بەرەو بیابانەکانی ئاسیای ناوین، هاتن، چەند خەسڵەتێکی رەگەزیی جیاوازیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، رەگەزناسانی مرۆیی پێیان دەڵێن: خەسڵەتە تۆرانیزمییەکان، (١٠٩/٣).

ئویغۆر (ئیغۆر)ەکان لە رووی ژیاریو کلتوورییەوە لە هۆزە تورکەکانیتر دەوڵەمەندتر بوون، بۆ نموونە: خەتێکی ناسراویان هەبوو، ئەم خەتە دروست کرابوو بۆ نووسینی زمانی تورکی رۆژهەڵاتیو وەرگێڕانی کۆمەڵێك کتێب لەژێر کاریگەریی نێردراوە تەبشیرییە نەستووریو بوودیو مانەوییەکان، لەوێ را بەر لەسەرهەڵدانی ئیسلام دوو شێوەزاری باو لەزمانی تورکی لەگۆڕا بوو: شێوەزاری ئویغور (شێوەزارە رۆژهەڵاتییەکە)و شێوەزاری کوك تورك (شێوەزارە خۆرئاواییەکە) (١٠/٤).

لەدەوروبەری سەدەی شەشەمی زایین، تورکەکان بوونە خاوەن دوو دەوڵەتی بەهێز لە مەنگولیاوەو تخووبی باکووری چینەوە تاوەکو دەریای ڕەش، درێژ ببوونەوە. دامەزرێنەری دەوڵەتە رۆژهەڵاتییەکە، (بۆمین) لە ساڵی (٥٥٢ زایین) کۆچی دوایی کرد، (ئیستم)ی برایشی کە هەموو لایەك ملکەچی بوون، لەدوای مردنی (بومین)ی برای، نزیکەی چارەکە سەدەیەك لەژیاندا مایەوە. پاشان بنەماڵەی (تانگ)ی دەستڕۆیشتوو لەچین، دەوڵەتە رۆژهەڵاتییەکەیانی لە دەوروبەری ساڵی (٦٣٠ز) لەناوبردو دەوڵەتە رۆژئاواییەکەشیان لە نزیکەی ساڵی ٦٥٩ز رووخاند. بەڵام زۆری نەخایاند، تورکەکانی باکوور لە ساڵی (٦٨٢ز) تەوقی دیلییەتی بێگانەیان تێکشکاندو تاوەکو ساڵی (٧٤٥ز) سەربەخۆیی خۆیان پاراستو لەم ساڵەشدا هۆزی (ئویغور) شانشینە باکوورییەکەیان لەناو برد. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم هێزێکی تورکیی نوێ سەری هەڵدا، ئەوانیش ئەو (قرقز)یانە بوون کە ئیمپراتۆرییەتی (ئویغۆر)یان لە ساڵی (٨٤٠ ز) رووخاندو (ئویغور)ەکانیش بەرەو ئەو ناوچەیە رەویان کرد کە لەم رۆژگارەماندا تورکستانی چینی پێکهێناوە (١١٢/٣).

تورکەکان، ئایینی شامانییان دەپەرست کە یەکێکە لە ئایینە کۆنەکان. (شامانی)یش واتا: پیاوی ئایینی کە خۆی بە ئاڵقەی پێوەندی دادەنێ لە نێوان خوداوەندو مرۆڤ ، ئەم شامانییانە ئیلهامی

کارەکانیان لەخوداوەندەکانەوە وەردەگرنو بە ڕێگەی سیحرو ئەفسوونەوە مرۆ لە دێوو درنـجو جندۆکـە قوتار دەکەن. بەڵام لە سەدەی پێنجەمی زایینەوەو لە دەرەنجامی کۆششی نێردراوە نەستوورییەکان، هاتنە سەر ئایینی مەسیحیو لەمانیشەوە (ئەلفو بێـی سـامی)یان وەرگـرت کـە دواجـار بەخـەتی ئویغوری ناسراو بریتی بوو لە١٤ پیت. وەلـێ ڕەنووسـی ئورخـوونی (٣٤) پـیتی لـە سـەدەی (٨)ی زایینەوە، شوێنی ڕەنووسـی ئویغـوری گرتـەوە (١٨/٤)، ئـەو دەمـەی نێـردراوە مژدەبـەر بـوودیو مانەوییەکان لە ناو تورکەکاندا سەریان هەڵدا (١١٢/٣). بەڵام دەرکەوتنی موسلمانەکانو ئەنجامـدانی غەزاو لەشکرکێشییە خێراکانیـان دوای سـەرکەوتنیان بـە سـەر ساسـانییەکاندا لـە سـاڵی ٦٥٢ز و پێشوازیکردنی ئێرانییەکان لە ئایینی تازەی ئیسلام، ڕێی لە پێش عەرەبەکان خۆش کرد بـۆ بەسـتنی پێوەندی بازرگانی لەگەڵ تورکەکان بە ڕێگای (حریر)ەوە کە تاوەکو چینو ماچین درێژ دەبۆوە، ئەو دەمە تورکەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆهەمینەوە هاتنە سەر ئایینی ئیسلامو دواجار بوونە مەچەکی ڕاستی عەرەب بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم ئایینە تا ناوەندەکانی چین (٣/٦).

ئەگەرچی مەملەکەتی تورکیی ڕۆژئاوا لە دەستپێکی سەدەی هەشتەم، هێشـتا دەسـتیان بەسـەر ئێراندا گرتبوو، ئێرانیش بەرلەوە لە ژێر دەسەڵاتی ئومەوییەکاندا بوو، ئەوا چەندین دەوڵەتۆکەی تورکیو فارسی لەمیانەی هەردوو سەدەی نۆیەمو دەیەمی زایین لەسەر شـانۆ سـەریان هەڵـدا، وەك: خیتـامی مەغۆلی لە باکووری چین، سامانی لە خۆراسان، ئیلخـانی لـە تورکسـتان، بـوەیهی لـە تەبەرسـتانو قـەراخانیو غەزنـەویش لـە وڵاتـی ئێـران. بـەڵام سـەرهەڵدانی سـەلجووقییەکان لـەوڵاتی تـۆرانو لەشکرکێشـییەکانیان بـەرەو ڕۆژئـاوا لەسـاڵی (٩٧٠ز)ەوە کـە لـەوێ ئـەم سـەلجووقییانە هـەموو دەوڵەتۆکەکانیان بەزاندو سەرکەوتن بەسەریاندا، لە سـۆنگەی ئەمـەدا (قـائیم)ی خەلیفـەی عەباسـی (١٠٣٠-١٠٧٥ز) هانای بردە بـەر (تـوغرول بـەگ)ی سـوڵتانی سـەلجووقییەکانو فـەرمانی دا لـە مزگەوتەکانی عێراق وتاری ئاینی بەناوییەوە بخوێندرێ (١٢٦/٣).

لەساڵی (٤٢٩ك-١٠٣٧ز) ئاپۆرەی لەشکری (غز)ی سەلجووقییەکان گەیشتە دەوروبەری موراغە، شاریان تاڵانو قەتڵو عامێکی بەرپادیان لەخەڵکی کرد، پاشان دایان بەسەر هۆزی هـەزبانی کـورددا و کوشتارێکی گەورەیان لەناویان نایـەوە، دوای ئەمـە هـەموو هـۆزو خێڵـەکانی ئـەو ناوچـانە لەگـەڵ فەرمانڕەوای ئازەربایجانو هسوژانی کوڕی مەهلانی کورد یەکیان گرتو ڕووبەڕووی هێرشی (غز)ییەکان بوونەوەو بەرگرییەکی مەردانەیان کردو دەرەنجام توانییان بیانشکێننو پاشەکشەیان پێ بکەن، ئەگەرچی بەشێکیان خۆی گەیاندە قۆڵی ورمێو ڕوویانکردە وڵاتی هەکاری کە لەو دەمـەدا سـەر بـە ویلایـەتی مووسڵ بوو و کاولکاریو تاڵانو بڕۆیەکی بێشوماریان لەوێ کرد (١٣٦/٨).

که ئەلپ ئەرسەلان لەساڵی ١٠٦٣ز هاتە سەر تەختی سەلجووقییەکان، بیزەنتییەکان ئەنادۆڵیان لە ئەنتاکیاوە لە باشوور تا کوردستان لە رۆژهەڵات داگیر کردبوو (١٧٦/١)، لەبەر ئەمە ئەلپ ئەرسەلان لەشکرێکی لە دژی بیزەنتییەکان لە ئاسیای ناوین ئامادە کردو لە شەڕی مەلازکورد ساڵی ١٠٧١ز سەرکەوت بەسەریانداو (رۆمانس دەیوجین)ی ئیمپراتۆریشیانی یەخسیر کرد (١٨٢/١). بەم کردەوەیەش هەموو وڵاتی ئەنادۆڵ بە کوردستانیشەوە، کەوتنە بن دەستی سەلجووقییەکان، هەندێ لە ناوچەکانی وەك دیاربەکر نەبێ، کە سەر بە مەروانی کورد بوون، مەروان دواترین ئەو فەرمانڕەوایانە بوو کە راستەوخۆ ملکەچی فەرمانی خەلیفە بوو (١٢٨/٣)، بۆیە نیزامولمولك- کە بووە وەسی لەسەر مەلکشای کوڕی ئەو ئەلپ ئەرسەلانەی کە لە ساڵی ١٠٧٢ کوژراو کوڕەکەشی هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی باڵق بوون- هێنای لە ساڵی ١٠٨٣ دیاربەکری داگیر کرد، ئەوسا زمانی عەرەبی وەکو هەموو میرنشینیو سەڵتەنەتەکانی تورك کە لەو ناوچانە تا سەدەی دوانزدەهەمینی زایین دامەزرابوون، زمانی فەرمی بوو (١٦٠/٥). دانیشمانییەکان فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتۆکانەیان دەکرد کە لە سەردەمی غازی ئەحمەدخاندا سیواسیان کردبووە مەڵبەندی خۆیان. دەوڵەتەکەی ئەحمەدخان ویلایەتەکانی خەربووتو ئەرزرومو تەرابزونو ئەنکەرەو قەستەمونیشی گرتبووەخۆ (١٨٤/١).

لە پاش مردنی مەلکشا لە ساڵی ١٠٩٢ز ئیمپراتۆرییەتی سەلجووقی زۆر بە خێرایی پارچە پارچە بوو، ئەمە لەو دەمەدا کە لەشکرکێشی خاچپەرستەکان بەرەو رۆژهەڵات دەستیپێکردو لەوێ بوونە کێبڕکاری سەرەکیی تورکەکان لەسەر سەڵتەنەتیان لەسووریاو وڵاتی ئەنادۆڵ.. دەبینی بەغدەوینی یەکەم لە ساڵی ١٠٩٨ میرنشینییەکی لە روها (ئۆرفە) دامەزراند، بەشێکی دیکەش لە خاچپەرستەکان بە سەرکردایەتیی (سیمیۆن) لە ئەستەمووڵەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی (ئەلکیس گومنین) بوو، روویکردە ئەنکەرەو داگیری کرد، لێرەشەوە روویکردە رۆژهەڵات، بەڵام (ئیسماعیل خانی دانیشمەندی) والیی ئاماسیە لەگەڵ هەریەك لە والیی قەیسەری (کومەشتکین)و والیی ئەنکەرە رێککەوتو لەشکرێکیان ئامادە کرد بەرامبەر هێرشەکەی سیمیۆنو لە نزیك شارۆچکەی جوروم بە سەریدا زاڵ بوون، ئەمیشیان هەڵاتو خۆی گەیاندە ئەو هێزە خاچپەرستەی روویکردبووە ئەنتاکیا. وەلێ (قلیج ئەرسەلان)ی فەرمانڕەوای (قۆنیا) لە نزیك ئاسکی شەهر بەرەنگاریان بۆوەو لە هەوەڵێن شەڕدا سەرکەوت بەسەریاندا، بەڵام خاچپەرستان بەردەوام بوون لەسەر ناردنی کۆمەکی زیاتر بۆ هێزەکانیان، بۆیە قلیج ئەرسەلان لە بەرامبەر ئەم هەموو هێزە پاشەکشەی کرد، دوای ئەمە خاچپەرستەکان شۆڕ بوونەوە بەرەو باشوور بۆ چیاکانی قارەمانو ئەنجاش بەرەو شاری ئەدەنە. بەشێکی تریشیان بەرەو چیاکانی گوروون وەڕێ کەوتنو لەوێشەوە بەرەو بوستان. لە لایەکی ترەوە بەشی هەرە زۆریان روویان دەکردە ئەنتاکیا کە (باغیسیان)ی

نەوەی ئەلپ ئەرسەلان فەرمانڕەوایی تیا دەکرد. باغیسیان بەبێ پشوودان بۆ ماوەی (٩)مانگی ڕەبەق بەرگری لە شاری ئەنتاکیا کرد، لێرەش قاتو قڕی لە نێوان هەردوو لا بڵاو بۆوەو شار لە سەر دەستی ئەو خاچپەرستانە هەرەسی هێنا کە وەکو دڕندەکێوی هێرشیان کردە سەر دانیشتوانەکانی، وەك ئەوە (ئەنناگومنین Anna Gomnen)ی کچی ئیمپراتۆر ئەلکسیس لە تۆمارکردنی یادداشتنامەکانی باوکیدا نووسیویەتیو هەروا دەڵێت: ((پاڵەوانانی جەنگی پیرۆزی دژ بە موسڵمانەکان مناڵانی تورکیان سەردەبڕیو گۆشتەکانیانیان دەبرژاندو پاشان دەیانخواردن)) (١/١٩٠)، لە پاشان خاچپەرستان لەوێوە بەرەو ئەزنیك لەشکریان ڕانیو دوای دەستبەسەراگرتنی، ڕوویانکردە (مەعەڕەی نوعمان) و بەوتەی (مێشو)ی مێژووناسی خاچپەرستان، زیاتر لە (١٠٠) هەزار کەسیان لێقەتڵ و عام کردن (١/١٩٨).

لەپاشان لەشکریان کردە سەر شاری قودسو لە (١٠٩٩) داگیریان کرد.

مووسڵو بەشی هەرە زۆری جزیرەی فورات تاوەکو باکوور لە ژێر دەسەڵاتی (عیمادەدین زەنگی) دابوو، ئەرتەقییەکان هێشتا ماردینو بەشێکی زۆری سووریایان بە دەستەوە مابوو (٣/٢١٨) ئەو دەمەی (صلاح الدین) سەری هەڵداو (سووریا)ی گرتو لە پاشان (دەوڵەتی فاتیمی) لە میسر لەناوداو قودسیشی لە ژێر دەستی خاچپەرستەکان ڕزگار کرد. کە لە ساڵی ١١٩٣یش کۆچی دوایی کرد، کوڕەکانیو دوای ئەمانیش ئەیووبیەکان، جڵەوی حوکمڕانییان لە سووریاو فەلەستینو میسر گرتە دەستو لەوڕا نەوەکانی (صلاح الدین) تەنها لە حەڵەب توانییان تاوەکو داگیرکاری مەغۆلەکان لەساڵی ١٢٦٠ بمێننەوە (٣/٢٣٦).

سەرهەڵدانی مەغۆل بە سەرکردایەتی جەنگیزخانو لەشکرکێشییان بۆ سەر زنجیرەی (کن)ی فەرمانڕەوا لەچین لای باکوور ساڵی ١٢٤١ز، دەستپێکی سەردەمێکی نوێ بوو لە شەڕو شۆڕو ئاژاوەو پشێوی کە لە چینو ماچینەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بگرە تا میسر لە ڕۆژئاوا هەڵایسا. ئەوە بوو جەنگیزخان توانیی لە ساڵی ١٢١٥ دەست بەسەر (پەکین)دا بگرێ، لە ساڵی ١٢٢١یش، (دەوڵەتی خەوارزمی) ڕووخاندو دوای ئەوە لەدەریای (خەزەر)ەوە بە سەر قەفقازیا (وڵاتی قیق) لەشکری بەرەو باشووری ڕووسیا ڕانی بۆ ئەوەی بە چۆمی (ڤۆلگا)دا بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیانو هەمیسان لە مانگی ئابی ساڵی ١٢٢٧ گەمارۆی (پەکین)ی پایتەختی چین بدەن پاش ئەوەی زنجیرەی حوکمڕانی (کن) توانیبوویان وەری بگرنەوە (٣/٢٦٨).

بەرلەوەی جەنگیزخان لەهەمان ساڵ (واتە ١٢٢٧) بمرێت، ئیمپراتۆرییەتەکەی لە نێوان کوڕەکانیدا دابەش کرد کە توانییان سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەیان تا ئەورووپای ڕۆژهەڵات بە ڕووسیاشەوە، فراوان بکەن. یەکێکیش لە نەوەکانی کە ناوی (هۆلاکۆ) بوو، ئاپۆرەی لەشکری مەغۆلی بەرەو باشووری

خۆرئاوا ئاژۆتو توانی دەست بگرێ بەسەر وڵاتی فارسو پاشان بەرەو شاری بەغدا ملی ناو لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٢٥٨ داگیری کرد. لە بەغدایشەوە رووی لەشکری کردە سووریاو ئاسیای بچووكو فەڵەستین، لێرەش (زاهیربیبرەس)ی سوڵتانی میسر پێشی لێ گرتنو لە شەڕی (عەین جالووت) ساڵی ١٢٥٩ توانی بۆ یەکەمین جار بیانشکێنێو ئیدی لەو رۆژەوە ئەستێرەی مەغۆل رووی لە کزی کرد (٣/٢٤٢).

لەم سەروبەندانەدا، (سلێمان شاقاڵپ ئەلپ)ی سەرۆکی هۆزی (قایی) ساڵی(٦٢١ك-١٢٢٤ز) کە لە هۆزانی (ئوغوز) بوون، بە سەرکردایەتی (٥٠)هەزار کەس، لە خۆراسانەوە بەرەو ئەنادۆڵ وەڕێ کەوتو هات لە ناوچەی نێوان ئەخلاتو ئەرزنجان نیشتەجێ بوو (١/٧). حەوت ساڵ دواتر، ئەو دەمەی جەنگیزخان مردو دەوڵەتی خوارزمی لە خۆراسان رووخا، سلێمان شا بیری کردەوە لە رێگای حەڵەبەوە بگەڕێتەوە بۆ (خۆراسان)ی زێدی خۆی، بۆ ئەم ئامانجەی ملی کەناراوەکانی چۆمی فوراتی گرتە بەرو کاتێك گەیشتە قەڵای (جعبور)، لەئەسپەکەی هەڵدێراو کەوتە نێو رووباری فوراتەوەو خنکا. دوای ئەم رووداوە دووان لەکوڕەکانی بەنێوی (سونگور تەکینو کوندوغدو)، بەرێوە بەرەو خۆراسان بەردەوام بوون.

لەولاشەوە دوو کوڕەکەی تری (ئەرتوغرولو دوندار) لە رێگەی (ئەرززوم)ەوە گەڕانەوە بۆ ناوچەی ئەنادۆڵ بۆئەوەی لەوێ نیشتمانێکی تازە بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بە رێگایانەوە توشیان بوو بە تووشی دوو کۆمەڵ لەدژی یەکتر شەڕیان دەکرد، هەردوو براکەش دایانە پاڵ لایەنە لاوازەکەی ئەو دوو کۆمەڵە شەڕکەرە، کاتێك کۆمەڵە لاوازەکەیان بە پشتیوانی ئەو دوو برایە سەرکەوت، دەرکەوت سەرکردەکەیان عەلائە دینی سوڵتانی سەلجووقییەکانەو کۆمەڵە دۆڕاوەکەش لە تەتارو مەغۆلەکانە. دواجا لە پاداشتی ئەم پشتیوانییە سوڵتان (عەلائە دین) ناوچەیەکی بۆ (توغرول) دابڕی کە کەوتبووە نێوان چیاکانی ئەرمەنو دۆڵی سوغوت بە نزیك (کوتاهیە)وە (٣/٧).

وڵاتی ئەنادۆڵ: لەو سەردەمەدا لە هەموو لایەکییەوە لە ژێر سمی گرانی ئەسپی داگیرکەراندا دەیناڵاند. لە رۆژهەڵات سەلجووقییەکانی ئێران تایبەتمەندییە جەنگییەکانی خۆیان لە دەست دابوو لەدەرەنجامی زەبری ئەو مەغۆلانەی وڵاتی ئەنەدۆڵیان لە هەموو قۆڵەکانی رۆژهەڵاتو باشووری رۆژهەڵاتەوە خستبووە بەر هەڕەشەو مەترسییەکانیان. لە قۆڵی رۆژئاواش سەرانی بیزەنتییەکان لە لایەکەوە پشتگیریی خاچپەرستانیان دەکرد بۆ داگیرکردنی وڵاتی ئەنادۆڵو لە لایەکی دیکەشەوە هەر خۆیان هەر کاتێك هەلیان بۆ بڕەخسایە دەستیان دەدایە لەشکرکێشی. بەش بەحاڵی سەلجووقییانی ئەنادۆڵو سووریاش لە باشوور لە بارودۆخێکی لەوانیتر باشتر نەبوون بە هۆی لەشکرکێشی خاچپەرستو مەغۆلەکان بۆسەر ئەم دوو وڵاتە. سووریاو وڵاتی ئەنادۆڵ نزیکەی (٢٠٠)ساڵ لە ژێر حوکمڕانی

خاچپەرستەکان بوون. حکوومەتی خیلافەتیش لە بەغدا رووخاو شەکەتیو لاوازی لە ناوچەکە باڵی بەسەر هەمواندا کێشابوو.

لەم بارە ئالۆزو پڕ بشێوێنییەدا، پێویستی دەکرد هێزێکی گەنجو تازە هەبێ بتوانێ هەموو کاروبارێك لێكو لەبارو راست بکاتەوە. دیارە (ئەرتوغرول) دەرکی بەم هەقیقەتە کردبوو، بۆیە هەوەڵێن دەرفەتی قۆزتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە لەو بیزەنتییانەی لە ناوچەی (کوتاهیە) سەرەئێشەو نارەحەتی بۆ (عەلائەدین)ی پاشای دەنێنەوەو توانی بە سەریاندا زاڵ بێت، لە پاشانیش رووی لەشکری کردە لای ئەو تەتارو بیزەنتینییانەی کە لە دۆڵی نێوان بۆرسەو یەنی شەهر دانیشتوونو سەرکەوت بەسەریانداو بیزەنتییەکانیشی تاوەکو لای دەریا رەتاندن (٣/٧).

ئەرتوغرول، سێ کوڕی هەبوو: عوسمان، کوندوزئەلپ، ساوچی. عوسمان لەساڵی ٦٥٧ك-١٢٥٨ز لەدایك بووبوو. لەپاش مردنی باوکی بە ماوەیەکی کەم ساڵی ٦٨٧ك-١٢٨٨ز توانیی دەست بگرێ بەسەر (قەراجاحەسار)، ئەمەش هەمان ساڵی لەدایکبوونی (ئۆرهان)ی کوڕی بوو. سوڵتان (عەلائەدینی سێیەم)ی حاکمی قۆنیا لەبەر کارو نەبەردییەکانی، ئەو شارەی بۆ دابڕیو نازناوی (بەگ)ی پێ بەخشی. ئەمە هانی (عوسمان بەگ)ی دا قەڵەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی خۆی فراوانتر بکات، بە تەرحێك ئەو قەڵەمڕەوییە پەلی هاویشت بەرەو دەریای رەش لە باکوورو دەوروبەری قوستەنتینیە (ئەستەموول) لەرۆژئاواو کەناراوییەکانی دەریای سپی ناوەراست لە باشوور، نەخوازە پاش ئەوەی دەستیگرت بەسەر بیلەچیكو ئاینە گولو یارحەسار بە شێوەیەکی وا دوای رووخانی دەوڵەتی سەلجووقی توانیی ناوی خۆی بە سوڵتان جاڕ بدات بەسەر دەوڵەتی تازە لەدایکبووی عوسمانی لەساڵی (٦٩٩ك-١٢٩٩ز) (٤/١).

لەبەر گرنگی ئەو رووداوانەی لە رۆژگاری عوسمانییەکان لە کوردستانی تورکیا روویان دا، پاشان رووخانی دەوڵەتی عوسمانیو هەڵگیرسانی شەڕی ئازادیخوازیی میللی لە وڵاتی ئەنادۆڵو دامەزراندنی تورکیای نوێ، ئەم بەشە دەکەین بەم سێ باسە سەرەکییەی لای پایین:

# باسی یەکەم

## کورد لە دەوڵەتی عوسمانیدا

لە هەموو سوورِو دەورانێکی مێژوودا، هۆزو عەشیرەتەکانی کورد سەربەخۆیی ناوخۆی خۆیان پاراستووە، جا ئەگەر کورد لە سەروبەندی میدیو ئەخمینییەکان نیمچە سەربەخۆییەکیان بووبێت، ئەوا ئەو هۆزو عەشیرەتانە لە سەردەمانی حکوومەتەکانی: سلۆقیو فورپیو ساسانیو عەرەبیو تورکییەکاندا، سەربەخۆیی خۆیان پاراست (١٠٨/٨). ئەم شتەمان لە باسی گەشتەکەی زەینەفۆن ئاماژە پێدا کە جەختی لەوە کردووە گەلی کورد بۆ پادشایانی فارس هەرگیز ملی نەداوە، تەنانەت جارێکیان یەکێك لە پادشاکانی فارس لەشکرێکی گەورەی کردۆتە کە سەریان پێکهاتبوو لە(١٢٠)هەزار شەرِکەر، بەڵام کاردۆخییە کوردەکان، پاکی ئەو لەشکرەیان تەفروتوونا کردووە (١٢٧/٩). ئەگەرچیش حکوومەتی (شەدادی) یەکەمین حکوومەتی کورد بووە لەساڵی (٣٤٠ك-٩٥١ز) لە باکووری ئازەربایجانو باشووری خۆرئاوای قەفقاز دامەزراو تا ساڵی (٥٩٥ك-١١٤٦ز) بەردەوام بوو، بەڵام دووەمین حکوومەتی کورد (حەسنەوی- بەرزیکانی) لە وڵاتی چیا لە کوردستان پێکهاتو ماوەی حوکمرِانیی هەتا ساڵی (٤٣٨ك) درێژەی کێشا (١٣٢/٨). پاشانیش میرنشینیە کوردەکان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان پەرەیان سەند بەجۆرێك ژمارەیان پتر لە(٢٥) میرنشین بوو (٣٦١/٢١). ئەو دەمەی عوسمانییەکان سەڵتەنەتیان گرتە دەست، (٥)پێنج لەو میرنشینییانە سەربەخۆ بوون، (١٩)نۆزدەشیان خاوەنی خودموختاری بوون، دواترینیان میرنشینی ئەردەڵان بوو کە بەهێزترینو گەورەترین میرنشینی کورد بوو. بەڵام لەوێ رِا چەندین دەوڵەتۆکەی ئەتابکی لەکوردستان لەشێوەی حکوومەت تاوەکو سەدەی شانزدەهەم بەردەوام بوون، ئەم حکوومەتانەش بریتی بوون لە: (١٤٢/٨)

١-حکوومەتی ئەرتەقی: ئەم حکوومەتە (ئەرتقی)ی مەملووکی سوڵتان مەلیکشا ساڵی ٤٩٥ك-١١٠١ز لەحەسەن کێف دایمەزراند، پاشان لەساڵی ٥٠٢ك-١١٠٨ز حکوومەتەکە بوو بەدوو بەشەوە، هۆبەی حەسەن کێفو هۆبەی ماردین. دەوڵەتی قەرەقۆینلوی تورکمانی لەساڵی ٦٣٠ك-١٢٢٣ز حکوومەتی یەکەمیانی لەناوداو ساڵی ٨١١ك-١٥٠٨زاییینیش

حکوومەتی دووەمیان (حکوومەتی ماردین)ی لەناودا. حکوومەتی (ئەرتقی)یش سەر بە سوڵتانی سلجووقیەکان بوو (١٠٤/٣).

٢-حکوومەتی شا ئەرمەن: سوقمانی قوتبی مەملووکی قوتبەدین ئیسماعیلی سەلجووقی حاکمی تەوریز، ئەم حکوومەتەی لە ئەخلات ساڵی ٥٨٣ك-١١٨٧ز دامەزراندو دەوڵەتی ئەیووبی لە ساڵی ٦٠٤ك-١٢٠٧ز لەناوی برد.

٣-حکوومەتی زەنگی: عمادالدین زەنگی کوڕی ئەقسەنەقر ئەم حکوومەتەی لە موسڵ ساڵی ٥٢١ك-١١٢٧ز دامەزراندو قەڵەمڕەوی بەرفراوان بۆوەو بوو بەچەند لقێکەوە: لقی موسڵ تاوەکو ساڵی ٦٦٠ك/١٢٦٢ز درێژەی کێشاو لێرەش مەغۆلەکان لەناویان برد. لقی شام: دەوڵەتی ئەیووبی لە ساڵی ٥٧٧ك/١١٨١ز رووخاندی. لقی شەنگار: ئەم میرنشینە ساڵی ٥٦٦ك/١١٧٠ز دامەزراو لەساڵی ٦١٧ك/١٢٢٠ز دەوڵەتی ئەیووبی لەناوی برد. لقی جزیرە- جزیرەی ئیبن عومەر- لە ساڵی ٥٧٦ك/١١٨٠ز دامەزراو لەساڵی ٦٤٥ك/١٢٤٧ز دەوڵەتی ئەیووبی رووخانی. لقی هەولێر ساڵی ٥٣٩ك/١١٤٤ز دامەزراو دەوڵەتی ئەیووبی لەساڵی ٦٣٩ك/١٢٥٣ز لەناوی برد.

٤-حکوومەتی ئەتابێکەی ئەرزنجان: میر ئیلدکز لە ساڵی ٥٣٦ك/١١٤١ز دایمەزراندو تاوەکو ساڵی ٦٢٢ك/١٢٢٥ز بەردەوام بوو لەم مێژووەش خوارزمییەکان لەناویان برد.

٥-ئەتابێکەی لوڕستان: ئەم حکوومەتە ئەبوتاهیری کوردی سەرداری ئەتابێکەی فارس ساڵی ٥٤٣ك/١١٤٨ز دایمەزراندو تاوەکو ساڵی ٨٢٧ك/١٤٢٤ز بەردەوام بووە لەم مێژووەش نەوەی تەیموورلەنگ لەناوی برد.

٦-حکوومەتی عەزیزانی کورد: لە پاش رووخانی حکوومەتی زەنگی، ئەم حکوومەتە لە(جزیرەی ئیبن عومەر) دامەزرا، دواترین میری، (بەدرخان پاشا) بوو، تاوەکو دامەزراندنی حکوومەتی بایەندەری ئاق قۆینلوی تورکمانی لە دیاربەکرو کوردستان بەردەوام بوو، وەختێ ئەم حکوومەتە تورکمانییە هات بەشێوەیەکی کاتی لەناوبران، چونکە دووبارە لە جزیرە سەری هەڵدایەوە تاوەکو ئەو رۆژەی کوردستان هاتە ژێر باری دەوڵەتی عوسمانی.

٧-حکوومەتی ئەیووبی: کەسێك لەمیرانی ئەیووبی لە شاری حەسەن کێفی نزیك ماردین دایمەزراند (١٧٢/١٢). ئەمە ئەو حکوومەتە بوو دوای لەشکرکێشی عوسمانییەکان هەرەسی هێنا، بەڵام ئەو دەوڵەتە ئەیووبییەی سوڵتان یوسف صلاح الدین لە میسر ساڵی ٥٦٩ك/١١٧٣ز دایمەزراندو

سەربەخۆ بوو، ئەوا زۆرینەی لەشکرەکەی لەهۆزەکانی کورد بوون‌و لەو میرە کوردانە پێکهاتبوو کە لە هەموو شەڕە گەورەو غەزا فراوانەکانیدا بەشدارییان کرد (١٤٥/٨).

٨-حکوومەتی فەزلەوی: ئەم حکوومەتە لە کوردستان لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی دامەزراو تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی نۆیەم بەردەوام بوو (١٤٢/٣).

دەستپێکی ناکۆکی نێوان کوردو تورك لە ڕۆژگاری سوڵتان صلاح الدین ئەیووبی، ساڵی ٥٨١ك/١١٨٥ز لە سەروبەندی خیلافەتی (ناسرلدین الله) لە سەر زەماوەندی ژنێکی تورکمان روویدا. لە ئاکامی ئەمەدا شەڕێکی گەورەو خوێناوی لەنێوان کوردەکانی موسڵ‌و میرنشینە تورکەکان لە کوردستان‌و دەوروبەری (جزیرەی ئیبن عومەر) قەوماو دوو ساڵی خایاندو زەرەرو زیانێکی گەورەی بە هەر دوولا گەیاند، بەڵام دواجار پەیمانێکی ئاشتەوایی لە نێوانیان لەبەر هۆی ئایینی بەسترا (١٤٦/٨) بۆ وەستان لەدژی خاچپەرستان. بەڵام ئەم ئاشتەواییە زۆری نەبردو هەمیسان شەڕو ململانێ لە نێوانیان لە پێناو سەروەری‌و دەسەڵات دەستی پێکرد کە تاوەکو ئەم ڕۆژگارەمان بەشێوەی پچڕ پچڕ درێژەی هەیە.

کە عوسمانی کوڕی ئەرتوغرول لە ساڵی ٦٩٩ك/١٢٩٩ز بووە سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی‌و خەلیفەی موسڵمانەکان بە هۆی لاوازی خیلافەتی بەناو ئیسلامی ئەو سەردەمەی میسر، هۆزەکانی چاوداری مەغۆلەکان لەقوڵی میرنشینی گەرمیانەوە هەڕەشەیان لە مەملەکەتەکەی دەکرد، ئەو کات دابوویان بە سەر قەراجاحەساراو بازاڕەکەیان تاڵان کردبوو، عوسمانیش لەشکرێکی بە سەرکردایەتی ئۆرخانی کوڕی‌و هاوڕێ لەگەڵ هەندێ لە سەرکردە ناسراوەکانی ئامادە کرد بۆ بەرەنگاربوونەوە لە مەغۆلەکان‌و لە نزیك ئویناشلی حەسار پەندێکی باشی پێیان داو بەزاندییانی. ئەم سەرکەوتنە سوڵتان عوسمانی دنەدا، پشت بە ئۆرخانی کوڕی ببەستێ‌و متمانەی پێ بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لە بیزەنتییەکان‌و گرتنی قەڵا سەخت‌و قایمەکەی بورسە لە ساڵی کە شوێن‌و پێگەیەکی گرنگی هەبوو و دواجار عوسمانییەکان لە پاش یەنگی شەهری پایتەختە کۆنەکەیان لەساڵی ٧١٧ك-١٣١٧ز، ئەو شوێنەیان کردە پایتەختی خۆیان.

ئۆرخان لەپاش مردنی باوکی ساڵی ٦٢٦ك/١٣٢٦ز جڵەوی سەڵتەنەتی عوسمانی گرتە دەست‌و (علاء الدینی ) برای کردە وەزیر (سەرۆك وەزیران)ی دەوڵەتی عوسمانی. ئەم (علاء الدین)ە یەکەمین یاساکانی ئەو دەوڵەتەی دەرکرد، لەوانە: لێدانی سکە (پارەی ئاسن)و دامەزراندنی سوپایەکی هەمیشەیی‌و دەستنیشانکردنی جلوبەرگی فەرمی دەوڵەت لە ساڵی ٧٢٩ك/١٣٢٨ز، بەو شێوەیە سوپای ئینکیشاری (یەنی جەری/ لەشکری تازە) لەو

موسڵمانانەی خۆیان دابوو بە دەستەوە بەپێی ڕاهێنانو پەروەردەی تایبەتو بەگوێرەی ڕێبازی بەکتاشی پوختەو ئامادە کرا.

لەم سەروبەندەی کەوا دەوڵەتی عوسمانی حیساب‌و کیتابی خۆی لەگەڵ بیزەنتییەکانو ئەودوای سەلجووقییەکان لەرۆژئاوا، یەکلاکردەوە، وڵاتی کوردان لە ژێر ڕکێفی ئیدارەی میرە مەغۆڵەکان بوو، بەڵام شەڕوشۆڕو پشێوی لە دژی ئەوان لە ناوچەکانی هەولێرو موسڵ نزیکەی ١٣ساڵ درێژەی کێشاو لە ساڵی ٧٠٥ك (خودابەندە)ی پاشای مەغۆل هێرشی کردە سەر کوردەکانی ویلایەتی جیلان (گەیلان) بەڵام هێرشەکەی شکاو سەرداری سوپاکەشی (قەتڵغ شا) کوژرا هەرچەندە ناوچەی نێوان ئەردەبیل‌و موراغە بووبووە مولگەی لەشکری مەغۆڵو بە ئلرەزووی خۆیان تەراتێنەیان تیا دەکرد. لە پاش رووخانی دەوڵەتی مەغۆل لەشکری دەوڵەتی قەرەقۆینلوی تورکمانی هێرشیان هێنایە سەر ناوچەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانو شەڕو پێکدادانو خەباتی سیاسیو ئاینی دەستیپێکرد.

سوڵتان ئۆرخان دوو کوڕی هەبوو: سولەیمانو موراد، سولەیمان پاش ئەوەی نازناوی (پاشا)ی وەرگرت بووە وەزیری دەستە راستی باوکی دوای مردنی (علاء الدین)ی مامی لەو ماوەیەی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ روویکردبووە چاکسازی ناوخۆییو رێکخستنی کارگێڕی، لەوڕا سوڵتان ئۆرخان چەندین مزگەوتو تەکیەو خانەقاو قوتابخانەو بیمارخانەو رێگاوبانی بنیات نا و هتد. هەروا سوڵتان ئۆرخان یەکەمین سوڵتانی عوسمانی بوو قوتابخانەیەکی ئایینی باڵای لە(بۆرسە)ی پایتەخت دامەزراندو ناودارترین زانایانی موسڵمانی تیا دانا، وەك: مامۆستا تاجەدینی کوردی کە جێی زانای پایەبەرزی قەیسەریو مامۆستای یەکەمی ئەو قوتابخانەیە لە ئەیالەتی قارەمان گرتەوە (١٠/٧). ئەوەش یەکەمین پێوەندی بوو لە نێوان کورد وەك میللەتێك‌و لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی وەك دامەزراوەیەکی رەسمی.دووەمین پێوەندیش لەرێگەی رێبازە سۆفییەکانەوە بوو. ئەوە بوو سوڵتان عوسمان هانی پێکهێنانی ئەو رێبازانەیدا لەسەرووی هەمووشیانەوە رێبازی نەقشبەندیو سەعدی (کە دامەزرێنەرەکەی سعدالدین جەباری) بوو و هەردوو ئەو رێبازەش لەرێبازە سۆفییە کوردییەکان بوون. بێجگە لەوەش بایەخی دا بە دامەزراندنی رێبازی بەستامیو بەکتاشی -کەوا هەموو سەربازە ئینکیشارییەکان هاتنە ریزیانەوە بە شێوەیەك لەگەورەترین مریدی بەکتاشییەکان لەوان بوون- تەنانەت ژمارەی ئەو رێبازانە گەیشتبووە (٣٢) رێبازی سۆفی (١٤/٧).

دیسان سـولّتان ئۆرخـان هـەردوو ئـەرکی مـوفتی ولاّتـی عوسمـانیو دادوەری لەشـکری یەکخست بەشێوەیەك هەردووك بوونە یەك ئەرك، بێجگە لەجیاکردنەوەی ئـەرکی وەزیـر یـان سەدری ئەعزەم کە وەکو پایەی سەرۆکی وەزیرانو ئەرکی سەرکردەی هێزەکانی عوسمانی بوو و لەسەر گرێدانی ئەنجومەنی شۆرا رۆیشتن کە لەرۆژگاری سولّتان عوسمان دامەزرا هـەر کاتێـك قـەومانێکی گـرنگ روویـدابا، لەگـەڵ بەشـدارینەکردنی کـوڕانی سـولّتان لـەم ئەنجومەنـەو راسپاردنی سەرکردایەتی هێزەکـانی عوسمـانی بـە سـەرکردە گـەلی نـامۆ لـەبری کوڕەکـانی سولّتان(١٥/٧).

هەر لەو ماوەیەشدا دەولّەتی عوسمـانی مشـووری ئـەوەی دەخـوارد بـەرەو ئـەوروپا پـەل بهاوێت. دەبینی پـاش ئـەوەی سـولّتان ئۆرخـان لەسـالّی ١٣٤٨ز (کانتـاکوزین) کچـی ئـەو ئیمپراتۆرە بیزەنتییەی هێنا کە لەسالّی ١٣٤٨ز داوای کۆمـەکی لەسـولّتانی عوسمـانی کـرد لەدژی کێبڕکارە لاوەکەی (بالیولۆگ)ی حـاکمی بولگاریـاو سـولەیمان پاشـای کوڕیشـی ئـەو ئەرکەی بەجێ گەیاندو لەتەنگـەی گـالیبۆلی پەڕییـەوەو (بـالیۆلۆگ)ی ئابلووقـەداو پاشـان بەسەریدا سەرکەوتو بە دەسـکەوتێکی زۆرەوە گەڕایـەوە. دواجـا، سـولەیمان پاشـا دووبـارە لەسـالّی ٧٥٨ك/١٣٥٧ز لـە گـالیبۆلی پەڕییـەوە بـۆ دەستبەسـەراگرتنی رۆدوسـتو (تکیرادگ)پایتەختی (بیزۆس)ی پادشای (تراقیا)و شارەکانی حیرابولو و جورلـو و شـارەکانی تری ناوچەی تراقیا (١٣/٧).

ئەوە رێکەوتێکی سەیر بوو سولّتان ئۆرخـانو سـلێمان پاشـای بـرای وەزیـرو سـەرکردەی هێزەکانی لەهەمان سالّدا هەردووکیان بە جیاوازییەکی کەم ئەوپەڕی چەند مانگێك بوو، بمرن، ئەوە بوو سلێمان پاشا لەسونگەی گلانـی ئەسـپەکەی لـەوەرزی راودا ٦٧٠ك/١٣٥٩ز کۆچـی دوایی کرد، لەکاتێکدا سولّتان ئۆرخان بە نەخۆشی (داء النقرس[٤]) لە٦٧١ك/١٣٥٩ز کۆچـی دوایی کردو مرادی کوڕی بە ناوی سولّتان مرادی یەکەم لەجێگـەی لەسـەر تـەختی دەولّـەتی عوسمانی دانیشت کە کەسێکی نەخوێندەوار بوو و لەسەردەمی ئەودا مۆری سولّتانی (توغرا) داهێنرا. سولّتان موراد چاوی بڕیبووە ئەوروپا، ئەدرنەو قەلاّی بۆنتوشو پاشان دەشتی زاگـرا

---

٤- داو النقرس: دەردی شاکان (داو الملوك) یشیشی پێ دەگوترێ. ماسولکەکان رەق دەبن و وەك خڕۆکەی (خوێ) وەك کریستالّ لە ناویانداپێکدێ و کار دەکەنە سەر گورچیلەکان و دەبنە هۆی مردن....ئەمەش لە دەرەنجامی زێدە رۆیکردن لە خواردنی گۆشتی سوور.(وەرگێڕ)

که به بەرهەمهێنانی برنج بەناوبانگە، گرت، تا گەیشتە فلیپەو مریچو دەروازەکانی بەلگراد لەساڵی ٧٦٦ك/١٣٦٤ز. لەولاشەوە (لالاشاهین)ی سەرکردەی، درێژەی بە لەشکرکێشییەکانی دا بەرەو وڵاتی سربو مەجەرستان دوای ئەوەی بەسەر پادشای مەجەرستان (لوی) زاڵ بوو. کۆماری بچووکی (راکۆزا)ش بەسەر دەریای ئەدریاتیکی لەساڵی ٧٦٧ك-١٣٦٥ز داوای پاراستنی (حمایە) لەعوسمانییەکان کرد، بەم جۆرەش نیمچە دورگەی بولقان تاوەکو دەریای رەش کەوتنە ژێر حیمایەی عوسمانی. لەدوای ئەو شەڕانەی کە نزیکەی (٥) ساڵ درێژەی کێشا، سولتان مورادی یەکەم پشووی بەخۆدا، هێنای دادوەری سوپاکەی (قارا خەلیل جاندارلی)ی بە وەزیر دامەزراند- ئەم پۆستە (١٠) ساڵ بوو هەروا بە بەتاڵی مابۆوە- (لالاشاهین)یش ئەیالەتی فلیپەی دابڕی (١٩/٧).

عوسمانییەکان تا ئەم سەروبەندە هەموو بایەخێکیان دابووە قۆڵی خۆرئاوای وڵاتەکەیان، ئەوەبوو کەوشەنی خۆیان تاوەکو ئەوروپا- بەسەر گالیبۆلی- لەسەر حیسابی بیزەنتییەکان درێژو فراوان کرد. بەڵام لەوێ را بەلای باکوورو باشوورو رۆژهەڵاتی دەوڵەتەکەیانەوە چەندین میرنشین هەبوون، وەك میرنشینەکانی: ئایدینو مینتشەو قەستەمونیو ویتکەو حەمیدیو گەرمیانو قارەمان. بۆیە هەوەڵین شت سولتان بیری لێ کردەوە کە خزمایەتیەك پێکەوە بنێت لەگەڵ سەرداری میرنشینی گەرمیان کە بەلای رۆژهەڵاتی قۆنیاو باکووری شاری ئەدەنەوەیەو مەڵبەندیشی قەیسەری بوو بە داخوازیکردنی کچی سەرداری (حاکمی) میرنشینی گەرمیان- کە گەورەترینو فراوانترین میرنشینەکانە- بۆ بایەزیدی کوڕی. کاتێك سولتان بەم ئاواتەی گەیشت حاکمی میرنشینەکە شارەکانی: ئاگری کوزو گاوشانلیو سیماو کۆتاهیە- وەك دەستەگوڵی بووکێنی لەسەر نەرێتی هۆزەکانی ئەو سەردەمە بە بۆنەی ئەو ژنهێنانەیەوە- دابڕیو پێشکەشی میر بایەزیدی کردن. بەڵام سولتان موراد هەر بەمەوە دڵی ئاوی نەخواردەوە، بەڵکو حاکمی میرنشینیی حەمیدییەی کوردیشی ناچار کرد دەوڵەتو سامانەکەی پێ بفرۆشێ. حاکمی بەستەزمانیش لەسەر ئەم مامەڵە دۆڕاوە رازی بوو، ئا، بەو شێوەیە سولتان موراد دەستی گرت بەسەر هەموو ئەو سەرزەمینانەی کەوتبوونە نێوان هەردوو میرنشینی (گەرمیانو قارەمان)ی نزیك ئەدەنە (٢٠/٧)، جا ئەگەر دانپێدانانی میرەکانی ئایدینو مینتشەو قەستەمونی بەدەوڵەتی عوسمانیشی بخەینەسەر لەرێگەی پێشکەشکردنی سەوقاتو دیاریی ژنهێنان بە کوڕی سولتان، ئەوا سنووری دەوڵەتی عوسمانی بەم شێوەیە درێژ ببۆوە، لای باکوور لەدەریای رەشەوە بەرەو دەریای سپی ناوەڕاست لای باشوورو لەسنووری

رۆمانیاو و مەجەرستان لای رۆژئاوا تاوەکو سنووری دەوڵەتی قــەرەقۆینلو کــە مەڵبەندەکــەی دیاربەکر بوو، هەروا میرنشــینی مــرعش کــە زنجــیرە حــاکمی ژولقەدەریــە حــوکمی دەکــردو میرنشینی ئەدەنە کە لەژێر حوکمڕانی کوڕانی رەمەزان بوو لەرۆژهەڵات، ئەو میرنشینانەی کە لەپاش نزیکەی سەد ساڵێك لەم مێژووەوە، خرانەپاڵ دەوڵەتی عوسمانی.

شــاری قوســتەنتینیە (ئەســتەموڵ)ی ژێــر دەســەڵاتی حــوکمڕانی (یــانی بــالیۆلوغی)ی ئیمپراتۆری بیزەنتی لەگەرمەی ئــەو هــەموو شــەڕو شــۆڕو لەشکرکێشــییەی عوسمانییــەکان لەنیمچە دورگەی بولقان، وەك دورگەیەکی دابڕاو مایەوە لەسای ئاگربەستی ژێراوژێــری نێــوان ئیمپراتۆرو سوڵتانی عوسمانی هەرچەندە هێزەکــانی دەســتیان گــرت بەســەر تــەواوی ئەدرنــە لەساڵی ٧٨٤ك/١٣٨٢ز و ئەگەرچی ئیمپراتۆری بیــزەنتی داوای یارمــەتی لــە پاپــا ئــوربینی پێنجەم کرد لەدژی سوڵتانی عوسمانی موورادی یەکەم، بــەڵام لــەرۆماوە بــە هەناســە ســاردی گەڕایەوەو بڕیاری دا خــۆی لەســوڵتانی عوســمانی نزیــك بخاتــەوە، بــۆ ئــەم مەبەســتە کــوڕە ناوەنجییەکەی تیۆدۆری نارد بچێتە ریزی لەشکری عوسمانییەوە، ئەمە شوێنەوارێکی باشی لای سوڵتان موورادی یەکەم بەجێ هێشت (٢١/٧).

هەندێ لەو رووداوانەی لەهەردوو مەملەکەتەکــە روویانــدا بوونــە فاکتــەری بــەهێزکردنی پێوەندی دۆستایەتی نێوانیان، وەلێ لەم سەروبەندەدا کارەساتێك بەســەر دەوڵــەتی عوسمانیــدا هات، ئەوەبوو ســەدری ئــەعزەم (خیرالــدین پاشــا قــارا خــەلیل جانــدارلی)ی وەزیــری دانــاو سەرکردەی مەزن لەساڵی ٧٨٨ك/١٣٨٦ز کۆچی دوایــی کــرد، بــۆ رێزلێنــانی ئــەم خانــەوادە بەخشندەیە سوڵتان موراد، عەلی پاشای کوڕی لەجێگای باوکی بەسەدری ئەعزەم دانا.

هەریەك لەپادشای میرنشــینی قارەمــان لــە رۆژهــەڵاتو پادشــاکانی ســربیاو بۆســنەو هرســكو مەجەرو ئەلبانیا کە ریزەکانیان یەکخستبوو، هەوڵیاندا ئەم کەشو هەوا نوێیــەی دەوڵــەتی عوســمانی بقۆزنەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا سوڵتان موورادی یەکەم لەشکرێکی گەورەی ئامادە کرد هەوەڵین جــار بــۆ شەڕی پادشای قارەمانو بە ئاسانی خستییە ژێر رکێفی خۆیەوە، لەپاشان روویکردە شەڕی ئــەو پادشــا ئەوروپییانەی کە بە ژمارەو چەكو تفاق لەو زۆرتر بوون، بەڵام وێــڕای ئــەوەش تــوانیی بەســەریاندا زاڵ بێت، وەلێ یەکێك لەمیرە سربییەکان بەنێوی میلوش کوبیلــوڤیچ روویکــردە لای ســوڵتانو وای نوانــد هاتووە ئامادەی خزمــەتو ملکەچــی فەرمانــەکانی بێــت، لــەناکاو بــە نەشــتەرێکەوە پەلاماریــداو دەستبەجێ لەساڵی ٧٩١ك/١٣٨٩ز کوشتی (٢٦/٧)، لەدوای خۆیشی بایەزیــدی کــوڕی هاتــە ســەر تەختی سەڵتەنەتو نازناوی ییلدیرم بایەزیدی لەخۆ نا.

رەنگ بێ -لێرەدا- سوودی هەبێت باسی ئەوە بکەین کە دوو کەسایەتیی گرنگ لەهەمان ماوەدا کۆچی دواییان کرد: یەکەمیان شێخ بهاء الدین یەکێك لەگەورەترین زانایانی نەقشبەندیو دووهەمینیشیان شاعیری مەزنی فارس حافزی شیرازی بوو کە کاریگەری زۆری هەبوو بە سەر شاعیرانی دەوڵەتی عوسمانی، زمانو ئەدەبیاتی فارسی جێگەی زمانی عەرەبی لە وڵاتی ئەنادۆڵ لە سەدەی سیزدەهەمی زایینییەوە گرتبووەوە، لە کاتێکدا زمانی توركی وا پاشەکشەی کردبوو ببێتە زمانی عەوامی تاکەکانی گەل (٧/٦).

یەکەم کردەوەی سوڵتان ییلدیرم بایەزید پاش ئەوەی هاتە سەر تەخت ئەوە بوو، دەستی چووە خوێنی تاقە براکەی- پاش ئەوەی لەو هەراو پشێوییانەی رۆژگاری باوکی موورادی یەکەم روویاندا برای هەوەڵی ساوجی تیاچوو-کوشتنی ئەو تاقە برایەی یەکەم بۆ زامنبوونی دەسەڵاتیو دووهەمیش نەبا لە دوا رۆژ ناکۆکی رووبدات. ئەو کردەوەیە- واتە کوشتنی برا لە لایەن سوڵتانی نوێوە- دواجا بووە یاساو بگرە نۆرمێکی سەرەکی لە سەڵتەنەتی عوسمانییەکاندا. لەبەر ئەمەش نازناوی ییلدیرم- بروسکە-ی لەخۆ نا چونکە بروسك ئاسا براکەی لەناودا (٢٧/٧).

سوڵتان بایەزید، پاش سەرکەوتنی لە کۆسۆڤاو سوێند خواردنی ئیتیانی کوڕی لازار پادشای سربیا بۆ پشتیوانی کردنی سوڵتان درێژەی بەشەڕدا لەدژی سربەکان، ناکۆکی نێوان ئیمپراتۆری قوستەنتینییەو کوڕەکەی قۆزتەوەو هاوکاری (ئەندرینیکوس)ی بەدە هەزار جەنگاوەر کرد بەرەو ئەستەمووڵ بڕۆنو ناچاری ئیمپراتۆر بکات تەختی پادشایەتی بۆ نەوەکەی بەجێ بێڵێت، لەپاشان هەردووکیانی-واتە ئیمپراتۆرو کوڕەکەی- لەقەڵای (ئینیماس) لەسەر دەریا نیشتەجێ کردو ئیمپراتۆری نوێ پەیمانیدا ساڵانە باجو خەراج لەگەڵ (١٠)هەزار سوار بداتە سوڵتانی عوسمانی، ئەمە لەساڵی ١٣٩٠ز لەسەری رێککەوتن (٢٧/٧). بەڵام ئەندرینیکۆس دەستی گرت بەسەر چەند پێگەیەکی سەر بە ئیمپراتۆری قوستەنتینیە، کەچی خەڵکەکەی (دانیشتوانی قوستەنتینیە) حەزیان دەکرد (مانۆیل) حاکمیان بێت، لەبەر ئەمە سوڵتان یەکێك لەئەفسەرەکانی خۆی ناردە ئەو شارە بۆ وەرگرتنی رای خەڵکی دەربارەی ئەو ئیمپراتۆرە نوێیەی ئارەزوویانە حوکمڕانییان بکات، لەئاکامدا دەرکەوت زۆرینەی خەڵکی لەگەڵ (مانۆیل)دان، سوڵتانیش ئەوی دانا -بە هاوبەشی کوڕەکەی- بە ئیمپراتۆری قوستەنتینییە بۆ ماوەی (٥٠)ساڵو لەژێر حیمایەی عوسمانییەکان.

دوای ئەوە بایەزید چاوی بڕییە لای ئەو (١٠) میرنشینانەی وان بەلای باکوورو باشووری رۆژهەڵاتی مەملەکەتی عوسمانییەوەو لەشکری ئاژۆتو دەستیگرت بەسەر (٧) میرنشینداو

میرنشینی (حەمیدییە)ی کوردیشی خستە سەر ملکی تایبەتی خۆیو لە پاشان میرنشینی (قارەمان)ی لە باشووری رۆژهەلات، داگیرکرد. بەم شێوەیە هەموو ئەنادۆڵ، کوردستان نەبێت، سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو. بەلام قایمکارییە تازەکانی ئیمپراتۆری پیری بیزەنتی (یانی) لە قوستەنتینیە، بیانوویەکی حاشاهەلنەگری بۆ سولتان رەخساند کە بچێت گەمارۆی ئەو شارە بدات، ئەمەش گەمارۆی یەکەم بوو و حەوت سالی خایاند، لەم سەروبەندانەشدا هێزەکانی عوسمانی بولگاریاو مەجەرستانو چەند بەشێکی یۆگوسلافیایان لە٧٩٤ك/١٣٩١ز داگیرکرد (٢٩/٧)، وەلێ یاخیبوونی حاکمی میرنشینی (قارەمان)ی سەر بە سەلتەنەتەکەی وایکرد بابداتەوە بۆ ناوچەی ئەنادۆڵو حیسابی خۆی لەگەڵ ئەو میرنشینانە یەکلابکاتەوە، توانیی حاکمی میرنشینی قارەمان ببەزێنێو میرنشینەکەی خستە پاڵ مەملەکەتی عوسمانیو پاشان رووی لەشکری کردە رۆژهەلات بەرەو میرنشینی سیواس. دادوەر (برهان الدین) بێجگەلە هەردوو شاری (قەیسەری)و (خەربووت) حوکمداری دەکرد لەدەرەنجامی ئەو پەلامارە (برهان الدین) بەرەو چیاکانی خەربووت هەلات، بەلام (قاراعوسمان) (قارایولوك) توانی دەستگیری بکاتو بیکوژێت. سولتان ییلدیرم ئەم بۆنەیەی بەهەل زانی (قاراعوسمان) بکات بەدۆستو هاوپەیمانی خۆیو بڕیاری دا حوکمڕانی میرنشینەکەی (برهان الدین)ی پێ بسپێرێ، بەلام خەلکی ئەوەیان رەتکردەوەو گوتیان باشتر وایە شارەکانی (تۆقاتو سیواسو قەیسەری)بکرێن بەیەك میرنشینیو راستەوخۆ بلکێنرێن بە دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ ئەوە لەژێر پارێزکارییدا بێت، سولتان لەسەر ئەم داواکارییە (سالی ٧٩٥ك/١٣٩٥ز) رازی بوو، دوای ئەوە ملی نا بەرەو میرنشینی (قەستەموونی) لەباکوورو بەسەر دەریای رەشەوە، ئەمیشی سەرڕای هەردوو میرنشینی ئایدینو منتشە خستە سەر سەلتەنەتەوە، بەم کارەش کەوشەنی دەوڵەتی عوسمانی لە شاری (سینوب)ەوە بەسەر دەریای رەشەوە هەتا شاری ئەستەمووڵ درێژ بووەوە (٣٠/٧).

ئەم سەرکەوتنە مەزنانە دنەی سولتان بایەزیدیان دا جۆرێك لە کەیفسازی و خاوبوونەوە دایبگرێ. ئیدی کۆڕی بەزمو سەماو گۆرانی دەبەستو بۆ هەوەڵین جار لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا بادەو شەرابی هێنایە ئەو کۆڕانەوە، لەولاشەوە عەلی پاشای وەزیری سەرقالی رابواردنو کاروباری خودی خۆی بوو لە بری ئەوەی مشووری سەلتەنەت بخوات، ئەم کەشو هەوا خۆشیو رابواردنەی سولتانو سەدری ئەعزەمی وایکرد جۆرێك لە گەندەلی کۆمەلایەتی بلاوبێتەوە تەنانەت حوکمرانو دادوەرانیش خاوەو بەرتیلیان وەردەگرتو مەحسووبیەتو خزم خزمۆکیو ناسیاوی لەسەلتەنەتدا تەشەنەی کرد.. تاوەکو ئەو رۆژەی هاتەوە سەرخۆیو بیری

لەکاروباری دەوڵەت کردەوە، بەجۆرێك فەرمانیدا (٤٠) دادوەر فڕێ دەنـە نێـو ئـاگر تـاوەکو دەمرن پاش ئەوەی لە قەڵایەکی قایم توندی کردن. بەڵام زمانلووسیو لێزانینی سەدری ئەعزەم لەدواین چرکە ساتەکاندا لەم چارەنووسە رزگاری کردنو پاشان هەریەك مووچەی دەرماڵەیەکی وایان بۆ بڕایەوە هەر هێندە بتوانن بژیو مەمر پێی بژین.

سوڵتان بایەزید چەندین مزگەوتیشی لەهەموو ناوچـەکانی دەوڵـەت رۆنـا، گـەورەترینیان مزگەوتی بۆرسەیە کە لەسەر شێوازی ئەندەلوسـی بنیـات نـراوە، دیسـا گرنگیـی بـە زانـاو سۆفییەکاندا بە شێوەیەك هێنای خوشکەکەی خۆی دا بە شێخی بوخارا (میری بوخـارا) کـەوا شێخ سەید عەلی هەمەدانی هات بۆ سەردانی، (بەرقووق)ی سـوڵتانی میسـریش ناونیشـانی سوڵتانی رۆمی بەسەرا دابڕیو ئیمتیازی هەڵگرتنی شمشێری سـوڵتانی عوسمانیشـی وەرگـرت هەر وەختێك نیازی بوایە لەشکری سەربازی بکات. ئەم نەریتەش وابوو پێیان دەگوت تەقلیدی شمشێر لەو دەمەی سوڵتانی عوسمانی نوێ دەهاتە سـەر تـەخت. سـوڵتان بایەزیـد، کوزەلچـە حەسار (ئەنادولۆ حەسار)یشی رۆنا بـۆ چـاودێریو فشـار خستنەسـەر شـاری قوسـتەنتینییە (٣١/٧). بەڵام ئیمپراتۆری قوستەنیتنییە ئەمەی بەدڵ نەبوو و بگرە بەهەڕەشەو مەترسییەکی دانا لەسەر خۆی. ئەو دەمەش عوسمانییەکان دەستیان کرد بە داگیرکردنی خاکی بولگارسـتان لەرێگـەی نیگبۆلیو شا سیسمانو کوڕەکەیان کوشت، پادشای مەجەرستان (سـیگمۆند) لـەو لەشکرکێشـیە نوێیەی لە تخووبی شانشینییەکەی قەوما هەستی بە نیگەرانی کـرد، بۆیـە لەگـەڵ شـای فەرەنسـا (شارلی شەشەم)و میرجا فۆیفودا (واژەیەکی سلاڤییە واتا حاکمی کارگێڕی وڵاتەکە یان یاریـدەدەرە سەربازییەکەی کە ئەمەش لەبەرامبەر واژەی سۆباشی عوسمانی یەك بگرێتەوە)، رێککەوت لەسـەر ئەوەی لەشکرێکی گەورەو گران بە سەرکردایەتی کۆنـت دی نیفـەر (جـانی ئـازا) ئامـادە بکـرێو سوارەیەکی زۆر لە ئەڵمانیاو باڤاریاو نەمساو ترانسلڤانیا لە جەنگێکی خاچپەرستانەی نـوێ تێـدا بەشدار بوونو روویکردە قەڵای نیگبۆڵدیو لەساڵی ١٣٩٦ ئابلووقەی دا.

لەشکری هاوپەیمان ئەمەندە زۆرو زەوەند بوو بە ڕادەیەك چەكو تفاقو کۆمەکی، بـە(٢٠) کەشـتی بەسـەر رووبـاری (تۆنـا) رەوانـە کـرا، کاتێـك ئـەو لەشـکرە مەزنـە لـە نزیکـی (نیگبۆلی)یـەوە لـەپاش گـەمارۆدانی، ئـۆردووی دامەزرانـد، سـەربازەکان دەسـتیان دایـە خواردنەوەی مەیو سەماو گۆرانی بەبێ ئەوە گوێ بدەنە هێـزی عوسمانییـەکان چـونکە- وەك پێیـان وابـوو- دڵنیـابوون کـە سـەرکەوتنیان مسـۆگەرە، راستییەکەشـی لەشـەڕی هەوەڵـدا هاوپەیمانەکان سەرکەوتن، بەڵام ئەوەیان فێڵێك بوو لە لایەن عوسمانییەکانـەوە، کاتێـك هێـزە

تایبەتەکەیان - بریتی بوو لەسەربازە چەلەنگو نەبەزەکان- بەشداری شەڕی یەکەم نەکرد، بەڵکو لەحاڵەتێکی ئامادە باشیدا لەپشتەوەی کێویکی نزیک مەیدانی شەڕەکە دانران، بەشێوەیەك لەشکری عوسمانی بە سەرۆکایەتی دۆغان بەگ وەختێ شکا، بەرەو کێوی ناوبراو هەڵات، لەشکری هاوپەیمانەکان کەوتنە راوەدونانیانو کاتێك بە کێوەکە گەیشتن، لەپرێکدا هێزە تایبەتەکانی عوسمانی لێیان راپەڕین کە زۆربەیان سوارەی ئینکشاری بوون بەسەرکردایەتی سوڵتان بایەزید کە زۆر بە توندی بەرپەرچیان دانەوەو تاوەکو نێو ئوردوگاکەی خۆیان -ئۆردوگای هاوپەیمانەکان- وەها راویان نان واقیان وڕماو شڵەژان، عوسمانییەکان ئەم بارەیان قۆزتەوەو دوای شەڕێکی خوێناوی سەخت توانییان زاڵ بن بەسەریاندا، زیانی عوسمانییەکان لەم شەڕەدا شەست هەزار شەڕکەر بوو، بەڵام زیانی هاوپەیمانەکان نزیکەی دوو هێندەی ئەم ژمارەیە بوو، بێجگە لە بەدیل گرتنی دە هەزار جەنگاوەر کە لەنێویاندا سەرکردەی لەشکرکە {((جان))ی ئازا} و پادشاو میرەکانی ئەوروپاو پاشماوەی سوارەکانی فەرەنسا بوون، ئەوە بوو ژمارەی ئەم سەرکردە گەورانە گەیشتە (٨٠) کەس، لەپاشان لەبەرامبەر دوو سەد هەزار دۆقە ئازاد کران (٣٥/٧).

سوڵتان بایەزید-لەسەر عورفو نەریتی ئەو سەردەمە- بە راگەیاندراوێك، حوکمڕانو پادشاکانی ئاسیای لەمەڕ سەرکەوتنەکانی ئاگادار کرد. ئەرکی ئەم راگەیاندنەی سپاردە باڵیۆزەکانی، بەرەو لای هەریەك لەسوڵتانی میسرو حاکمانی عێراقی عەجەمو عەرەبیو سوڵتانەکانی تەتارو ئەرمینیا بێجگە لەوەش بەشێك لەدەستکەوتە ماددیو مرۆییەکانی- دیلەکان- بۆ ناردن. لەپاشان ئاوڕی دایەوە لای شاری ئەستەموولْ کە هێشتا-(٥) ساڵ بوو- لەژێر ئابلۆوقەی عوسمانییەکاندا بوو، بە ئیمپراتۆر (مانوێل)ی راگەیاند کە پێویستە مزگەوتێك لەئەستەموولْ بنیات بنێو قازییەکیش بۆ موسڵمانەکان تێدا دابنێ. بەڵام مانوێل لەو کارەدا سستی نواند، لەبەر ئەمە سوڵتان ئیمپراتۆری گۆڕیو یانی بالیۆلۆغی گەورە کە بە ناوی ئەوەوە ناونرا بوو ببێتە ئیمپراتۆری قوستەنتینیە-داناو (یانی) لەسەر داوای سوڵتانی عوسمانی رازی بوو، بەمەش ئەم مزگەوتە بووە چوارەمین مەڵبەند بۆ خواپەرستی موسڵمانەکان لەئەستەموولْ، ئەمە دوای ئەوەی هەریەك لەسولەیمانی خەلیفەی عوسمانیو ئەرتوغرولی سەلجوقیو صلاح الدینی ئەیووبی ئیمپراتۆری قوستەنتینییەیان ناچار کرد سێ کلێسا لەو رۆژگارەدا بکات بە مزگەوت. بەڵام کاتێك سوڵتان بایەزید نامەیەکی پڕ گەفو هەڕەشەی لەتەیمورلەنگ - کە ناوبانگی جیهانی داگرتبوو- پێ گەیشت، وەڵامێکی توندو ریسوا ئامێزی

دایەوە، هەر بەمەشەوە نەوەستا، بگرە بەرەو ئەرزنجان - کە تەیمورلەنگ پێشکەشی تاهیرینی پادشای ئەرمینیای کردبوو- وەڕێ کەوتو ساڵی ٨٠٣ك/١٤٠٠ز داگیری کرد، دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ (بۆرسە)ی پایتەختی، بۆ ئەوە ئەمجارەیان بەرەو قوستەنتینیە بروات تاوەکو بۆ دووهەمین جار گەمارۆی بدات بە ئامانجی دەست بەسەراگرتنی، وەلێ لەبەر ئەوەی تەیمورلەنگ ئەرزنجانی وەرگرتەوەو کوشتارێکی زۆریشی لەسیواس- کە یەکێك بوو لەسامانەکانی دەوڵەتی عوسمانی- نایەوە، لەو لاشەوە تەتارەکان روویانکردبووە رۆژئاوا، لەبەر ئەم هۆیانە سوڵتان بایەزید ناچاربوو هەمیسان بگەڕێتەوە بەرەو پایتەختەکەی (٣٧/٧).

ئەو دەمەی (تەیمورلەنگ) بۆ یەکەمین جار شاری بەغدای لە (٢٠ی شەواڵی ٧٩٥ك/١٣٨٣ز) گرت، تیا جێگیر نەبوو، بەڵکو لەشکری بەرەو (تکریت) رانیو بۆ ماوەی (٤٠) رۆژ ئابلووقەی دا، تا خۆی دا بەدەستەوە، تەیموور تکریتی کاولو وێران کردو لەوێشەوە بەرەو دیاربەکرو روها (٢٢١/١١)و ئەو دوای ولاتانی کوردستان وەڕێ کەوت، تا گەیشتە قەڵای وانو لەوێ میری هەکاری گەمارۆدا، پاشای قەڵاکەی گرت، هەروا ئابلۆوقەی سەختی خستە سەر هەموو ئەو قەڵاو دژانەی لەرێگەی بوونو دەستی بەسەر هەموویاندا گرت. دوای ئەم کارەی بەرەو (موسڵ) ملی ناو توانی لەرۆژی هەینی رێکەوتی ١١ی مانگی سەفەری ساڵی ٧٩٦ك/١٣٨٤ز بە رێگایەوە بەرەو کوردستان داگیری بکات. لێرەش میرەکانی کوردو حاکمانی ئەو دەمە کە بریتی بوون لەهەریەك لە: میر عەلی سەرداری ئەربیلو میر عزالدینی کوردی حاکمی جزیرو میر سولەیمانی ئەیووبی حاکمی حەسەن کێفو میر تاهیرەدین حاکمی ماردین، هەر هێندەیان پێ کرا لەگەڵ حاکمی موسڵو غرزان بچنە ئۆردوگای تەیمورلەنگو ئامادەیی خزمەتو ملکەچیی خۆیان لەبەرامبەر دەربڕن، بەم تەرحەش ولاتەکەیان لەوەیشومەی کاولکاریو تالانی تەیمورلەنگ پاراست (١٦٠/٨)، لەولاشەوە میر حاج شەرەفی بەتلیسی سەردانی ئوردوگای تەیمووری لەرۆژی ١٥ی رەجەبی هەمان ساڵ کردو هەموو کلیلی قەڵاکانی بەتلیسو ئەخلاتو موشو ئەودوای قەڵاو تاوەرەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بێجگەلە دیاریو سەوقاتو شتومەکی کەونارای دانسقە هەمووی پێشکەش بە تەیمورلەنگ کرد، تەیمووریش لەبەرامبەر ئەم کارەی میر شەرف جلوبەرگی جوانو پشتێنی زێڕو شمشێری کالانزێری پێشکەش کرد، (میر) بەمە سەری خۆی لەنێو هاوەڵانی بەرزکردەوە نەخوازە تەیمور ویلایەتی بەتلیسی بە میر حاج شەرەف سپارد دوای ئەوەی باسینو ئونیكو ملازکوردیشی خستە سەر (٤٠١/١٢)، بەو شێوەیە میر حاج شەرەف بتلیسی توانی میرنشینی بەتلیسو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی لەوێرانکاریو فەوتانو تالانو سەرشۆڕی رزگار بکات.

تەیمورلەنگ پاش ئەوەی کوردستانی هێنا بە ژێر رکێفی خۆیەوە، میرانشای کوڕی تێدا بە سەردار داناو لەگەڵ سوپاکەی لەوێ هێشتییەوە، پاشان بایدایەوە بەرەو بەغدا بۆئەوەی هەمیسان داگیری بکات دوای ئەوەی زانیی ئەحمەد جەلاییری حاکمی پێشووی کە لەکاتی داگیرکردنی یەکەم هەڵاتبوو، دووبارە گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا. بەڵام جەلاییری کە تا ساڵی ٨٠١ك حوکمی بەغدای دەکرد بۆ والی فەرەج بەجێی هێشتو هانای بردە بەر ییلدیرم بایەزیدی سوڵتانی عوسمانیو داوای لێکرد یارمەتی بداتو پشتی خۆیو قارایوسف- کە ئەویش بەرەو لای هانای بردبوو-بگرێ دژی تەیمورلەنگی داگیرکەری وڵاتی هەردووکیان (٤٣/٧).

تەیمورلەنگ کاتی خۆی هەواڵی سوکایەتی پێکردنی سوڵتان بایەزیدی وەرگرتبوو بە رێگەی ئەو پەیکەی نامە پڕ هەرەشەو گوڕەشەکەی بۆ سوڵتانی عوسمانی نارد لەحاکمانی میرنشینەکانی گەرمیانو منتشەو ئایدین کە پەنایان بۆ تەیمورلەنگ بردبوو دوای ئەوەی بایەزید دەستی گرت بەسەر میرنشینەکانیاندا، بۆیە زۆر دەهریو تووڕە بووە، کاتێکیش بە نامەیەك وەڵامەکەی بایەزیدی وەرگرت کە پڕ بوو لەسوکایەتی پێکردنو هەڕەشە، بێجگەلەوەش کە زانی سولتانی عوسمانی دەستی گرتووە بەسەر ئەرزنجان کە پێشتر پێشکەشی تاهرینی پادشای ئەرمینیای کردبوو، لەبەر هەموو ئەمانە تەیمورلەنگ شێتو هار بوو، بۆیە، لەیەکی مانگی موحەڕەمی ساڵی ٨٠٣ك/٢٢ی ئابی ساڵی ١٤٠٠ز لەشکرێکی گەورەی ئامادە کردو بەرەو سیواس ملی ناو وێرانی کرد کە ئەو کات ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی (١٠٠) هەزار کەس بوو (٤٣/٧)، دوای ئەمە روویکردە ئەرزنجانو ئابلووقەی دا، چونکە ئەرتوغرلی کوڕی سوڵتان بایەزیدی حاکمی ئەو شارە بەشێوەیەکی نەبەردانە بەرگری لێکرد، بەڵام دواجار شار خۆی دا بەدەستەوەو ئەرتوغروڵ کوژرا، بەمەش شەڕ بووە مەسەلەیەکی حەتمی لەنێوان هەردوو مەزنان، سوڵتانی مەغۆڵو سوڵتانی عوسمانییەکان ئەگەرچی هەردووکیان سەر بە رەگەزی تورك بوون.

وێڕای ئەوەی تەیمورلەنگ بەگەلێ نازناوەوە ناوی دەرکردبوو، وەك: گورگان (خاوەنشکۆی مەزن= عاهیلی ئەعزەم)و ساحیب قڕانو جیهانگیر (حاکمی جیهان- یان جیهانگیر)، بەڵام لەمۆرەکەی تەنها دوو واژەی بەکاردەبرد، ئەویش: راستی- رستی (راستی- سەلامەتی)بوو (٣٨/٧). جگەلەمەش فرە تاکتیکی سەربازی لەشەڕەکانیدا بەکاربردووە، بۆنموونە زنجیر بۆ بەستنەوەی سەربازەکانیو گواستنەوەیان بەپەت بەسەر کێوەکان بۆ پشتەوەی هێڵەکانی دوژمن

تا لەپڕێکدا بەسەریاندا بدەن، هەروا ئاگریان لەدەمی ئەشکەوتەکان دەکردەوەو گڕیان تێبەردەدا بۆئەوەی هەرچییەکی تێدایە بە ئازووقەو بنیادەمەوە هەموو بسووتێن، بێجگەلەوەش پەنای دەبردە بەر جەنگی دەروونی لەدژی دوژمنەکانیو سیخوڕی دەنارده ناویان بۆ زانینی هەواڵو ئامادەباشیان، سەرڕای بایەخدانی بە پەیكو بالیۆزانو ئازار نەدانیان ئەگەرچی دڵڕەقو دڕندە بووە، سەربازەکانیشی جلی یەکگرتوویان لەبەر دەکردو تیپێکی زرێپۆشیشیان بوو، واتە سوپەریان دەرکردە سەرو جەستەیان، ئەم تایبەتمەندیو جیاوازییە سەربازییانە لەو رۆژگارەدا لەرۆژهەڵات باو نەبوو (٤٦/٧). تەیمورلەنگ هەندێ لەم شێوازە سەربازییانەی لەدژی خەنێمە عوسمانییەکەی بەکار هێنا، ئەوە بوو کۆمەڵێك سیخوڕی ڕەوانە کرد پێوەندی بکەن بە سەربازە تەتارەکانەوە لەسوپاکەی بایەزیدی عوسمانیو خەڵەتاندنی بۆئەوەی بێنە ریزی سوپاکەی تەیمورلەنگ لەکاتی شەڕەو پێیەی پێیەی سوڵتانی تەتارەو لەهەمان نژادە، نەخوازە دوای ئەوە کە بەرێگەی سیخووڕەکانییەوە زانیی ئەو سەربازانە (٦) مانگە مووچەیان وەرنەگرتووە (٤٧/٧)، چونکە سوڵتان بایەزید بەوە ناسرابوو زۆر قرچۆكو ڕەزیلەو هەرچەندە عەلی پاشای وەزیری تکای لێکردو پێی گوت کارێکی پێویستو زەروورە دەرگاکانی گەنجینە بۆ سەربازەکان والا بکاتو هەوڵ بدا تەیمورلەنگ بەرەو چیاکان وەکێش بکات بۆئەوەی شەڕی پارتیزانی لەدژی دەست پێبکەن چونکە لەشکرەکەی لەهەژمار نایاو ئەستەمە لەناوچە تەختانییەکاندا بەسەریا زاڵ بین. وەلێ سوڵتانی عوسمانی گوێی خۆی لەهەمبەر ئەم تکایانەی وەزیر کەڕ کردو بەرەو شەڕی سەربازانی تەتار رۆیشت لای دەروازەکانی ئەنکەرە کە لەلایەن (تەیمورلەنگ)ەوە ئابلۆوقە درابوو، تەیمورلەنگ کە ئەمەی بیستەوەو زانی بایەزید تەنها سێ هەنگاو لێوەی دوورە، بەپەلە ئابلۆوقەی لەسەر ئەنکەرە هەڵگرتو روویکردە رووباری (جوبوق)و لەوێ لەشکربەزی کردو بەم رەنگە ئاوی لە لەشکری عوسمانییەکان بڕی کە ژمارەیان نزیکەی بیست هەزار شەڕکەر لەمیرنشینانو رەگەزی جیاجیا بوون کەچی لەشکری تەتار هاورەگەزو بەژمارە (٧) هێندەی ئەوان بوو (٤٧/٧).

لەشکری عوسمانیی شەکەتو ماندوو بەهۆی بڕینی (٦) رۆژی رەبەق بەرێگاوە لەگەڵ لەشکری تەیمورلەنگی زۆرو زەبەند بەیەکا هاتنو پێکیان داداو کاتێك سەربازانی میرنشینانی ساروخانو منتشەو گەرمیانو ئایدین، میرەکانی خۆیانیان لەتەك تەیمورلەنگ بینی، ئەوانیش لەگەڵ تەتارەکانی نێو سوپای عوسمانی- کە سیخوڕەکانی تەیمورلەنگ رایانکێشابوون- دایانە پاڵ شەڕکەرانی تەیمورلەنگو پشێوییەکی زۆر کەوتە ریزەکانی

عوسمانییەکانەوە. کە وەزیر عەلی پاشا ئەم حاڵەی بینی، شازادە (میر) سلێمانی کوڕی سوڵتان بایەزیدی راکێشا، لەولاشەوە میری (ئاماسیە) هەردوو کوڕانی سوڵتانی دووەمو سێیەم شازادە محەمەدو عەباسی بردو هەڵاتن. بەڵام سوڵتان بایەزید بەخۆیو (١٠) هەزار لەئینکیشارییەکان-کە پاشماوەی سەربازەکانی بوون-هەتا ئێوارەی هەمان رۆژی ژی الحجەی ساڵی ٨٠٤ك/ ٢٠ی تەموزی ساڵی ١٤٠٢ز شەڕی کرد، دەرەنجام لەگەڵ نەوەکەی لەحالێکدا مرۆ بەزەیی پێ دەهاتەوە خۆیدا بەدەستی سوڵتان (مەحموودی چەغتایی)یەوە کە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی تەیمورلەنگ (٤٨/٧).

پاش ئەوەی تەیمورلەنگ لە ئوردوگاکەی لە ئەنقەرە ماوەیەك پشووی دا، بەرەو ئەزمیری ئاژۆتو داگیری کرد، ئەنجا لەنزیك (ئەفس) لەوپەڕی باشووری خۆراوای دەریای سپی ناوەراست لەشکربەزی کرد، لەوێ سوڵتانی بەندکراوی عوسمانیو میر موسای کوڕی وەگەڵ خۆی خستبوو، هەرچی سێ کوڕەکەی تری سوڵتانیش بوو، ئەوا (سولەیمان)ی کوڕە گەورەکەی لەگەڵ (عەلی پاشا)ی وەزیر گەیشتە ویلایەتی رۆمێلی (بولکان)و لەوێ ناوی خۆی بەسوڵتانی عوسمانی جاڕدا. محەمەدی کوڕیشی بەیاوەری بایەزید پاشا کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی باوکی، روویکردە تۆقات (بریزا)، پاشان قەڵای (ئەماسیا)ی گرتو (قوباد ئۆغلو)ی حاکیمی تەتاری بەزاندو ئەویش ناوی خۆی جاڕدا بەسوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی. ئەو دەمەی تەیمورلەنگ بە رێگای گەڕانەوەیدا لە ئەزمیرەوە بەرەو بەغداو ئەنجا سەمەرقەند دەڕۆیشت، سوڵتان بایەزید لە سەربازگاکەی تەیمورلەنگ لە شاری (ئاکشەهر) لە ١٤ی مانگی شەعبانی ساڵی ٨٠٥ك/١٤٠٣ز کۆچی دوایی کرد، لەبەر ئەمە تەیمورلەنگ موسای کوڕی کە ئەویش لەگەڵ باوکیدا دیل بوو-ئازادی کردو پۆشتەترین جلو بەرگی بەبەردا کردو شمشێری کاڵان زێڕی پێداو تەرمی باوکی بۆ خستە سەر وڵاخو لەگەڵ گرۆیەك لە پاسەوانەکان ناردییەوە بۆ بۆرسەی پایتەختی عوسمانی کە لەو دەمەدا لە ژێر فەرمانڕەوایی (عیسا)ی برای بوو کە نێوی خۆی بەسوڵتانی عوسمانی جاڕدابوو (٥٥/٧). ئەو بارە پەرت پەرتبوونو پێکەفرەییەی سەڵتەنەت لە جەستەی دەوڵەتی عوسمانی دا بۆ ماوەی (١٠) ساڵ درێژەی هەبوو هەتا ئەو دەمەی محەممەد دەستی رۆیی بەسەر براکانیا زاڵ بێتو هەمیسان توانی دەوڵەت یەکبخاتو بە ناوی محەممەدی یەکەم یان سوڵتان محەممەدی چەلەبی لە ساڵی ١٣٧٨ هاتە سەر تەخت تاوەکو ساڵی ١٤٢١ بەردەوام بوو و گرنگی دا بە لە شکرکێشی بەرەو ئەورووپا لە رۆژئاوا بەبێ ئەوە بایەخ بدات بە رۆژهەڵات.

دوای مردنــی تەیمورلــەنگ ســاڵی ٨٠٧ك/١٤٠٥ز، (شــاهروخ مــیرزا)ی کــوڕی رووی لەشکرکشی کردە ئەرمینیا، بۆیە میر شەمسەدین بدلیسی میری بدلیس لەگەڵ مەلیك محەمەد حاکمی هەکاریو مەلیك خەلیل حاکمی حەسەن کێفو میری خیزانو هەندێ میرانــی تــر کۆبووەوەو چوونە بارەگای شاهروخ دلسۆزیو ملکەچی خۆیان لــە بەرامبــەر نوانــد وەك چــۆن پێشتر میرە کوردەکانی ویلایەتی خوری ئێرانی ئەوەیان کردو بــەم شــێوەیە وڵاتــی خۆیــان لــە شەڕو وەیشوومەی قوتار کردو شوێنو پێگەکەی خۆیشیان پاراست (١٦٠/٨).

کە حکوومەتی ئاق قۆینلو (دەوڵەتی مەڕی چەرموو) حکوومەتی قــەرەقۆینلو (دەوڵــەتی مەڕی رەش)ی لەناوبرد، دیاربەکری کردە پایتەختی خــۆی. ئــوزون حەســەن (حەســەنە درێــژ) حاکمی ئاق قۆینلــو نــاکۆکیو نوشوســتی نێــوان کوردەکــانی قۆزتــەوە بــۆ ریشەکێشــکردنی میرنشینە نیشتمانیە کوردییەکان بەسوود وەرگرتن لە هەمان تایفەگــەری تــاوەکو تــوانی بــە تەواوی لە ساڵی ٨٧٥ك/١٤٧٠ز دەست بگرێ بە سەر کوردستاندا. بەڵام سەرکەوتنی (ئــوزون حەسەن) خانی ئاق قۆینلو بــە ســەر (ئــەبو ســەعید مــیرزا)ی نــەوەی تەیمورلــەنگ، وایکــرد پایتەختەکەی لە دیاربەکرەوە بگوازێتەوە بۆ تەورێز، هــەروا چــاوی لــەوەش بڕیبــوو زاڵ بێــت بەسەر سوڵتانی عوسمانی محەمەدی دووەم (محەمەدی فاتح ١٤٣٢-١٤٨١ز) لــە پــاش گــرتنی قوستەنتینیە لە٢٩ مایسی ١٤٥٣ز. ئەوەبوو ئیسحاق بەگی حاکمی میرنشینی قارەمــان کــە لە چنگی لەشکری عوسمانییەکان هەڵاتبوو، خستبوویە ژێرباڵی خۆی، نەك هەر ئەوەش بەڵکو لەشکرێکی گەورەشی ئامادە کردو سنووری رۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی پێ بەزاندو تۆقــاتی داگیرکرد. پاشان بەرەو دیاربەکر وەڕێ کەوتو ئەنجا بە سەر رۆخی رووباری فوراتەوە لەشکری دامەزراند، بەش بەحاڵی لەشکری عوسمانیش ئەوا بۆ ماوەی (٦) رۆژ چووە ناو قووڵایی خاکی ئاق قۆینلو هەتا گەیشتە نزیکی ئەرزنجان کە ئۆردوگای (ئوزون حەســەن)ی لێیــە ئــەویش لــە بەرواری ١ی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی ٨٧٧ك/٢٦ی تــەمووزی ســاڵی ١٤٧٣ز لەشــوێنێك پێی دەگوترا (ئوتلوق بــەلی) هــەردوو لەشــکر لەشــەڕێکی ســەختو گرانــدا بەیــەکا هــاتنو لەدواییدا (ئوزون حەســەن) شــکاو بــۆی دەرچــوو، بــەڵام عومــەر تورخــانی وەزیــریو قــازی لەشکرەکەی کە لە هەمان کات قازیی هەموو قازییەکانی (حەسەن کێف)یش بــوو- و هــەروا زانای عێراقی محمود شەریحیو چەندین کەس لــە ســەرکردەکانی لەشــکرەکەی هــەموو بــەدیل گیران. لە پاشان (محمدی فاتح) رۆیشت ئەرزنجانو قەراحەساری داگیرکردو دوای حەسانەوەیەکی کورت گەڕایەوە بۆ (ئەستەمووڵ) (١٦٣/٧).

کاتێك شا ئیسماعیلی سەفەوی سەری هەڵدا، پاش ئەوەی دەستی بە سەر ئێرانو ئازەربایجانـدا گرتو لە ساڵی ٩٠٧ك/١٥٠١ز تەورێزی کردە پایتەخت،سـەر لـەنوێ لـە سـاڵی ٩٠٩ك/١٥٠٣ز لەشکرێکی گەورەی کردە سەر ورمێ، دوای ساڵێك بە سەر ئەمەدا، خاکی کوردستانی نێوەراسـتی هەتاوەکو (بستان) بەزاندو لەوڕا چوو بەگـژ (عـلاءالدولـە)ی حـاکمی میرنشـینی (زولقەدەرییـە) (٢٢٦/٧)و شـا ئیسـماعیل داوای لێکـرد کچـەکەی پـێ بـدات بـەڵام (عـلاءالـدین) داواکـەی رەتکردەوە، بێجگە لەمەش پەنای دابووە (ئەلوەند بەگ) بەدوا سوڵتانی ئـاق قۆینلـو دوای ئـەوەی ئەمیان لەپێش ئیسماعیل سەفەوی بـەزی، لەپاشـان بایدایـەوە دیاربـەکرو خەربوتیشـی لەسـاڵی ٩١٣ك/١٥٠٧ز داگیرکرد، ئەگەرچیش میرەکانی کورد ملکەچبوونیان لەبەرامبەر پێشـاندا، بـەڵام شا ئیسماعیل سەفەوی هەموویانی لەزیندانێ توندکردو لەجیاتییان دەستو پێ قزڵباشەکانی خـۆی کردە حاکم بەسەر میرنشینە نێوخۆییەکان لەکوردستاندا (١٦٤/٨).

شا ئیسماعیلی سەفەوی، لەو رۆژەوەی میر ئەحمەدی کوڕی سوڵتان بایەزید بوو بوە والـی بە سەر ئاماسیەوە پشتی دەگرت لە دژی سەلیمی بـرای، نـەك هـەر ئـەوە بگـرە کوڕەکـانی ئەحمەدی خستە بن باڵی خۆیەوە کە روویان کردە لای، پـاش ئـەوەی بگـرەو بـەردە لـە سـەر سەڵتەنەت لە نێوان کوڕو نەوەکانی بایەزیدی دووەم تەشەنەی کرد. ئەگەر ئەو نامە پڕ گـەفو هەڕەشە ئامێزانەشی بخەینە سەر کە شا ئیسماعیل لەگەڵ هەندێ دیاری گاڵتەجاڕی، وەك بـە نموونە (قوتووی حەشیشە) بۆ یاوز سەلیم ناردبوونی کاتێك لە سەر تەختی سەڵتەنەت دامەزرا، هەروا وەڵامدانەوەی سوکایەتیپێکردنی سوڵتانی عوسمانیو دیارییە لەکەدارەکانی بـۆی- وەك جلوبەرگی ژنانەی شا ئیسماعیل- ئـەوا روودانـی شـەڕی نێوانیـان هـیچ شـكو گومـانێکی نەدەویست، بە هەقیقەت ئەمەیان قەوماو سوڵتان یاوز بە لەشکرێکی بێ هـەژمارو گرانـەوە بەرەو تەورێز ملی نا، کاتێ گەیشتە شاری جەرمیك مستەفا بەگی میری کوردی- کە یـەکێك بوو لە سەرکردەکانی باڵی چەپی لەشکرەکەو دواجا لە دەوڵەتی عوسمانی بووە وەزیر- راسپارد ئەرکی گەمارۆدانی بایبۆرتو گرتنی لەئەستۆ بگرێ. میرە کوردەکانیش لە دەرەنجامی هەوڵو کۆششی زانای پایەبەرزو دانای کورد مەلا ئیدریس بدلیسی چوونە پاڵ سوڵتان، ئەمە وایکـرد تای تەرازووی سوڵتانی عوسمانی لە شەڕی بەناوبانگی چالدیران (٢ی مانگی رەجـەب ٦٢٠ك/ ١٥١٤ز) بە لایەوە قورسو سەنگین بێ، لەم شەڕەدا.

سوپای شا ئیسماعیلی سەفەوی تووشی نوشوستییەکی فرە گەورە هاتو وەها لووتی شکا کە دواجار نەیتوانی لە چیاکانی زاگرۆسەوە بەرەو ئەنادۆڵ بپەڕێتەوە، چونکە هەموو کوردستان هاتە ژێر باڵی دەوڵەتی عوسمانییەوە (٢٥٤/٧).

جا ئەگەر شێخ ئیدریسی بدلیسی بە ڕاستی توانیبێتی ڕێبەرانی میرنشینیە کوردییەکان قەناعەت پێ بینێ کە/ ئەوان سەربەخۆیی خۆیان لەدەست نادەن ئەگەر بێتو ملکەچی عوسمانییەکان بن، کەوا لەسەروبەندی نێوان ١٥١٤-١٥٤٠ و لە سەردەمی هەردوو سوڵتان سەلیمی یەکەمو سولەیمانی قانوونی لەشکری سەربازییان سازو ئامادەکرد ئەوا میرنشینە کوردنشینییەکانی توانییان خودموختاری خۆیان بپارێزن لە دەرەنجامی هەوڵو خەباتی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بۆ قەناعەتپێکردنی بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی بە زەروورەتی دامەزراندنی قایمقامو موتەسەڕفو کارگێڕییەکان لەخودی ڕۆڵەکانی کورد لەناوچە کوردنشینەکان (٧٥/١٣).

بە پێی تۆمارگەو دەفتەرە خاقانییەکان، ئەو میرنشینو حکوومەتە کوردییانەی کە لە ساڵی ١٠١٨ك/١٦٠٢ز حوکمیان ڕەوابوو لەرووی جۆری زەویو زارو ملکدارو کرێیانەوە، دابەش بووبوونە سەر ئەم ویلایەتانەی لای خوارەوە: (٣٦٢/٢١)

**١-ویلایەتی دیاربەکر:** لە (١٩) سنجق (لیوا) پێکهاتبووە، دوویان ساڵانە بەکرێ دەدرانو ئەو دوایشی بە پابەندبوون (ئیلتیزام)و نە بەگایەتی تیابوون ((زەعامەت))[ بەگایەتی ئەو زەویو زارە میرییانە کە دەوڵەت لەزەویوزاری دەوڵەتی داگیرکراو دەیبەخشێتە پیاوانو جەنگاوەرەکانی]و نە تیمار [تیمار واتە دابڕینی زەویوزار بۆ سوارە شەڕکەرەکان]، بەڵکو بە میرات بابەلباب کرابوون بە ملك، چونکە لەو زەوییانەن کە (بەقەڵەم فەرزو بە (پێ)یش دابڕاون)، بەڵام حاکیمانی ئەم سنجقانە لەکاتی شەڕ یان یاخیبوون سەربازو یارمەتییان دەدا بە سوڵتانی عوسمانیو ئەو حاکیمەی ئەمەی ڕەت دەرکردەوە لەحاکمییەتی رووت دەکرایەوەو کوڕی یان کەسێك لەخزمەکانی لەجێی دادەنرا، بەڵام لەکاتی ئاساییدا بە هیچ شێوەیەك نابوو لابرێن.

سنجقەکانی ئەم ویلایەتەش ئەمانە بوون: خەربوت، ئەرغانی، سیوەرەگ، نسیبین، حەسەن کێف، چەمشکەزەك، سعرت، میافارقین، ئاقچە قەڵا، خابور، شەنگار، قلوب، مهرانی،تەرجیل، ئاتاق، برتك، جیاقچور، چەرمیگ.

حکوومەتەکانیشی بریتی بوون لە: حکوومەتی جزیرە، ئاغیل، کنج، بالو، حەزۆ.

**٢-ویلایەتی وان:** لە١٣ سنجەق پێکهاتبوو، زەوی میریو تیماریشی تیابوون، سنجەقەکانیش ئەمانە بوون عادلجواز، ئەرجیش، موش، بارگیری، کرکر، کیسانی، ئەسپایرت،

کیس، کوردی نەوەی قتور، قەڵای بایەزید، بروع، ئوجكو حكوومەتی بدلیس مامەڵەی لەگەڵ ئەم سنجەقانە دەكرد لەرێگەی ملكدارییەوە.

**٣-ویلایـــەتی شـــارەزوور:** بـــریتی بـــوو لـــە(٢٠) ســـنجەق هەنـــدێ زەوی‌و زاری مـــیری‌و دەرەبەگایەتیی تێدابوون بۆ بەدواداچوونی حكوومەتی ئوجدی، ئەم سنجەقانەش بـریتی بـوون لە: ئەرگیل، كیشاف، شارباژێر، چنگولە، جەوەڵ حمرین، هەزار مــراد، دیلجـوران، میركافـا، حەریردەتلو، نیلكارو، سییە، ئاجور، ئیرومان، دودات، برنت، بلقاس.

لە ویلایەتەكانی دیاربەكرو وانو شارەزوور، ژمارەیەك سەرۆك هۆزی كوردی لێ بوون، نازنـاوی ((میر))یان هەڵگرتبوو، بەڵام مافی ئەوەیان نەبوو ئاڵا هەڵكەن، واتا: ئاڵای تایبەتی خۆیـان نـەبوو، مافی ئەوەشیان نەبوو ببنــە مــیری ســنجەقەكانو هــەروەك خــاوەن بەگایــەتی بــوون لــە دەوڵــەتی عوسمانیداو ملكو سامانیان بە میرات بۆ كوڕو نەوەكانیان دەمایەوە، هەروا سەربازو كۆمەكیان لە كاتی شەڕو پشێویدا بە سوڵتانی عوسمانی دەدا، سەرۆكی خێڵ یان هۆزی كورد (میر) مــافی هــەبوو سەرانە وەربگرێ بە ڕێژەی (١/١٠)دەیــەك لــە مــەڕومالاتو بــەروبوومی جوتیــاران چـونكە هـەم خاوەنی زەوی‌و هەم خاوەنی عەشیرەتە (٢٦٣/١٣). بێجگە لەوەش مافی كارگێڕی‌و ڕێكخستنیشی هەبوو، چونكە جوتیار بۆی نەبوو بەبێ ئاگاداری میر زەوییەكەی بەجێ بێڵێت.

لەساڵی ١٢٧٤ك/١٨٥٨ز یاسای زەوی‌وزار دەرچوو، بەگوێرەی یاســاكە مــیرە كوردەكــان ئـەو زەوییانەی لە ژێر دەستیاندایە بووە ملكیان، بەڵام دواتر میرنشینە كوردییەكان هەر بــەگوێرەی ئــەم یاسایە كۆتاییان پێ هێنرا كە بریتی بوون لەمیرنشینەكانی (هەكاری‌و بدلیسو سلێمانی-بابان) لــە دەوڵەتی عوسمانی، پاش ئەوەی ژیانی كۆمەڵایەتی‌و بژێوی نەتەوەی كورد پێشكەوت (٢٦٢/١٣).

بێجگە لەوە ئەم زەوی‌و زارانە بەپێی ئەو یاسایە، قابیلی كڕینو فرۆتنو مامەڵە كردن بوو پێیانەوە لەبەرامبەر ئەو قەرزانەی لەسەریان بوو كەپێشتر قەدەغە بوو بفرۆشرێن. بەو شێوەیە دەرەبەگایەتیی گەورە لەناوچەی ڕۆژهەڵاتو باشووری ڕۆژهەڵاتی ئانادۆڵ پێكهات لەئــەنجامی زەوتكردنی ئەو زەوییانە لەرۆژگاری دەوڵەتی عوسمانی یان كڕینییان لەرێگەی ئــەو قەرزانــەی لەسەر خاوەنەكانیان مابوون لەسەردەمی كۆماری.

مێژوونووسی گەورەی كورد میر شــەرەفخان بدلیســی دانــەری كتــێبی شــەرەفنامە، دەڵێــت: میرنشینە كوردییەكان لەســەردەمی حــوكمڕانیی عوسمانییەكانــدا ((خۆیــان حــوكمڕانیی خۆیانیــان دەكرد، ڕۆخی چەپی چۆمی فوراتی ڕۆژئاواو هەموو ناوچەكانی ڕۆخی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری مرادســو كە لقێكە لە هەردوو لقەكەی فورات لەژێر حوكمڕانیی میرنشــینە كوردییەكانــدا بــوون. كوردەكــان

ملکەچی فەرمانەکانی سولّتانو دیارییان پێشکەش دەکردنو ئەو داواکارییانەی سولّتان دەیویست، بەجێیان دەگەیاندو لەشکرو سەربازی یەدەکیان دەدا کاتێ پێویستی پێ بان)) (٢٦/٢).

بەلاّم ئەم میرنشینانە وێڕای خودموختاری بوونو باشترین پێوەندییان لەگەلّ دەسەلاّتی عوسمانیدا، ناوە ناوە بەگژ عوسمانییەکاندا رادەپەڕین، هێزەکانی عوسمانیش لە هەموو لەشکرکشییەکانیان بۆسەر شۆڕشگێڕانی کورد ژمارەیەك سیخوڕو بەکرێ گرتەی- لەدەرەنجامی ترساندن یان بەتەماکردن - پەیدا دەکردن بۆ لێدانی کورد بە دەستی کوردی هاوخوێنی خۆی لەو هێرشە سەربازییانەی دەکران بۆ کپکردنی شۆڕشەکانیان. شتێك نەبووە رێگر لەپێشی عوسمانییەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە- سیاسەتی پەرت بکەو زالّ بە- تەنانەت کە پێشتر لەنێوان ئەوانو کوردەکان بەلێنو پەیمان هەبوون سەرڕای هاتنی خۆبەخشانەی کوردەکان بۆ ناو ریزەکانی ئەوان (٣٥/١٤). لەکاتێکدا عوسمانییەکان بە چاوی رەزامەندییەوە دەیانڕوانییە کوردەکانو متمانەی سولّتان یاوز سەلیم بەو شێخ ئیدریسەی کە هەولّ دەدات بۆ راکێشانی کوردان بەلای عوسمانییەکاندا لەشەڕیاندا دژی ئێرانییەکان، وایکرد فەرمانی سولّتانیی سپی(کاغەزی نەنووسراو) بۆ رەوانە بکاتو چۆنی بوێ پڕی بکاتەوەو بەسەر هەرکەسێ بیهەوێ لەمیرە کوردەکان بەشیان بکاتەوە (٢٦٩/٧) دوای ئەوەی شێخ ئیدریسی بدلیسی وەك والی لێهات بەسەر ناوچەی کوردستان- سەرباری بدلیسی میرنشینییەکەی- کە سەر بە دەولّەتی عوسمانی بوو.

سولّتان سولەیمان قانوونی ١٤٩٤-١٥٦٦ لەسەردەمی خۆی، یەکەمین والیی تورکی لەسەر کوردستان دانا، پاش ئەوەی میرە کوردەکان میرنشینە کوردییەکانیان لەباوکەوە بە میرات بۆ دەمانەوە. دەبینی کاتێك دەروێشە قەلّەندەرییەکان سالّی ٩٣٣ك/١٥٢٧ز ئالاّی یاخیبوونیان لە ویلایەتی قارەمان هەلّکرد، سولّتان سولەیمانی قانوونی مەملەکەتەکەی بۆ سێ ویلایەتی گەورە دابەشکرد بۆ هەر یەکەیان (میرێکی میران= بەگلەر بەگی) یەکی دانا بۆ بەڕێوەبردنی، ئەوانیش ئەم بەگلەربەگییانە بوون: یەعقوب پاشا میری میرانی رۆم (بولقانو ئەوروپا)، بەهرام پاشا میری میرانی ئانادۆلّ (ناوچەکانی ئاسیای بچووکی ناوین) خەسرەو پاشا میری میرانی دیاربەکر (ناوچەی کوردستان) (٣١٥/٧)، کە پێشتر ئەم ناوچەیە لەچوارچێوەی دەسەلاّتی شێخ ئیدریسی بدلیسی بوو. لەسالّی ٩٤١ك/١٥٣٤ز سولّتان سلێمانی قانوونی، سلێمان پاشای والی دیاربەکری- پاش ئەوەی بەغدای داگیرکرد- خۆیو حامیەکەی ناردە ئەو شارەو

کردییە والی شاری بەغدا، ئەوەش یەکەمین والی عوسمانی بوو لەوێ دانرا. هەروا ئەم سوڵتانە لەشەڕی ساڵی ٩٥٥ك/١٥٤٨ز بەشێك لەکوردستانی ئێرانی داگیرکرد (١٨٠/٨).

ناوچەی کوردستان لەسەروبەندی سێ سەد ساڵی پاش ئەو مێژووە بووە گۆڕەپانی شەڕی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو فارس(سەفەوی) هەتاوەکو ساڵی ١٨٤٠ (٢٩٠/١٥).

ئەگەرچی کورد لەو ماوەیەدا چەندین شۆڕشیان لەدژی هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو فارس بەرپاکرد بۆ نموونە، وەك شۆڕشی کوڕی جانپۆلاد(٥ ) لەساڵی ١٠١٦ك/١٦٠٧ز لەدژی عوسمانییەکان، شۆڕشی هۆزەکانی برادۆست لەقەلای دمدم لەساڵی ١٠١٧ك/١٦٠٨ز شۆڕشی هۆزەکانی موکری لەساڵی ١٠١٩ك/١٦١٠ز لەدژی فارسەکان، بێجگە لەشۆڕشەکانی بادینانو بنەماڵەی بابانەکانو هۆزەکانی میللیو ئەوانیتر، بەلام میرنشینەکانی بدلیسو ئامێدیو هەکاری بە سەربەخۆیی لەژێر فەرمانڕەوایی میرە کوردەکان مانەوە تا ئەو دەمەی هاتنە ژێر تابیعییەتی عوسمانییەکانەوە لەساڵی ١٠٧٠ك/١٦٦٠ز (٢٠١/٨). بەلام گرنگترین ئەو شۆڕشە کوردییانە، شۆڕشەکەی بەدرخان پاشای میری حکوومەتی بۆتان- جزیرەی ئیبن عومەر- بوو لەساڵی ١٢٢٧ك/١٨١٢ز، چونکە ئەم شۆڕشە بزوتنەوەیەکی نەتەوەییو نیشتمانی بوو، تێدەکۆشا بۆ رزگارکردنی هەموو ناوچەکانی ولاتی کورد (هەموو کوردستان) لەدیلیو ئەسارەتی بێگانە بە رێگەی بنیاتنانی یەکێتی نێوان میروسەرانی کوردو دامەزراندنی هاوبەندییەکی برایانەی تۆکمەو پتەو لە نێوانیان بۆ رێخۆشکردن بەرەو سەربەخۆیی. میر بەدرخان پاشا لەم کارەی یەکەمین هەنگاوی هاویشت ئەو دەمەی سنووری میرنشینەکانی بەرفراوان کرد هەتا شاری وان لە باکوورو لەملاشەوە بەرەو دەوروبەری موسڵ لە باشوور. هەروا سکەشی (پارە) بەناوی خۆیەوە لێداو کارگەیەکی بۆ فیشەگو تفەنگ لەشاری (جزیرە) دامەزراند. کە حکوومەتیش لەشکرێکی بەهێزی سەربازی نارده سەر بۆ داگیرکردنو ملکەچکردنی، ئەم میرە کارێکی وای پێکرد با بە دەواری شەڕی نەکردبێ، لەپاش ئەم سەرکەوتنەش سەربەخۆیی خۆی جاڕدا (٢٣٧/٨). بەلام ئەو دەمەی دەسەلاتدارانی عوسمانی هێزێکی سەربازیی گەورەو بێشوماریان ئامادە کرد لە دژیو یەکێك لە سەرکردەکانی بەناو

---

٥- وەچەی بنەماڵەی جانپۆلاند ماونو لەلوبنان دەژین و بوونەتە عەرەب، ئەوان لەریشەدا کوردن و درووزین، خوالێخۆشبوو کەمال جونبلات وەزیری ناوخۆی لوبنان لە١٩٧٠و سەرۆکی حیزبی ئیشتراکی تقدمی بوو، ئێستا کوڕەکەی وەلید جونبلات سەرۆکی حیزبەکەیە. (وەرگێڕ).

(عزالدین شێر) ناپاکی لەگەڵدا کرد، نوشوستی هێناو شەڕی دۆڕاند. دەوڵەتی عوسمانیش بەم بۆنەیەوە میدالیای شەڕی کوردستانی دەرکرد، وەك یادگارێك بۆ سەرکەوتنی.

دوای ئەوە، چەندین شۆڕشی تر لەکوردستان لەدژی عوسمانییەکان بەرپابوو لەسالآنی ۱۸۲۰ شۆڕشی کوردەکانی زازا (ڤاڤا)و ۱۸۲۹-۱۸۳۹ شۆڕشەکانی هەکاریو رەواندزو تورعابدینو شۆڕشی شەریف خانی بدلیسی لەساڵی ۱۸۳٤، بەڵام هەر هەموویان هەرەسیان هێناو هەموو میرنشینە کوردییەکانیش لەژێر حوکمی راستەوخۆی عوسمانییەکان لەساڵی ۱۸٤۷ رووخان (۳٥/۱٤). ئەگەر بێتو بڕوانینە هۆکارەکانی هەرەسهێنانی ئەم شۆڕشانە دەبینین پوختەیان بریتییە لەم خاڵانەی خوارەوە:

۱- نەبوونی یەکێتی یان جۆرێك لەیەکێتی نێوان رابەرو سەرانی کورد دەربارەی ئامانجە نەتەوەییەکانو نەبوونی ئەو پێشەوایەی کە بتوانێت دەسەڵاتی ئایینیو دنیایی نێوانیان یەکبخات.

۲- بە سانایی پەیداکردنی ئەو سیخوڕو ئالّقە لەگوێیانەی کە هەم لەپێشو هەم لەکاتی شەڕدا ناپاکی لەگەڵ رۆڵەکانی نەتەوەکەیان دەکەن.

۳- نەبوونی داهاتی دارایی تەواو بۆ دامەزراندنی کارگەی چەكو جبەخانەی شەڕو پێداویستییەکانی .

٤- بەرهەڵستی دەوڵەتانی زلهێز - لەناوچەکەو لەدەرەوەی- بەرامبەر بە یەکگرتنی کوردو سەربەخۆیی بوونیان.

لەدەرەنجامی شۆڕشە یەك لەدوایەکەکانی کورد کە تا شەڕی یەکەمی جیهانی بەردەوام بوو، دەسەڵاتدارانی عوسمانی سیاسەتیان بەرامبەر بە کوردو کوردستان هەموار کرد بە ئازادکردنی بەندکراوەکانو مامەڵەی نەرم لەگەڵیانو هورووژاندنی دەماری ئایینی بە ئامانجی نزیکخستنەوەیان لەحوکمڕانانی عوسمانی، هەوڵیشیان دا بۆ رازیکردنی سەرۆك هۆزە کوردییەکانو ئەوانیترو یەکسانبوونیان لەگەڵ کەمایەتییەکانی دیکەی دانیشتووی ویلایەتە عوسمانییەکانو لەسەردەمی سوڵتان (عبدالحمیدی دووەم) فێرگەی هەمایۆنی عەشایەر لەئەستەموڵ دامەزرا لەپێناو فێرکردنی منالآنی سەرکردەکانی ئەو هۆزو عەشایەرانە بە مەبەستی ئامادەکردنیان بۆ وەرگرتنی پایەی سەربازیو کارگێڕیو لەناوبردنی ناکۆکییەکانی نێوان سەرانی هۆزە کوردی یان هۆزە عەرەبییەکانو هۆزەکانی تر.

فێرگەی هەمایۆنی عەشایەر لەرووی خوێندنەوە کە ماوەکەی پێنج ساڵو فێرگەیەکی ناوخۆییش بوو و بەدرێژی خوێندنەکە قوتابی تیا دەمایەوە، وەك قوتابخانەی ئامادەیی

بوو لەم رۆژگارەماندا، دەرچووانیشی یان دەچوونە قوتابخانەی جەنگی (کۆلێژی سەربازی) یانیش فێرگەی شاهی (کۆلێژی زانستە سیاسییەکان). ئەگەرچیش ئەم فێرگەیە سەرەتا تایبەت بوو بە کوڕانی سەرۆك هۆزە عەرەبییەکان، بەڵام دەستیکرد بە پێشوازیکردن لەکوڕانی هۆزە کوردییەکانو کوڕانی کەسایەتییەکانی ئەرناووتو کەمایەتییە موسڵمانەکانی تر. دووای ئەوەش کە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا لەو ئامانجەی لەپێناویدا دامەزرا، (١٧)ساڵ دواتر داخرا (١٧/٤).

هەرچەندە میرنشینە کوردییەکان بۆ ماوەیەکی زۆر سەربەخۆیی خۆیان پاراست، بەڵام قۆناغی ململانێو شەڕی ئێرانی-عوسمانی، تۆخمێکی نوێی خستە سەر ناوچە دیموگرافییە کوردنشینەکە، بە تایبەتیش پاش ئەوەی سەرانی میرنشینیی کوردی ئەردەڵان لایەنی شای ئێرانیان گرت، لەولاشەوە میرە کوردەکانی تر هەواداریی باوی خۆیان بەرامبەر بە خەلیفەی عوسمانی پاراست. لەوەدەمەدا میرنشینی ئەردەڵان بەو هەڵوێستە یەکلایەنەی- پێچەوانەی میرنشینە کوردییەکانی تر- یەکەمین زەنگی لێدا بۆ پرۆسەی لەت لەتکردنی کوردستان. چونکە کاغەزێکی براوەی دایە دەست ئێرانو دەوڵەتی عوسمانییەوە تا گەمەی پێ بکەن، ئەویش دابەش بوون بوو، واتا دابەشکردنی کوردستان لەنێوان چەند بەشێکی سەر بە شای ئێرانو چەند بەشێکی سەر بە سوڵتانی عوسمانی. ئەمەش ئەو لەتکردنە مێژووییە بوو کە دواتر هەموو پەیمانو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە ڕێکخستنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێرانو عوسمانی چەسپاندییان بە دەسکردی دەوڵەتە مۆنۆپۆلەکان بە تایبەتی پەیمانی ئەرزرۆمی دووەم ساڵی ١٨٤٧و ڕێککەوتننامەی دارشتنی سنوور بۆ ساڵی ١٩١٣و پاشان پەیمانی لۆزان ساڵی ١٩٢٣و سەکی ئینتیدابی بەریتانی لەسەر عێراق (١٧١/٣).

# باسی دووەم

# کوردو شەڕی رزگاریخوازیی نیشتمانی

شۆڕشو راپەڕینەکانی گەلی کورد بەبێ پسانەوەو بێ هەدادان بەردەوام بوو لەدژی ئەو کاربەدەستە عوسمانییانەی نیازیان بوو دەست بگرن بەسەر ئەو میرنشینە کوردییانەی تێدەکۆشان سەربەخۆییان بپارێزن، ئەمە وایکرد عوسمانییەکان لەشکری سەربازی ساز بدەن لەدژی شۆڕشگێڕانی کوردو فرەجار هێڕشە سەربازییەکان، دانیشتوانی گوندە کوردەکانیان بە رێگایانەوە دەکردنە ئامانجو کاولو وێرانیان دەکردنو خەڵکەکەیان ئاوارەو دەربەدەر دەکردن یان دەیانگواستنەوە بەرەو ئەو ناوچانەی زۆرینەی دانیشتوانیان تورك بوون، ئەم بارە پتر لە(١٨) جار لەسەروبەندی حوکمڕانیی عوسمانی تەنها لەدەرسیم روویدا (٨٩/١٣)، سەرکردەکانی ئەو لەشکرکێشییانە سەرڕای ئەم کردەوانەشیان، بۆ سەرانی هەندێك لەهۆزە کوردییەکان جەختیان دەرکردەوە کە ئامانجیان لەم هێرشانە ئەوان نییەو بەڵکو ئامانجیان هۆزە کوردەکانی ترە لەمەشدا دەیانەویست یەکێتی ریزەکانیان تێکبدەنو ناکۆکی بخەنە نێوانیانەوە (٩٠/١٣).

ئەو دەمەی (ئیتیحادییەکان) جڵەوی دەسەڵاتی سیاسییان لە دەوڵەتی عوسمانی گرتە دەست، رۆژنامەنووسی ناسراوی تورك (حسێن جاهید یالچین) کە یەکێك بوو لە لایەنگرە توندرۆکانی (ئیتیحادییەکان) لە رۆژنامەکەی بە ناوی (تەنین) لەساڵی ١٩٠٩ وتارێکی بڵاوکردەوە تێدا دەڵێت: ((ئێمە کێشەی کەمایەتییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا بە شێوەیەکی بنەڕەتی یەکلا دەکەینەوە)). ئەمە بەبێ پێچوپەنا ئاماژەیەکی ئاشکرا بوو کە ئامانجی ئیتیحادییەکان، بە تورك کردنی کەمایەتییەکانە، بە تایبەتی کوردەکانو توانەوەیان لە نێو دەریای گەلانی عوسمانیدا.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانەیان (ئیتیحادییەکان) پەنایان بردە بەر خۆنزیکخستنەوە لەهەندێك لەسەرانی هۆزە کوردییەکانو راکێشانیان بۆلای خۆیان بە دامەزراندنیان لەچەند ویلایەتێکی کوردنشین. بۆ نموونە (پابتی کوڕی ساغر) یان بە والی لەسەر (هوزات) دانا، کە پاشان تیپی سوارەو جاندرمەی کوردی پێکەوەنا بەنیازی کپکردنی شۆڕشەکەی سەید رەزا ئاغا، بەڵام لەمەدا نوشوستی هێناو (قارا خچر)ی سەرکردەی عوسمانییەکان کوژراو خۆیشی بە ناچاری هەڵات (٦٣/١٣).

کاتێك ئاگری شەڕی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا، وەهیب پاشای سەرکردەی لەشکری سێیەمی عوسمانی لەهۆزات خۆیو (ئەحمەت عیزەت پاشا)ی سەرکردەی لەشکری دووەم لە(مەعموورەی عەزیز) بوون، بەڵێنیان بە کوردەکان دا: ئەگەر هاتو کورد دەست هەڵبگرن لەهێرشبردنە سەر هێزەکانی عوسمانیو هاوکاری بکەن بۆ دەرکردنی ئەو رووسانەی ئەرزنجانیان داگیرکردووە، ئەوا دەوڵەتی عوسمانی هەموو داواکارییەکانی نەتەوەی کورد جێبەجێ دەکاو ئەو گوندو ئاوایییە کوردانە ئاوەدان دەکاتەوە کە وێران کراونو سوتاونو لەرووی مادیشەوە قەرەبووی کوردەکان دەکاتەوە پاش ئەوەی شەڕ کۆتایی پێ دێ. بەڵام هۆزە کوردییەکان ئەمەیان رەتکردەوەو هێزێکیان پێکهێنا بریتی بوو لە(١٠) هەزار جەنگاوەر لە٣٠ی ئازاری ساڵی ١٣٣٢ك بۆ بەگژا چوونی هێزەکانی عوسمانی لە پێناو سەقامگیرکردنی ئەمری واقیع لەناوچەکەو تێگەیاندنی رووسەکان بەوەی کە کێشەی کورد لەسەر حیسابی داخوازییە نەتەوەییەکانی، سازش قەبووڵ ناکات (١٣/١٠٣).

لە٢٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٦ کە رووسەکان هەوڵیاندا هێرش بکەنە سەر ئەرزنجان، وەهیب پاشا توانیی قەناعەت بە(گول ئاغا)ی سەرۆك هۆزی باڵەبانی کوردی بێنێت بۆ بەرگریکردن لەئەرزنجان، یارمەتی عوسمانییەکان بکات. بەڵام گوڵ ئاغا لەم شەڕەدا بریندار بوو و پاشەکشەی کردو ئەرزنجانیش لە١١ی تەمووزی ساڵی ١٩١٦ کەوتە دەستی رووسەکان (١٣/١١٢).

لەپاش قەتڵو عامی ئەرمەنییەکان لەلایەن هێزەکانی عوسمانییەوەو سوتاندنی گوندو ئاوایی کورد لەلایەن هەمان ئەو هێزانەو دەربەدەرکردنیان لەئاکامی هاوکارینەکردنیان بۆ ئەو هێزانە لە دژی رووسەکان، ژەنراڵی رووس (لاهۆڤ Lahof) داوای لەکوردو ئەرمەنی کرد بچنە پاڵ هێزەکانی رووس لەدژی عوسمانییەکان لەپێناو وەدیهێنانی داخوازییە نەتەوەییەکانیان. مستەفا وەفای سەرکردەی کورد بەدەنگ ئەو داواکارییەوە هات و دایە پاڵ هێزەکانی رووس (١٣/١١)و هۆزەکانی کوردیش ئەو ناوچەیەی کەوتۆتە خۆرئاوای چۆمی فورات لەهێزەکانی عوسمانی پاك کردەوە عەلی شیر قۆچگیریلی بووە نوێنەری کوردەکان لەئەرزنجان، پاشان لەگەڵ رووسو ئەرمەنەکان رێککەوت لەسەر جاڕدانی حکوومەتی کوردی لەشاری ناوبراو و رووبەرەکەی فراوان بکرێ بۆئەوەی ناوچەی ئوواچیكو دەرسیمی خۆرهەڵاتو خۆرئاوایش بگرێتەوە و وایلێهات بە دەوڵەتی کوردستان ناسرا (١٣/١١٣).

هێزه (ئیتیحادییەکان) چەند تیپێکی خۆکوژی لەکوردانی ئالْقەلەگویْو کرێگرتەی خۆیان بە ناوی تیپەکانی حەمیدییەوە پێکهێنا، بۆ پەلاماردانی ئەم دەوڵەتە کوردییە تازە ئیجادە، بەڵام ئەم هێزانەیان نەیانتوانی لە پێش نەبەردیو پاڵەوانێتی کوردانی بەرگریکار لە دەوڵەتەکەیان، خۆیان رابگرنو زۆر بە خراپی شکان. لە تۆڵەی ئەم نوشوستییەیاندا هێزەکانی عوسمانی دەستیان کرد بە سوتاندنی گوندو ئاوایی ئەو هێزانەی سەر بەخۆیان بوون بە بیانووی ئەوە کە لە شەڕا کەمتەرخەمییان کردووە (١١٤/١٣).

ئەو دەمەی شۆڕشی سوشالیستیی مەزن لە رووسیای قەیسەری بەرپابوو و دەسەڵاتی سۆڤیتی لەو وڵاتە دامەزرا، ژەنراڵ (لاهۆف) لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٨ هێزەکانی لە ئەرزنجان کێشایەوەو بەڕێوەبردنی ناوچەکەی دایە دەست (مراد پاشا)ی سەرکردەی ئەرمەن کە ئەمیشیان پێشنیاری بۆ (عەلی شێر)ی سەرکردەی کورد کرد بەڕێوەبردنی ناوچەی رزگارکراو لەعوسمانییەکان بخاتە ژێر سەرکردایەتیی خۆیەوە لەبەرامبەر رازی بوونی لەسەر جاڕدانی دەوڵەتی کوردستان لەناوچە کوردنشینەکاندا. بەڵام دەستەی کوردی وتووێژکار لە سەر ئەمە رازی نەبوون (١١٥/١٣).

(وەهیب پاشا) ویستی ناکۆکی لە نێوان کوردو ئەرمەنییەکان بقۆزێتەوە تا کورد بهێنێتە ژێر بار، هەمیسان بڵاوی کردەوە کە دەوڵەتی عوسمانی رازییە لەسەر داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد لەپاش تەواوبوونی شەڕی جیهانی یەکەمو لێبوردنیشی لەبارەی چوونی عەلی شێر بۆ پاڵی هێزەکانی رووس جاڕداو هەردوو سەرکردەی کورد (عەلی شانو حەیدەری) کە بە لایەوە دەستەبەسەر بوون بەرەڵلا کرد، بەوەشەوە نەوەستاو هێنای هەموو سەرکردەکانی کورد بەعەلی شێرو دەستبەسەرگیراوەکانیشەوەی بانگهێشت کرد بۆ سەر خوانێکی گەورە لەبارەگای سەرکردایەتییەکەی خۆی سازی کردبوو (١١٥/١٣). موراد پاشا لەبری ئەوەی مەرجی گفتوگۆکانی لەگەڵ کوردەکاندا هەموار بکات، دەستیکرد بە رستنی وانەکانی لەدژیانو هاندانی ئەرمەنییەکان بۆ تالانکردنی گوندو ئاوایی کوردانو کوشتنی دانیشتوانییان لەناوچەکەدا، ئەم کارەشی پاڵی بە کوردەکانەوە نا هاوکاری هێزەکانی عوسمانی بکەنو بچنە سەر ئەو هێزە ئەرمەنییانەی کە بەناچاری لەئەرزنجانو ناوچەکانی دەوروبەری پاشەکشەیان کرد. بەڵام سەید رەزای سەرکردەی کورد، پێی خۆش نەبوو کورد لەگەڵ عوسمانییەکاندا لەدژی ئەرمەنی بجەنگن، بەو شێوەیە خۆیو کۆمەڵێك زۆر لەهۆزە کوردییەکان هەڵوێستی بێلایەنیی گرتەبەر لەشەڕو بگرەو بەردەی (ئەرمەنی- تورکی)دا (١١٦/١٣).

ئەو کەش‌وهەوا سیاسییە کراوەییەی پاشی ساڵی ١٩٠٨ دەوڵەتی عوسمانی بەخۆوەی بینی، وایکرد هزری نەتەوەیی لای هەموو نەتەوە ناتورکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی گەشە بکات‌و ببووژێتەوە، ئەوە بوو کوردەکان چەندین کۆمەڵەو پارتی سیاسییان پێکهێناو رۆژنامەو بڵاوکراوەیان دەرکرد، لەوێ یەکەمین کۆمەڵەی کوردی بە ناوی (کۆمەڵەی تەعالی‌و تەرەقی کورد)ەوە دامەزرا کە سەرۆکانی بنەماڵە کوردییە ناودارەکانی لەخۆ گرتبوو، وەك: شێخ عبدولقادر شەمزینی‌و میر ئەمین عالی بەدرخان‌و داماد ئەحمەد زولکفل پاشاو ژەنرال شەریف پاشاو ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرو رۆشنبیرانی کوردو خوێندکارو قوتابیانی زانکۆ (٥٧/١٦). لە ئەستانەش‌و لە هەمان ساڵ کۆمەڵەیەکی وێژەیی پەروەردەیی بە ناوی (کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کوردی) دامەزراو فێرگەیەکی کوردیی لە چەنبرلی تاش لە ئەستەمووڵ بۆ فێرکردنی زمانی کوردی کردەوە. بەڵام پاش ئەوەی نیازی تۆرانیزمی ئیتیحادییەکان ئاشکرا بوو، هەل هەردوو کۆمەڵەو فێرگەکەیان داخست. لەبەر ئەمە (کۆمەڵەی تەعالی‌و تەرەقی) ناچار بوو چالاکی نهێنی سنووورداری خۆی پیادە بکات (٥٢/١٤). کۆمەڵە چەند لقێکی کارای لە دیاربەکرو بدلیس‌و عەزیز هەبوو. سەرڕای ئەوەش لە ئەستەمووڵ رۆژنامەی (هەتاوی کورد) لە لایەن (کۆمەڵەی کۆمەك‌و پێشکەوتنی کورد)ەوە کە لەم شارە دامەزرا، دەرچوو. دوا بەدوای ئەمیشیان کۆمەڵەی هیوا دامەزرا رۆژنامەی (رۆژا کورد)ی دەرکرد لە لایەن رۆشنبیرانی کوردەوە بەڕێوە دەبراو دەردەچوو کە سەر بە بنەماڵەی دەسترۆیشتوو و ناسراو بوون لەنێو کوردەکاندا (٥٥/١٧). لەوێ ئەم رۆژنامانە خاوەن ڕێبازی نەتەوەیی روون‌و رۆڵی خۆیان بوون لەپەخشکردنی هەستی نەتەوایەتی لە نێو رۆڵەکانی گەلی کورددا‌و پرۆژەی ئەلفبایەکی نوێیان دانا بۆ زمانی کوردی، بۆیە پانتایی بڵاوکردنەوەیان بەرفراوان بوو (٤٤/١٨).

کە شەڕی جیهانی یەکەم قەوما کوردەکان لە بارێکی پەرت‌و بڵاوی‌و ناهومیدیا دەژیان لە سۆنگەی نوشوستیهێنانی هەموو بزوتنەوە کوردییەکان بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانیان کە بەرجەستە بوو لە رزگاربوون لە دەسەڵاتی عوسمانی‌و وەدەستهێنانی سەربەخۆیی‌و یەکگرتنیان. وەلێ کورد- پاش ئەوەی مستەفا کەماڵ بزوتنەوە رزگاریخوازییەکەی ئەنجامدا- هەوڵیان دەدا بۆ رێکخستنی ریزو هێزە نیشتمانیەکانیان لەناوەوەی وڵات‌و روونکردنەوەی ئامانجەکانیان بۆ جیهانی دەرەوە، دوای ئەوەی رۆژنامەی کوردستان کە میر مەدحەت پاشا لەقاهیرە ساڵی ١٨٩٨ دەریکرد، تێدەکۆشا بۆ بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی‌و داواکردن بۆ یەکێتی نێوان

ڕێبەرو سەرکردەکانی کوردو پیاوە ئاینییەکان. لەدوای جارڕدانی کودەتای عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨ ئەم ڕۆژنامەیە دووبارە لە ئەستانە بە سەرپەرشتی میر سورەییا بەدرخان دەرچوو، دوای ئەوەش هەمیسان لە قاهیرە لە سەروبەندی شەڕی جیهانی یەکەم، دەرچوو (٥١/١٤).

لەپاشان، میر ئەمین عالیو جەلادەتو کامەران بەدرخانو کەمال فەوزیو ئەکرەم جەمیل پاشازادەو دکتۆر شوکری محەمەدو مەمدوح سەلیمو ئەوانیتر، کۆمەڵەی (تەشکیلاتی کۆمەڵایەتی کوردستان) یان دامەزراند، لە هەمان کات لە ئەستانە کۆمەڵەیەکی دیکە هەبوو بە ناوی (حیزبی میللەتی کورد). هەموو ئەم کۆمەڵانە، بە دامەزراندنی کۆمەڵەی (خویبونی کورد) لە ساڵی ١٩٢٧ هەڵوەشێنرانەوە، دوای ئەوەی ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵانە هاتنە ریزییەوە، بە شێوەیەك بووە تاکە هێزێکی کوردیو کاریگەر لەسەر گۆڕەپانی سیاسی (٥٣/١٤).

ئەگەرچی شۆڕشی بدلیس کە لەساڵی ١٩١٣ هەڵایسا، بەخێرایی کپ کرا، ئەوە هەموو ئەو بزوتنەوە کوردییانەی کە سەرکردەکانی کورد یەکلایەنە بەرپایان کرد سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، شۆڕشەکەی بەدرخان نەبێت، چونکە کورد لەناو ئەو بزوتنەوانەدا پێشەوایەکی بەهێزیان پەیدا نەکرد لەدەوری کۆببنەوە، بێجگە لەمەش ناپاکیی هەندێ لەسەرکردەکانی کوردو چوونیان بۆ لای دوژمن- عوسمانییەکان یان فەرەنسا- ئەمەش فاکتەرێکی سەرەکیی سەرنەکەوتنو نوشوستیهێنانی نەتەوەییان بوو.

دەوڵەتی عوسمانی هەڵایسانی شەڕی جیهانی یەکەمی کردە بیانوو، بۆئەوەی غەزای پیرۆز- جیهادی پیرۆز- لەدژی کافران جاڕ بدات! ئەم جیهادە- وەك ئەو دوای نەتەوە ناتورکەکانی عوسمانی- کوردیشی گرتەوە، ئەمە بووە هۆی پەککەستنی کۆمەڵەکانو ڕاگرتنی دەرچوونی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکان لەبەر پەلکێشکردنی لێپرسراوو بەڕێوەبەرانیان بەرەو بەرەکانی شەڕ. ئەوە بوو گەلی کورد بەرەو ناو دۆزەخی ئەم شەڕە سەختو دژوارە، هەردوو لەشکری (١١) کە بارەگای لە(مەعموورە عەزیز)و لەشکری (١٢) کە بارەگای لەموسڵو (١٣٥) بلۆك سوارە لەلەشکری یەدەك (واتە (٤) تیپی سەربازیو لیوایەك)یان پێشکەشکرد، بێجگەلە ڕەوانەکردنی هەندێ یەکەی سنوور- پارێزەرانی سنوورو تەواوی ئالیاتی جەندرمەو پیاوانی ئاسایش. هەروا زۆربەی تاكو ئەفسەرانی دوو سوپای دیکە، سوپای (٩) لەئەرزرومو سوپای (١٠) لەسیواسیان پێشکەش ناو ئەو شەڕە کرد سەرباری ناردنی کۆمەكو یارمەتی بۆ ئەم هەموو لەشکرە زۆرە بەپێی توانا. لە لایەکی ترەوە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە خۆبەخشەکانی هۆزە کوردییەکان لە ژێر ئالای (شێخ مەحموود)دا لە شەڕی شعێبە لە دژی ئینگلیز لە عێراق

بەشدار بوون (٢٥٩/٨). ئەما کورد لەهەردوو بەرەی جەنگی قەفقازو عێراق زەرەرو زیانێکی گەورەو گرانیان پێکەوت لە دەرەنجامی زاڵبوونی هەستی ئایینی بەسەر هەستی نەتەوایەتیو نیشتمانیدا وێرای ئەو بێبەزەییو دڵڕەقییەی ئیتیحادییەکان لە بەرامبەر کوردەکان نواندیانو سیاسەتی زەبرو زەنگو کوشتنو بە تورك کردنیان لەدژ بەکار برد. ئەوەبوو دواجا (سەید لوتفی فیکری) ئەندامی ئەنجومەنی مەبعوپانی عوسمانی پێشوو لە سەر لیستی ویلایەتی دەرسیمی کوردی لەمانگی ئابی ساڵی ١٩١٨ نامەیەکی بوێرانەو زۆر روونو ئاشکرای نارد، لە نامەکە باسی لە هەموو گرفتو کێشەکانی دەوڵەتی عوسمانی کردووە بۆ سوڵتان محەمەد (وەحیدەدین)ی شەشەم پاش ئەوەی هاتە سەر تەختی سەڵتەنەت. داواش دەکات ئەندامانی حیزبی ئیتحادو تەرەقی ئەوانەی کە مامەڵەی خراپیان لەگەڵدا کردو ناچاریان کرد وڵات بەجێ بێڵێو لەجنیف دانیشێ، ببەخشێت، چونکە ئەو سەردەمە- سەردەمی ئیتحادو تەرەقی جارێکی تر ناگەڕێتەوە لەبەر ئەوەی دەسەڵاتیان بە شێوەیەکی خراپو نادروست بەکار هێناو بووە هۆی ئەوەی گەل لێیان بڕەوێتەوە لەم سەروبەندە دەستوورییەی کە کەمایەتیی کورد بە ئاواتەوەیە لەسای سەڵتەنەتدا مافی خۆی بەدەست بێنێ (٢١٠/٢٤).

ساڵی ١٩١٩ رۆژنامەیەك بە زمانی فەرەنسی لەئەستەموولٚ دەردەچوو بەناوی Lepays، رۆژنامەیەکی دیکەش بەزمانی تورکی بەناوی (حادیسات)، هەردوو رۆژنامەکە سەر بە کۆمەڵەی (بەرگری کردن لەمافی ویلایەتییەکانی رۆژهەڵات)ی کوردییەوە بوو، داوای مافی نەتەوەیی کوردی دەکرد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیو هەڵوێستی بێلایەنی دەگرتەبەر لە نێوان حکومەتی سەڵتەنەت لە ئەستەموڵو نێوان بزوتنەوەکەی مستەفا کەماڵ پاشا، ئەم کۆمەڵەیە چەند یادداشتێکی سەبارەت بە مافەکانی گەلی کوردی بۆ سەرۆکانی دەوڵەتانی هاوپەیمان کە هێزەکانیان خاکی دەوڵەتی عوسمانییان داگیر کرد، ناردبوو، هەروەها نوێنەرەکانیشی ناردبووە پاریس بۆ بەشداریکردن لە وتووێژی ئاشتی. رۆژنامەی (ئاڵای سوور)ی زمانحاڵی کۆمەڵەکە لە ئەرزروم بە بەڕێوەبەرایەتی نەجاتی بەگ دەردەچوو کە یەکێك بوو لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵە، بەڕێوەبەرانی تری: رایف ئەفەندیو حاج حافیز ئەفەندیو سلێمان بەگو مەقسوودو مەسعوود بەگو کازم بەگ- رایف ئەفەندی سەرۆکی کۆمەڵەکە لە ١٠ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩ دوو مانگ دوای دەستپێکی بزوتنەوەیەکی مستەفا کەمال پاشا داوای لێکرد سەرۆکایەتیی کۆنگرەی کۆمەڵەکە بکات. ئەم هەلە رێی بۆ مستەفا کەمال پاشا خۆشکرد بتوانێ بە خێرایی بجووڵێو هەوڵی کاریگەر بدات بۆ ئامادەکردنی جەماوەری ئەنادۆڵی رۆژهەڵات بۆ پێشوازیکردن لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی، مستەفا

کەمال لە یادداشتەکانیدا سەبارەت ئەم دەستپێشخەرییە بەو پەڕی سوپاسگوزارییەوە باسی کردووە (٦٣/٢٣).

ئەو دەمەی مستەفا کەمال پاشای سەرپەرشتیاری گشتی لەشکری عوسمانی لە١٩ی مایسی ١٩١٩ ژێراوژێر روویکردە ناوچەی رۆژهەڵاتی تورکیا. لە کۆمەكو پشتگیری کورد بەرامبەر بە بزوتنەوەکەی دڵنیابوو، چونکە ئەوان تینووی ئازادیو وەکو خۆیشی شۆڕشگێڕنو لە پێناو ئازادیو سەربەخۆییدا تێدەکۆشن، بۆیە هەوەڵێن مەسەلە دوای بڕیاری دەستپێکردنی بە شەڕی رزگاریخوازی میللی، ئەوەبوو رووبکاتە کوردستانی دەوڵەتی عوسمانیو لە سامسۆن بە سەر دەریای رەشەوە، دابەزێ. پاشان بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ سەرانی کورد لە پێناو پشتگیری بزوتنەوەکەی. لەمەشدا بە ئاواتی خۆی گەیشتو کورد زۆر بە خۆشحاڵییەوە لە ناوچەکەیاندا بەخێرهێنانیان کرد. تەنانەت خودی مستەفا کەمال ئاهەنگو خۆشییەکانی پێشوازیکردنی لە لایەن کوردەکانەوە لە شاری سیواس سەر لەبەیانی رۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ وەك جەژن وەسپ دەکات. بۆ ئەوەش پشتیوانییان لە بزوتنەوەکەی کرد، چونکە ئەو شەڕی داگیرکارە کافرەکانو ئەو حکوومەتە عوسمانییانە دەکات وان لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەری بێگانە دا. کورد هەموو شتێکیان پێشکەش کرد لە پێناو سەرکەوتنی بزوتنەوەکەیدا، بۆیە ئەویش بیری کردەوە کۆنگرەیەکی گشتی لەشاری سیواس گرێ بدات، بۆ ئەم مەبەستەش لەرۆژی ٢٢ی حوزەیران ئەم زانیاریانەی لای خوارەوە بۆ هەوادارانی خۆی نارد:

١-لەبەر ئەوەی مەترسی، هەڕەشە لەسەرانسەر نیشتمانەکەمانو سەربەخۆییمان دەکاتو حکوومەتی ناوەندیش لەئەستەموڵ ئەرکەکانی خۆی بەجێ نەگەیاندووە بۆ رزگارکردنی گەلو پاراستنی سەربەخۆیی وڵات، ئەوا دامەزراندنی ئەنجومەنێکی نیشتمانی فرمانی گەیاندنی دەنگمان بگرێتە ئەستۆو بەرگری لەمافەکانمان بکات، بۆتە ئەرکێکی پێویست.

٢-بڕیار درا بە زووترین کات کۆنگرەیەکی نیشتمانی لەسیواس ببەسترێ، بەو پێیەی لە هەموو شارەکانی تر لەرووی ئاسایشەوە بەرقەرارترە.

٣-بۆیە پێویستە (٣) کەس لەهەر لیوایەك لە لیواکانی ویلایەتەکە لەوانەی میللەت متمانەی داونەتێ زۆر بەپەلەو بەوپەڕی نهێنییەوە دەستنیشان بکرێنو ئەگەر پێویستیشی کرد بە شێوەیەکی وا کەس نەیانناسی، بۆ کۆنگرە بنێردرێن.

٤-کۆنگرەیەك لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات- ئەو ویلایەتانەی زۆرینەیان کوردن- لەبەرواری ١٠ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩ لەئەرزروم دەبەسترێت، جا لەحاڵێکدا ئەگەر شاندەکانی ویلایەتە

غەیرە کوردییەکانی تر لە کۆنگرەی سیواس تا ئەو مێژووە ئامادە بن، ئەوا ئەندامانی کۆنگرە لەئەرزرۆم دێنە پاڵ کۆنگرەی سیواس.

ئەگەر چاوێك بگێڕین بە دانە دابەشکراوەکانی ئەو گشتاندنە، دەبینین دابەش کراون بەسەر والییەکانی ئەم شارانە: ئەرزروم، سیواس، قەستەمونی، دیاربەکر، وان، جانیك، سامسۆن، وسەرکردایەتییەکانی ئەو تیپە سەربازیانەی لەوشارانەدان کەوا هاوکاریی بزوتنەوەکەی دەکەن (٢٨/٢٣)و زۆرینەی زۆری دانیشتوانیان پێك دێنن.

حکوومەتی سەڵتەنەت لەئەستەمولّ مستەفا کەمال پاشای لاداو سەبارەت بەو گشتاندنەی عەلی کەمال بەگ وەزیری ناوخۆ دەریکرد، رایسپارد کەس لەگەڵیدا هەڵسو کەوت نەکات، عەلی کەمال لە گشتاندنەکە تاکیدی کرد کە ئەو لادانەی مستەفا کەمال لەسەر داواو پێداگرتنی (نوێنەری فوق العادەی)ی ئینگلیز لەئەستەمولّ جێبەجێ کراوە (٣٦/٢٣) کە ئەو کات ئەستەمولّیش بە چەندین کۆمەڵەی سیاسیو نەتەوەییو کۆمەڵایەتیو رۆژنامە زمانحاڵەکانیانەوە جمەی دەهات، بۆ نموونە لەئەستەمولّ لەماوەی نێوان ١٩٠٨-١٩٢٠ پێنج رۆژنامەی هەبوو لەهەردوو زمانی تورکیو کوردی دەردەچوون هەر لەئەستەمولّدا عەبدوڵڵا جەودەت سەرنووسەری رۆژنامەی (ئیجتیهاد)و دیارترین رۆژنامەنووسەکانی کوردو خاوەنی زۆرێك لەکتێبی دانراوو وەرگێڕاوی کلتووریو زانستی بوو (٢٥٦/٢٤)، ئەمە لەکاتێکدا گرووپی سوشالیستە میللییەکان کە نوێنەری (گوقات) لەئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی (نازم بەگ)ی کورد لە١٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٠ دایمەزراند رۆژنامەی (ئەمەك- کۆشش)ی لەئەستەمولّ دەردەکرد (٩٠٤/٢٣).

یاریدەدەری والی دیاربەکر کە ناوی مستەفا بوو، لەبروسکەیەکدا لە٨ی حوزەیرانیی ساڵی ١٩١٩ بە مستەفا کەمال پاشای پشکنەری لەشکری سێیەمو یاوەری فەخریی عالی مەقامی سەڵتەنەت، راگەیاند، لاوەکانی کورد لە ویلایەتە کە بە قسەو بەڵێنی مستەر نوئێلی حاکمی سیاسی ئینگلیز لە سلێمانی هەڵخەڵەتاون کە سەردانی دیاربەکری کردو بەڵێنی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی پێداون لەژێر پارێزگاریی بەریتانیا، بۆیە ئەو لاوە کوردانە هەوڵیان دا لەپێناو ئەم ئامانجەدا کۆمەڵەیەکی کوردی دابمەزرێنن. بەڵام یاریدەدەری والی دیاربەکر چالاکی لێ قەدەغە کردن، چونکە ئەوان سەرپێچییان لەیاسای کۆمەڵەکانی عوسمانی کردووە (٩٠٤/٢٣).

پاش ئەوەی مستەفا کەمال لەپشتگیریی کوردەکان دڵنیابوو، ئەم بروسکەیەی لای خوارەوەی لە١٨ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩ بۆ هاوڕێی (جەعفەر تەیار)ی سەرکردەی سوپای یەك لەئەدرنە، نارد:

((مەترسیی دابەشبوونی وڵاتەکەمان و هەوڵدانی دەوڵەتانی ئیئتیلاف بۆ خنکاندنی سەربەخۆییمانو بێدەسەڵاتی حکومەتی سەڵتەنەت، پاڵمان پێوە دەنێت کاری بەپەلەو یەکلاکەرەوە بکەین لەپێناو رزگارکردنی وڵات لەداگیرکردنی بێگانەو کلکایەتیو پەرتەوازەیی، لەبەر ئەمە بڕیارمان دا بە پێکهێنانی (کۆمەڵەی بەرگریکردن لەمافی ئەنادۆڵو رەتکردنەوەی کلکایەتی) لەهەموو سوچێکی وڵات لە ناوچەکانی رۆژهەڵات، بۆیە تکا دەکەم دوو کەسی دەستنیشانکراومان لەئەستەموڵەوە بۆ بنێرنو لەبەڵگەنامەیەکی ئیمزا کراویشەوە لە لایەن خۆتانەوە دەسەڵاتی ئەوەمان بدەنێ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە بخەینە ئەستۆ. بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆیش لەژێر پارێزگاری بەریتانیا پووچەڵ کرایەوە دوای ئەوەی کوردو تورك یەکیان گرت لەپێناوی یەکێتی نیشتمانیدا)) (٢٣/٩١٠).

پێشتر رایف ئەفەندی سەرۆکی کۆمەڵەی بەرگریکردن لە مافی ویلایەتە کوردییەکانی رۆژهەڵات لە برۆسکەیەکدا کە لە١٠ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩ بۆ مستەفا کەمال پاشای هەنارد، متمانەی پێدا سەرۆکایەتی کۆنگرەی کۆمەڵەکە لە ئەرزروم بگرێتە ئەستۆ- چونکە هەردووك- واتە مستەفا کەمالو کۆمەڵەکە- تێدەکۆشن بۆ رزگارکردنی وڵات لە داگیرکەران. لەبەر ئەوەی کۆمەڵەکە بڕوای پێیەتیو رێزی لێ دەگرێو وەك فریادرەسێك سەیری دەکات لەم میحنەتەی بەسەر وڵاتدا هاتووە (٢٣/٩٢٤) لەبەر ئەم دەسپێشخەرییە گەورەو گرنگە لەم قۆناغە سەختەی وڵات پێدا دەڕوات، مستەفا کەمال پاشا ئەم ویستو ئارەزووەی رایف ئەفەندی (سەرۆکی کۆمەڵەی بەرگریکردن لە مافی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات) بۆ هەموو ویلایەتەکانی تر، ئەوسا کۆنگرەی ئەرزروم لە ڕێکەوتی ٢٣ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩ بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال پاشا بەسترا، کە ئەم وتارەی لەپێش ئەندامانی کۆنگرە خوێندەوە (٢٣/٩٢٦).

**ئامادەبووانی بەرێز:**

گەلەکەمان لە٣٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ رازی بوو لە سەر ئاگربەست لەگەڵ دەوڵەتانی ئیئتیلاف بۆئەوەی ئاشتی لەم ناوچەیەدا بەرقەرار بێتو هەر گەلێك مافی خۆی لە

ژیانێکی ئازادو شەرفمەندییانەدا وەدەست بێنێ، بەڵام ئەو دەوڵەتانە پایتەختی سەڵتەنەتیان لە ئەستەموڵ داگیرکردو هانی یۆنانییەکانیان دا دەست بە سەر ئەزمیرو شوێنەکانی تردا بگرن، ئەوەش واتا سەرشۆرکردنو ملکەچکردنی میللەتو خەلیفەی موسلمانانیش تێکڕا، لە دەستدرێژییەکی ئاشکرادا.

حکوومەتی ئەستەموڵ هێندە بێدەسەلاتیو سەرشۆڕی پێشان دا، بەشێوەیەك ئەرمەنییەکان زاتی ئەوە بکەن لە ویلایەتە ئازیزەکانی رۆژهەلاتمان، دەوڵەتێك بۆ خۆیان دابنێن، لەولاشەوە یۆنانییەکان هەموو ناوچەکانی تەراقیاو دەوڵەتانی ئیئتیلافیش ئەو دوای ناوچەکانی ئەنادۆڵیان داگیرکرد بۆ زیندە بە چاڵکردنی هەموو ئاواتێکی ئەم گەلە لە ژیانی سەربەستیو خۆشیو سەربەخۆییدا.

ئەوە هەقیقەتێکی مێژوویی حاشا هەڵنەگرە، کە ناکرێ بوونی هیچ گەلو میللەتێك هەڵبوەشێنرێتەوەو مافی بخورێو حوکمی لەناوبردنی بەسەرا بدرێ، ئەگەر ئەو گەلە وەپەرۆشی ئازادی بێتو لەپێناو شەرەفو سەربەخۆییدا تێبکۆشێت، لەبەر ئەوە میللەت لە وڵاتی ئەنادۆڵ بڕیاری دا مافی خۆی لە داگیرکەرو زۆرداران بسێنێ، بۆ ئەمەش بڕیاری دا بە دامەزراندنی ئەم کۆمەڵانە: کۆمەڵەی بەرگری لەمافو پاراستنی ماف، پارێزگاری لە نیشتمانو رەتکردنەوەی پاشکۆیی بوونو ئینتیداب هەروا دامەزراندنی هەموو کۆمەڵەکانی تر لەپێناو مسۆگەرکردنی پاراستنی پیرۆزییەکانمان.

ئێستاش، پاش ئەوەی، نوێنەرەکانمان کە ئینگلیز دووری خستبوونەوە، گەیشتنە دوورگەی ماڵتە، بەرەو پاریس بۆ بەشداریکردن لەکۆنگرەی ئاشتی، بڕیاردرا بە یەکخستنی ئەو کۆمەڵانەی لەپێناو نیشتمانو گەلدا خەبات دەکەن، لەناویەك کۆمەڵەدا لەگەڵ پێکهێنانی حکوومەتێکی نیشتمانیی سەربەخۆی کاتیو دوور لەدەسەلاتی بێگانەو بەبێ قەبوڵکردنی پاراستنی هیچ لایەك، ئەم حکومەتەش لەو کۆمەڵە لەدایك دەبێ بۆ پاراستنی قودسییەتەکانمانو ئومێدمان زۆرە خوای گەورەو میهرەبان بە حورمەتی خۆشەویستی خۆیو پێغەمبەری سەروەرمان گەلی نەجیبمان سەربخات کە پارێزەری ئایینی هەقو ئایینی محەمەدی شەریفە تا رۆژی پەسلاَن و پارێزەری مەقامی بەرزی سەڵتەنەتو خیلافەتی مەزنو ئەنجومەنەکەی ئێمەشە کە پاراستنی ئەو پیرۆزیانەی پێ سپێردراوە.. ئامین)).

له٢٤ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩، کۆنگرەی ئەرزروم، ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتیی کۆمەڵەی (بەرگری لەمافی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ)ی هەڵبژارد، کە بارەگای لە(ئەرزروم)ە ، لەم کەسانەی لای خوارەوە: (٩٣٣/٢٣).

١- مستەفا کەمال پاشا پشکنەری پێشووی سوپای ٣,

٢- ڕەووف بەگ وەزیری پێشووتری دەریایی.

٣- عیزەت بەگ نوێنەری تەرابزۆن لەئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی.

٤- رایف ئەفەندی نوێنەری ئەرزروم لەئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی، کورد بوو.

٥- سەروەت بەگ نوێنەری تەرابزۆن لەئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی.

٦- شێخ فەوزی ئەفەندی: شێخی تەریقەتی نەقشبەندی لەئەرزنجان، کورد بوو.

٧- بەکر سامی بەگ، والی پێشووی بەیروت.

٨- سەعدوڵلا ئەفەندی: نوێنەری پێشووی بدلیس (کورد بوو).

٩- حاجی موسا بەگ: سەرۆك عەشیرەتی مۆتی کورد.

دوای تەواوبوونی ئیشو کاری کۆنگرەکە مستەفا کەمال پاشا چەند پەیامێکی بۆ ژمارەیەکی زۆر لەسەرۆك هۆزو کەسایەتییە کوردە ناسراوەکان ناردو تیادا داوای لێ کردن بەشداری بکەن لەبزوتنەوە رزگاریخوازییەکەیو لەبەرامبەریان پێزانینی خۆی وەبیرهێنانەوە بۆ ئەو دەستە سپیو یارمەتییە زۆرەیان کە بۆ خزمەتی ئیسلامو سەرخستنی خەلیفەی موسلمانانو شەڕەکانی عوسمانییەکان دژی دوژمنانیان پێشکەشیان کردنو هەروا ڕۆڵی دلێرانەیان لەسەندنەوەی بدلیس لەچنگی دوژمنان (٩٣٧/٢٣). جەختیشی لەوە کردەوە کە دەستکێشانەوەی لەسوپا- ولەو شەرەفە سەربازییەی ئاشقییەتی- بۆ ئەوە بوو ئەم بزوتنەوە نیشتمانییە بە پشتیوانی کەسایەتییە نیشتمانییەکانی وەك خۆیان، بەرپا بکات (٩٣٨/٢٣) کە بە هیچ کلۆجێك کەمتەرخەمی ناکەن بۆ بەشداریکردن تیادا، ئەو کەسایەتییانەش ئەمانە بوون: حاجی موسابەگ سەرۆکی هۆزی موتکیو یەك لەوانەی مستەفا کەمال پاشا کاتێك سەرکردەی لەشکری دوو بوو لەناوچەی ئەو هۆزانە وتووێژی لەگەڵدا کردبوو سەبارەت بە کێشە نیشتمانییەکان، شێخ عەبدولباقی ئەفەندی لەبدلیس، عەبدولرەحمان ئاغا لەشیرناك، عومەر ئاغا لەدرشا، رەسول ئاغا لەموش، شێخی مەزن زیاددین ئەفەندی لەنورشەمس، جەمیل چەتۆ بەگ لەسەرۆکەکانی غرزانو ئەوانیتر (٩٤٤/٢٣). بێجگەلەمەش پەیامێکی تایبەتی بۆ (شێخ مەحموود) لەسلێمانی نارد تیادا داوای لێدەکات هاوکاری لەگەڵدا بکاتو هەوڵبدات بۆ

بەرپەرچدانەوەو بەکژداچوونی ئەو پڕوپاگەندە ژاراوییانەی ئینگلیز لەناوچەکە بڵاویان دەکاتەوە، جەختیشی بۆ کردووە کە بزوتنەوەکەی، موسوڵمانەکانو خەلیفەکەیان لەریسوایی‌و کۆیلایەتی دەردێنی‌و نیشتمانیش لەدابەشبوونو پەرتبوونو داگیرکردن رزگار دەکات بۆ ئەوە سەربەخۆیی وەدەستبێنێ‌و هاوڵاتیانیش بە ئازادی‌و کەرامەتییانەوە شادو بەختەوەربن (٩٤٢/٢٣).

بەڵام هەموو ئەم پەیامو داواکارییانەی بۆ پشتگیری‌و هاوکاریکردنی لەگوێی هەندێ لەسەرۆك‌و رابەرانی کورد وەکو گیزەی مەگەز وابوو، چونکە مستەفا کەمال پاشا سەرانی هەندێ لەکۆمەڵەی (تەعالی کورد)ی تاوانبارکرد بە هاوکاریکردن لەگەڵ ئینگلیز بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانو هەوڵدان بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەکەی‌و پیلانگێڕی لەدژی شەخسی خۆی.  لەبەر هەوڵدانی مستەفا کەمال بۆ دەسگیرکردنی کوبرتین نۆئیل‌و نەوەو کوڕەکانی بەدرخان پاشا کە لەگەڵیدا هاوکارییان کردبوو (١١٦/٢٣) سەرەڕای رێگە نەدانی خۆی‌و سەرکردە سەربازییەکانی بەپێکهێنانی تیپی سەربازی کوردی لەلایەن کوردەکانەوە لەئەرزروم بۆ بەرگریکردن لەویلایەتەکانی رۆژهەڵات (١٠٩/٢٣) هەروا رێگەنەدان بەدامەزراندنی هەر بزوتنەوەیەك بەناوی کوردەوە لەناوچەکەدا (١٢٥/٢٣)، لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە کوردەکان بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان لەگەڵ ئەوەدا بوون هاوکاری لەگەڵدا بکەنو شان بەشانی تورکەکان لەشەڕی رزگاریخوازیی میللیدا هاوبەش بنو مەسەلەی مافی نەتەوەیی کورد بۆ پاش رزگاریبوون دوابخرێ، ئەندامەکانی کۆمەڵەی (بەرگریکردن لەمافی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات) نوێنەرایەتی ئەم بەشەیان دەکرد.

بەشی دووەمیشیان: رەتیدەکردەوە هاوکاری لەگەڵ مستەفا کەمال پاشا بکاتو بانگەشەی دەکرد بۆ پێوەندیکردن بە دەوڵەتانی ئیئتیلافەوە لەپێناو سەندنی مافی نەتەوەیی کورد بەرێگای کۆنگرە نێونەتەوەییەکان. کۆمەڵەی تەعالی کوردستانو بنەماڵەی بەدرخان پاشا سەرۆکایەتی ئەم بەشە، یان ئەم لایەنەیان دەکرد، لەبەر ئەمە دەبینی بەشی یەکەم یان کۆمەڵی یەکەمیان لەکۆنگرەی سیواس کە لەچواری ئەیلوولی ساڵی ١٩١٩ بەسترا پێکهاتبوو لەم بەرێزانەی خوارەوە بە سیفەتی نوێنەرانی کۆمەڵەی بەرگریکردن لەمافی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بە شاندێك بەشدارییان کرد:

١- مستەفا کەمال پاشا.

٢- ڕەووف بەگ.

٣- زانای ئایینی ڕایف ئەفەندی (کورد بوو).

٤- شێخ فەوزی ئەفەندی (کورد بوو).

٥- شێخ سامی بەگ.

لەوێدا، کۆنگرەی ناوبراو (مستەفا کەمال پاشا)ی بە هاوکاریو پشتگیریی نوێنەرە کوردەکان، بە سەرۆك هەڵبژارد پاش ئەوەی هاوڕێی گیانی بەگیانیو هاوبەشی بزوتنەوەکەی، ڕەووف بەگو چەندین کەس لەئەندامانی کۆنگرە بەرهەڵستی ئەوەیان کرد (٨٧/٢٣).

عیسمەت ئینۆنۆ لەیادداشتەکانیدا سەبارەت بە پشتگیری کورد لەتورکەکان لەسەروبەندی شەڕی ڕزگاریخوازیدا، دەڵێت: ((کوردەکان بە گشتی پێیان باشتر بوو کە لەچوارچێوەی کۆمکاری تورکیدا بمێننەوە لەپێناو پاراستنی یەکێتی خاکی نیشتمان، لەبەر ئەمە هاوکاری گەورەیان پێشکەش کردین، لەکۆنگرەی ئاشتی پاریسیشدا هەموو دوپاتمان دەکردەوە.. ئێمەی تورك فلانە شتو فیسارە شتمان دەوێ، یان ئەم شتەمان ڕەتدەکردەوەو بە شتەکەی تر ڕازی دەبووین...)) (٢٤/٢٦).

کۆنگرەی سیواس زۆرێك لەو بڕیارانەی دەرکرد کە جەختیان دەکردەوە لە سەر دواخستنی کێشەی کورد بۆ ماوەی پاش ڕزگاری، بۆ نموونە ناوی (کۆمەڵەی بەرگریکردن لەمافی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات)ی گۆڕی بە (کۆمەڵەی بەرگریکردن لەمافی ئەنادۆڵو وڵاتی ڕۆم)، پاش ئەوەی نوێنەرانی هەموو ناوچەکانی تورکیا لەم کۆنگرەیە ئامادەبوونو کۆنگرە بەرهەڵستی لەهەموو شێوەیەکی ئەو دەوڵەتۆکانە کرد کە دەوڵەتانی هاوبەند (ئیئتیلاف) هەوڵیاندا لەناوچەکانی بن دەسەڵاتی خۆیاندا دایانبنێن. کۆنگرە دیسان بە پێویستی زانی حوکمێکی سەربەخۆ لەناوچەکە یان لەو ناوچانەی داگیرکەران لێی دەکشێنەوە یان ناچار دەکرێن لێیان بکشێنەوە، دابنرێ، سەرڕای ئەوە نابێ ئینتیدابی هیچ دەوڵەتێك لەدەوڵەتانی ڕۆژئاوا قەبووڵ بکرێو خۆئامادەکاریش دەستپێبکات بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی کە ماوەی (٤) ساڵە پەکی کەوتووە (١٤٢/٢٣).

بەو جۆرە دوای ئەوە هەموو شتێك لەپێش (مستەفا کەمال دا) گوشادو ئاسان بوو، بەسەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیو پشتگیریکردنی لەلایەن سەرانو گەورەو پیاوانی ئایینی کوردەوە، ئیدی بیری لەدوو مەسەلەی گرنگ دەکردەوە:

یەکەم/ ئامادەکردنو تەیارکردنی هەموو چینو توێژەکانی گەل لەئەنادۆڵ بە هەموو نەتەوەکانییەوە لەبزوتنەوەیەکی میللی رێكو پێك بۆ ئەوەی لەگەڵ داگیرکەراندا بجەنگێو لەئەنادۆڵ وەدەریان بنێ.

دووەم/ هاوکاری کردن لەگەڵ سیستمی نوێ لەرووسیای سۆڤیتیو بتەوکردنی پێوەندیی دۆستانە لەگەڵیدا لەپێناو زاڵبوون بەسەر کۆسپوتەگەرەکانداو بۆ وەرگرتنی یارمەتی لەو حکوومەتە نوێیە بەو سیفەتەی کە بزوتنەوەی کەمالی، بزوتنەوەیەکی میللی رزگاریخوازییە.

بەپێی مەسەلەی یەکەم، ئەوە بوو مستەفا کەمال لەگەڵ هەموو چینو ئەو کۆمەڵە رێکخراوانەی کاریگەرییان هەیە لە ئەنادۆڵ وەك سەرۆکانی هۆزو رێبەرانی تایفە ئاینییەکان لەشێخانی رێبازی ئاییینیو ئیمامو پێشنوێژانی مزگەوتەکانو کەسایەتیی پایەداری کۆمەڵایەتی لەناوچەکە، هاوکاری کرد، بەمەش توانیی بنکەیەکی میللی فراوان لە ئەنادۆڵ بۆخۆی ئامادە بکاتو پشتی پێ ببەستێتو لێوەی بجولێت بەرەو شەڕی رزگاریخوازی لەدژی داگیرکەرە ئینگلیزو فەرەنسیو یۆنانییەکان.

کورد خزمەتێکی زۆر گەورەیان پێشکەش بە بزوتنەوەی نیشتمانی تورك کرد کە دەرەنجام بووە بەردی بناغەی کۆماری تورکیای نوێ (٢٨٦/٨) لەکاتێکدا ئەرمەنییەکان بە پشتیوانیو کۆمەکی زۆری ئەوروپا بڕیاریان دا لەپشتەوە زەبرێکی گەورە بکێشن بە بەرەی نیشتمانی تورکیا لەبەر ئەوەی مەترسییە لەسەر (ئەرمینییای گەورە) کە پەیمانی سیڤەر پێیانی بەخشی. بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە کۆماری یەریڤانی ئەرمەنی لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٢٠ هێزە سەربازییەکانی لەسەر سنووری رۆژهەڵاتی باکووری تورکیا خڕکردەوەو هەڕەشەی دەکرد بێنە ناو تورکیاوە، لەبەرامبەر ئەم مەترسیەدا کازم قەرابەکر پاشا بە لەشکرێکەوە کە زۆربەی کورد بوو لەمانگی ئابی هەمان ساڵ دەستی خۆی خستە پێش بۆ شەڕی سوپای ئەرمەنیو توانی دەست بگرێ بەسەر قارس پاش ئەوەی پەندێکی وای پێدا نەتوانێ بیر لەدەستدرێژیو هێرش بردن بکاتەوەو ئەگەر دەستێوەردانی حکوومەتی کۆماری سۆڤێت لەو کێشەیە نەبوایە، کۆماری ئەرمەنی لەیەریڤان داری بەسەر پەردوویەوە نەدەما (٢٨٥/٨).

کورد وە نەبێ تەنها لەبەرەکانی شەڕی رۆژهەڵاتو باشوور یارمەتیو خزمەت پێشکەش بە بزوتنەوەی نیشتمانی تورکان بکەن، بەڵکو نیشانەی ئەم یارمەتیو خزمەتە، لەشەڕەکانی سەقاریاو ئەفیونی قەراحەسارو ئینونۆو ئەو شەڕە گەورەیەش زۆر بەروونی دیارە کە سەرکەوتنی یەگجارەکی وەدەست هێناو تێدا یۆنانییەکان نوشوستیان هێناو شکان (٢٨٧/٨)،

سەرڕای ئەوە هێزەکانی ئەرمەنیش کە فەرەنسییەکان یارمەتییان دەدان بۆ پێکهێنانی ئەرمینیای گەورە لە ناوچەی کیلیکیا لە پێش سوپاکەی صلاح الدین پاشا کە زۆرینەی کورد بوو، هەرەسیان هێنا (٢٨٧/٨)و فەرەنسییەکان ناچار بوون پەیمانی ئەنکەرەی بەناوبانگ لەساڵی ١٩٢١ مۆر بکەن.

بە پێی مەسەلەی دووەمیش (هاوکاریکردن لەگەڵ یەکێتی سۆڤیت)، ئەوە مستەفا کەمال دەرکی بە پێگەی ستراتیژی وڵاتەکەی لە نێوان رۆژئاواو یەکێتی سۆڤیت کردبوو (٦٩/١٩)، بۆیە بە لایەوە گرنگ بوو لە هەردوو لا سوود وەربگرێ بۆ دەرهێنانی وڵاتەکەی لە ژێر باری برسێتیو داگیرکردن لە لایەكو لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی سەروەریی تەواوی بەبێ هیچ کۆتو مەرجێك وەدەست بێنێ. جا بە نواندنی نەرمیو زمان لووسی روویکردە ئەو سۆڤیتیانە کە سنوورەکانی رۆژهەڵاتی تخوبی تورکیایان والاکرد بۆ یارمەتیدانی بە کەرەستەی شەڕو چەكو تراکتۆرو دانەوێڵە. بەڵام سۆڤێت نرخی ئایدیۆلۆژییان لە بەرامبەر ئەم یارمەتییە لێ دەویست، نەوەك پارە، بۆیە زۆری نەبرد گرێی دڵیان بۆ مستەفا کەمال کردەوە بۆ ئەوە رازی بێت لە سەر دامەزراندنی پارتێکی کۆمۆنیستی لە تورکیا ئەو ئەندامو لایەنگرانی بەناوی لەشکری سەوزەوە شەڕی داگیرکەر بکەن، مستەفا کەمال لەسەر ئەم داواکارییە رازی بوو، بەمەشیان ویستی ئیشارە بە رۆژئاوا بدات کۆمۆنیستی وا خەریکە لە دەرەنجامی داگیرکاریی هێزەکانی هاوپەیمان دزە بکاتە ناو ئەنادۆڵەوە.

پارتی کۆمۆنیستی تورکیا (لەشکری سەوز) دەستیکرد بە پەخش کردنی بیروباوەڕەکانی لە رۆژنامەی تێکۆشانو گێتی تازەدا، کە سەرنووسەرەکەی عارف ئوروج بوو و ئەحمەد حیلمی خاوەن (رۆژنامەی تێکۆشان)و پزیشکی بەیتەری نوری دەرسیمی کوردو بازرگانێك بەناوی (نوری) کۆمەکیان دەکرد. لەپاش ماوەیەکی کەم شاندێکی سۆڤێت سەردانی ئەنادۆڵیان کرد بە نیازی فراوانکردنی ئاڵقەی حیزبی ناوبراو، لەنێو شاندەکەدا شەریف ماناتۆفو زینەتوڵلا نەوشیروانو مستەفا سوبحی هەبوون، کە ئەم کەسەی دواییان پاشتر پارتێکی کۆمۆنیستی نهێنی لە تورکیا دامەزراند، لە سوشیالیستی نێونەتەوەیی سێیەمیش نەریمانۆڤی ئازەربایجانیو سولەیمان سامی ئامادە بوون (٦٩/١٩).

کۆنگرەی ئەرزروم وەکو ئەنجومەنێکی دامەزرێنەر وابوو بە لای تورکیای تازەئیجادەوە، چونکە کۆنگرەکە بە هەڵبژاردنی مستەفا کەمال بۆ سەرۆکایەتیکردنی بەکۆی دەنگەکان، بەردی بناغەی یەکەمی ئەو کۆمارەی دانا. مستەفا کەمال لەوتارەکەیدا لەپێش کۆنگرە

جەختی کردە سەر دامەزراندنی دەوڵەتی تورکی لەچوارچێوەی سنووری ئەنادۆڵ تاوەکو ببێتە دەوڵەتێك تیادا یاسا سەروەرو بە سەربەخۆیی سیاسی بێ کۆتو بەندیش شاد بێت بە ڕێکخستنو یەکخستنی هەموو کۆمەڵە نیشتمانییە کاراکانی دژ بەداگیرکاری بیانی، کۆنگرە کۆتایی بەکارەکانی هێنا پاش ئەوەی ئەم بڕیارانەی خوارەوەی دەرکرد (٦٦/١):

أ-ئەنادۆڵ بە سنوورە نەتەوەییەکەیەوە یەك نیشتمانەو دابەشبوون قەبووڵ ناکات.

ب-لەحاڵێکدا دەوڵەتی عوسمانی رووخاو دابەش بوو، ئەوا گەلی تورك لەپێناو مافەکانی تێدەکۆشیو بەرگری لە نیشتمانەکەی دەکات لە دژی بێگانە.

ج-لەکاتێکدا حکوومەتی ناوەند نەیتوانی سەربەخۆیی نیشتمان بپارێزێ، ئەوا حکوومەتێکی کاتی هەڵبژێردراو لە لایەن کۆنگرەی نیشتمانی گشتییەوە پێکدێت، لە حاڵێکیشدا ئەوە نەکرا، ئەوا دەستەی دامەزرێنەر ئەرکی هەڵبژاردنی دەگرێتە ئەستۆ.

د-پێویستە کار بکرێ بۆ ڕێکخستنو وەگەڕخستنی چالاکی هێزە نیشتمانییەکان لە پێناو وەدیهێنانی سەروەریی ئیرادەی میللەت.

ه-ناکرێ چینەکانی مەسیحی ئەو مافو ئیمتیازاتانەیان بدرێتێ کە دەبنە مایەی تێکدانی سەروەریی نیشتمانیو هاوسەنگی کۆمەڵایەتیی.

و-بەهیچ شێوەیەك ئینتیداب لە سەر تورکیا، یان پاراستن لە سەر تورکیا لە لایەن هەر لایەکەوە بێت، قەبووڵ ناکرێ.

ز-پێویستە کار بکرێ بۆ بەستنی ئەنجومەنی (مەبعوسانی عوسمانی)و ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەتو زامنکردنی سانسۆری میللی لە سەر کارەکانی.

بەگوێرەی خشتەی کارەکانی کۆنگرەکە، دەستەیەکی دامەزرێنەر لە(٩) کەس بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال دەستنیشان کرا کە لقەکانی ئەم گردبوونەوە نیشتمانییە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دامەزراند. کوردەکان پێش ئەمە (کۆمەڵەی بەرگریکردن لەماف لەڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ)یان دامەزراندبوو، بەڵام ئەو کۆمەڵەیە چووە پاڵ (کۆمەڵەی بەرگری لەماف لەئەنادۆڵو وڵاتی ئەرزروم) کاتێك کۆنگرەی ئەرزروم لە٣ی تەموزی ساڵی ١٩١٩ بەسترا پاش ئەوەی ٣ کورد بەئەندام لەکۆی (٨) ئەندام وەك لێژنەی سەرپەرشتیکار لەسەر کۆنگرەی ناوبراو هەڵبژێردران ئەمانە بوون: شێخ فەوزی سەرۆکی تایفەی نەقشبەندی لەئەرزنجان، سەعدوڵڵا لەسعرتو حاجی موسا سەرۆکی هۆزی موتکی (٦٥/٤).

کاتێك ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورکی لەئەنکەرە ساڵی ١٩٢٠ بەسترا، (٧٢) نوێنەری تیابوو نوێنەرایەتی کوردیان دەکرد، ئەمانە هاوکارییان لەگەڵ مستەفا کەمالدا کرد لەپێناو وەدیهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانیان (٥٨/٨).

کۆنگرەی ئەرزروم جۆشو حەماسەتی نیشتمانی خستەبەر جەماوەرو خەڵکی دەستیان کرد بە رێکخستنی بەرخودان لەدژی داگیرکەرانو لەزۆربەی ویلایەتەکاندا چەند کۆمەڵەیەکی بەرگری نیشتمانی دامەزرا، بەڵام ئەم کۆمەڵانە بە پاڵنەری هەستی نیشتمانی خۆیان کاریان دەکرد بەبێ ئەوە بدەنە پاڵ گردبوونەوەی نیشتمانی کە دەرەنجامەکەی کۆنگرەی ئەرزرومی لێکەوتەوە.

لەبەر ئەوە مستەفا کەمال داوای کرد کۆنگرەیەکی نوێ لەشاری سیواس لەڕێکەوتی ١٩١٩/٩/٤ ببەسترێو ئەویش (واتە: کۆنگرە) مستەفا کەمالی بەسەرۆکی خۆی هەڵبژارد دوای ئەوەش کۆمەڵەی بەرگریکردنی ماف لەئەنادۆڵو (وڵاتی رۆم واتا: تورکیای ئەورووپی ئێستا) دامەزرا و ئەندامی نوێشیان بۆئەو دەستە دامەزرێنەرە هەڵبژارد کە پرنسیپەکانی پەیمانی نیشتمانیو ئایدیۆلۆژییەتی نوێی دەوڵەتو رێبازە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی دانا (٦٧/١).

کۆنگرەی سیواس پێش کۆتاییهێنان بە دانیشتنەکانی بڕیاری دا بە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی لەناوچە رزگارکراوەکانی تورکیاو لەپاشان ناردنی نوێنەرە نوێیەکان بەرەو ئەنجومەنی (مەبعوسانی عوسمانی) لەکاتی گرێدانیدا لەئەستەمووڵ، ئەمە وەکو هەوڵێك بۆ پێکانی دوو چۆلەکە بە بەردێك:

یەکەمیان/ بۆ پێشاندانی هێزی بەرگری میللی لەبەرامبەر داگیرکردنو ئەوەش پێشان بدات کە هێزەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال ناوچەکانی رۆژهەڵاتی وڵاتیان کۆنترۆڵ کردووە.

دووەمیان/ شپرزەکردنو ئیحراجکردنی ئەو ئینگلیزانەی کە پشتگیری دەسەڵاتی خەلیفەی هاوپەیمانیان دەکەن لەدژی مستەفا کەمالو بزوتنەوەکەی.

کاتێك ئەنجومەنی مەبعوپان لە١٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٠ کرایەوە نوێنەرانی سەر بە مستەفا کەمال چوونەریزی ئەم ئەنجومەنەوەو بە راشکاویی بەرگرییان لەبزوتنەوەی بەرخودان لەدژی داگیرکردن کرد.. لەبەرامبەر ئەمە ئینگلیز دەسبەجێ فەرمانی بەهێزەکانی هاوپەیمان دا ئەستەمووڵی بارەگای خیلافەت لە١٦ ئاداری ١٩٢٠ داگیر بکەن، پاشانیش

هێزەکانی ئینگلیز چوونە ناو ئەنجومەنی مەبعوسانو داوایان لەسەرۆکایەتی ئەنجومەن کرد نوێنەرە کەمالییەکانیان تەسلیم بکەن..

ئەمە لەحاڵێکدا روویدا ئەنجومەن کۆبوونەوەی خۆی گرێدا بوو، هۆڵەکە زەناو غەڵبە غەڵبێك دایگرت ئەو پەڕی نەبێ کە دوای ئەمە سەرۆکی ئەنجومەن داوای لەئەفسەرە ئینگلیزەکان کرد سەنەدێك ئیمزا بکەن تیا بڵێن ئێمە نوێنەرانی ناوبراومان گل داوەتەوە.

سەرکردەی هێزە ئینگلیزیەکە بەمە رازی بوو و سەنەدەکەی ئیمزا کرد، بۆ رۆژی دواتر رۆژنامەکان هەواڵی دەستدرێژی ئینگلیزیان بە گلدانەوەی هەر پێنج نوێنەرە کەمالییەکان بڵاوکردەوە، بە گەیشتنی ئەم هەواڵە رای گشتی لەناوەوەو دەرەوەی وڵات هورووژا. کەمالییەکان ئەمەیان وەك شێوازێك قۆزتەوە بۆ زڕاندنی ناوی ئینگلیزو زوڵمو ستەمو هاوکارییان لەگەڵ خەلیفەدا- دواجار بەدڵنیاییەوە زانرا کە بۆ ئەو مەسەلەیە پێشتر مستەفا کەمال لەگەڵ ئەو (٥) نوێنەرە رێککەوتبوو- و پاشان کار بکرێ بۆ گواستنەوەی ئەنجومەن بۆ ئەنکەرە، ئەمەش وەك سەرەتایەك بۆ کێشانەوەی شەرعییەتو سەندنەوەی لەحکوومەتەکەی ئەستەموڵ. بەو جۆرە ئەنجومەن دوا کۆبوونەوەی لەئەستەموڵ لە ڕێکەوتی ١٨ی ئاداری ساڵی ١٩٢٠ گرێدا، واتا (٢) رۆژ پاش دەسدرێژیکردنە سەریو لەسەر داوای یەکێك لەنوێنەرانی سەر بە کەمالییەکان، کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەن بۆ کاتێکی تر دواخران.

مستەفا کەمال ئەم هەلە زێڕینەی قۆزتەوەو بەیاننامەیەکی بۆ ڕای گشتی تورکی بڵاوکردەوە تێدا گوتی: ((لەبەر نەمانی سەروەریی دەوڵەتی عوسمانی- کە نزیکەی (٧) سەدساڵ بەردەوام بوو- لەئاکامی داگیرکردنی بارەگای خیلافەتو پایتەختی دەوڵەت لەلایەن ئینگلیزو دەستدرێژی کردنیان بۆسەر ئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی کە وایکرد کۆبوونەوەکانی هەڵپسێرێ بۆ کاتێکی تر... بۆیە داوا لەئەنجومەنی مەبعوسان دەکەم کۆبوونەوەیەکی (فوق العادە) لەئەنکەرە ببەستێ بۆ تاوتوێکردنی چارەنووسی گەلی تورکو مافی ژیانو سەربەخۆییو بریاری چارەنووسی لەم بارودۆخە ناسکەدا...)) (٦٨/١).

بەو شێوەیە ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورە) لە یەکەمین دانیشتنی لە ئەنکەرە لە رێکەوتی رۆژی ٢٣ی نیسانی ١٩٢٠ خۆی کۆکردەوە بە ئامادەبوونی ١١٥ نوێنەر توانییان لەکاتی دیاریکراودا بگەن لەکاتێکدا پاشماوەی ئەندامەکانی تریش لەسەرەتای مانگی ئایار گەیشتن، ئەوانە نوێنەرایەتی چینو توێژە جیاجیاکانی گەلیان دەکردو پێکهاتبوون لە: ئەندامانی ئەنجومەنی مەبعوپانی عوسمانی، نوێنەرانی تازەی هەڵبژێردراو، سەرکردە سەربازییەکان،

تاکەکانی هێزە میللیە شەپقەرەشەکان، سەرکردەکانی بەرگری نهێنی، سەرکردەکانی حیزبە سیاسییەکان، سەرۆك هۆزەکان، ئیمامو وتار خوێنانی بەکتاشی، شێخانی مەولەویو سەرۆکانی تایفە ئایینیەکان. ئەم ئەنجومەنە (مستەفا کەمال)ی نوێنەری ئەرزرومی بە کۆی دەنگ وەك سەرۆك دەستنیشان کرد، ئەمەش وەك شەرعییەت دانێك بوو بۆ گشت فەرمانو رێنماییەکانی بەو پێیەی سەرۆکی حکوومەتی کاتییە.

ئەوە مەسەلەیەکی سروشتی بوو کە ناکۆکی ئایینزاییو سیاسی لەنێوان ئەم تێکەڵە ناهاورەگەزییەی نوێنەرانی (ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە) سەر هەڵبدات، ئەوی راستیش بێت چەندین گرۆو کۆمەڵی سیاسی لەنێو ئەنجومەنە نوێیەکە بەدەر کەوتن، وەك: باڵی سەربەخۆیی، گروپی چاکسازی، گرۆی میللی، کۆمەڵی پاراستنی پیرۆزییە ئایینیەکان، کۆمەڵی پاراستنی مافی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات- کوتلەی کوردەکان-. ئەمە لەلایەکەوە وایکرد کۆسپو تەگەرە بکەوێتە پێش بەرێوەچوونی کارەکانی، ئەنجومەنو لەلایەکی دیکەوە کوتلەکانیش فراوانتربن بۆ ئەوە ببنە بناغەیەك بۆ حیزبە سیاسیەکان لەم قۆناغە بەراییەی بزوتنەوەی گەلی تورکی لەدژی داگیرکەر. مستەفا کەمال پێی وابوو ئەم ناکۆکییانە لەخزمەتی ئەم قۆناغەدا نییە کە وڵات پێدادەڕوات، بۆیە بڕیاری دا کۆمەڵی بەرگریکردن لەمافی ئەنادۆڵو وڵاتی رۆم سەر لەنوێ ببوژێنێتەوە، وهێندەی پێ نەچوو هەموو کۆمەڵەکانی تر هاتنە پاڵ ئەم کۆمەڵەو بەمە جارێکی تر یەکێتی ئەنجوومەنی گەورەی وڵات هاتەدی کە قۆناغی سەربەخۆییو دەرکردنی داگیرکەر پێویستی پێیەتی (٦٩/١).

پاش ئەوەی کۆنگرەی لۆزان کوردی لەتوکیا بێهومێدو دەسخەڕۆکرد، چونکە تەنها جەختی کردبووە سەر رێزگرتن لە مافی رۆشنبیریو ئایینی کەمایەتییەکان، کێشەی کورد تەنها لە مەسەلەی مووسڵ چەقی بەست لێرەش ئەرکی ئەو لایەنەی ئەم ویلایەتە عوسمانییە دەخرێتە سەری، بە (کۆمەڵەی گەلان) سپێردرا. بۆ ئەمەش لیژنەیەکی تایبەت پێکهات بۆ زانینی ویستو ئارەزووی دانیشتوانەکەی، لیژنەکە لەساڵی ١٩٢٥ گەیشتە بەغداو پاشان بەرەو موسڵ کەوتە رێو لەوێ لێکۆڵینەوەی گشتی تیا ئەنجامدا، دواجا لیژنە راپۆرتێکی ئامادە کردو لە١٦ی تەمووزی هەمان ساڵ رەوانەی کۆمەڵەی گەلانی کرد، تیادا هاتبوو. ((پێویستە ئارەزووی کوردان لەبەر چاوبگیرێ بۆ دامەزراندنی فەرمانبەریانو زمانی کوردیش بە رەسمی بێت لەفێرگەو دادگاو لێکۆڵینەوەو موحاکەمە کردندا، لیژنە پێیشی وایە لەحاڵێکدا ئەگەر هات زەمانەتی تەواوو بەڵێنی بەهێز بەکورد نەدرێ بۆ ئەوەی ئیدارەیەکی نێوخۆیی

سەربەخۆیان هەبێت (٤) ساڵ دوای پەسەندکردنی پەیمانی ئینگلیزی- عێراقیو نەمانی کۆمەڵەی گەلان لەعێراق، ئەوا زۆربەی کوردەکان پێیان باشترە بچنە پاڵ ئیدارەی تورکان نەك سەر بەئیدارەی عێراق بن.(( لەسەر بنەمای ئەم راپۆرتە ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان بریارێکی دەرکرد بە گرێدانی ویلایەتی موسڵ بە حکوومەتی عێراق دوای خستنەڕووی هەندەك مەرجو تەحفوزات)) (١٥٤/١٤). ناوەندە تورکە پێشکەوتنخوازەکان پێیان وایە ئینگلیز خۆی هانی شێخ سەعیدی کوردی داوە بۆ یاخی بوونی چەکداری لەساڵی ١٩٢٥ وەکو هەولێك بۆ دابەشکردنی تورکیا، پاش ئەوەی تورکەکان رازی بوون لەسەر بوونی کورد لەکۆنگرەی سیواسو لەکاتی پێکهاتنی کۆمیتەی سەرکردایەتی شەڕی ئازادیخوازی میللی کە ئەندامە کوردەکانیشی لە خۆگرتبوو، هەروا (لۆزان)یش دانی بەمافی نەتەوایەتیی کەمایەتی کورد لەتورکیا لەچوارچێوەی ئەو پەیمانە نیشتمانییەی مستەفا کەمال بڵاوی کردەوە، ناوە، (٣٥/٢٢)، وابوو، چۆن دەکرێ بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازیی کورد بەرپا بێت ئینگلیزو کۆمەڵەی (هەوادارانی ئینگلیز) کە بارەگاکەی لەئەستەموڵ بوو، سەرکردایەتی بکات. هەروا ئەم بزوتنەوەیە هەولێکی ئاشکرا بوو لەلایەن بەریتانیاوە بۆ لێدانی یەکێتی کوردەکان بە رێگەی بەستنەوەی ویلایەتی موسڵ بەدەوڵەتی عێراقەوە کە زۆرینەی دانیشتوانی بەچڕی لەکەمایەتیی کوردە بە عێراقەوە لەسەر داوای کوردەکانی ویلایەتەکە دوای بەکارهێنانی هێز لەلایەن تورکیاوە بۆ دامرکاندنی یاخیبوونەکەی شێخ سەعیدو بەکاربردنی سیاسەتی بە تورك کردن کە دوای ئەمە بەکار برا (٣٥/٢٢).

# باسی سێیەم

## کوردو مستەفا کەمال ئەتاتۆرك

دوای ئەوەی حیزبی (ئیتیحادو تەرەقی)، دەسەڵاتی لە دەوڵەتی عوسمانی پاش کودەتاکەی ساڵی ١٩٠٨ وەرگرت، سیاسەتی بە تورك کردنیان لەدژی کەمایەتییە نەتەوەکانی دانیشتووی دەوڵەت، وەك: عەرەبو کوردو چەرکەسو ئەرمەنو ئەوانیتر پیادە کرد. پوختەی ئەم سیاسەتە بریتی بوو لەتوانەوەی زۆرێك لەتوخمە ئەتنیکییەکانی ناو دەوڵەت لەنێو توخمی نەتەوەی تورکو هەوڵدان بۆ سڕینەوەی کلتوورو زمانیانو راگوێزانیان لەناوچەکانی خۆیان. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، خەلیفە سوڵتان محەمەد (رەشاد)ی پێنجەمیان قایل کرد مەرسوومێك بە یاسایەك مۆر بکات(٦٠/١٤) بریتی بوو لەچەند بڕگەیەك رێ بەم سیاسەتە زاڵمانە دەدات.

ئەم یاسایە بەرجەستە بوو لە ئاوارە کردنی هەموو کوردەکان لەزێدی خۆیانو پەرتو بڵاوەپێکردنیان لەویلایەتە تورکییەکان، بە شێوەیەك رێژەی دوورخراوو راگوێزراوان لەهەر شارێکی تورك لە(٥٪)ی دانیشتوانی تورك زیاتر نەبێو بە مەرجێکیش سەرۆكو دەمڕاستو دەسترۆیشتوانی کورد ناچار بکرێن تەنها لەشارو مەڵبەندە تورکییەکان نیشتەجێ بنو دەستو پێوەندەکانیشیان لەپیاوانی هۆزو خێڵەکانی تر لەگوندە دوورەدەستەکاندا نیشتەجێ بکرێن بۆ ئەوەی پێوەندیی لەنێوان خۆیانو نێوان سەرۆکەکانیان نەبێت.

ئاوەها گەلی کورد لەنێوان تورکەکاندا پەرتەوازە دەبن بە شێوەیەك دەکرێ پاش ماوەیەکی کەم زمانی کوردیو هەموو بنەما نەتەوەییو دابو نەرێتە میللییەکانی بزر دەبنو بەوەش دواترین ئاسەواریان لەرووی بوونو وجودەوە دەسڕێتەوەو بە کردەوەش حکوومەتی عوسمانی بۆ کارکردن بەم یاسایە دەسپێشخەری کرد.

لەقەیدو تۆمارگاکانی بەڕێوەبردنی راگوێزەران کە بەم مەسەلەیەوە سەرقاڵ بوون، توانراوە ئەوە وەربگیرێ کە ژمارەی کۆچپێکراوانی کورد لەکوردستانەوە بەرەو ویلایەتە تورکییەکان گەیشتووەتە ٧٠٠٠٠٠ کەس هەروا هەندەك لەتۆمارگاکان بەڵگەی ئەوەیان داوە بەدەستەوە کە چارەنووسی ئەو کوردانەی بەزۆر راگوێزراون بەلای ئەو بەڕێوەبەرایەتییەوە بە تەواوی نەزانراوە (٦١/١٤).

لەسۆنگەی ئەمەش کلیمانسۆی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا لەسەروبەندی شەڕی یەکەمی جیهانی لەلێدوانێکدا گوتی: ((عوسمانییەکان لەسای ئیدارەی خراپو جۆرەها شێوازی زۆڵمو زۆریانو لەمیانەی چەندین سەردەمدا سەلماندیان هیچ جۆرە لێهاتوویی‌و کارامەییەکیان نییە لەبەڕێوەبردنی تونمە ناتورکەکان، جا مادامێك مەسەلەکە وایە پێویستە هیچ نەتەوەیەك لەژێر باری حوکمڕانییاندا نەهێڵین)) (١٤/٦٥).

ئەم لێدوانە گرنگو مەترسیدارەو چالاکییەکانی کۆمەڵە کوردییەکان لەم کاتانەدا وایانکرد (باب العالی) دڵەراوکەو مەترسی دایبگرێ، بۆیە بیری لەفێڵێك کردەوە نەهێڵی کوردستان لەباب العالی جیابێتەوەو سەربەخۆیی لەئیدارەی تورك وەربگرێ. ئیدی رۆژنامەکانی عوسمانی پەیتاپەیتا برایەتی موسلمانێتی‌و برایەتی نیشتمانێتی عوسمانی بەبیر کوردا دەهێنانەوە، پاشان (باب العالی) دەستپێشخەری کرد لەپێکەوەنانی دەستەیەکی وەزاری، لەکێشەی کورد بکۆڵێتەوە و شێوازێکی کارگێڕی بدۆزێتەوە لەکوردستاندا جێبەجێ بکرێ بە جۆریك لەئیدارەی عوسمانی لانەدات، دەستەکەش پێکهاتبوو، لەهەر یەك لە: شیخولئیسلام حەیدەری زادە ئیبراهیم ئەفەندیو عەیوق پاشای وەزیری ئەشغالو عەونی پاشای وەزیری دەریاوانی‌و میرئەمین عالی بەدرخان ئەندامی کۆمەڵەی تەعالی کوردستانو هەریەك لەمراد بەدرخانو عەبدولقادر ئەفەندیی ئەندامانی ئەنجومەنی ئەعیان (١٤/٦٦).

دەستە وەزارییەکە لە(باب العالی) کۆبووەوەو چەند دانیشتنێکی گرێداو دەرەنجام بە رێککەوتن ئەم بڕیارانەی لای خوارەوەی دا:

١- پێدانی ئۆتۆنۆمی بە کوردستان بە مەرجێك کورد رازی بن لەچوارچێوەی کۆمکاری عوسمانی بمێننەوە.

٢- گرتنەبەری رێو شوێنی کاریگەر بۆ جاڕدانی ئەم خودموختارییەو دەسبەجێ دەست بکرێ بە جێبەجێ کردنی ناوەڕۆکی.

رۆژگار تێپەڕی بێ ئەوەی فەرید پاشای سەدری ئەعزەم بڕیارەکانی دەستەی ناوبراو جێبەجێ بکات: نیشتمانپەروەرانی کوردیش هەر ئەوەیان پێ کرا هەوڵە سیاسییەکانیان لەئەوروپا بخەنەوە گەڕ، بۆ ئەمەش هەریەك لەکۆمەڵەی تەعالی کوردو کۆمەڵەی تەشکیلاتی کۆمەلایەتی‌و کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان شەریف پاشایان بە نوێنەری خۆیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی بەرگری لە سەربەخۆیی کوردستان بکاتو هەوڵ بدا بۆ سەرخستنی کێشەی نیشتمانی کورد لە بەردەم هاوپەیمانەکان لە کۆنگرەی ئاشتەوایی، کە لەوێ دوو نەخشەو دوو

یادداشتنامەی سەبارەت بە داخوازیو مافی نەتەوەی کوردی پێشکەش کردن. کار و چالاکییەکانی نیشتمانپەروەرانی کوردو ماندوو بوونیان لەسای سیاسەتی شەریف پاشا ئەم دەرەنجامانەی لای خوارەوەی لێکەوتەوە:

١- بەستنی پەیمانێکی هاوبەندی لەنێوان خۆیو نێوان بەغوس نۆبار پاشای سەرۆکی شاندی ئەرمەنی لەپاریس، کار بکات بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێوان ئەرمەنو کورد بەرێگایەکی ئاشتییانە بەبێ ئەوە بوارە بە دەوڵەتەکان بدرێ دەستێوەردان بکەن.

٢- کار بکرێ بۆ دانپێدانانی هاوپەیمانەکان لە پەیمانی سیڤەردا بە مافی ژیانی کوردو سەربەخۆیی کوردستان.

کۆمەڵەی تەعالی کوردستان کە لە پاش ئاگربەستی مۆنرۆس لە ئەستەموڵ دامەزرا، لە گشت کۆمەڵە کوردییەکانی تر چالاکی زیاترو رۆشنبیرانی کوردیشی پتر لە دەوری خۆی کۆ کردبۆوە، پوختەی بەرنامەی کۆمەڵە لە وەدیهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیدا خۆی دەبینییەوە، بەمەش پاڵی دابوو بەو پرنسیپانەی سەرۆکی ئەمریکا ویلسن بانگەشەی بۆ دەکرد بە پێی پرنسیپی مافی چارەنووس بۆ گەلانی ژێردەستەی حوکمی عوسمانی.

لەبەر ئەوەی بەریتانیا بەڵێنی دابوو بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ گەلی کوردو ئەرمەنییەکانیش داوایان بۆ کۆنگرەی ئاشتی بەرز کردەوە مافی دەوڵەتی سەربەخۆیان پێ بدرێ، بۆیە داخوازیی کوردیش بۆ سەربەخۆیی وەك کەمایەتییەکانی تر، خرایە بەرنامەی کۆنگرەکەوە. لەکاتێکیشدا کۆمەڵەی تەعالی کوردستان بە سەرۆکایەتیی سەید عەبدولقادر سەرۆکی ئەنجومەنی شوورای دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی دەدا بۆ کردنەوەی لقەکانی لەهەموو ئەو قەزاو ناحییانەی کە زۆرینەی دانیشتوانییان کوردن، چونکە (عەبدولقادر) بۆ رێبەرانی کورد تاکیدی دەکرد کەوا کاربەدەستانی عوسمانی بەڵێنیان داوە بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانو دانی مافی خودموختاری لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بەو مەرجە راستەوخۆ ببەسترێ بە حەزرەتی سوڵتانییەوە، لەهەمان کات بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال هەوڵی دانانی پردی پێوەندی دەدا لەگەڵ رێبەرانی کورد لەئەرزروم. ئەوە بوو مستەفا کەمال لەئەیلوولی ساڵی ١٩١٩ پێوەندیی پێوە کردنو داوای کرد لەشاری سیواس لەگەڵیان کۆبێتەوە.عەلی شانو سەرانی هۆزە کوردییەکان لەگەڵیدا دانیشتنو بارودۆخی کێشەی کوردیان بۆ باس کردو ئەوەیان رەتکردەوە دەوڵەتی ئەرمەنی گەورە دابمەزرێ - ئەو پرۆژەیەی خرابووە بەر باس- ورەنگدانەوەی هەبوو لەسەر پەیمانی سیڤەر کە بڕیار

بوو گشت ئەو ویلایەتانە بگرێتەوە کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن، تاکیدیشیان کردەوە تا دوایی تێدەکۆشن لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان.

بەڵام بە گوێرەی ئەو تەلگرافەی مستەفا کەمال لەهەمان رۆژ لەکازم قەرا بەکر پاشا- سەرکردەی هێزە میللییەکان لەناوچەی رۆژهەڵات- وەریگرتو تێدا هاتبوو ناوبراو موقەدەم (نۆئیل) گرتووە کە هاوپەیمانەکان بە رەزامەندیی فەرید پاشا لەئەستەمووڵ ناردبوویان بۆ ئاگادار بوون لەبارودۆخی ناوچەی کوردەکان، هەروا بەدرخانو ژمارەیەك لە بنەماڵەی جەمیل پاشاو والیی مەعموورەی (عەزیز)یشی گرتووە بە تۆمەتی هاوکاریکردن لەگەڵ موقەدەم (نۆئیل)ی سیخوڕی ئینگلیزو بە داڕشتنی پیلانێك بۆ هێرشبردنە سەر کۆنگرەی سیواس کە بڕیاربوو بە سەرۆکایەتیی مستەفا کەمال پاشا ببەسترێ (١٢٣/١٣)، سەبارەت بە کێشەکە مستەفا کەمال بە خۆنازینەوە درێژەی بە قسان داو گوتی، پێی وانییە وەزارەتەکەی فەرید پاشا داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد جێبەجێ بکات، جگە لەوەش کوردەکان پێیان راسپاردووە- واتە خۆی- لەکۆنگرەی ئەرزرومو لەدانوستاندنەکانی ئایندە نوێنەرایەتیی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بکات (٢٧/نتق).

کوردەکان لەپاش ئەم چاوپێکەوتنەیان لەگەڵ (مستەفا کەمال)دا هیچیان لەپێشدا نەما ئەوە نەبێ: هەوڵدەن ریزەکانی خۆیان رێك بخەنو دەست بکەن بە خەبات لەپێناو مافە رەواکانیان. بۆ ئەمەش سەرۆکانی هۆزو عێڵە کوردییەکان لەتەکیەی حسێن عەبدال لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٠ لەنێوخۆیاندا کۆبوونەوەو لەسەر پێکهێنانی هێزێك رێککەوتن کە ژمارەی (٤٥) هەزار شەڕەکەربێت، بەڵام سەبارەت بە چۆنێتی گەیشتن بە ئامانجەکانیان، بوون بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم/ بە سەرۆکایەتی مەچۆ ئاغا- سەرکردەی پێشووی جەندرمەو سەرۆکی هۆزەکانی عەباسان بوو، بە زەرورەتی دەزانی سەربەخۆیی کوردستان جاڕبدرێو کاروچالاکی سیاسی وەگەڕ بخرێ بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجە.

بەشی دووەمیشیان (عەلی شان) سەرۆك هۆزەکانی قۆچگیری سەرکردایەتی دەکرد، ئەمان پێیان وابوو پێویستە بەرنامەی کارێك دابنرێ و لە هەلو مەرجی هاتوو کەڵك وەربگیرێ بۆ گەیشتن بە ئامانج.

بەڵام هەردوو بەشەکە لە رێکەوتی ١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٠ لە هۆزات رێککەوتن لەسەر ئەوەی چەند پرسیارێك بە نووسین بخەنە بەرچاوی حکوومەتی ئەنکەرە بە

ڕێگای سەید ڕەزا پارێزگاری ویلایەتی دەرسیمو داوای لێ بکرێ کە پێویستە حکوومەتی ئەنکەرە بە نووسین وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە (۱۲۹/۱۳) کە بریتی بوون لەم خاڵانەی پایین:

١. ئەوە کارێکی زەرووره حکوومەتەکەی مستەفا کەمال هەڵوێستی خۆی روونو ئاشکرا بکات لەمەڕ بڕیاری حکوومەتی سەڵتەنەت لە ئەستەموڵ سەبارەت بەدانی خودموختاری بۆ کورد.

٢. هەڵوێستیی حکوومەتی مستەفا کەمال لە بەڕێوەبردنی کوردستان بە خودموختاری چییە؟

٣. واپێویست دەکات حکوومەتەکەیان هەموو گیراوەکان لە گرتووخانەکانی عەزیز و مەلاتیەو سیواسو ئەرزنجان ئازاد بکات.

٤. کێشانەوەی هەموو بەرپرسە کارگێڕییە تورکەکان لە ناوچە زۆرینە کوردنشینەکان.

٥. هەموو ئەو هێزانەی بۆ ناوچەی قۆچگیری نێردراون، پاشەکشەیان پێ بکرێ.

مەچو ئاغا ئەم پرسیارە تۆمار کراوانەی گەیاندە والی دەرسیم، هەڕشەی ئەوەی لێکرد کە ئەگەر لە ماوەی (٢٤) ساعات وەڵام نەدرێتەوە، ئەوە بەرپرسیار نییە بەرامبەر ئەوەی دواجا چ دەقەومێ (۱۲۹/۱۳).

بەڵام حکوومەتی ئەنکەرە وەڵامی پرسیارەکانی نەدایەوە، بەڵکو تەنها دەستەیەکی ناردە شاری دەرسیم بۆ ئەوەی چاوی بکەوێ بە سەرۆك هۆزو خێڵەکانی کورد وەکو هەولێك بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە.

وەلێ سەرانی هۆزە کوردییەکان دەستەی ناوبراویان دەرکردو ئەم بروسکەیەی لای خوارەوەیان لە ویلایەتی عەزیزەوە هەواڵەی حکوومەتی ئەنکەرە کرد.

بۆ/ کۆڕی نیشتمانیی گەورە لە ئەنکەرە

دەقی پەیمانی سیڤەر جەختی لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ کردووە کە ویلایەتەکانی دیاربەکرو عەزیزو وانو بدلیس دەگرێتە خۆ، بۆیە پێویستە ئەم دەوڵەتە پێك بهێنرێ، بە پێچەوانەی ئەمەش بڵاوی دەکەینەوە: (( ئێمە ناچارین ئەم کێشەیە بەزەبری چەك وەدەست بێنین)).

لە ١٥ی تشرینی (٢) ١٣٣٦ ك- ١٩٢٠ ز

**ئیمزا سەرۆکانی هۆزە کوردەکانی دانیشتووی خۆرئاوای دەرسیم:**

سەرانی هۆزەکانی کورد هەروا مەترسیی خۆیان دەربڕی لەوەی حکوومەتی نوێی تورکیا کورد لە ناوچەکانی خۆیان ڕابگوێزرێت، ئەم مەسەلەیە بە کردەوە دەسەڵاتدارانی عوسمانی (١٨) جاران لەسەروبەندی حوکمی عوسمانی لەناوچە کوردنشینەکان، پیادەیان کرد (١٤٦/١٣).

بەڵام (٧٢) نوێنەری کوردی هەڵبژێردراو لە(کۆڕی نیشتمانیی گەورەی تورك)ی حکومەتەکەی تورکیاو لە لایەنگرانی بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال تەلگرافیان بۆ هاوپەیمانەکان لێداو گوتیان ئێمە نامانەوێ لە تورك جیاببینەوەو لەگەڵ ئەوە داین تاهەتا پێکەوە بژین. دوای ئەمە سەرانی هۆزە کوردەکان دەوڵەتیان لەناوچەی قۆچگیری لە ١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ جاڕدا. کە حکوومەتی شۆڕشیش لە ئەنکەرە ئەمەی بیست ، ئاماژەی (بە کۆڕی نیشتمانیی گەورەی تورك) (پەرلەمان)دا، شاندێك ڕەوانەی ناوچە کوردنشینەکە بکرێ بەنیازی ڕێنمایی کردنیان بە سەرۆکایەتی حاجی عوسمان فەوزی نوێنەری ئەرزنجانو(دیاب ئاغا) کە نوێنەرێکی زۆر نزیکی مستەفا کەمال بوو، خودی ئەم دوو نوێنەرەش لە کەسایەتییە ناسراوەکانی کورد بوونو لەوێ داوایان لە سەرانی کوردەکان کرد بۆ ئەنجامدانی وتووێژ لە ئەرزەنجان، بەڵام سەید ڕەزاو عەلی شێر تاکیدیان بۆ عوسمان فەوزی کرد کە پێویستە حکوومەتی ئەنکەرە بە پێری داخوازییەکانی کوردەوە بێت بۆ قەرەبوکردنەوەی دانیشتوانی قۆچگیریو تێدا والییەکی کورد دابمەزرێنێو لە فێرگە کوردییەکاندا دەست بکرێ بە فێرکردن بە زمانی کوردیو فێرگەش بکاتەوە. عەلی ڕەزا والی ئەرزنجان پشتگیریی خۆی بۆ داخوازییەکان دووپات کردەوەو گوتی حکوومەتی تورکیا بەو داخوازییانە ئاگادار دەکەمەوە، موفتی ویلایەتەکەش حاجی فەوزی بە پێی ئەو دەسەڵاتەی لەلایەن مستەفا کەمالەوە پێی درابوو سوێندی خوارد کە (کۆڕی نیشتمانیی گەورە) لەسەر داخوازییەکان رازی دەبێت (١٦٥/١٣) بەڵام نورالدین پاشا سەرکردەی سەربازی ناوچەی قۆچگیری ئەو داخوازییانەی ڕەتکردەوەو عەلی ڕەزای گواستەوە بۆ ویلایەتی (ئولتی)و هەریەك لە (عەلی شان)و (حەیدەر)یشی لە بەندیخانە توند کردو هەردوکیان تاوەکو ساڵی ١٩٣١ واتە تا ئەو دەمەی لێبوردنی گشتی جاڕدرا لە ئەستەموڵ بە دەستبەسەری مانەوە، دوای لێبوردنەکەش گەڕانەوە بۆ شارۆچکەی (عمرانیە)، لێرەش

عەلی شان کوژراو (حەیدەر)یش بە سەختی بریندار بوو لە دەرەنجامی فڕێدانی بۆمبێك بۆ ناو ئەوماڵەی تیا دادەنیشتن (١٦٦/١٣).

مستەفا کەمال لە سەرەتاوەو لەپاش پەسەندکردنی پەیمانی سیڤەر لەلایەن (باب العالی) یەوە ئەو پەیمانەی دانی بە مافی ژیانی کوردو سەربەخۆیی کوردستان نا دەرکی بەوە کردبوو کە لە توانایدا نییە شەڕی کورد لە لایەكو هێزە داگیرکارەکانو (باب العالی)یش لە لایەکی ترەوە، بکات.

ئیدی پاش کۆنگرەی ئەرزروم بە فێڵو زۆرزانی خۆی کاریدەکردە سەر ڕێبەرانی کوردو تێی دەگەیاندن ئیستا زەرووره کێشەی کورد دوابخرێ تا ئەودەمەی هەموو بستێکی وڵاتی تورك لە دوژمنان پاك دەکرێتەوەو کونگرەی ئاشتەوایی گشتی دەبەسترێ، ئەو کارەش تەنها بە یەکگرتنی هەردوو نەتەوەی کوردو تورك کە خاوەنی ئەم وڵاتەن دێتە بەرهەم، بەڵێنی راشکاویشی دەدانێ کە تورکیا پاش ئەوەی رزگاری دەبێت دان بە سەربەخۆیی کوردو کوردستان دەنێت بە رووبەرێکی گەورەترو فراوانتر لەوەی لەپەیمانی سیڤەردا هاتووە (٧٠/١٤).

رۆژنامەکانی (باب العالی) لەو سەروبەندە جەختیان لەوە دەکرد کە سەڵتەنەتی عوسمانی گرنگیی بە کێشەی کورد داوەو ئەو دەستە وەزارییەی بۆ ئەم ئامانجە پێکهاتووە، بە گیانی برایەتی ئیسلامیو ئەو پێوەندییە مێژووییە بەهێزانەی هەردوو نەتەوەی تورکو کوردیان پێکەوە گرێ داوە، چارەسەری کێشەکە دەکات، ئەو پێوەندییانە گەرەکە نەهێڵن کوردەکان دەستبەرداری برا تورکەکانیان بن لە رۆژانی تەنگانەدا، ئەمەیان واو لەو لاشەوە رۆژنامەی (حاکمیەت میللەت)ی زمانحاڵی ئەو بزوتنەوە نیشتمانییەی مستەفا کەمال سەرکردایەتیی دەکات وتار لە دوای وتاری دەڕازاندەوە لە بارەی ئەو کارەساتو نەهامەتییانەی رووبەڕووی موسڵمانان دەبنەوە، ئەگەر هاتو کوردو تورك بەرامبەر بە داگیرکاری زۆردار یەك نەگرن پێویستە لە سەر ئەو کوردانەی کە لە باوباپیرانییانەوە میرخاسیو نەبەردیو شۆڕەسوارییان بۆ ماوەتەوە، برا تورکەکانیان بە تەنها لە بەرەکانی شەڕی ئەو دوژمنانە بەجێ نەهێڵن کە دەوری تورکیایان داوە.

هەر چەندە دەستە وەزارییەکەی سەڵتەنەتی عوسمانی لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سستی دەکردو هەوڵی دەدا کۆمەڵە کوردییەکان سەرقاڵ بکات لەپێناو سوود وەرگرتن لەکات لەلایەكو لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵانە روو نەکەنەوە لای بزوتنەوەکەی

مستەفا کەمال...ئەوا رۆشنبیرانی کورد مەرجی هاوکاری خۆیان لەگەڵ مستەفا کەمال ئەوە بوو هێزە تورکیو شاهانەکان وەك نیازپاکییەك بەرامبەر بە بەڵێنەکانی بۆ کورد لە ناوچەی کوردستان پاشەکشە پێ بکات (٧١/١٤). ئەگەرچیش زۆرینەی کوردەکان ئەوانەی کە هەستی ئایینیو مرۆڤایەتییان بەلاوە زاڵ بوو بڕوایان بە بەڵێنی تورکەکان کرد، بەڵام نیشتمانپەروەرانی کورد متمانەیان بە قسەو بەڵێنی تورکانی عوسمانیو کەمالییەکانیش نەدەکرد لە بەرامبەریان (٧١/١٤). لەبەر ئەوە بیریان لە گرتنەبەری چەند رێو شوێنێکی پێویست کردەوە بۆ بەرگریکردن بە رێگەی هێزی چەکداری لە پێناو مافی کوردستان کە پەیمانی سیڤەر دانی پێدانا پاش هەوڵو قوربانییەکی زۆر خۆیان بینییەوە لە پێش ئەو هاوپەیمانانەی کەوا کوردان لەو بڕوایەدا نەبوون ببنە کۆسپێك لە پێش داخوازییە نیشتمانییەکانیان، ئەوە بوو بەشێکی گەورە لە باشووری کوردستان لە ژێر دەستی ئینگلیز مایەوە، فەرەنسییەکانیش شوێنە کەناراوییەکانیان داگیر کردبووو هەرچی باکووری کوردستانیشە رووسو ئێرانیو تورکەکان داگیریان کردبوو.

سەرۆکەکانی شاندە هاوپەیمانەکان لە پاریس بۆ شەریف پاشای سەرۆکی شاندی کورد لە پاریس جەختیان لە سەر ئەوە دەکردەوە کە هێمنی پاراستنی کوردەکانو ئارامگرتنیان کارێکی پێویستو زەرووره بۆ هاتنەدیی ئامانجەکانی کوردو هەر هەوڵێك بۆ تێکدانی ئارامی، داخوازییە نیشتمانییەکانی کورد دەخاتە بەر مەترسی، سەرکردەکانی هاوپەیمانەکانو نوێنەرانی سامیشیان لە ئەستانە هەمان بەیتوبالۆرەیان بۆ نوێنەرانی کۆمەڵە کوردییەکان دەژەنی.

لەبەر ئەوە سەرکردەی ئەودەمەی هێزەکانی ئینگلیز لە کوردستان ژەنراڵ ماك ئەندرۆ بەیاننامەیەکی بە زمانی کوردی بڵاو کردەوە تیادا ئەمەی لای خوارەوە هاتبوو(٧٢/١٤).

((لەبەر ئەوەی چارەنووسی ئەو سەرزەمینە عوسمانییانەی کە زۆربەی دانیشتوانیان لە نەتەوەی کوردن، لە کۆنگرەی ئاشتەوایی دیاری دەکرێو ئەو کۆنگرەیە داخوازییەکانی نەتەوەی کوردو مافی سروشتی کوردو کوردستان دێنێتەدی، بۆیە پێویستە کوردەکان پابەندی پاراستنی هێمنیو ئارامی بنو دڵنیاو خاترجەم بن لە عەدالەتی ئینگلیز کە مافی کوردەکان دەپارێزێ)).

ئەو دەمەی مستەفا کەمال پاشا پەیمانی سیڤەری رەتکردەوە(٢/٣)ی سەرزەمینی تورکیای ئیستای لە ژێر دەستابوو، ئەو سەرزمینەش لەو پەیمانە نیشتمانییە دیاریکرد کە

(ئەنجوومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك) لە ئەنکەرە بڕیاری لە سەردا، دوای ئەوەش یەکێتی سۆڤێت سوپاکانی لەو ناوچە تورکییانەی داگیری کردبوو کێشایەوەو دانی بە بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال نا بەو پێیە بزوتنەوەیەکی نیشتمانی رزگاریخوازییەو لە دژی ئیستعمارو داگیرکردن تێدەکۆشێ، نەخوازە پاش ئەوەی لێدوانەکانی مستەفا کەمالو وتە شۆڕشگێرییەکانی لەگەڵ وتەکانی لەنینی سەرۆك یەکەمین دەوڵەتی سوشیالیستی لە جیهان هیچ جیاوازییەکیان نەبوو. نووسەری تورکی پێشکەوتنخواز چەتین ئاڵتان لە وانەیەکیدا کە لە زانکۆی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئەنکەرە ساڵی ١٩٦٦ پێشکەشی کرد تاکید لە سەر ئەم مەسەلەیە دەکاتو دەڵێ: ((ئەگەر بە دواداچوونێك بە قسەکانی ئەتاتۆرك لە ساڵی ١٩٢١ بکەین، دەبینین جیاوازییان نییە لەگەڵ قسەکانی لنین)) (١/٢١).

لێرەشەوە، ئەوا رەتکردنەوەی پەیمانی سیڤەر لەلایەن مستەفا کەمالەوە لە پێگەیەکی بەهێزەوە دەهات بەرامبەر بە لاوازیو نوشوستیی حکوومەتی سەڵتەنەت لە ئەستەموڵ کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی کاربەدەستانی داگیرکەری بیانی، هەر بۆیەش دەوڵەتە داگیرکەرەکان ناچار بوون بچنە کۆڕی وتووێژی نوێوە لەگەڵ نوێنەرەکانی پەیمانی لۆزان، ئەو پەیمانەی کە چاوی پۆشی لە بەرامبەر دامەزرانی دەوڵەتی کوردیو ئەم مەسەلەیەی گوڕییەوە بە دانپێدانان بە کەمایەتیی کورد لە ناو دەوڵەتی تورکیای تازەدامەزراو بەو مافانەی لە مادەکانی (٢٨، ٢٩، ٤٠) ی بەشی ٣ کە دەڵێ: ((حکوومەتی تورکیا بەڵێن دەدا ئەو کوردانەی کە کەمایەتییەکی رەگەزین لە تورکیا مافی راشکاویان هەبێت لە قسەکردن بە زمانی نەتەوەیی خۆیانو دادبینیی کردن پێی لە پێش دادگا تورکییەکانو دەرکردنی رۆژنامەو گۆڤار بەزمانەکەیانو دامەزراندنی یانەی کوردی : زانستیو کۆمەڵایەتیو پەروەردەییو شادبوونیان بە هەموو مافێکی سیاسی کە تورك هەیانە)).

بەڵکو ئەم مافە بەزەمانەتی نێودەولەتی بووە بە گوێرەی مادەی (٤٤) کە دەقەکەی ئەمەیە: ((بەڵێنەکانی تورکیا بەرامبەر بە کورد، بەڵێنی نێودەوڵەتین نابێ لە هیچ بارێکدا هەڵبوەشێنرێنەوە بە پێچەوانەشەوە ئەوا ئەو دەوڵەتانە پەیمانەکەیان ئیمزاکردووەو هەروا کۆمەڵەی گەلانیش مافی سەرپەرشتیکردنیان هەیە لەسەر جێبەجێکردنی ئەم بەڵێنانە، لەلایەن تورکیاوە بگرە مافی ئەوەشیان هەیە دەستێوەردان بکەن لە دژی (واتە دژی تورکیا) بۆ ئەوە ناچاری بکەن بەڵێنەکانی کە لەبەر چاو جیهان داویەتی جێبەجێیان بکات)).

به پشتبەستن بە نێوەڕۆکی ئـەم دەقانـە، مسـتەفا کـەمال پاشـاو ئەنـدامانی (کـۆڕی نیشتمانی گەورەی تورك) لە ئەنكەرە بەهۆتافو خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لە لێدوانـەكانی حسین عەونی بەگی نوێنەری کوردی ئەرزرۆم لەو کۆڕە کرد کاتێك گوتی ((مافی قسـەکردن لەسەر ئەم سەكۆیەوە بۆ هەر دوو نەتەوەی کوردو تورکە))، هەروا (فەتحی بـەگ) یـش کـە سەرۆکی شاندی تورك بوو لە کۆنگرەی تەرسانە لە ئەستانە کە بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی موسل بەسترا لەهەمان کۆنگرە لە لێدوانێکی گوتی: ((ئـەم نیشـتمانە تـەنها تایبـەت بـە هەردوو نەتەوەی کوردو تورکە)) (٧٥/١٤). نەك هـەر ئەمـەش بـەڵکو خـودی مەسـتەفا کەمال لەساڵی ١٩٢٣ دانـی بـە خودموختـاری کوردەکانـدا نـا کاتێـك گـوتی: ((کـۆڕی نیشتمانی گەورە لە هەردو گەلی تورك‌و کورد پێکهاتووەو پێویسـتە کـورد لـەو ناوچـانەی چڕییەکی دانیشتوانی جیاواز پێکدێنن، خودموختارییان پێ بدرێ)) (٤٦/٢٠).

بەڵام هـەموو ئـەم بەڵێنانـەی بـەکورد دران، بەباچـوون چـونکە پـەیمان‌و بەڵێنـەکانی سەڵتەنەتی عوسمانی کە دابوونی بەدانی خودموختاری بۆ کورد، نەهاتنەدی یەکەم بـەهۆی خۆگێلکردنی لیژنە وزارییەکە دووەمیش چونکە حکوومـەتی سـەڵتەنەت رووخـا. بـەڵێنی هاوپەیمانەکانیش بۆ کـورد جێبـەجێ نـەکران لەبـەر هەڵویسـتی جیاجیـای هـەر یەکـەیان بەرامبەر بە کێشەی کورد لە لایەك‌و دوایەش بەهۆی زاڵبوونی بەرژەوەندی‌و تـەماحیان لـە ناوچەکە بەسەر کێشە مرۆییەکان‌و چارەنووسـی گەلانـدا. بـەڵێنی بزوتنـەوەی نیشـتمانیی تورکە کەمالییـەکانییش ویـڕای دەقـە روون‌و راشـکاوەکانی پـەیمانی لـۆزان‌و ئیمزاکردنـی دەوڵەتەکان لەسەری بەزامنکردنی مافی کوردان، ئەوانیش نەهاتنەدی بەهۆی پاشگەزبوونی حکوومـەتی ئەنکـەرە کـە هاوسـەنگی نێودەوڵـەتی کاریگـەریی هـەبوو لـە پابەنـدبوونی دەوڵەتەکانی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوین بەو بارودۆخـەی سـەقامی گرتـووە بـێ ئـەوە هـیچ گۆڕانکارییەکی گەوهەری تیا بکرێ.

## سەرچاوەكانی بەشی دووەم


١- م. شەمسەدین: ماچی دەن ئاتی یە، قەناعەت كتێبخانەو مەتبەعەسی ئەستامبول ١٣٣٩,

٢- محمود بن حسين الكشغرى: ديوان لغات الترك ساڵی ٤٤٦ ك، بەشی یەكەم، مەتبعە عامرە ئەستامبول ١٣٣٣.

٣- كارل بروكلمان: تاريخ الشعرب الاسلاميه الجزو الپانى ، ترجمه الدكتور نبيه امين فارسو منير البعلبكى، دارالعلم للملايين گ٢، بيروت ,١٩٥٤

٤- ابراهيم الداقوقى: فنون الادب الشعبى التركمانى، بغداد ,١٩٦٢

5- mukrimin Halill Yinanc, Turkiye Tarihi istanbul 1944.

6- Agah Sirri Levend, Turk Dilinde gelisme ve Sadelsme, Ankara 1972.

7- Joseph Von Hammer, Osmanli, ceviren Mehmed Ata, Ozetieyan Prof Dr.A. Karahan cilt.

٨- محمد امين زكى: خلاصه تاريخ الكوردو كوردستان، ترجمه محمد علی عونی، ج١، گ٢ بغداد ١٩٦١.

9- Xenophon. The Persian Expedition, England 1965.

١٠- ابن الپیر، الكامل، ج٩ص١٣-٢٦، تیادا دەڵێت (ئەبو عەبدوڵلا حسين بن دوستك) كە لە كوردی حەمیدییەیە، هەوەڵێن كاری داگیر كردنی شوێنەكانی دیاربەكر (دیاربەكر، ئەرجیش، میافارقین) بوو...

١١- عباس العزاوى، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٢، گ١، بغداد ,١٩٣٦

١٢- شرفخان بدليسى، شەرەفنامە، وەرگێرانی مەلا جمیل رۆژبیانی بغداد ,١٩٥٣

13- Dr. Nuri Dersimi, Dersinde Dersim, Beyrut 1950.

١٤- د. بلە ج شيركو،القچيه الكرديه، مگبعه السعادهـ القاهره ١٩٣٠.

١٥- س.هـ لونكريك، اربعه قرون من تاريخ العراق الحديپ، ترجمه جعفر الخيـاگ، گ٣بغـداد ١٩٦٢,

١٦- رفيق حلمى: العراق منژ فجر التاريخ الى سنه ١٩٢٠، محاچره القيت فى المدرسه الپانويه بالموصل، ١٩٣٤,

١٧- عبدالرحمن قاسملو، كردستانو الاكراد، بيروت , ١٩٧٠

١٨- ف.ف مينورسكى، الاكراد، ملاحقات و انگباعات. ترجمه د. معـروف خزنـەدار بغـداد ١٩٦٨,

١٩- ابراهيم الداقوقى: فلسگين و الصهيونيه فى وسائل الاعلام التركيه، بغداد ,١٩٨٧

20- edogru Dergisi, Sayi 46, 6-11 1988, 2000

21-Muzeffer Erdost, Turkiyede Feodalizmin Kaynakaiare Ve Bugunku Durumun Uzerine bir Tasiak, Aydinlik Dergisi, Cilt 1, 1968.

22-Mehri Belli Millet Gercegi, Aydinilik Sosyalist Dergisayi 7, Mayis 1969-22.

23- Mustafa Kemal ATATURK, NUTUK, 1, 1919- 1920, Istanbul 1964.

24- Fuat Oral. Turk Basin, Birnci Kitab 1831- 1922 Istanbul.

25- G.M.Atac, tukiyede Sosyalismin Tarhine bakis, P.D Aydinlik dergisi, sayi J-17 mar 1970.

26- Mehri Belli Millet Gercegi, Aydinilik Sosyalist dergi, sayi 7, Mayis 1969.

27- Mustafa Kemal ATATURK, NUTUK, Istanbul.

سەرکەوتنی بزوتنەوەی نیشتمانی لە تورکیای نوێ، کاریگـەریی گـەورەی هـەبوو لەسـەر ڕێکخستنی ژیانی سیاسیو دیموگرافی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوین، ئـەوە بـوو مسـتەفا کـەماڵ ئەتاتۆرك بە پێی پرەنسیپو بنەمای هاوچەرخەکان دەستیکرد بە کۆکردنەوەی نێومالّی تـورك بە ئامانجی گەیاندنی تورکیـا بـە کـاروانی شارسـتانێتی ڕۆژئـاواو لـە لایـەك و لـە لایـەکی دیکەشەوە کارکردن لەگەڵ دراوسێیەکانی تورکیای تازەدامەزراو هەوڵی دا بـۆ بەرقـەراربوونی بارودۆخ لە ناوچەکەدا. جا لەم هاوکێشەیەدا، کورد وێڕای ئەو هـەموو شـۆڕشو ڕاپەڕینانـەی بەرپایان کرد، زەرەرمەندی یەکـەم بـوون لـە سـۆنگەی هەڵمەتـەکانی ڕاگواسـتنو داواکردنـی بەردەوام لەسەر سەربازگرتنی بەخورتی (تەجنیدی ئیجباری)و کۆمـەکی شـەڕو کۆکردنـەوەی باجی هەمەجۆرو بە زۆرەملێ – لە ئاکامی زاڵبوونی هاوکێشە نێودەوڵەتییەکان لە ناوچەکەو هەروا لـە دەرەنجـامی ڕێککـەوتنی دەوڵـەتانی ناوچـەکە لـە سـەر پاراسـتنی بەرژەوەندییـە گرنگەکانیان، بە تایبەت بەرژەوەندییە ئابووریو ستراتیژییە پێگەییەکان.

لەبەر گرنگی ئەم قۆناغەو ئەو ڕۆڵەی گەلی کورد لە میانەیدا گێڕای، وا لەم سـێ باسـەی لای خوارەوە لە بارەیەوە دەکۆڵینەوە:

# باسی یەکەم

## کوردو سیستەمی تاکە حیزب

ناوەندە سیاسییەکانی تورك، ڕێبەرانی ئینقیلابی عوسمانییان لە حیزبی ئیتحادو تەرەقی (٧٢/١) کە لە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٠٨ تا ١٩١٩ پێگەی دەسەڵاتیان گرتە دەست، بە دیکتاتۆرییەت تۆمەتبار دەکرد، چونکە لەو ماوە دوورو درێژەدا یەکلایەنە حوکمڕانو بواریان بە هەڵبژاردنی ئازاد نەداو دەنگی ئەو ئۆپۆزسیۆنەشیان کپ کرد کە حیزبی ئازادیو ئیئتیلافی راستڕۆ درەوشاوەترین ئەستێرەکانی بوو لە سەر شانۆی سیاسی ئەو سەروبەندە.

مستەفا کەمالیش پاش ئەوەی کێشەکانی لە بەردەمدا تەخت بوو و توانیی ناوچەکانی رۆژهەڵاتو باکوورو باشوور لە داگیرکەران پاك بکاتەوە، لە ساڵی ١٩٢١ حکومەتی (کۆڕی گەورەی نەتەوەی تورك)ی دامەزراندو لە ساڵی ١٩٢٢ سەڵتەنەتی عوسمانیی هەڵوەشاندەوەو لە ساڵی ١٩٢٣ جاڕی کۆماریی دا، پاشانیش لە ساڵی ١٩٢٤ خیلافەتی ئیسلامی لابرد. مستەفا کەماڵ لەم هەموو هەنگاوانەی پشتی بەستبوو بە (کۆڕی گەورەی نەتەوە) کە پێش ئەوەی جاڕی جمهوورییەت بدرێ، کۆمەڵەی بەرگری لە مافی ئەنادۆڵو ولاتی رۆم زۆرینەی نوێنەریان لە ناو ئەو کۆڕەدا پێکدەهێنا، بەڵام پاش ئەوەی دەوڵەتی کۆماری دامەزرا، ئەم زۆرینەیە گواسترایەوە بۆ (حیزبی گەلی کۆماری). ئەو رژێمە سیاسییانەی لە ئەوروپا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانو لە دەرەنجامی گەشەکردنی رێبەرایەتیی تاکڕەوی پێکهاتن، حکومەتی تاکە حیزبو یەکبوونی دەوڵەتو حیزب بوو. ئەم نموونە ئەوروپییانە بوونە ئەو مۆدێلەی بزوتنەوەی کەمالیزم تا کۆتایی شەڕی جیهانی دووەم پیادەی بکات، وەلێ سیستەمەکانی حوکمڕانی ئەوروپایی بە تایبەتی لە ئیتالیاو ئەڵمانیا بەم رێبازە تاکڕەویو تاکە حیزبییەیان، گەرەکیان بوو ئایدیۆلۆژییەتی چینی حوکمڕانو ئەو حیزبەی گوزارشت لەم ئایدیۆلۆژییەتە دەکات، بسەپێنن. کەچی بزوتنەوەی تورکە کەمالیزمەکان کە چوو بە گژی دەوڵەتی عوسمانیو هێزە بیانییە داگیرکەرەکانی ئەنادۆڵو بیرۆکراتییە دەستڕۆیشتووەکانی ناو کۆمەڵگەی تورك، رێکخراوێکی سیاسی بوو تێدەکۆشا لە پێناو دامەزراندنی سیستمێکی کۆماری بتوانێ سەربەخۆییو سەروەریی نیشتمانیی بپارێزێو کۆڵەگە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکان لەسەر پرەنسیپە رۆژئاواییو ئەوروپاییە هاوچەرخەکان بچەسپێنێو یەکێتیی نەتەوەش بە گشت چینو توێژە کۆمەڵایەتییەکانییەوە بپارێزێ (٨/٢).

بەڵام غەمی گەورەی مستەفا کەمال ئەوە بوو: بتوانێ جۆرە ئۆپۆزسیۆنێك بۆ حیزبە دەسەڵاتدارەکەی (حیزبی گەلی کۆماری) دابنێت، یەکەم: بۆ ئەوەی کالایەکی دیموکراتییانە بېڕێ بە بالای حکوومەتەکەیو دووەمیش بۆ ئەوە هەلێك برەخسێنێ بۆ دەرکەوتنی بیروڕای جیاواز لە شێوە ئۆپۆزسیۆنێکی ژیرانە یا خود ئۆپۆزسیۆنێکی گونجاوو بەلێکحالیبوون لەگەڵ حکوومەت هەلسوکەوت بکات (٦/٣)، لێ ئاواتەخوازیش بوو ئەم ئۆپۆزسیۆنە، ئۆپۆزسیۆنێکی دیموکراتی یان لیبرالییانە بێت، نەوەك کۆمۆنیستی یاخود سوسیالیستی، بە تایبەت پاش ئەوەی جموجۆڵو مقۆمقۆیەك سەری هەڵدەدا لە بەرامبەر زاڵبوونی حیزبی گەلی کۆماری بە سەر (ئەنجومەنی نەتەوە)و هەوڵدانی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی بە سەر کاروباری سیاسەتی دەرەکی، دوور لە پەرلەمان.

ئا بەو رەنگە، کۆمەڵێك پەرلەمانتار حیزبێکی نوێیان لە ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ بە ناوی (حیزبی ئیرتیقای کۆماری) دامەزراند، لە سەروویانەوە هەریەك لەم نوێنەرانە بوون: ژەنراڵ عەلی فوئاد جیاسوی، مارشاڵ کازم قەرابەکر، دکتۆر عەدنان ئادیوار، حوسنی رەئوف ئورپای، ئیسماعیل جانپولاد، ئەحمەد شوکری، خالیس تۆرگوت. پێکهێنانی ئەم حیزبە تازەیە دڵەڕاوکەو نیگەرانییەکی هورووژاند لە نێو حیزبی گەلی کۆماری دەسەڵاتدار. بەڵام مستەفا کەماڵ سوپاسگوزاریو خۆشحاڵیی خۆی لە بەرامبەر حیزبی تازەدامەزراو، بەم شێوەیە دەربڕی: (( ئێمە بەم تاکە حیزبەی لە ئەنجومەن نوێنەرایەتیمان دەکات، وێنایەك دەدەینە ئەوانیتر لەمەڕ کەڵەگایەتی (دیکتاتۆرییەتی) حوکمڕانیمان، لە کاتێکدا دەکۆشین وێنایەك بەرۆژئاوا بدەین کە سیستەمێکی دیموکراتی دادەڕێژین، بۆیە پێویستە لەوێ ڕا دوو حیزبی سیاسی لە پەرلەماندا بوونیان هەبێت بۆ ئەوەی حیزبی دووەم کاری ئۆپۆزسیۆن بکات و چاودێری حکوومەت بکات لە کاروبارەکانیدا، لەبەر ئەوە من لایەنگیری دامەزراندنی حیزبە نوێیەکە دەکەم)) (٧٣/٢).

لە پرەنسیپو بەرنامەی کاری حیزبی ئۆپۆزسیۆنی تازەدامەزراو: سوود وەرگرتن لە هزری لیبراڵیو بانگەشەکردن بۆ دیموکراتیو پاراستنی ئازادییە گشتییەکانو رێزگرتن لە قودسییەتە ئایینییەکانو چاودێریکردنی کارەکانی حکوومەتو بەدیهێنانی یەکێتی نیشتمانیو ئیکتیفای زاتی لە بواری کشتوکاڵیو بەپیشەسازیکردنی وڵات بوو.

حیزبی تازەی ناوبراو، رۆژنامەیەکی تایبەت بە خۆی نەبووبێت بە زمانحاڵی، بەڵام رۆژنامەکانی: (وەتەن)و (یەکبوونی هزرەکان)و (ئیستیقلال= سەربەخۆیی)و (هەواڵەکانی دوایین)، پشتگیریی لێ دەکردنو بیروبۆچوونو چالاکییەکانی ئەم حیزبەیان بلاودەکردەوە. وا دیارە بیروباوەڕە لیبرالییەکانی حیزبەکەو رێزگرتنی لەپیرۆزییە ئایینییەکان، توێژگەلێکی ئایینیو کۆنەپەرستیو

داخ لە دڵانی دژ بەرەوشەکەی لە دەوروبەری خۆی کۆکردەوە. ئەمە وایکرد ببێتە هێزێکی کاریگەر لە ناو کۆمەڵگەی تورکی پاش ئەوەی چەند لقێکی لە زۆربەی ویلایەتە تورکییەکاندا کردەوە.

مشتومڕی توند لە ناو (ئەنجومەنی نەتەوە) لە نێوان (حیزبی گەلی کۆماری)و (حیزبی ئیرتیقای کۆماری) روویدا سەرباری ئاڵوگۆڕکردنی تۆمەت بەرامبەر بە یەکتر، نەك هەر ئەوە، بگرە رۆژنامەکانی ئۆپۆزسیۆن هێرشی رەخنە ئامێزی توندییان دەستپێکرد لە دژی حیزبی گەلی کۆماری، تەنانەت رۆژنامەکانی ئەستەموولّ، وەك: (وەتەن)و (تەنین)و (یەکبوونی هزر)و (هەواڵەکانی دوایین)و رۆژنامەی (قانیع)یش کە لە(ئەدەنە) دەردەچوو، هەموو رێککەوتن بۆ هێرشکردنە سەر رژێمی دەسەڵاتدار تا کار گەیشتە ئەوەی رۆژنامەی (تەنین) بەوپەڕی بوێرییەوە بێژێ: ((حیزبی گەلی کۆماریو حکوومەتەکەی عیسمەت ئینۆنۆ پاشا بەقەدو فەساڵی بلحو ناشیرینیو هەڵپەی بۆ دەسەڵاتو کورسی، بۆیان نییە بڵێن: ئێمە نوێنەرایەتیی گەلی تورك دەکەین)) (٨٨١/٤-٨٢).

رەنگە، ئینتیماکردنی ژمارەیەك لە کەسایەتیی ئایینیو سیاسی هاوکار لەگەڵ لایەنە بیانییەکان بۆ ناو ئەم حیزبە، لە بێچانسی دیموکراتییە تورکییە ساواکە بوو بێت، بێجگە لەوەش هەندەك لە پیاوانی سەربازی بوونە قوربانی پیلانی ئەو گومانلێکراوانە. دەبینین لە کاتێکدا بەریتانیا هۆشدارییەکی توندی دایە حکوومەتی تورکیا لە سۆنگەی هەڵوێستی بەرامبەر مژدەبەر نەستوورییەکانو ولاتیش کەوتە ئەوپەڕی ئامادەباشییەوە بۆ شەڕ لە دژی بەریتانیا، لەم هەلومەرجەدا ژمارەیەك لەو نوێنەرە سەربازییانەی سەرکردایەتیی تیپە سەربازییەکانی: یەكو دوو و سێو پێنجو سیوحەوتیان بەدەستەوە بوو و بە گەورە پشکنەرانی سوپاو لە نێویانیشدا: مارشاڵ کازم قەرابەکر بوو، دەستیان لە ئەرکە سەربازییەکانیان کێشایەوە بۆ ئەوەی سەرقاڵی فرمانە پەرلەمانییەکانیان بنو پاشانیش چوونە ناو پارتە ئۆپۆزسیۆنەکەوە (٨٥٧/٤).

بە رێکەوت واڕووی دا، لە کاتی تاوتوێکردنو مشتومڕ لە سەر بودجەی ساڵی ١٩٢٥ دەمەقاڵەیەك سەری هەڵدا لە نێوان نوێنەرانی (حیزبی کۆماری)ی حوکمڕانو ژەنراڵ خالید بەگ نوێنەری (ئەردەهان) کە هاوکاریی لەگەڵ ئینگلیزو رووسە سپییەکان (بیلا رووسەکان)و ئیتیحادییەکان دەکرد لە پێناو پێکهێنانی هێزێکی سەربازی تورك بۆ بە گژداچوونی رووسە بەلشەفییەکان، لە ئاکامی ئەو دەمەقاڵێیە تەقە لە خالید بەگ کراو لە ناو ئەنجومەن گیانی لەدەست دا (٧٥/١).

رۆژێك بـەر لـەم رووداوە، واتـا لـە١٣ی شـوباتی سـاڵی ١٩٢٥ (شـێخ سـەعید) یاخییـە[٦] بەناوبانگەکەی لە ویلایەتی کـەنج لـە رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ دەسـتپێکرد. ئۆپۆزسـیۆنی دەسـەڵات رووداوی کوشتنەکەی خالید بەگو یاخیبوونی شێخ سەعیدی کە ئینگلیز یارمەتی دەداو کۆمەڵەی (ئیتیحادو تەرەقی)ی کوردو کۆمەڵە ئایینییەکانیش پشـتگیرییان دەکـرد، قۆزتـەوە بـۆ سـازدانی هێرشێکی کوێرانە لە دژی حکوومەتو پارتی دەسەڵاتدار (٧١/٢).

هەرچەندە دەسپێکی شۆڕشی شێخ سەعیدی کورد بەهەڵـەو بـە بـێ پلانرێـژیو پـێش ئـەوەی هەلومەرجی گونجاوی بۆ بڕەخسێ بـوو، بـەڵام ئامادەکـاریی بـۆ ئـەم شۆڕشـە لـە سـاڵی ١٩٢٢ دەستپێکرد، ئەو دەمەی لیوا خالید بەگی کورد خۆیو یوسف زیـای نوێنـەری بـدلیس کۆمەڵـەی (خۆیبوون)ی کوردیان لە ئەرزروم دامەزراند و ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتییە ناسـراوەکانی کـوردو ژمارەیەك لە رۆشنبیرو ئەفسەرانی کوردیش تیا بەشدار بوون، ئەم کۆمەڵەیە وەك پارتێکی سیاسـی کوردی وا بوو، ئامانجی یەککگرتنی کوردو داوای مافە نەتەوەییەکانیان بوو (١٧٣/٥).

یوسف زیای بدلیسی لە ئـاخرو ئـۆخری سـاڵی ١٩٢٤ سـەردانی ئەسـتەمووڵی کـردو لـەوێ پێوەندیی بە رابەرانی حیزبی (ئیرتیقا پەروەر- ئیرتیقا)ی نەیاری مسـتەفا کـەماڵو ژمارەیـەك لـە حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی ترەوە کرد، دوایەش هەر لـە ئەسـتەمووڵەوە بروسـکەیەکی بـە جـوفرە بـۆ (رەزا)ی برای کە لە تیپی سەربازیی کارای ناوچەی هیزان ئەفسەر بوو، نارد. (رەزا) لەو بروسـکەیە وا حاڵی بوو کە ئیشارەیە بۆ یاخی بـوون، بۆیـە دایانـە پـاڵ ئیحسـان نـووری پاشـاو یـاخیبوونی گشتییان جاڕداو چوونە شاخ. بە رێکەوت شێخ سەعیدی کورد دەیویست لە(سوڵحان)ی گوندەکـەی خۆیەوە بچێت بۆ ناوچەی هـۆزی دەراخـێنی لـە رێگـا تووشـی دەبـێ بـە تووشـی کۆمـەڵێك لـە جەندرمەی تورك کە چاودێریی جموجۆڵەکانیان دەکرد، جەندرمەکان ویستیان یاوەرانی شێخ سەعید بگرن، بەڵام ئەوان خۆیان بە دەستەوە نەداو بـەرگرییان کـرد، دەرەنجـام لـە١٩٢٥/٢/٨ ئەفسـەری جەندرمەکانو ژمارەیەك لـە جەندرمـەکان کـوژران، وەختـێ کوردەکـان ئـەم رووداوەیـان بیسـت، هوروژمیان هێنایە سەر مەڵبەندی ویلایەتی دەراخێنیو لـە١٩٢٥/٢/٤ دەسـتیان بەسـەرداگرتو سەرۆکی هۆزی (مۆدان) فەقێ حسێنیان بەوالی لەسەر ویلایەتەکە دانـا، ئـەم زاتـەش یاسـایەکی دەرکرد بە گوێرەی یاساکە دەراخێنی کرا بە مەڵبەندی کاتیی حکوومەتی سـەربەخۆی کوردسـتانو

---

٦- سەرچاوەکە مەبەستی شۆڕشەکەی (ئاگری داغ)ە بە رابەرایەتی شەهیدی نەمر شێخ سەعیدی پیران. (وەرگێڕ)

شێخ سەعیدیش بووە فەرماندەو میری ئەو خەباتگێڕە کوردانەی کە توانییان دەست بگرن بە سەر دیاربەکردا (١٨٣/٥).

لە دوای ئەم رووداوانە، حکوومەتی ئەنکەرە (یوسف زیا) لە رۆژی ١٩٢٥/٣/١٩ گرت و لەسێدارەیان دا. ئەگەرچی هێزەکانی کورد توانییان ویلایەتەکانی مووش‌و عەزیزو مەلاتیەو چەند بەشێکی تر لە ویلایەتە نزیکەکان بخەنە ژێر رکێفی دەسەلاتیانەوە، بەلام هێزەکانی تورك بە داگیرکردنی هەموو ئەو شارو شارۆچکانەی بەشدارییان لەشۆڕش کرد توانییان ئەم بزووتنەوەیە دامرکێنن‌و شێخ سەعیدو (٤٧) سەرکردەی تر لە سەرۆکانی ئەو هۆزە کوردییانەی بەشدارییان لە شۆڕشەکە کرد، گرتن‌و سەر لەبەیانی رۆژی ٤ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٥ لە شاری دیاربەکر هەموویان لەسێدارە دران. دوای ئەمەش حکوومەتی تورك دەستیدایە هەڵمەتێکی بەرفراوان بۆ راگواستنی کورد لە ناوچەکانی خۆیانەوە بەرەو ناوچەکانی خۆرئاواو ناوچەی کوردستانیان دابەش کرد بۆ سەر چەند ناوچەیەك لە ژێر ئیدارەی سەربازی‌و دژو قوللەی سەربازییان لەسەر شاخ‌و کێوەکان دامەزراند بۆ چاودێریکردنی بزاڤ و جم‌وجۆڵی کوردو کۆنترۆڵکردنی.

لە ساڵی ١٩٢٦، (عەلی جەمال)ی والیی تورکی دیاربەکر سەردانی سەرکردەی کورد (سەید رەزا)ی سەرۆکی هۆزەکانی قۆچگیری کرد بە ئامانجی تاوتوێکردنی کاروباری کوردو داوای کرد بۆ بەستنی کۆنگرەیەك لە ئەنکەرە بە ئامادەبوونی سەرۆکەکانی هۆزە کوردەکان‌و ژمارەیەك لە ئەندامانی (ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی)و چەند وەزیرێك بۆ لێکحاڵیبوون دەربارەی زۆربەی کێشەکانی کوردستانی تورکیاو هێورکردنەوەی رەوشی ناوچەکەو داواکردن لە یاخیبووانی کورد لە چیاکان بۆ فرێدانی چەکەکانیان (١٩/٥). بە کردەوە، تیمی وتووێژکاری کورد پێکهات بچێتە ئەنکەرەو بریتی بوو لەم بەڕێزانە: محەمەد عەلی گەنجوی سەرۆکی هۆزی قەراباڵ‌و قۆج مستەفاو مەچۆ ئاغای سەرۆکی هۆزەکانی عەباسان‌و هەردوو کوڕەکەی حسێن‌و بەکۆ جەمشیدی سەرۆکی هۆزی فراخدان‌و وەلی دیاب ئاغاو سلێمانی سەرۆك هۆزی بیلۆنکان‌و شێخ ئاغا سەرۆك هۆزی قیرجان‌و (یوسف)ی سەرۆك هۆزی بەختیارو هەردوو برازاکانی سەید رەزا (رەهبەرو ئەرسەلان)و (بەکۆ)ی سەرۆك هۆزی مەقسودانی گەورەو (قەنبەر)ی سەرۆك هۆزی مەقسودانی بچووك‌و (عەلی) سەرۆك هۆزی ئالان‌و (مستەفا)ی سەرۆك هۆزی حەیران‌و (وەلی حەقی) سەرۆك هۆزی شادان‌و محەمەد کەیفی‌و سلێمان‌و میر لیوای خانەنشین (خەلیل)ی سەرۆك شارەوانی عەزیزو (سەبری)ی سەرۆکی خۆیەتی لە ویلایەتەکەو (ئیپیش زەکی) ئەندامی لێژنەی راوێژکاری لە ویلایەتەکەو سەرڕای (عەلی جەمال)ی والیی ویلایەتەکە (١٦٤/٥).

ئەم دەستە کوردییە گەیشتە ئەنکەرەو دەسبەجێ لەگەڵ بریکاری وەزیری ناوخۆ سەید جەمیل کۆبووەوە بە ئامادەبوونی ژمارەیەك لەو پەرلەمانتارانەی کە پشتگیرییان لە پێشنیارەکەی (عەلی جەمال)ی والی کرد بۆ گەڕاندنەوەی هەموو راگوێزراوە کوردەکان بۆ سەر زێدی خۆیانو بەرزکردنەوەی یاسای لێبوردنی گشتی لە کورد بۆ (ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە)و دابەشکردنی زەویوزار بەسەر کوردانی دانیشتووی: دەرسیم، عەزیز، ئەرزنجان، مەلاتیە، بەڵام بە مەرجێك کورد ئارامیو هێمنی لە ناوچەی رۆژهەڵات بپارێزن (١٩٦/٥).

وەختێك شاندە کوردییەکە لە ئەنکەرە گەڕایەوە، هۆزەکانی قۆجان بە پشتیوانیی هەردوو هۆزی رزیكو شەمکان، ئاڵای یاخیبوونیان هەڵکردبوو، چونکە (حەیدەر پاشا)ی سەرکردەی هێزەکانی تورك لە ناوچەی (عەزیز) ئەو هۆزانەی ناچار کرد زێدی خۆیان بەجێ بهێڵنو بچن لە ناوچەکانی تر نیشتەجێ بن. (عەلی جەمال)ی والیش بۆ ئەوەی یاخیبوونی ئەو سێ هۆزە کپ بکات، داوای یارمەتی لە سەرانی ئەو هۆزانە کرد کە لە کۆنگرەی ئەنکەرە ئامادەبوون، گوایە ئەمەش لە پێناو ئەوەی حکوومەتی ئەنکەرە داخوازییەکانیان جێبەجێ بکات، وەلێ سەرۆکانی ئەم هۆزانە دوو مەرجیان لێ داواکرد لە بەرامبەر پێشکەشکردنی ئەو یارمەتییە (٢٠٠/٥)، دوو مەرجەکەش ئەمە بوو:

١-سوپای تورك کاری نەبێت بە سەر پرۆسەی تەمێ کردنی ئەو سێ هۆزە کوردە بەڵکو تەنها کورد لەوە بەشداری بکا.

٢- ناردنی بڕێکی زۆر لە ئازووخەی جەنگیو تفاقی سەربازی بۆ ئەم سێ هێزە کوردەی کە ئەو سێ هۆزە تەمێ دەکات.

ئامانجی سەرانی هۆزە کوردەکان لەمەدا ئەوە بوو: والی ئەم دوو مەرجەیان قەبووڵ نەکات بۆ ئەوەی نەچن بە گژ برا کوردەکانیان لە هۆزەکانی قۆچانو رزیكو شەمکان. بەڵام (عەلی جەمال)ی والی، هەردوو مەرجەکەی پەسند کردو پێوەندی کرد بە(حەیدەر پاشا) ی هێزە تورکییەکان لە ناوچەکە بۆ ئەوەی لە سەر ئەوە رازی بێت. بەڵام حەیدەر پاشا، دوو مەرجەکەی رەتکردەوەو لەگەڵ والی ناکۆك بوو لە سەر چۆنێتی لەناوبردنی یاخیبوونەکە، پاشان سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد بۆ شەڕ لەگەڵ هۆزە یاخییەکان (٢٠١/٥) تا توانی یاخیبوونەکە کپ بکاتو دوای ئەوەش پێشنیاری بۆ حکوومەت کرد تورکیا بکرێ بە (٤) ناوچەی سەربازییەوە بە نیازی ئاسانبوونی کۆنترۆڵکردنی، حکوومەتی ئەنقەرە پێشنیارەکەی پەسند کردو ئیدی تورکیا هەر شوێنێك پشێویو ئاژاوەی تیایە

کردنی بە (٤) ناوچەی سەربازیو لە هەر ناوچەیەکیش، سەرکردەیەکی سـەربازی دامەزرانـد، ئـەم ناوچانەش بەم شێوەیەی خوارەوە بوون (٢٠٣/٥):

١- پشکنگە (مفتشیە)ی ناوچـەی یەکـەم مەڵبەندەکـەی دیـار بـەکرەو هـەموو ناوچـەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیا، وەك (ویلایەتـەکانی: دیاربـەکر، وان، بـدلیس، مـووش، هـەکاری، ماردین، سعرد) دەگرێتەوە.

٢-پشـکنگەی ناوچـەی دووەم، مەڵبەندەکـەی (ئـەرزروم)ەو هـەموو ناوچـەکانی باشـووری کوردستانی تورکیا، وەك (هۆزات، مەلازکرد، ئەرزنجان، دەرسیم، بایپۆرت) دەگرێتەوە.

٣-پشـکنگەی ناوچـەی سـێیەم، مەڵبەندەکـەی (عـەزیز)ەو هـەموو ناوچـەکانی خۆرئـاوای کوردستانی تورکیا، دەگرێتەوە.

٤-پشکنگەی ناوچەی چوارەم، مەڵبەندەکەی (تەراقیا)یە.

بەم شێوەیە ئابڵووقەیەکی سەربازیی بەهێزی خستە سەر ناوچـە کوردنشـینەکانی تورکیـا، بـۆ سەرکوتکردنی هەر چ بزوتنەوەیەکی یاخیبوون، یان شۆڕش کە کورد بەرپای دەکـەن لـەپێناو مافـە نەتەوایەتیو کلتوورییەکانیان.

حیزبی گەلی کۆماری دەسەڵاتدار ئەم هەلومەرجانەی قۆزتەوە بۆ جاڕدانی بـاری نائاسـایی لـە وڵاتو بۆ داڕشتنی یاسای بڕیاری کپکردن (السـکون) لـە پێنـاو کپکردنـی دەنگـی ئۆپۆزسـیۆنو لێدانی یاخیبوونی چەکداریی کورد کە بووە بزوتنەوەیەکی گەورەو بەهێزو ئـەو ناوچـە رۆژهەڵاتـەی گرتەوە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن. پرۆژە یاسای بڕیاری کپکردن (السکون) کە حکوومەت ناردییە بەردەم ئەنجومەنی نەتەوە بۆ ئەوەی بە شێوەی یاسایی بڕیاری لەسەر بدرێ، دەقەکەی ئەمـە بـوو: ((حکوومـەت، پـاش رەزامەنـدیی سـەرۆکی کۆمـار مـافی هەیـە، قەدەغـەکردنی یـان هەڵوەشاندنەوەی کاروچالاکی هەموو ئەو حیزبو کۆمەڵەو رۆژنامانە بکات کە ئاسایشی دەوڵـەت تێکدەدەن یـان دەکۆشـن بـۆ گـۆڕینی سیسـتمە کۆمەڵایەتییەکـەی یـانیش پشـتگیری بزوتنـەوە کۆنەپەرسـتیو پیلانگێڕییـەکان دەکـەن بـە شـێوەی راسـتەوخۆو بـە شـێوەیەکی کـارگێڕیو پەلکێشکردنی ئەنجامدەرانی ئەم کردەوانە بەرەو پێش دادگاکانی سەربەخۆیی (٧١/٢).

بەڵام حیزبی ئیرتیقای کۆماری لە دژی داڕشتنی ئەم یاسـایە وێسـتا، بـەو سـیفەتەی هـەموو بنەمایەکی ئازادی هەڵدەوەشێنێتەوە و خەڵکی دەمکوت دەکاتو کـۆتو بەنـدیش دەخاتـە پـێش رۆژنامەگەری ، لەبەر ئەمە رۆژنامەکانی لایەنگری حیزبی ئیرتیقای کۆماری دەستیان دایە هێرشو پەلامارێکی کوێرانە بۆ سەر بیرۆکەی ئەو پرۆژە یاسایەو بە ئـامرازێکی تازەیـان دانـا بـە دەسـتی

حکوومەتەوە بۆ جاڕدانی کەڵەگایەتی (دیکتاتۆریەت)ی بێ پەروا لەو وڵاتە. بەڵام زۆرینەی رەهـای حیزبی گەلی کۆماری دەسەڵاتدار لە(کۆڕی گەورەی گەل) تـوانی زۆر بلـەز بڕیـار لـە سـەر یاسـای ناوبراو، بدات، بەرایی دەرەنجامەکانیشی ئەمە بوو کـە رۆژنامـەکانی لایـەنگری حیزبـی ئیرتیقـای کۆماری داخران‌و دواییش خودی حیزبەکە لە(٥)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ داخرا (٧٥/١).

پاشـان بزوتنەوەیـەکی پاکسـازیی سیاسـی فـراوان لـە سـەر هـەموو ئاسـتێکی حکـوومی‌و رۆژنامەڤانی دەستپێکرد هەر لە(فەتحی بەگ)ی پارێزگاری پارێزگاکەی ناوچەی شۆڕشـەکەی شـێخ سەعیدەوە بگرەو تا دەرکردنی زۆرێك لە ئەنـدامانی حیزبـی دەسـەڵاتدار بـە تۆمـەتی بێـدەنگی‌و دەرنـەبڕینی سـەرنجیان لەمـەڕ کەشـفکردنی جم‌وجـۆڵ‌و چـالاکییەکانی حیزبـە ئۆپۆزسـیۆنەکەوە، پاشانیش راگرتن‌و دادگاییکردن‌و بەندکردنی چەندین رۆژنامەنووسی وەك: حسێن جاهد یالچـین کـە حوکمی دەسبەسەرکردنی یەگجارەکی لە ناوچەی جوروم بە سەرا سەپێنراو هەریـەك لـە نووسـەران زەکەریا سەرتل‌و جەواد شاکر بەگ‌و ئەدیبی گالتەجاڕیش ئەشرەف ئەدیب، تەوقیف کران (٧٦/١).

راگواستنی کوردەکان لە پاش شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی کورد و یاخیبوونی هۆزەکانی قۆجـان، بەرەو ناوچەکانی خۆرئاوای ئەنادۆڵ، وایکرد میللەت لە کوردستانی تورکیا بکەوێتە کـەف‌و کـوڵ‌و جۆش‌و خرۆشێك ئەوپەڕی نەبێت، ئەوە بوو هۆزەکانی جـەلالی‌و حەسـنان‌و حـەیران یـاخیبوونێکی چەکدارییان لە کێوەکانی ئاگری داغ ساڵی ١٩٢٦ بە سەرکردایەتی (بـەرخۆ)ی جـەلالی بـەرپاکرد و داوایان ئەمە بوو هەموو راگوێزراوانی کورد بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان، ئیحسـان پاشـا کـە لـە دوای شۆڕشەکەی شێخ سەعید پەنای بۆ عێراق بردبوو، توانیی بە نهێنی خۆی بگەیێنێتە چـیاکانی ئاگری- ئیحسان پاشا راوێژکاری سەربازی کۆمەڵەی (خۆیبوون) بوو کە لە ساڵی ١٩٢٥ لـە لایـەن کۆمەڵێك لە رۆشنبیرو پیاوانی سەربازی‌و سەرانی هۆزەکانی کورد، دامەزراو یەکەمین کۆبوونـەوەی خۆی لەگوندی (بەحەمدوون) لە لوبنان لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٢٧ گرێ دا.

ئیحسان پاشا دەستیکرد بە رێکخسـتنی هێزەکـانی (ئیـبراهیم خاسـکی تـالڵا)ی ناسـراو بـە (ئیبراهیم پاشا) لەناوچەی ئاگری، گۆڤارێکی هەفتانەشی بە زمانی کوردی دەرکـرد و ناوچـەکەی وا رێکخست بە شێوەیەك بشێ بگوترێ وەك قەوارەیەکی سەربەخۆی کوردی وایە (٥٤٨/٥).

ئەو هێزە کوردییانەی لە چـیاکانی ئـاگری مۆڵیـان خواردبـوو، دەسـەڵاتی خۆیـان لـە ناوچـە کوردنشینەکاندا فراوان کرد بە رادەیەك حکوومەتی ئەنکەرە لە بەرامبەریان تـرس‌و دڵەڕاوکەیـەکی زۆری لێنیشت، لەبەر ئەمە بڕیـاری وتوویـژی لەگـەڵ ئیحسـان پاشـا دا کـە ئەمیشـیان بـۆ ئـەم

مەسەلەیە مەرجی پیادەکردنی چەند ڕێو شوێنێکی دانا بۆ ئەوە تورکەکان پێش ئەوەی بکەونە وتووێژ لەگەڵیدا، جێبەجێیان بکەن، (٥/٢٤٩):

١-گەڕاندنەوەی هەموو هۆزە راگوێزراوەکان بۆ ناوچەکانی شوێنی رەسەنی دانیشتنی خۆیان.

٢-گەڕاندنەوەی زەویوزارە زەوتکراوەکانی کورد بۆ خاوەنەکانیان.

٣-هەڵوەشاندنەوەی (بڕیاری دوورخستنەوەی رۆشنبیرە کوردەکان بەرەو ناوچەکانی رۆژئاوای ئەنادۆڵ).

وەلێ حکوومەتی ئەنکەرە، ئەم مەرجانەی پەسند نەکرد، بەڵکو چەند هێزێکی گەورەو گرانی ئامادە کرد بۆ کوژانەوەی شۆڕشی ئاگری، بەڵام لەمەدا سەرنەکەوت. لەم سەروبەندەشدا کۆمەڵەی خۆیبوون لە٢٩ی ئاداری ساڵی ١٩٢٩ پێوەندیی کرد بە جەمیل پاشا دیاربەکریو کوڕەکانییەوە کە ئەمانیش زۆر بە گەرمییەوە پێشوازییان لە هەنگاوەکانی کۆمەڵەکە کرد، کە دوایی چالاکییەکانی گواستنەوە بەرەو سوریا.

کە حکوومەتی ئەنکەرە نەیتوانی شۆڕشی ئاگری داغ لەناو ببات، رێککەوتنێکی لەگەڵ حکوومەتی ئێران مۆر کرد بۆ داڕشتنی سنووری نێوان هەردوولا بە شێوەیەك ناوچە کوردنشینە شۆڕشگێڕەکان کەوتنە چوارچێوەی دەسەڵاتییەوە، جا لەشکرێکی قەبەو گرانی رێکخست بۆ لەناوبردنی ئەو بزوتنەوەیەو توانیی لە ساڵی ١٩٣٠ گڕی دامرکێنێ (٥/٢٥٣).

هۆزە کوردییەکان لە پاش سەرنەکەوتنی بزوتنەوە چەکدارییەکەی دەرسیم ساڵی ١٩٣٠، جارێکی تر تووشی راگواستنو گرتن بوونەوە، ئەمە بێزارییەکی گشتی بەلای گەلی کوردەوە هورووژاندو دەست کرا بە بەرزکردنەوەی ئەرزوحاڵو داواکاری بۆ گەڕاندنەوەی راگوێزراوانو ئازادکردنی گیراوەکانو کەمکردنەوەی حوکمەکانی سەر بەندکراوەکان، لە دەرەنجامی ئەمەدا رۆژنامە تورکییەکان لە میانەی ساڵی ١٩٣٥ چەندین بابەتیان لەو ئەرزوحاڵو داواکارییانە بڵاو کردەوەو تاکیدیان کرد کە (ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورك) بە ئامادەبوونی مستەفا کەماڵ لەو داخوازییانە دەکۆڵێتەوە، سەرەنجام مشتو مڕەکانی لەمەڕ ئەم مەسەلەیە، ئەم بڕیارانەی لای خوارەوەی لێکەوتەوە (٥/٢٤٦):

١-گۆڕینی حوکمی خنکاندن دەرهەق بە کوردەکان، بە سزاگەلی سووکتر.

٢-دواخستنی جێبەجێکردنی حوکمەکانی تر کە لە گرتووخانە دەرکراون.

٣-ئاسایی کردنەوەی بارودۆخ لە ناوچە کوردنشینە زەرەرمەندەکان، وەك ئەوە چۆن پێش قەومانی رووداوەکان بوو.

تورکیا  دوای ساڵی ١٩٣٥ بە قۆناغێکی فرە تاریکدا تێپەڕی، ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٣٠ حیزبێکی ئۆپۆزسیۆنی نوێ بە سەرۆکایەتیی سدیق مستەفا کەمال‌و بە ئیحای (فەتحی ئۆکیار) ناو دامەزرا بوو، ئەو حیزبەی کە تەنها (٣) مانگ، (لە١٢ی تەمووز - تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠) بەردەوام بوو چونکە هەمان ئەو تۆمەتەی خرایە پاڵ کە بە گوێرەی (حیزبی ئیرتیقای کۆماری) هەڵوەشێنرایەوە، تۆمەتی بە کاربردنی ئایین وەکو ئامرازێك بۆ گەیشتن بە مەبەست‌و ئامانجە سیاسییەکانی (١/٧٦).

بەڵام، مستەفا کەماڵ ئەو بارە هێمنی‌و کپییەی پاش کوژاندنەوەی شۆڕشەکەی شێخ سەعید (لەماوەی نێوان ١٩٢٥-١٩٣٠) باڵی کێشابوو، قۆزتەوە بۆ جاڕدانی چاکسازیی کۆمەڵایەتی کە بەم کارانەی دەیویست تورکیا بگەیێنێتە کاروانی شارستانێتی رۆژئاواو دابڕینی پێوەندیی بە ژیاریی رۆژهەڵاتی‌و ئایینی ئیسلامەوە، بۆیە تورکیای تازەدامەزراو، بەمە کەسایەتیی خۆی لەکیس دا، چونکە، نە بووە دەوڵەتێکی ئەورووپایی نوێ‌و نە توانیی ئەو کلتووورە رۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتییەی بپارێزێ کە پێوەندییان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام‌و زمانی قورئانەوە هەیە، ئەو رێ‌و شوێنە یاساییی‌و کۆمەڵایەتییەی تورکیا بە (شۆڕشەکان) ناوزەدی کردبوون، ئەمانە بوون: دوورکەوتنەوە لە شەریعەتی ئیسلام‌و پراکتیزەکردنی یاسای شارستانێتی رۆژئاوایی (تێکەڵەیەك لەهەردوو یاسا شارستانییەتییەکەی فەرەنساو سویسرا)و لابردنی پیتە عەرەبییەکان لەنووسینی تورکی‌و پیادەکردنی ئەلفای لاتینی بۆ ئەو نووسینەیان‌و کردنی شەپقە بە پۆشاکێکی نەتەوەیی گەلی تورك‌و جاڕدانی عیلمانیەتبوونی دەوڵەت.

مستەفا کەمال سەرکردەیەکی بێهامتاو کەسایەتییەکی گەورە بوو، توانیی وڵاتەکەی لە ژێر رکێفی هێزەکانی داگیرکردنی (٤) دەوڵەتی ئەورووپایی دەربێنێ‌و دەوڵەتێکی تازە لە سەر داروپەردووی ئیمپراتۆرییەتی پیری عوسمانی بنیات بنێ، وەلێ، ئەنجامدانی  کردەوەگەلێکی مەزنی وەها شتێکەو بڕوابوون بە دیموکراتییەتی راستەقینەو فرەیی هزروسیاسیش شتێکی ترە، نەخوازەش پاش ئەوە هەوادارانی پرەنسیپی [تاکە رابەرێك بۆ گەلێك‌و بۆ تاکە نیشتمانێك] بڵاوکردەوە، ئەمەش هەمان ئەو بیرۆکەیە بوو هیتلەرو نازییەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد.

رەنگە، مستەفا کەمال لە تۆمەتی کەڵەگایەتی (دیکتاتۆرییەت)و دەسەڵاتی تاکڕەوی، بێبەری بێت، لەوانەشە نارازی بووبێت لە سەر بڵاوکردنەوەی ئەم بیرە رەگەزپەرستی‌و نازییەتە، بەڵام تاقمە مەرایی کارەکانی کردیان بە تاکە رابەرو سەرکردەی پاڵەوان‌و کەسایەتیی دوور لە هەڵەو هزرڤانی داهێنەر... بە شێوەیەك هەموو دەستکەوتەکان بە دەستی ئەو داهێنراون‌و ئەفراندنەکانیش پوختەی هزروبیری ئەون‌و

هەموو پرۆژەكانیش بە ئاراستەكردنو رێنمایی ئەو وەدی هاتوون... كەچی ئەو دەمەی لـە ١٠ی تشـرینی یەكەمی ساڵی ١٩٣٨ مردو توركیا بیرۆكەی فرەیی حیزبی سیاسی پەسند كـرد، نـەیارانو خەنێمـەكانی گوناهی هەموو ئەو هەڵە سیاسیو تەنگژە ئابوورییانەی بەسـەر وڵاتـی توركیـادا هـاتن لـە سـەروبەندی دەسەڵاتی تاكە حیزبدا (١٩٢٣-١٩٥٠)، هەموو ئەمانەیان خستنە ئەستۆی خـودی مسـتەفا كـەماڵو هەندێ جاریش خستییانە ئەستۆی (عیسمەت ئینونۆ)ی هاوەڵ ریبازەكەی. شایەنی گوتنە، هـەر لەسـاڵی ١٩٨٩ بەدوا یادەوەریی مردنـی مسـتەفا كـەماڵ ئـەتاتۆرك، تـەنها وەك وەبیرهێنانەوەیـەك لـە لایـەن حكوومەتی توركەوە دەكرا بەبێ ئەوەی ئەو هەموو مەراسیمو ئاهەنگە پڕ هەیتو هووتو شكۆدارانەی بۆ ساز بدرێ كە جاران بۆی رێك دەخران، ئەمەش بە تێكشكاندنی ئەو بیرۆكە تاكپەرستیە دانرا كـە رژێمـە دەسەڵاتدارەكانی توركیا بە درێژی (٥٠)ساڵی رابوردوو لە توركیا چەسپاندبوویان، بەڵكو بە ئاشـكراو بـە راشكاویش بە دیكتاتۆرییەت تۆمەتبار كرا، وەك ئەوە رۆژنامەی حورییەتی توركی لە رۆژی ١٩٩٠/١/٨ بڵاوی كردەوە بەبۆنەی ئاهەنگەكانی حەفتەی رزگاریو سەربەخۆیی كە لە شاری مەرسین سـازدراو لـەوێ مشتو مڕێكی گشتی كرا لەبارەی شەڕی سەربەخۆییو نەوەی نوێ بە سەرپەرشتی فكری ساغلار نوێنەری حیزبی سوسیالیستی میللی (حیزبەكەی ئەردال ئینۆنو)و پرۆفیسۆر دكتۆر (مته تۆنجـای) لەمـەڕ شـەڕی سەربەخۆییو كەماڵ ئەتاتۆركەوە دواو گوتی:(( بەهەقیقەت، ئـەوە شـەڕی سـەربەخۆیی نـەبوو، چـونكە دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێكی ئیستیعماری نەبوو تاوەكو شەڕی رزگاریخوازی لە دژی بكـرێ، بـەڵكو ئـەو شەڕە وەك لە رووداوەكانی تێدەگەین وەكو خەباتێكی نەتەوایەتی وابوو، ئەوە بزوتنەوەیـەكی ئـایینی یـان بزوتنەوەیەك بوو، ئـایینی وەك ئامرازێـك بـەكار بـرد بـۆ وەدیهێنـانی ئامانجـەكانی، چـونكە بیرۆكـەی (ئیستیعمارە داگیركەرەكان كافرن)ی بڵاوكردەوە لەپێناو ئامادەكردنی گەل، ئەو جەنگەش نـەبوو كـە بـێ هامتا بێت، شەڕێكی بچووك بوو، بەڵام درێژخایەن بوو)).

ئێمە، وەك چۆن شانازی بـەم شـەڕەوە دەكـەین، ئـەوە لـە وڵاتەكەشماندا شـتی وا هـەن مایـەی شەرمەزاریمانن، ئەو (مستەفا كەماڵ= وەرگێڕ) یاخیبوونەكەی شێخ سەعیدی لە ساڵی ١٩٢٥، كـردە پاساوێك بۆ داخستنی حیزبەكانی ئۆپۆزسیۆنو زەوتكردنی ئازادییە گشتییەكان بۆ ماوەی (٢٠) سـاڵ. ئەم قۆناغەی كـە بـە موسـتەفا كـەماڵ دەسـتیپێكرد، زۆری لـە توركیـا كـرد (٢٠) سـاڵ لەسـای دیكتاتۆرییەتێكی دژواردا بژی. جا، ئەگەر جەماوەری گـەل خۆشـحاڵ بـوو بـە رزگـاربوون لەچـنگی داگیركردن لە دەرئەنجامی شەڕی سەربەخۆیی، ئەوا زوڵمو ستەمی تاكە حیزبی دەسەڵاتدارو كەڵـەگا كـە شان بەشانی ئەو قۆناغە پیادە بوو، هەموو پەتێكی ئەو خۆشەویستییەی پساند كە مستەفا كـەماڵیان بە جەماوەرەوە دەبەست، بەشێوەیەك ئەفسانەكەی بە مردنی لەساڵی ١٩٣٨وە كۆتایی هات)).

## باسی دووەم
## کوردو عیسمەت ئینۆنۆ

شۆڕشە کوردییە یەك لەدوا یەکەکانی سەروبەندی ساڵانی ١٩٢٥-١٩٣٠ زەرەرو زیانێکی گەورەو گرانی ماڵیو گیانی لێ کەوتەوە، نەك تەنها بۆ تورك، بەڵکو بۆ کوردیش، ئـەوە بـوو لەشکرکێشییە بێ بڕانەوەکانی تورك بڕستی لەکوردان بڕیو پاش ئەوەی شۆڕشگێڕەکانیشیانی ناچار کرد پەنا بۆ چیاکان بـەرن بـە ئومێـدی هـەلی ڕەخسـاو، یـان بـەرەو پـەرتو بـڵاویو سەرگەردانی وەك پەنابەر لە ئێرانو سوریەو میسرو وڵاتە ئەوروپییەکانو... هتد.

هەر ئەو زەرەرو زیانانەش حکوومەتی تورکیایان ناچار کرد- ئەگەر بۆ ماوەیەکی کـاتیش بێت - دەست لە سیاسەتی زەبرو زەنگ هەڵبگرێو پاڵی پێوە نێن بەڵێن بە کوردەکان بدات بۆ چاکسازی بارودۆخەکان لە کوردستانی تورکیا، جا حکوومـەت (فـەخری پاشـا)ی پشـکنەری گشتی ناوچـەی یـەکی بـە هاوکـاری لەگـەڵ (حەسـەن حوسـنی پاشـا)ی سـەرکردەی تیپـی مۆڵخواردووی (عزیز)ی نارد بۆ وتوویژ لەگەڵ ڕێبەرانی کـورد بـۆ ئـەوەی چـی تـر یارمـەتی شۆڕشگێڕانی هۆزی قۆجگیریو هۆزە لایەنگرەکانی نەدەنو شوێنو پەناگەیان بۆ دابین نەکـەن، لـە بەرامبەریشـدا حکوومـەت لێبـووردنی گشـتی بـۆ شۆڕشـگێڕە کوردەکـان دەردەکـاتو ڕاگوێزراوەکانیش دەگەڕێنێتەوە سەر زێدو ناوچەکانیان (٥/٢١٤).

وەلـێ، نیشـتمانپەروەرانی کـورد کـە بینیبوویـان چ کارەسـاتگەلێکیان بـە دەسـتی حکوومەتەکەی عیسـمەت ئینۆنـۆ بەسـەر هـات کـە بەوپـەڕی بێبـەزەییو توندوتیژییـەوەو بەهەماهەنگی لەگەڵ ئەم پشکنەرە گشتییەی ناوچەکەو سەرکردەکانی ئەو تیپە سەربازییانەی هاتنە سـەردانیان بەهـەموو توانایەکیانـەوە هـەوڵیان دا لەناوچـە کوردییەکـە بزوتنـەوەکان خامۆش بکەن... بۆیە بڕیاریاندا- واتا ڕێبەرانی کـورد- کۆنگرەیـەکی گـەورە سـاڵی ١٩٢٦ ببەستن کە هەموو لایەنە سەرەکییە کوردییەکان لە نوێنەرەکانی کۆمەڵەکانو سـەرانی هـۆزو پیاو ماقووڵانی وڵاتو مەڵبەندەکان بگرێتە خۆ، بـۆ دەرکردنـی بڕیـاری بلـەزو کاریگـەر بـۆ گێڕانەوەی ڕەوڕەوەی خەبات لە پێناو ڕزگارکردنی کوردسـتان لەدڕندایـەتیی حکوومەتەکـەی

عیسمەت ئینۆنۆ بەر لەوێ بکارێ هۆزە کوردییە نەبەزو ئازاکان پەرتو بلاوە پێ بکاتو پاشماوەی نیشتمانپەروەرانی کوردیش لەناو ببات کە پەنایان بردۆتە بەر کێوەکانی کوردستانی تورکیا. ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانە توانییان بە سەرکەوتوویی (کۆنگرەی نیشتمانی گەورە)یان لە ساڵی ۱۹۲۷و لە ناو خاکی تورکیا ببەستن کە بۆ ماوەی مانگ‌ونیوێك درێژەی بە کۆبوونەوەو دانیشتنەکانی داو دەرەنجام چەندین بڕیاری زۆر گرنگی دەرکرد، لەوانە: (۹۰/٦)

١- هەڵوەشاندنەوەی هەموو کۆمەڵە کوردییەکان وەك رێ خۆشکردنێك بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی گەورە بۆ کورد کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵە کۆنەکانو ئەندامی نوێ بگرێتە خۆ.

٢- درێژەدان بە شۆڕشو خەبات لە دژی تورکان تا ئاخرین سەربازی تورك خاکی پاکی کوردان وەجێ دێڵێ.

٣- لەپێش ئەوەی دەست بدەنە شۆڕشێکی سەرانسەری، ئەمانەی خوارەوە بەجێ بگەیەنن:

أ- پێویستبوونی دانانی سەرکردەیەکی گشتی بۆ هەموو هێزەکانی کورد.

ب- هەموو هێزەکانی شۆڕش لە سەر شێوازە سەربازیو جەنگییەکان رێكو پێكو بە هەموو جۆرە چەكو ئازووخەیەکی شەڕی نوێ پۆشتەو پەرداخ بکەن.

ج- مەڵبەندێکی گشتیو تایبەتی بۆ شۆڕشو سەرکردایەتیی بالای هێزە نیشتمانپەروەرە کوردییەکان لە یەکێ لە کێوە سەرکەشەکانی کوردستان، دیاری بکەن.

٤- پێوەندی دۆستایەتیو ئاشنایەتی لەگەڵ حکوومەتی ئێرانو گەلی فارس پەیدا بکەن.

٥- پێوەندی دۆستایەتیو ئاشنایەتی لەگەڵ هەردوو حکوومەتی عێراقو سوریا دابمەزرێننو بەو مافە رازی بن کە پێیان بدرێ جگە لەوە داوای هیچ مافێکی سیاسی تر نەکەن.

کۆمەڵەی خۆیبوون لە ماوەیەکی کەمدا توانیی چەندین لقو پۆپی لە هەموو ناوچە کوردنشینەکانو دەرەوەیدا دابمەزرێنێو بلاو بکاتەوە، تەنانەت لە ئەورووپاو ئەمریکاش داو فەرماندەیی مەڵبەندی گشتی کۆمەڵەکە درایە دەستی ئیحسان نوری پاشا بۆ ئەوەی یەکە سەربازییە کوردییەکان لەو کێوە فرە سەختو قایمەدا دابمەزرێنێت و رێکبخات (۹۲/٦).

حکوومەتی عیسمەت ئینۆنۆ، هەر لە ئاخروئۆخری رۆژەکانی مانگی نیسانەوە تا (٥)ی حوزەیران بەو پەڕی نهێنییەوە دەستیکرد بە ئامادەکاری بۆ شەڕ بە هەموو هێزێکی سەربازییەوە لە دەوروبەری چیای ئاگری داغ بە نیازی لەناوبردنی کۆمەڵەی خۆیبوونو

چالاکییەکانی لە چیای ناوبراو، ئەوە بوو لە هەموو لایەکەوە پەلاماری گوندەکانی دەوروبەری چیاکەیان دا، ئەو هێزانە بە ڕێگایانەوە پتر لە١١٢٠ گوندی کوردیان لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٣٠ کاولو وێران کرد (٩٧/٦)و توانیان دەست بگرن بەسەر بارەگای کۆمەڵەی خۆیبوون لە ئاگری داغو پاشماوەی هێزەکانی کوردیش بەرەو ئێران کشانەوەو ژمارەیەکی زۆریش لە ڕووناکبیرانی کوردو پێشەواکانی پەنایان بردە بەر دەوڵەتە دراوسێکانی تورکیا.

ناوچەی کوردستانی تورکیا پشتگوێ خرابوو هیچ بنەمایەکی ژیانی نوێی پێوە نەبوو، وەك: ڕێگاوبانو فێرگەو خەستەخانە، حکوومەتی تورکیاش پاش ئەوەی شۆڕشی ئاگری داغی لەناو برد، ویستی هێڵی شەمەندەفەر بۆ ناوچەکە رابکێشێ بە مەبەستی ئەوەی یەکەم کۆنترۆڵکردنی ئاسان بێتو دووەمیش دڵی کورد رازی بکات. بۆ ئەم مەسەلەیەش (عیسمەت ئینۆنۆ)ی سەرۆك وەزیرانی ئەو دەمە لە٢٩ی ئابی ساڵی ١٩٣٠ هێڵی شەمەندەفەری ئەنکەرە- سیواس لەو ناوچەیە کردەوە و بە خۆنازینەوە وتارێکی بریقەداری پێشکەش کردو تێدا گوتی:(( لەم وڵاتەدا جگە لەتورك کۆمەڵێکی تر مافی ئەوەی نییە داوای قەوارەیەکی نەتەوەییو نیشتمانی بۆ خۆی بکات. ئەم هەقیقەتە سادەیە بە رەهابێ و بێ ئەوەی گومانێك وەجێ بهێڵێو بێ ئەوەش هەلێك برەخسێنێ بۆ بەرپابوونی ئاژاوەو شۆڕش، روونو ئاشکرا دەبێت ئەو کاتەی هێڵی ئاسنین دەگاتە سنوورو شوێنە دوورە دەستەکانمان))(١٠٢/٦).

ئەگەرچی ئەم قسەیە زۆر بە راشکاویی پەردە لەسەر پلانو نیازەکانی حکوومەتی (ئینۆنۆ) هەڵدەماڵێ، وەلێ کورد دوای ئەو کارەساتەی لەئاگری داغ بە سەریان هات، چەکیان فڕێ نەدا، بەڵکو کۆمەڵەی خۆیبوون کە لە نیشتمانپەروەرانی کورد پێکهاتبوو، تێکۆشا بۆ کۆکردنەوەی ریزەکانیانو خەبات لە پێناو بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانیان. دەبینین کاتێك حکوومەتی تورك لە مایسی ساڵی ١٩٣٢ لە(ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە) یاسای رێکخستنی پیشەیی دەرکرد، کە دەقەکەی بەم شێوەیە بوو:(( ئەوانەی بە تورکی نادوێن، مافیان نییە دووبارە خانوو لە گوندو ناوچە جیاجیاکان دروست بکەن، یاخود دووبارە رێکخراوی پیشەیی یان نووسین یا چینایەتی پێك بێنن))، لەوڕا ئەو یاسایە دەسەڵاتی دایە وەزارەتی ناوخۆ ئەو رێکخراوانە- بە هەموو ئەو رێکخراوانەش لەو دەمەدا هەبوون، هەڵبووەشێنێتەوە.

ئاشکرا بوو، یاساکە بە پلەی یەکەم مەبەستی کورد بوو، ئەوە بوو لە پاش ماوەیەکی کەم ئەو فێرگانەیان داخست کە زمانی کوردییان تیا دەخوێنرا بە پێی ناوەڕۆکی مادە (٣٩) لە پەیمانی لۆزان کە جەخت دەکاتە سەر زەرورەتی لەمپەر نەخستنە بەردەمی بە کارهێنانی هەرچ

زمانێك لە لایەن هاولاتی تورکیاوە چ لە پێوەندییە تایبەتییەکانی یان لە بوارەکانی بازرگانی یان ڕۆژنامەنووسیو میدیا.. جگە لەوەش یاسای ناوبراو دژی مادە (٣٨)ی ئەم پەیمانە بوو کە ئەرکی ئەوەی خستبووە سەر شانی تورکیا، بوار بدات خەڵکی تورکیا تەواوی مافەکانیان پیادە بکەن. سەرەڕای ئەمە حکوومەتی تورکیا لە ساڵی ١٩٣٢ زمانی کوردیی بە شێوەیەکی رەسمی قەدەغە کردو هەموو کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکانی هەڵوەشاندەوەو دەستی گرت بەسەر کتێبو چاپەمەنییە کوردییەکانو واژەی کوردو کوردستانی لە نێو هەموو کتێبو فەرهەنگەکاندا ڕەش کردەوە، لەو دەمەشەوە کوردیان بە تورکی کێوی ناوزەد کرد، نەك هەر ئەمە بگرە دەستیشیان گرت بە سەر ئەو کتێبو پەرتووکانەی باس لە تورکیاییبوونی کورد دەکەنو گوتیان لێرە میللەتێك نییە بە ناوی کوردەوە، چونکە واژەی کورد لەدەنگی (کارت کورت) هاتووە، ئەمەش لەدەرەنجامی تێکشکانی ئەو سەهۆڵەوەیە بەسەریدا دەڕۆن لە ناوچەی ڕۆژهەڵات کە کورد تیادا نیشتەجێیە (٥٠/١٠).

پیادەکردنی ئەم هەنگاوانە بوونە مایەی تووڕەییو بێزارییەکی گشتی بە لای دانیشتوانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتو باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا کە کوردەکانی زۆرینەی دانیشتوانیان پێك دەهێنن، بەڵام ئەو زۆرینەیە لە ناوچەی دەرسیم زۆر چڕو پڕتر بوو، لێرەدا چەندین شۆڕشو ڕاپەڕین هەڵایساو هەمیشە بەرهەڵستییان لەو هەنگاوانە دەکرد حکوومەت لە دژی کورد هەڵی دێنان، دەرسیم ئەو کێشەیە بوو حکوومەتی تورکیای نیگەران دەکرد، تەنانەت مستەفا کەماڵ ئەتاتۆرك لە کاتی کردنەوەی ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی ساڵی ١٩٣٦ ڕووی دەمی وتاری کردە نوێنەرانی ئەنجومەنو گوتی:(( گرنگترین ئەو کێشە ناوخۆییەی سەرقاڵی کردووین، کێشەی (دەرسیم)ە، لەبەر ئەوەو بۆ ڕێخۆشکردن لە پێناو ریشەکێشکردنی بەرهەڵستیکردنیان بەرامبەر بە هەنگاوەکانی حکوومەتو بە مەبەستی دەرکردنی بڕیارگەلی خێرا، پێویستە حکوومەت دەسەڵاتی فراوانو ڕەهای بدرێتێ)) (٢٥٩/٥). بە پراکتیك ئەمە جێبەجێ کراو پەرلەمان یاسایەکی داڕشت بە پێی یاساکە حکوومەت دەسەڵاتی فراوانی پێدراو ئەمیشیان (واتە حکوومەت) دەسەڵاتێکی زۆری دایە ژەنراڵ عەبدوڵڵا ئەلپ دۆغان بە جۆرێکی وەها بتوانێ هەموارو گۆڕانکاریی بکات بەرامبەر بە بڕیاری دادگاکان یان دواخستنیان، پاشان هەر ئەم ژەنراڵەی کردە حاکمی سەربازی بە سەر ویلایەتی دەرسیمو بە پشکنەری سێیەمی گشتیش بەسەر ویلایەتەکانی (عەزیز)و (دەرسیم)و (بنگۆل)و هەروا بە فەرمانداندەی گشتی هێزە سەربازییەکان لەم ویلایەتانە کە بوونە یەکەیەکی کارگێڕیی نیمچە سەربەخۆ لەژێر دەسەڵاتی

ئەلپ دۆغان کە بەو جۆرە خۆی دەیەویّو بە دەسەڵاتی رەها حوکمڕانییان بکات (٢٦٠/٥).
ئەلپ دۆغان لە ناوچە ئیدارییەکانی ژێر دەسەڵاتی، باری نائاسایی راگەیاند، پاشانیش کەوتە چوکڵەجزێدانو هەراسانکردنی سەرۆکانی عەشیرەتەکانو رووناکبیرانی ناوچەکەو بەکاربردنی زەبروزەنگ لەبەرامبەریان. کاتێکیش دانیشتوانی دەرسیم لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٧ نامەیەکیان هەواڵەی کۆمەڵەی گەلان کرد بۆ ساکالاّکردن لە هەنگاوەکانی حکوومەت لەدژیان بە قەدەغەکردنی زمانو فێرگە کوردییەکان، حکوومەت لەهەمان ساڵ یاسای نیشتەجێکردنی دەرکرد کە دەسەڵاتی دایە حکوومەت بە نیشتەجێکردنی غەیرە تورك لەو ناوچانەی چڕی دانیشتوانەکانیان تورکن، کوردەکان بە ئاشکرا بەرهەڵستیان لەمە کردو یاسای نێو براویان جێبەجێ نەکرد.

لە رووبەڕووبوونەوە بەو لاوە رێگە چارەیەکی تر نەما، لەوڕا سەید رەزاو عەلی شێر رابەرایەتیی شۆڕشی چەکداریی عەلەوییە کوردەکانیان کردو بۆ ماوەی دووساڵ شەڕ درێژەی کێشاو حکوومەتی تورك هێزێکی سەربازی یەکجار زۆری بۆ سەرکوتکردنی بەکارهێناو فڕۆکەی جەنگیشی خستەکار بۆ لێدانی گوندی کوردو ناوچەکانیان بە شێوەیەکی دژوار. لەئاکامی ئەم هەموو زەبروزەنگو سەرکوتکردنەی تورك سەرکردەکانی بزوتنەوەکە بەناچاری خۆیان دا بەدەستەوە، ئەوە بوو (سەید رەزا) لە١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٧ خۆیو (١٠) سەرکردە لە شۆڕشەکەی دەرسیم لە شاری (عەزیز) لەسێدارە دران، بەر لەوەش عەلی شێر بەدەستی (رەهبەر)ی برای سەید رەزا کە بۆ بەرژەوەندی تورك کاری دەکرد، کوژرا (٢٨٩/٥).

دوای ئەمە، عیسمەت ئینۆنۆ لە وتارێکی لە پەرلەماندا، گوتی:(( وا توانیمان کێشەکە یەکلابکەینەوەو چاکسازیی ئیدارییمان دەستپێکرد، ویلایەتی دەرسیم بە جۆرێکی نوێ رێك دەخرێو بەپێی یاسا ناوێکی تازەمان لێنا، ئەویش (تونجەلی)یەو ئەو والییە سەربازییە بەرێوەی دەبات کە حوکمی عورفی تیا جاڕدا (٣١/٥).

بەو شێوەیە پەردەیان بەسەر کێشەی کورد لەتورکیا دادا، ئیدی نە کەسێك گوێی لە کێشەی کوردو نە ناوی کورد بوو، بە تایبەتی هەلومەرجی نالەباری ئەو دەمە کە لە میانەیدا جیهان پێشوازیی لە شەڕی دووەمی جیهانی دەکرد، کۆمەڵەی (خۆیبوون)ی ناچار کرد لە ساڵی ١٩٣٩ خۆی هەڵبوەشێنێتەوە کە بینی لەکیشیدا نییە سوود بەکوردو دۆزی رەوای کورد بگەیەنێت. حکوومەتی تورکیش پێوەندییە دەرەبەگایەتییە خێڵەکییەکانو مەرجەعییەتی ئایینیو عەشایەریی کوردی لێکداترازاندو هەڵوەشاندەوە کە فاکتەرێکی هاوکار بوون بۆ کۆکردنەوەو

ڕێکخستنەوەی نێومالّی کورد، جگە لەمەش دوای ڕەزامەندیی (ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورك) دەستیکرد بە ڕاگواستنی سەرۆکانی عەشایەری کوردو دەستبەسەرداگرتنی مولّکەکانیانو گواستنەوەیان بۆ سەر ملّکی دەولّەت.

دەمکوتکردنی سیاسیو قەدەغەکردنی ئازادییە سیاسییەکان وایکرد، توێژو کۆمەلّە سیاسییە جیاجیاکان بە ڕاستڕەوو چەپڕەویانەوە لەو سەروبەندە پەنا ببەنە بەر کاروچالاکی نهێنی بە هاندانو پشتگیریکردنی دەولّەتە گەورەکان کە دەیانەویست بەرژەوەندییەکانیان لەم پارچە گرنگەی جیهاندا بپارێزن. دەبینی لە لایەکەوە لایەنگرانی خیلافەت کە لە ئەوروپا دادەنیشتن دەستی کۆمەكو یارمەتییان درێژ دەکرد بۆ هەموو ئەو بزوتنەوە ڕاستڕەوو کۆنەپەرستییانەی کە هەلّگرانی هزری کەمالیزمو چاکسازییە کۆمەلاّیەتییەکانیان بە کوفرو بێ بڕوا بوون بەخوا تۆمەتبار دەکردنو هەولّیان دەدا هەستو بیروبڕوای ئایینی بۆ مەرامی سیاسی خۆیان بەکار بێنن، کەچی هێزە چەپڕەوەکان لە کارکردن کشانەوەو جمو‌جۆلّی نهێنییان دەمێك بە ناوی شۆڕشو دەمێك بە ناوی پێشکەوتووخوازو مارکسیزمەوە دەستپێدەکرد لەپێناو دامەزراندنی تورکیایەکی سوسالیستی دیموکراتیی ئازادو بە پێی بنەما زانستییەکانی سوسیالیستی (٧٧/١). حیزبی شیوعی نهێنی تورکیش لە هەموو ناوەندەکاندا دەستی بە چالاکییەکانی کردبوو، بەلاّم بە هێمنیو لەسەرەخۆ لەبەر بارودۆخی سەختو ناهەمواری ئەو دەمە کە ولاّت پێدا تێدەپەڕی. یەکەمین جار گۆڤاری (ئیدینلك= ڕووناکی)و پاشانیش (ئوراك چکیچ= داسو چەکوش)ی بلاّوکردەوە، هەردوو گۆڤارەکەش پشتگیرییان لە هەنگاوەکانی مستەفا کەمالّ دەکرد، چونکە پێیان وابوو جارێ زووە بۆ ئەوەی بزوتنەوەیەکی جیا لە ئیرادەی دەولّەت پێك بێت، بەلاّم مستەفا کەمالّ ئاگای لە پلانو تاکتیکیان هەبوو، بۆیە هەردوو گۆڤارەکەی داخستو زۆرێك لە ئەندامانی کۆمەلّی (ڕووناهی) هەوالّەی گرتووخانە کرد، بەلاّم سێ کەس لە نووسەرانی ئەو دوو گۆڤارە توانییان بۆ دەرەوەی تورکیا هەلّێن، ئەوانیش: (دوکتۆر شەفیق حوسنیو نازم حیکمەتی شاعیرو ئەدیبو نووسەر حەسەن عەلی ئادین) بوون کە هەمان کات لە سەرکردەکانی حیزبی شیوعی نهێنی تورك بوون. دوای ئەوە (ویداد نەسیم تور) توانیی ڕیزەکانی پارتی ناوبراو لەناوەوەی تورکیا ڕێك بخاتو بووە سکرتێری گشتی حیزب، وەلێ شەفیق حوسنی داوای لە ویداد نەسیمو کۆمەلّی مەکتەبی سیاسی کرد بێنە ڤیەننا بۆ ڕاوێژکردن لە بارەی کاروبارەکانی حیزب، لەوێ ڕێککەوتن دکتۆر شەفیق حوسنی ئەرکی سەرۆکی لێژنەی پێوەندی لەگەلّ کۆمنترن پێ بسپێردرێ، بەم شێوەیەش حیزبی شیوعی تورکیا بەسترا بەحیزبی شیوعی سۆڤیەتەوە، کە ئیتر

لەو رۆژگارەوە لە ژێر کاریگەریو ڕێنمایی ئەم حیزبەدا بوو چ لەچالاکییە سیاسییەکانی یاخود لەکارو چالاکییە ئاشکراکانی لە تورکیا (٢٤)، لەو لاشەوە پەلاماری حکوومەتی تورك بۆ سەر ئەو حیزبە بەردەوام بوو، دەبینی فرەجار هێزە سەربازییەکان لە پڕێکدا هەڵیاندەکوتا سەر بارەگا نهێنییەکانیو ئەندامو لایەنگرانیان دەگرت، تەنانەت خودی دکتۆر شەفیق حوسنیش لەماوەی نێوان ١٩٢٦-١٩٣٨ لەگرتن نەجاتی نەبوو، ئەوە بوو لەم ساڵە (١٩٣٨) کە مستەفا کەماڵ مرد بە لێبوردنی گشتیو بە بۆنەی مردنی ئەتاتۆركو هەڵبژاردنی عیسمەت ئینۆنۆ بە سەرۆك کۆمار، لەگرتووخانە ئازاد کرا (١٩/٧).

لەساڵانی ٣٠یەکانی (سەدەی بیستەم) بۆچوونێکی فاشیستی لەناو تورکیا سەری هەڵدا، پێی وابوو تورکیا تەنها یەك گەلە پێکهاتووە لەچینێك تاکە پێشەوایەك حوکمڕانی دەکات (٧٨/١)، لەبەر ئەمەو بە پێی یاسای ژمارە (٣٠٠٨)ی (٨) حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٨ هەموو مانگرتنو خۆپیشاندانێك قەدەغەکراو گەنجانی تورك ناچار کران بێنە ناو ڕێکخراوەکانی لاوانی حیزبی گەلی کۆمارییەوە، هەروا دەقی هەردوو ماددەی (١٤١و١٤٢)ی یاسای سزاکانی ئیتالیای فاشیزم خرایە نێو (یاسای جەزای تورکی ساڵی ١٩٣٦)ەوە.. ئەم دوو ماددە لاستیکییە لەراسپاردەکانیاندا هاتووە: هەر بزوتنەوەیەك یان دەربڕینی بیروڕایەکی پێشکەوتنخوازیی پێچەوانەی بیروڕای ڕژێمی دەسەڵاتدار، بە بزوتنەوەیەکی رووخێنەر دەژمێردریو تاوانباریشە بە گوێرەی ئەو دوو مادەیە ٣-٥ ساڵ زیندانی دەکرێت.

ئەگەر چەند شتێکی دیکەش بخەینە سەر ئەمە، وەك ئەو دروشمەی حیزبی دەسەڵاتدار (حیزبی گەلی کۆماری) لەو سەروبەندە بەرزی کردەوە کە دەڵێ: ( نەسەرپشکی= ئیمتیازات، نەچینایەتی، بەڵکو ئێمە تاکە کۆمەڵێکی یەکڕیزین)و هەروا دۆستایەتی باوی ئەڵمانیای نازیشی لەگەڵدا بێت، ئەوا وێنەکە کامڵ دەبێ، دەرەنجامیش بۆچوونێکی فاشیستی بوو لەحوکمڕانیدا — بەتایبەت پاش مردنی مستەفا کەماڵ ئەتاتۆرك لە١٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٨،و خنکاندنی هەموو جۆرە ئازادییەك سەرڕای زیندە بە چاڵکردنی هەر بۆچوونێکی بەرهەڵستکار بەرامبەر بە دەسەڵات، ئەڵمانیای نازیش پشتی ئەم بۆچوونە نیمچە فاشیزمنییەی لەتورکیا گرتو لەرووی مادیو مانەوییەوە کۆمەکی دەکرد (٧٥/٢). بەڵام هەرسهێنانی فاشیزمو دەستخەڕۆبوونی فاشیستییەکان لە تورکیا، ڕژێمی سیاسی ناچار کرد روو بکاتە لای دیموکراتییەتی رۆژئاواو پرنسیپی فرە حیزبی پەسند بکات، ئەگەرچی هیچ گۆڕانکارییەك بە سەر بارودۆخی سیاسی لەو وڵاتەدا نەهات.

## باسی سێیەم

## شەڕی جیهانی دووەمو کێشەی کورد

که هێزەکانی تورکیا شۆڕشی سێیەمی (دەرسیم)یان لەساڵی ۱۹۳۹ دامرکاندو لەپاش مردنی مستەفا کەماڵ ئەتاتۆرك، عیسمەت ئینۆنۆ بە سەرۆك کۆماری تورکیا هەڵبژێردرا. ئینۆنۆ هەوڵی دا بارودۆخی کوردستانی تورکیا هێور بکاتەوە، بۆ ئەم کارەی بەڵێنی چاکسازی بارودۆخەکانی داو وتووویژی لەگەڵ سەرانی کورد کرد لەپێناو راگرتنی بزوتنەوەکانی یاخیبوونو شۆڕش لەناوچە کوردنشینەکە بە هاوکاری لەگەڵ پشکنەری گشتی (موفەتیشی عمومی)و سەرکردەکانی ئەو تیپانەی سەری لێدان (٥/٢٣٧). وەلێ هەڵایسانی شەڕی دووەمی جیهانی لەساڵی ۱۹۳۹و هەوڵی وەستانی بێلایەنی تورکیا لەو شەڕە، پەردەیەکی رەشو تاریکی تاوەکو بیست ساڵی دواتر بەسەر کێشەی کورددا پۆشی، لەوڕا ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا قۆناغێکی تاریکیان لەژیان بەسەر برد، وەك بلێی فەرامۆشی تا هەتایی باڵی بەسەریاندا کێشاوە... ئەمە واو لەکوردستانی عێراقو ئێرانیش بزوتنەوەی گەلی کورد تێدەکۆشا بۆ رێکخستنی ریزی کوردەکان لەچوارچێوەی چەند رێکخراوێکی سیاسی کاریگەر بۆ داخوازیی مافی نەتەوایەتی کورد لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆییو نێونەتەوەییدا.

ئەگەرچی پەیمانی سەعد ئابادی نێوان ئێرانو ئەفغانستانو تورکیاو عێراق کە لە ساڵی ۱۹۳۷ بەسترا، بە پلە یەك لەدژی بزوتنەوەی کوردو پاشان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە ناوچەکە مۆرکرا، ئەوا بزوتنەوە رزگاریخوازییەکانی جیهان لە سەروبەندی شەڕی دووەمی جیهانی تێدەکۆشان بۆ پێکهێنانی ئەو بەرە نیشتمانییانەی تێدەکۆشن بۆ کردنی پەرلەمان یان ئەنجومەنە نیشتمانییەکان بە دەستەیەکی دیموکراتی تیادا ویستو ئیرادەی گەل رەنگبداتەوەو بەدی بێت لەپێناو ئەنجامدانی ئەو چاکسازییە بنەڕەتییانەی کە وڵات دەیهەوێن بە رێگەی یەکێتی نیشتمانیو هاوکاری نێوان هەموو حیزبو لایەنە پێشکەوتنخوازو نیشتمانیو نەتەوەییەکانو کۆمەڵێك لەبۆرژوای کورد توانییان (کۆمەڵەی برایەتی) بە سەرۆکایەتی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموودی حەفید لەساڵی ۱۹۳۸ دابمەزرێنن، ئامانجی

رزگارکردنی کوردو کوردستان بوو، هەرچەندە سنووری چالاکییەکانی تەنها لەسلێمانی بوو (٩٢/١١). ئەم کۆمەڵەیە یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی کورد بوو لەعێراق کە بە ئاشکرا بانگەشەی بۆ رزگاری کوردستان دەکرد، ئەمە لەکاتێکدا کۆمەڵەیەکی تر لەکەرکوك بە ناوی (کۆمەڵەی دارکەر) لە ساڵی ١٩٣٧ دامەزرا، هێندەی نەخایاند ناوەکەی گۆڕاو بوو بە (حیزبی هیوا)و چالاکییەکانی تەنها لەنێوان سەرۆکانی عەشایەرو ئاغاو بەگو شێخاندا بوو، وای لێکردبوو دوور بێت لەجەماوەرەوە، بە پێی بۆچوونی (رەفیق حیلمی)یش سەرۆکی حیزبەکە، پشتی بە ئینگلیز بەستبوو وەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی کوردو پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، بەڵام ئەم تێڕوانینە دوای کۆنگرەی حیزب ساڵی ١٩٤٥ لەگوندی کەلار، گۆڕا (٩٧/١١).

حیزبی هیوا لە دژی فاشیزم تێکۆشاو سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی کرد شان بەشانی بزوتنەوە رزگاریخوازییەکانی گەلانی جیهان بۆ بەرەنگاربوونەوە لەبیروباوەڕی نازییەکان. ئەو حیزبە لەساڵی ١٩٤٢ دوو نوێنەری لەسەرکردایەتییەکانی خۆی ناردنە کوردستانی ئێران بۆ پێوەندیکردن بە سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد لەو وڵاتەو بۆ پتەوکردنی پێوەندی نێوان هەردوو بزوتنەوەکە، چونکە زەمینەی لەبار لەکوردستانی ئێران هەڵکەوتبوو بۆ دامەزراندنی حیزبێکی کوردستانی دیموکراتی، ئەوە بوو کۆمەڵەی (ژیانەوەی کورد) لە١٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٢ لەعێراق دامەزراو زۆری نەخایاند کۆمەڵەکە گۆڕا بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق (١١٤/١٠٠).

سەرەڕای ئەو ناکۆکییە قووڵانەی کە لەنێوان کۆمەڵەو حیزبە کوردییەکان بە راست و چەپییانەوە لەماوەی نێوان ساڵی ١٩٤٢-١٩٤٦ رووی دا، بەڵام بارودۆخ لەبەرژەوەندیی پارتی دیموکراتی کورد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی بەردەوام بوو ئەم پارتە بەتێکەڵبوونی هەردوو حیزبی شۆرشو رزگاری کورد لە١٦ی ئابی ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بوو، لەپاش ئەوەی راستو چەپی کورد جیاوازیی ئایدیۆلۆژیی نێوانیان لەبەرژەوەندیی هاوکاریکردنیان لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت یەکلاکردەوە لەبری هاوکاریکردن لەگەڵ ئینگلیز لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد، بەتایبەتی پاش دامەزراندنی کۆماری مەهابادی کوردی لەساڵی ١٩٤٦ لەئێرانو یەکگرتنی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەعێراق (کۆمەڵی مەلا مستەفای بارزانی)و چەندین لەکادیرانی حیزبە کوردییە عێراقییەکانو ئەفسەرانی کوردی هەڵاتووی سوپای عێراق لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد

لەئێران، بەمەش مەڵبەندی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد گواسترایەوە بۆ ئێران لەپێناو کارکردن یەکێتی گەلی کوردو پشتگیریکردنی خەباتی گەلی کورد لەپارچەکانی تری کوردستانی دابەشکراو بەسەر عێراق‌و ئێران لەپێناوی دان پێدانان بە قەوارەو مافە کلتووری‌و کارگێڕی‌و پەرلەمانییەکانیاندا.

کۆمەڵێك لە نەتەوە پەرستە تورکە خاوەن بیروبۆچوونە ئاینییەکان، هەوڵیاندا حیزبێکی نوێ وەك هەوڵێك بۆ گێڕانی رۆڵی ئۆپۆزسیۆن لە تورکیا دابمەزرێنن. لە١٨ی تەمووزی ساڵی ١٩٤٥ حکوومەت رازی بوو لەسەر دامەزراندنی (حیزبی ژیانەوەی نەتەوەیی) لەلایەن دەزگای دمیراغ‌و حسێن عەونی ئولاشی‌و جەواد رفعەت ئاتیلهان، حیزبەکە بانگەشەی دەکرد بۆ هەڵبژاردنی راستەوخۆو رەتکردنەوەی خاوەنداریێتی دەوڵەت بەرامبەر هۆیەکانی بەرهەم‌و هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار لەراپرسییەکی گشتی‌و پەسندکردنی سیستمی بازرگانی ئازادو یەکێتی ئیسلامی‌و بادانەوە بەرەو رۆژهەلات لەسیاسەتی دەرەوە (١/٧٨).

وێڕای ئەوە حیزبی ناوبراو ئەرکی ئۆپۆزسیۆنی لەدەرەوەی پەرلەمان گرتە ئەستۆ، چونکە نەیتوانی لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠ هیچ کورسییەك لەپەرلەمان وەدەست بێنێ، وەلێ ناچار بوو ساڵی ١٩٥٥ دەرگاکانی خۆی دابخات.

پاش کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی دووەم‌و جاڕدانی پەیمانی ئەتڵەنتیك، دەوڵەتێك لەجیهاندا نەبوو بتوانێ حاشا لەمافی مرۆڤ بکات‌و دان نەنێت بە ئازادییە گشتییەکاندا، نەخوازە دوای ئەوە نەتەوە یەکگرتووەکان دامەزراو هزری فرە حیزبی بە زەمانەتێك دانرا بۆ دیموکراتییەت‌و ئازادییە گشتییەکان... تورکیاش ناچار بوو لەدەرەنجامی فشاری رای گشتی‌و رۆژنامەکان ئەو بنەماو پرنسیپانە بە هەند وەربگرێ دوای ئەوەی بەرخودان لەدژی تاکە حیزبی دەسەلاتدار پەرەی سەندو جموجۆڵی ئۆپۆزسیۆن لەریزەکانی سەری هەڵدا، تەنانەت ژمارەیەکیشیان لەپێڕەوی حیزبی ناوبراو لایدا بەئاراستەکردنی رەخنەی ئاشکرا بەرامبەر بە حیزبی گەلی کۆماری دەسەلاتدارو بگرە هەریەك لەنوێنەران جەلال بایا کە لەدوای هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠ بووە سەرۆك کۆمارو تاوەکو ئیمڕۆیش لەنێو سەرۆکانی کۆمار بە تاکە سەرۆکی مەدەنی دادەنرێ، چونکە ئەوانیتر هەموو سەربازی بوون، پاشان تورگۆت ئوزال سەرۆکی مەدەنی دووەم بووو عەدنان مەندەریس‌و فوئاد کۆپرلوو رەفیق قورالتان ئەندامانی حیزبی گەلی کۆماری دەسەلاتدار لەفراکسیۆنە پەرلەمانییەکەی، داوایان لەو حیزبە کرد بارودۆخەکان

بگێڕدرێتەوە دۆخی خۆی بە گەڕانەوە بۆ سەروەریی یاساو بنەبڕکردنی ئەو پێشێلکارییانەی هاوڵاتیان بە دەردییانەوە دەناڵێنن.

ئەو پێشنیارەی نوێنەرانی ناوبراو بۆ فراکسیۆنە پەرلەمانییەکەی حیزبی گەلی کۆماری بەرزیان کردبۆوە، شەپۆلێك رەخنەو مشتومڕی نایەوە، حیزبەکە بۆ پەرچدانەوەی ئەم مەسەلەیە هەریەك لە(عەدنان مەندەریس‌و فوئاد کۆپرلو)ی لەحیزب دەرکردو شەرەفی ئەندامێتیشی لێیان سەندەوە. ئەنجا هەریەك لەجەلال بایارو رەفیق قورالتان ئەوانیش دەستیان لەحیزبی ناوبراو کێشایەوە، پاشانیش هەر چوار نوێنەرەکە حیزبی دیموکراتیان لەئەنکەرە لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٤ دامەزراند (٧٩/١).

دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی لەتورکیا زەنگێك بوو بۆ دامەزراندنی چەندین حیزبی سیاسیی دیکە، چونکە لەماوەیەکی کەمدا - کەمتر لەساڵێك- دەیەها حیزبی سیاسی بچووك‌و گەورەی خاوەن مەیل‌و بۆچوونی جیاجیا، دامەزران، گرنگترینییان ئەمانە بوون:

١-حیزبی لادێی تورك: لە١٩ی ئایاری ساڵی ١٩٤٦دامەزرا، لێ کاروچالاکییە سیاسییەکانی لە ئەستەموولْ دەستی پێکرد، بەڵام زۆری نەخایان دەرگاکانی داخست بۆ ئەوەی لە دواییدا ئەندامەکانی بچنە ناو حیزبە تازەکەو بە هەمان ئەو ناوەی کە لە ساڵی ١٩٥٢ دامەزرا.

٢-حیزبی سوسیالیستی تورك/ بەم ناوە زیاتر لە(٥) حیزبی سیاسی دامەزرا، بەهێزترینیان ئەو حیزبە بوو (ئەسعەد عادیل موستەفا جاب ئۆغلوو هاوەڵەکانی لە١٤ی ئایاری ساڵی ١٩٤٦ دایانمەزراند، لێ ئەو حیزبە بە پڕووپاگەندەکردن بۆ کۆمۆنیستی تۆمەتبارکرا، دوای دادگاییکردنێك کە (٨) ساڵی خایاند، تۆمەتباران بەرەڵڵا کران، حیزبەکەش لەساڵی ١٩٥٢ داخرا.

٣-حیزبی کرێکاران‌و جوتیارانی تورك/ ئەم حیزبە دکتۆر شەفیق حوسنی دیمیر (سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی نهێنی تورك)و هاوەڵەکانی لە٢٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ دایانمەزراند، رۆژنامەی (نیقابە)و گۆڤاری (جمهور) زمانحاڵی حیزبەکە بوون، بەڵام تۆمەتبارکردنی حیزبی ناوبراو بە پڕووپاگەندەکردن بۆ شیوعیەت بووە هۆی قەدەغەکردنی.

٤-حیزبی نەتەوە/ بە سەرۆکایەتی مارشال فەوزی چەقماق دامەزرا کە یەکێك لە هاوەڵانی مستەفا کەماڵ‌و بەرپرسێکی سەربازی گەورە بوو، هەروا لەدامەزرێنەرانی ئەم حیزبە عوسمان بولوك باشی‌و حەسەن دەنجەر بوون. ئەو حیزبە بانگەشەی بۆ یەکێتی نیشتمانی‌و رێزگرتن لە

پیرۆزییە ئاینییەکانو بڕوابوون بە شۆڕشەکانی کەمالیزم دەکرد، رۆژنامەی (سەباح) زمانحـاڵی حبزب، مێژووی دامەزراندنی ۲۰ی تەموزی ساڵی ۱۹٤۸ بوو.

٥-حیزبی شیوعی نهێنی تورکیا/ ئەم حیزبە بە درێژەپێدەری ئـەو حیزبـە شـیوعییە تورکییـە دادەنرێ کە لە ساڵی ۱۹۲۲ دامەزراو کوردەکان رێژەیەکی زۆریان لە نێو ئەندامەکانی پێك دێنا.

هەرچـەندە حیزبـی دیمـوکراتی زۆرینـەی دەنگـەکانی لەهەڵبـژاردنی سـاڵی ۱۹٤٦ بـە دەستنەهێنا، چونکە لە دەستپێکی دامەزراندنیداو لەبەر ئەوەی بریتی بوو لە کۆمـەڵێك لـەو بیرۆکراتییانەی لە حیزبی گەلی کۆماریو سەرۆکەکەی عیسمەت ئینۆنۆ جیابـوونـەوە، بـەڵام توانی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹٥۰ بە زۆرینەی دەنگ سـەرکەوێت بەسـەر حیزبـی گـەلی کۆماری دا، بەوەش قۆناغێکی نـوێ لـە دیکتاتۆرییـەتی تاکـە حیـزب بـۆ ماوەیـەکی کـەم هەڵپێچرایەوە... لەو ماوەیەش ئازادی رۆژنامەگـەری فەراهـەمو حیزبـی تـازەو ئۆپۆزسـیۆن سەریان هەڵدا، وەلێ سەرکەوتنی حیزبی دیموکراتی وەرچـەرخانێکی سیاسـی پێشـکەوتنخواز نەبوو، بەڵکو رواڵەتێك بوو لە رواڵەتەکانی ئارەزووی نوێخوازیی پاش کەڵەگایەتی تاکە حیزب کە پتر لە چارەکە سەدەیەك درێژەی کێشا، سەرڕای ئەوەش لێبوردنی سیاسی گشتی دەرکـردو هەندێ لەو یاسایانەی هەڵوەشاندەوە کە حیزبی گەلی کۆمـاری دەریکردبـوون، هـەروا بـانگی نوێژەکانی بە زمانی عەرەبی گەڕاندەوە، کە پێشتر حیزبی گەلی کۆماری یاسایەکی دارِشـتبوو ئەو بانگانە بە تورکی بدرێن (۱/۸۷).

ئەگەرچی کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد(۷) بەو کۆمارە دادەنرێ خەونی کوردی وەدیهێنابێ بە درێژایی خەباتو قوربانیدانیان لەماوەی سـێ هـەزار سـاڵی رابـوردوودا، بـەو پێیـە بـووە یەکەمین دەوڵەتی کوردی بە چەمکە سیاسییە نوێیەکەی، بەڵام ئاکامە کارەساتئامێزەکەی ئەم کۆمارە دیموکراتییە ساڵێك پاش دامەزراندنی، بزوتنەوەی گەلی کوردی لەسەرتاپا کوردسـتان رووبەڕووی ناهومێدیو هەناسە ساردی کـردەوە بـە تایبـەت دوای لەسـێدارەدانی رێبـەرانی کۆمار: قازی محەمەدو هەڤاڵەکانیو پەنابردنی مەلا مسـتەفای بـارزانیو ئەنـدامانی پـارتی دیموکراتی کوردستان بۆ یەکێتیی سۆڤییێتو مەڵبەنـدەکانی سـەرکردایەتی شۆڕشـی کـوردیش دووبارە گەڕانەوە عێراق.

---

۷- بە هەڵە دەوترێ کۆماری مهاباد- بەڵکو ڕاستیەکەی کۆماری کوردستان لە مهاباد.(وەرگێڕ و پێداچۆرەوە)

ناوچەی کوردستانی تورکیا لەدوای ئەو شەڕو شۆڕە خوێناویو توندانەی تیادا قەومان، نیمچە چۆڵوهۆڵ مایەوە، لێرەدا ئەو کوردانەی مابوون پەنایان بردە بەر ئەشکەوتو پەناگاکان، یان بەرەو لوتکەی چیاکان، بەشێکی زۆریشیان لەتاراوگە لە رۆژئاوای ئەنادۆڵ ژیانیان بەسەر دەبرد. بەلاّم بە کۆتاییپێهێنانی شەڕی دووەمی جیهانو ئەو شەپۆلە دیموکراتییەی دواتر باڵی کێشاو هەروا جاڕدانی جیهانیی مافی مرۆڤ ، هەموو ئەم فاکتەرانە حکوومەتی تورکیایان ناچار کرد، کوردە راگوێزراوەکان لەزستانی ساڵی١٩٤٨ بگێڕدرێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، ئەمەش وایکرد نەهامەتییەکانیان سەختو زیاتر بن، چونکە لەوێ ژمارەیەکی زۆریان بەهۆی برسێتیو سەرماو قاتو قڕییەوە گیانیان لەدەست دا (٣٢٤/٥).

بەڕێز (عوسمان مەتە) نووسەری رۆژنامەی سۆن پۆستە کە لەئەستەموول دەردەچوو، رەوشی کوردستانی تورکیای لەپاش سەردانەکەی بۆ ناوچەکە لەنیسانی ساڵی ١٩٤٨ وەها وەسپ کردووەو دەڵێت:(( لەم ناوچە پانو بەرینە کە لە قالان (دەرسیمی پێشوو)ەوە تا کێوەکانی ئارارات درێژ بۆتەوە، سووڕامەوەو لەگەڵ خەڵکەکەی قسەم کرد، گوتیان ئێمە لەباجگرو جەندرمە بەولاوە چاومان بە کاربەدەستانی تورك نەکەوتووە. چونکە لێرە نە رێگەیەکی قیرتاو هەیە، نە پردێك رۆنراوە، قوتابخانەو حوجرەکانیش داخراونو ناوچەکە خاڵییە لەهەر خەستەخانە یاخود بنکەیەکی تەندروستی، کشتوکاڵیش وا داروخاوە بە شێوەیەك دانیشتوان بژێوییان تەنهاو تەنها لەسەر لەوەڕاندنی بزنە.. لەولاشەوە ئەو گوندانەی بەسەر تەپۆڵکەکانەوە بنیات نراون لەحاڵێکدان مرۆ گریانی بۆیان دێت. بەرپرسیارێتی ئەم ژیانە سەرەتاییو نامرۆییەی خەڵکی تێدان، دەکەوێتە ئەستۆی ئەو دەزگاو دایەرە حکوومییانەی لافی ئەوە لێدەدەن گوایا ئەوان چاکسازی لەبارودۆخەکان دەکەن (٣٢٦/٥).

کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەساڵی ١٩٤٧ پرنسیپی (ترۆمان)ی جاڕداو تیادا بەرگری ئەمریکای لەو رەوشانەی لەهەریەك لەتورکیاو یۆنان هەیە، گرتبووە خۆ، تورکیاو یۆنان بە پشتبەستن بە پرەنسیپی ناوبراو لەساڵی ١٩٥٣ چوونە ریزی پەیمانی ئەتڵەسییەوە (پەیمانی ناتۆ)، تورکیا چەند یەکەیەکی سەربازی نارد بۆ بەشداریکردن لەشەڕی کۆریا، بەم کارەشی بووە بەشێك لەناوچەی ژێر دەسەلاّتی رۆژئاوا، نەخوازە دوای هەوڵدانی بۆ بەستنی پەیمانی بەغدا لەساڵی ١٩٥٥ لەنێوان خۆیو عێراقو ئێرانو پاکستانو دوای ئەمە تورکیا چەندین رۆڵی گێڕا لەسەر هەردوو ئاستی ناوچەکەو نێودەوڵەتی لەدژی بزوتنەوە رزگاریخوازییەکانو دەوڵەتەکانی جەمسەری سۆشالیستیو کە هەڵمەتی پڕۆپاگەندەی پیادە کرد

بەرامبەر بە کۆمۆنیستی‌و ئەگەری فراوانبوونی سۆڤیێت. جیاوازیی ئەو (١٠) ساڵەش کە لەمیانەیدا هەردوو سەرۆك (بایار)و (مەندەریس) دەسەڵاتی سەرۆکایەتی تورکیایان گرتبووە دەست، ئەوە بوو: ئەم دووانە سیاسەتێکی راسترەوی توندڕۆیان لەناوەوەی تورکیا پیادە کرد تەنانەت دووربوو لەهەموو عورفێکی ئەو فەلسەفە ئەتاتۆرکییەی مستەفا کەماڵ دایڕشتبوو و بە بناغەیەکی دادەنا لەبناغەکانی کۆماری تورکیای تازە دامەزراو.

لەبەر ئەوەی کورد لەتورکیا لێی قەدەغە کرابوو هەر کۆمەڵەو حیزبێك بۆخۆی دابمەزرێنێ، بەڵکو نووسینیش بە زمانی کوردی بە پێی یاسای ساڵی ١٩٣٢ لێی حەرام بوو، بۆیە لەو سەروبەندە کوردی تورکیا روویانکردە خەباتی سیاسی‌و رۆشنبیری بۆ وەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانیان لەچوارچێوەی ئەو حیزبە سیاسییانەی دامەزران دوای ئەوەی تورکیا فرە حیزبی پەسەند کرد. روناکبیرانی کوردیش لەدەوری یانە رۆشنبیرییەکان‌و لقەکانیان لەرۆژهەڵات (ناوی فەرمی بوو بۆ کوردستانی تورکیا دوای ساڵەکانی پەنجا) کۆبوونەوە بۆ دەرکردنی ئەو گۆڤارانەی خزمەتی ئامانجەکانیان دەکەن. بۆ نموونە: نووسەری کورد مووسا عەنتەر گۆڤاری (وڵات)ی دەرکرد کە گۆڤارێکی پێشکەوتووخواز بوو، بایەخی دەدا بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی لەجیهانی سێیەم بە پلەی یەکەم‌و هەروا بە دۆزە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد. نووسەری پێشکەوتووخوازی تورکیش (یەشار نابی) خاوەنی گۆڤاری (وارلق= وجود)ی بوونیزمی لەساڵی ١٩٥٩ چالاکییەکی بەرچاوی نواند بۆ دامەزراندنی یەکێتی ئەدیبانی تورك‌و توانیی لەساڵی ١٩٦٠ ئەو یەکێتییە دابمەزرێنێ‌و یەعقووب قەدری قەرا عوسمان بووە سەرۆکی یەکێتییەکەو کۆمەڵێك لەئەدیب‌و روناکبیرانی کورد لەدەوری کۆبوونەوە، پێشتریش نووسەری چەپ حیکمەت قویلجیملی لە٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ حیزبی (نیشتمان)ی دامەزراندو کاتێك ئەم حیزبە لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٥٧ بەشدارییان کرد، (٤٠) کەس لەئەندامانی کوردی حیزبە کە گیران‌و بە تۆمەتی کۆمۆنیستییەوە رەوانەی دادگا کران. ئەو حیزبە لەرێکەوتی ٣٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٧ بە شێوەیەکی کاتی چالاکییەکانی لێ قەدەغە کرا. بەڵام ئەو ئەندامە کوردانەی کەوا دەسگیرکرابوون لە٢ی ئاداری ساڵی ١٩٦١و پاش کوودەتاکەی ٢٧ی مایسی ساڵی ١٩٦٠ بەرەڵڵاکران (٤٥٣/١٢). حیزبی (نیشتمان) بانگەشەی دەکرد بۆ پەسەندکردنی ستراتیژییەتی (دیموکراتی شۆڕشگێڕی)و پیادەکردنی چاکسازیی کشتوکاڵی‌و هەڵوەشاندنەوەی دەرەبەگایەتی‌و سەرڕای پیڕەوکردنی پیشەسازی تەکنیکی‌و رەتکردنەوەی پەیمانە سەربازییەکان.

پێشێلکارییەکانی حیزبی دیموکراتی بەرامبەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە سەروبەندی مانگرتنی قوتابیان لەساڵی ١٩٥٦ گەیشتنە چڵەپۆپەو ئەوەندەی نەمابوو ئەم حیزبە ببێتە چڕنووکی پشیلە بە دەستی ئیمپریالیزمی ئەمریکاوە لەساڵی ١٩٥٧ بۆ دەستێوەردان لەکاروباری ناوخۆی سووریاو هێندەشی نەمابوو خۆی تووشی دەستێوەردانی سەربازی بکات لەعێراق دوابەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بۆ بەرگریکردن لەپەیمانی ناتۆو چەندین تاوانی وەحشیگەرانەشی ئەنجامدا لەدژی بەندکراوەکان بە ئەشکەنجەو ئازاردانیانو تەقەکردن لەخۆپیشاندەرانو خوێندکاران لەهەردوو ساڵی ١٩٥٩-١٩٦٠ لەدەرئەنجامی هەڵپەکردن بە دوای بەرژەوەندییە تایبەتییەکانو بۆ بەرگریکردن لەسیاسەتی ئەمریکا لەناوچەکە، لەوڕا (٧٤) هزرڤانی زانکۆییو ڕۆشنبیر لە١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ دەستگیر کرد، لەنێویاندا (٤٩) هزرڤانی کورد بوون هەموویان درانە دادگا بە تۆمەتی بانگەشەکردن لەمیانەی نووسینەکانیان بۆ جوداخوازیو پلانگێڕان لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیو هەریەکەیان بە ٣-١٤ ساڵ حوکم دران. ئەو قوتابییانەش لەخۆپیشاندانەکانی ئاداری ساڵی ١٩٦٠ دەسگیرکران، ژمارەیەکی زۆریان قوتابی کورد بوون، بەتایبەتی لەویلایەتەکانی: هەکاریو ئەرزرومو سعردو مەلاتیەو ئەنکەرە. جگە لەوەش کورد لەچوارچێوەی خەباتی گەلی تورك لەدژی سەرکوتکردنو ستەمکاری بەشدارییان لەخۆپێشاندانو مانگرتنو پەناگیریو هەموو جۆرە خەباتێك کردووە کە لەئاکامی ئەوەدا بزوتنەوەکەی ٢٧ی مایسی ساڵی ١٩٦٠ ڕووی دا.

لە١٤ی نیسانی ساڵی ١٩٦٠ ڕۆژنامەکانی تورکیا، هەواڵی گرتنی (٥٠) هاوڵاتییان بڵاوکردەوە بە تۆمەتی ((هەوڵدان لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بە دابڕینی بەشێك لەنیشتمانی بەنرخی تورکیا، لەوڕا دادوەری گشتی کۆماری داوای دەرکردنی بڕیاری حوکمی لەسێدارەدانی کرد بەرامبەر بەو تۆمەتبارانەی کە زۆربەیان ڕووناکبیرو ڕۆژنامەنووسو قوتابیو ژمارەیەکیش کرێکاریان تیابوو، بەڵکو ئابووریزانێکی ناسراویشیان لەناودا بوو لەدەرچوانی زانکۆی سۆربۆن..)) ئەو تۆمەتە وەك تێکەوتنێکی سیاسی وابوو بۆ حکوومەتەکەی عەدنان مەندەریس، چونکە لەکاتێکدا حکوومەت دانی نەدەنا بە بوونی کورد لە تورکیا، کەچی بە زمانی خۆیو بە شێوەیەکی ڕەسمی بڵاوی دەکاتەوە کە بزوتنەوەیەکی کوردی ڕێكوپێك لەوڵاتدا هەیە، دوای ئەوە کە بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك پەردەی لە سەر دادەپۆشیو حاشای لێ دەکردو چەندین مومارەسەی شۆفێنی لەدژی بەکار دەبرد.

## سەرچاوەکانی بەشی سێیەم

١- ابراهيم الداقوقي: فلسطين و الصهيونية في وسائل الاعلام التركية، بغداد ١٩٧٩

2- F.Husrev Tokin: Turk Tarihinde Siyasi Partiler, Istanbul 1965.

3- Metin To Ker, Seyh Sait Isyni, Ankara 1964.

4- Mustafa Kemal Ataturk, Nutuk, Istanbul 1964.

5- Dr. Nuri Dersimde: Dersime Dersim, Beyrut 1964.

٦- د.بلةج شيركؤ، القضية الكردية، القاهرة ١٩٣٠.

7- Metin Toker, Solda Ve Sagda Vurusanlar, Ankara 1989.

٨- عبدالرحمن قاسملو: كوردستان و الاكراد بيروت- ١٩٧٠.

٩- فاضل حسين، مشكلة الموصل، ط٢، بغداد ١٩٦٧.

10- Aziz Nesin: Bulgaristande Turkler Turkiyede Kurtler, Istanbul, 1989.

١١- د. عبدالستار طاهر شريف: الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكردية في نصف قرن ٨-١٩-١٩٥٨، بغداد ١٩٨٩.

12- Proleter Devrimci Aydinlik Dergisi, Ankara Sayi 10-24 Ekrim 1970.

کوودەتاکەی ٢٧ی مایسی ١٩٦٠ شۆڕشێك نەبوو بە مانا وردو راستەقینەکەی ئەم واژەیە، چونکەگۆڕانکاریی بنەڕەتیو گەورەی لەتورکیا ئەنجام نەدا، لێ کوودەتایش نەبوو بەو چەمکە باوەی ئامانجی تەنها گۆڕینی دەموچاوو سیماکان بێت، چونکە ئەو ((کۆمیتە یەکێتییە نیشتمانییەی)) کوودەتا سەربازییەکەی بەرپا کرد، گوزارشتی لەچینە بۆرژوا پێگەیشتووەکانی نێو کۆمەڵگەی تورکی دەکرد لەدوای کراوەیی ئابووری لەسەر رۆژئاوا کەوا بە سەخاوەتەوە کۆمەکی داراییو ئابووری گەورەی پێشکەش بە تورکیا کرد بە تەرحێکی وا تورکیا جۆرێك لەگەشەی ئابووریو پیشەسازیو کۆمەڵایەتی بەخۆوە بینی کە چیتر بارودۆخەکانی جاران لەگەڵ ئەم گەشەکردنەدا نەدەگونجان، بۆیە بزوتنەوەکەی ٢٧ی مایس دەستیدایە کۆمەڵێك چاکسازی بۆ ئەوەی کۆڵەگەکانی چینە بۆرژوا پێگەیشتووەکان بچەسپێنێ. بۆ نموونە حکوومەتی کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانی دەستوورێکی نوێی دانا زامنی پراکتیزەکردنی ئازادییە دیموکراتییەکان بکاتو رێگا بدات بە دامەزراندنی حیزبە چەپو سوشیالیستەکانو هەروا زامنکردنی مافی مانگرتنو دامەزراندنی سەندیکاو هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەرەبەگ لەلادێیەکانو ئازادکردنی بەندکراوو گیراوە سیاسییەکان لەو هزرڤانو قوتابیو لاوانەی لەلایەن دادگاکانەوە حوکم دراون... بەڵام ئەم حکوومەتە بەرامبەر بە پرەنسیپەکانی کەمالیزمو شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانی بە ئەمانەتەوە مامەڵەی کردو مانەوەی خۆیشی لەنێو پەیمانە سەربازییە دوژمنکارییەکان (پەیمانی ناتۆو سەنتۆ) هێشتەوە، بێجگە لەمەش هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەر بڕگەو مادە فاشیزمە ستەمکاریەکانی ١٤١و ١٤٢و ١٦٣ لەیاسای سزاکانی تورکیا کە وەك شمشێری دیموقلیس وابوون بەسەر ئازادیی رادەربڕینەوە لەتورکیا، نەهێنا. بۆیە دەبینی بە هیچ شێوەیەك درێغی نەکرد لەگرتنی چەندین کەس لەو هزرڤانو سیاسەتمەدارە پێشکەوتووخوازانەی کە داوای پیادەکردنی هەنگاوی شۆڕشگێڕانەی زیاتریان دەکرد، وەك: کشانەوە لەپەیمانە سەربازییەکانو کلکایەتیی ئەمریکاو هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕگەو مادە فاشیستییانە لەیاسای سزاکانی تورکیا .

لەگەڵ ئەوەی حکوومەتی ((کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانی سەربازی)) دەسەڵاتی دایە دەست پیاوانی مەدەنی لەدوای ئەو هەڵبژاردنە گشتییانەی کە لە١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦١ بەڕێوەچوو و تیادا حیزبی گەلی کۆماری بردییەوە پاش مانەوەی وەك ئۆپۆزسیۆن بۆ

ماوەی (١٥) ساڵ لەدەرەوەی دەسەڵات، بەڵام ڕەوشی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی گەلی کورد لەم وڵاتەدا هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نەهات، ئەگەرچی (٤) ئەندام لەکۆی (٢٠) ئەندامی حکوومەتەکەی ((یەکێتی نیشتمانی سەربازی)) کورد بوون، ئەوانیش: ئەکرەم ئاجونار لەسیواس، موجیب ئاتاتلی لەئەرزروم، وەهبی ئەرسۆ لەئەرزنجان، کامل قەراوڵی لەکەسکای، دواجاریش ئەم بەڕێزانە بوونە ئەندام لەئەنجومەنی پیرانی تورکیا، ئەمە جگە لەجەمال گورسێل (کە ئەویش لەو بڕوایەدان کورد بێت) بووە سەرۆکی کۆمارو هەروا (ئەلب ئەرسەلان تورکیش)یش لەحکوومەتی کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانی دەرکرا بەهۆی بیروبڕوا راستڕەوە توندڕۆکانییەوە.

هەرچەندە حکوومەتی کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانی بڕوای بە هزری سوشیالیستی هەبوو و زۆربەی ئەندامەکانی لەئەفسەرانی پێشکەوتووخوازو بگرە لەچەپەکانیش بوون، بەڵام نەیدەوێرا دان بەوەدا بنێ لەتورکیا کێشەیەك هەیە بە ناوی کێشەی کوردەوە، تەنانەت وتەبێژی فەرمی بەناو ئەم حکوومەتەوە چەندین جار دووپاتی دەکردەوە کە پێویستە کێشەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات چارەسەر بکرێن، بێ ئەوەی ناوی کورد بێنێ، بەڵکو هێندێکیشیان هەڕەشەی لەناوبردنی کوردییان دەکرد ئەگەر هەر جموجۆڵو بزوتنەوەیەك لەرۆژهەڵات بەرپا بێت. لەبەر گرنگی ئەم قۆناغە سیاسییە لەتورکیا چونکە زەمینەی لەباری ڕەخساند لەپێش هەموو ئەو بزوتنەوە سیاسییانەی تورکیا لەهەردوو دەیەی دواتر بەخۆوەی بینی، بۆیە لەم سێ باسەی لای خوارەوەدا، بەم شێوەیە لێی دەکۆڵینەوە:

## باسی یەکەم

## دەستووری ساڵی ١٩٦١

بزوتنەوەی ٢٧ی مایسی ساڵی ١٩٦٠ ئەنجومەنێکی دامەزرێنەری پێکهێنا بۆ دانانی دەستووری وڵات پاش ئەوەی دەستووری ساڵی ١٩٢٤ی هەڵوەشاندەوە، چونکە مادەکانی لەگەڵ بارودۆخی سەردەم نەدەگونجان. لەناو ئەنجومەنەکە ناکۆکی توند رووی دا هەرچەندە لەسەر بنەمای حیزبی دانەمەزرابوو، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لەدادوەرو پارێزەرو پەرلەمانتارو رۆژنامەنووس‌و هزرڤان‌و سەندیکاکاری لەخۆ گرتبوو، تەنانەت مشت‌ومڕەکان — لەدواین رۆژەکانی ئامادەکردنی دەستوور- لەسەر دوو جەمسەر بەڕێوە دەچوون نەخوازە لەتاوتوێکردنی کێشە سەرەکییەکانی (٧٢٦/٤) وەك: مڵکداری‌و خۆماڵیکردن‌و پلاندانان‌و پەرەپێدان. بەڵام گفتوگۆکان لەکاتی لێتوێژینەوە لەمادە (٢)ی دەستوور کە هاوبەندە بە شێوەی دەوڵەت‌و چەمکە سیاسییەکەیەوە فرە توند بوون‌و کاتێکی زۆریان خایاند (٧٢٢/٤)، داڕشتنی ئەم مادەیە، دەقەکەی بەم شێوەیە بوو:((تورکیا، کۆمارێکی دیموکراتی سوشیالیستی عیلمانییە)) لێرەدا شرۆڤەکردنی واژەی سوشیالیستی Sosyal بووە هۆی ناکۆکی گەورەی نێوان ئەندامانی ئەنجومەنی دامەزرێنەر، چونکە موحافیزکارەکان پێیان وابوو پرنسیپێکی تێدایە توندڕۆیی چەپی لێدەکەوێتەوە، هەرچی چەپەکانیش بوون جەختیان لەوە دەکرد کە ئەم بیرۆکەیە واتە: سوشیالیستی بە واتای دادوەریی کۆمەڵایەتی دێت، نەوەك سوشیالیستبوونی دەوڵەت. دەرەنجام رێککەوتن لەسەر ئەمەی کە سوشیالیستی یانی ئەو دەوڵەتە کۆمەڵایەتییەی کە بڕوای بە مافی مرۆڤ هەیەو یاسا تێدا سەروەرەو زامنی پیادەکردنی ئازادییە گشتییەکان دەکات بەپێی چەند کۆتبەندێکی دیاریکراو.

ئەرکی ئەنجومەنی دامەزرێنەر لەسەرتاوە دیاری کرابوو بۆ دانانی بنەماکانی سیستمێکی دیموکراتی پشت ببەستێ بە مافی مرۆڤ‌و ئازادییە گشتییەکان‌و هەروا بە هزری سوشیالیستی کۆمەڵایەتی بەرەو ئاقارێکی پەرەسەندوو. لێرەشدا دەستووری نوێی تورکیا - دەستووری ساڵی ١٩٦١- جەختی کردۆتە سەر خاوەنداریتیی تاك‌و کێبڕکێی ئازاد لەتەك رێگرتن لەقۆرخ‌و مۆنۆپۆڵکردن بە مەرجێك لەسەر حیسابی هەوڵ‌و ماندووبوونی ئەوانیتر نەبێت، بۆیە ئەو فۆرمانەی داڕشت کە زامنی مافی کرێکاران‌و جوتیاران دەکەن، وەك بەشداربوونی کرێکاران لەقازانج‌و دابەشکردنی زەوی‌وزاری زیاد لەئاتاجی خاوەن مڵکە گەورەکان بەسەر جوتیاراندا بەو شێوەیەی بیرۆکەی دەوڵەتی خۆشگوزەران Welfare state بەدی بێت لەپێناو پەرەپێدانی نەتەوەیی بە رێگەی

دەزگای پلاندانان TPD بەو پێیەی دەوڵەت دەزگا تاکە کەسییە خاوەن قازانجە گشتییەکان خۆماڵی بکات لەحاڵێکدا بەکاربردن (ئیستیغلال) بکات یان ئەرکی خۆیان بەجێ نەگەیەنن، لەبەرامبەریشدا هەر دەزگایەك چ حکوومی یان ملکی دەوڵەت بێت لەتوانایدا نەبێ ئەو ئامانجانەی وەدەست بێنێ کە لەیاسا پێڕەوکراوەکاندا جەختیان لەسەر کراوە، ئەوا دەفرۆشرێنە کەرتی تایبەت (٧٧٦/٤).

دەستووری ساڵی ١٩٦١ بیرۆکەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانیشی پەسند کرد و وایکرد دەسەڵاتی دادوەری بە تەواوی سەربەخۆ بێتو ڕێگە نەدرێ بە گواستنەوەی دادوەران یان خانەنشینکردنیان تەنها بە ئارەزووی خۆیان نەبێتو مووچەی باشیشی بۆیان بڕییەوە. هەرچی دەسەڵاتی یاسادانانیشە، ئەوا بە ڕێگەی ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورکەوە پیادە دەکرێت، ئەو ئەنجومەنەش بریتی بوو لەدوو ئەنجومەن: ئەنجومەنی پیران، ژمارەی ئەندامەکانی ١٨٣ کەس بوو لەنێویاندا (٣٤) کورد هەبوون لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦١ (٦/ئەلبوم)، لەکۆی ئەوانە (١٥٠) کەسیان بە هەڵبژاردنی نهێنی راستەوخۆ، هەڵدەبژێردرێن، کەچی سەرۆکی کۆماریش (١٥) کەسایەتی لەپیاو ماقوڵانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو بیرمەند لەوانەی خزمەتی بەرچاویان بە کۆمەڵگەی تورکی کردووە دامەزرێنێت، لەناو ئەنجومەنەکە، لەکاتێکدا حکوومەتە (١٨) کەسییەکەی کۆمیتەی نیشتمانی وەك ئەندامی هەمیشەیی هاتە ناو ئەنجومەنی پیران. ئەنجومەنی نوێنەرانیش پێکهاتووە لە(٤٥٠) ئەندام بە شێوەی نهێنی راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. لەیەکەمین ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی تورك کە لە١٥ی تشرینی یەکەم ئەنجامدرا (٤٩) ئەندامی کوردی تیابوو، لەپاشان لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٥ ئەم ژمارەیە سەرکەوت بۆ (٦١) ئەندامی کورد (٥/ئەلبوم).

لەپێناو زامنکردنی هەموو ئەو پرەنسیپە بنەڕەتییانەی کە یاسای سەرەکی ساڵی ١٩٦١ لەخۆی گرتبوون، چەند دەزگایەکی دەستووری لەشێوەی (٣) دادگای سەرەکی دامەزران، ئەوانیش:

١-دادگای دەستوور، بە دەستووری کردنی ئەو یاسایانەی کە حکومەتەکان دەریان دەکەن و هەر یاسایەك پێچەوانەی مادەکانی دەستووری ساڵی (١٩٦١)ە هەڵیان دەوەشێنێتەوە یانیش لەگەڵ نێوەڕۆكو دەقەکەیدا ناگونجێ، لەوڕا هەر تاكو ڕێکخراوو حیزبێك بۆی هەیە داوا بۆ بەردەم ئەم دادگایە بەرز بکاتەوە لەدژی ئەو حکومەتەی ئەم یاسایەی دەرکردووەو بڕیارەکانیشی قەتعیو مولزەم دەبن.

٢-دادگای شوورا: دەڕوانێتە سکاڵای تاك یان دەزگاکان لەدژی ئەو بڕیارە کارگێڕییانەی حکوومەت کە تاکەکان پێیان وایە ناهەقییان تێدایە بەرامبەر بە مافەکانیان لەهەموو روویەکی ژیانەوە، چونکە لەوێ ڕا تاك یاسابەندییەك (حەسانەت)ی هەیە دژی ستەمی دەوڵەت نەوەك دەوڵەت

حەسانەی هەبێت بەرامبەر بە ڕەخنەو گازاندەی تاك لەسەر كردەوە ناڕەوا یان نایاساییەكانی دەوڵەت. لەبەر ئەمە سیستەمی دەستووریی توركیا بیرۆكەی نایاساییبوونی ئەو فەرمانە ئیدارییانەی چەسپاند كە حكوومەتەكانی توركیا دەریاندەكەنو حوكمی یاسایان هەیە. چونكە هەموو یاسایەك بۆ ئەوەی شەرعییەت وەربگرێ، پێویستە پەرلەمان بڕیاری لەسەر بدات، ئەگینا باتڵو نامولزەم دەبێت، دەبینی كاتێك دەستووری ساڵی ١٩٦١ تاكیدی كردەسەر ئازادییە سیاسیو هزریو زانستیو هونەریو ئایینییەكانو مافی كۆبوونەوەو مانگرتنو خۆپیشاندان (بڕوانە هەردوو مادەی ٢٠و ٢١)، ئەوا چەند پێوەرێكی وردی دانا (مادە:١١) بۆ ئەو سنوورانەی گەرەكە ڕەچاو بكرێن لەمومارەسەكردنی ئەو ئازادییانە وەك: بەرژەوەندیی گشتیو عورفو نەریتو ئادابە گشتییەكانو سیستەمی گشتیو عەدالەتی كۆمەڵایەتیو مافی ئابووریو ئاسایشی نەتەوەیی لەپێناو پیادەكردنی ئەو ئازادییانە بە شێوەیەكی تەندروستو بە گوێرەی نۆرمەكانی دیموكراتی لەچوارچێوەی چەمكێكی پێشكەوتوخوازانەی ژیانی سیاسی.

٣-خانەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریو میدیا: هەرچەندە دەقی مادە (١٠لەدەستووری ساڵی ١٩٦١ تاكید لەوە دەكات كە هەر تاكێك مافو ئازادیی خۆی هەیەو ناكرێ دەستیان لێ هەڵبگیرێ یان هەڵبوەشێنرێنەوە چونكە یاسابەندییەك (حەسانەت)ێكی وەهای هەیە گەرەكە دەوڵەت زامنی مومارەسەكردنی بە شێوەیەكی پێویست بكات، ئەوا مادەكانی ١١و ٤١ چوارچێوەیەكی گشتیان بۆ چۆنێتی پیادەكردنی ئەو مافو ئازادییانە دانا بە فەراهەمكردنی زەمانەت بەرامبەر بە توێژینەوەی زانستیو ئازادیی ڕۆژنامەگەریو ڕادەربڕین، لێرەشدا هەر تاكێك بۆی هەیە بەبێ مۆڵەتی بەرایی دەوڵەتو بەبێ سانسۆر ڕۆژنامە دەربكات. حكوومەتی یەكێتی نیشتمانی یاسایەكی نوێیشی بۆ ڕۆژنامەگەری (یاسای ڕۆژنامەگەریو ئازادیی هزر) لە٤ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦١ دەركرد، بە گوێرەی ئەو یاسایە ئازادییەكی ڕەهای دایە ڕۆژنامەگەریو مافو دەسكەوتی گەورەی بۆ كرێكارانی چاپەمەنیو نووسەرانی ڕۆژنامەكان وەدەست هێنا بەر لەوەی ئەو مافو دەسكەوتانە بۆ خاوەن ڕۆژنامە وەدەست بێنێ. سەرڕای ئەوەش یاسای پرەنسیپە ڕەوشتییەكانی پیشەی ڕۆژنامەگەری لە١١ی ئاداری ساڵی ١٩٦١ دارِشتو بە گوێرەی یاساكە هەر ڕۆژنامەنووسێك بەڵێن دەدا پابەندی ڕەوشتی باش بێت بەرامبەر بابەتەكانیانو ڕەخنەگرتنیان لەكەسایەتییە ڕەسمیو ناڕەسمییەكانو لەبەر ڕۆشنایی بیرۆكەی ئەم یاسایە خانەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریو میدیا دامەزرا كە وەكو دادگایەكی ڕۆژنامەنووسی دانرا بۆ سەپاندنی سزای دارایی بەسەر ئەوانەی سەرپێچی لەیاسای ڕۆژنامەگەریو بنەما ڕەوشتییەكانی پیشەی ڕۆژنامەنووسی دەكەن (١٣٣/١).

به پشتبەستن بە دەقەکانی مادە (١٠) لەدەستووری ساڵی ١٩٦١، حکوومەتی تورکیا یاسای دەزگای رادیۆو تەلەفزیۆنی ژمارە ٣٥٩ بۆ ساڵی ١٩٦٤ دەرکرد، بە پێی ئەم یاسایە دەزگاکەی کرد بە دەستەیەکی گشتی سەربەخۆ دوور لەدەسەلاّتی دەوڵەت، بەو پێیە ئۆپۆزسیۆن مافی دەربڕینی ڕاو پەخشکردنی پرۆپاگەندەی هەڵبژاردنی هەبێت بە ڕێگەی ئەم دەزگایەوە بە کاتێکی یەکسان لەگەڵ ئەو کاتو ماوەیەی دەزگاکە بۆ حیزبی دەسەلاّتدار دەیڕەخسێنێ.

یاسای دەزگای پلاندانانی دەوڵەت کە حکوومەتی کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانی لەساڵی ١٩٦٠ دایڕشت هەرچەندە جەخت دەکاتە سەر زەروورەتی گرنگیدان بە پەرەپێدانی ناوچەی رۆژهەلاّت (کوردستانی تورکیا) تا بگاتە ئاستی ناوچە پێشکەوتووەکانی دیکەی تورکیا، وەلێ حکوومەتە یەك لەدوایەکەکانی تورکیا درێژەیان بەسیاسەتی پشتگوێخستنی ئەو ناوچانە تاوەکو ساڵی ١٩٨٣ دا، لەم ساڵەشدا حکوومەتی کوودەتاکەی ١٢ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ یاسای پەرەپێدانی ناوچەی باشووری رۆژهەلاّتی ئەنادۆڵی دەرکرد، لەوڕا حکوومەتەکەی ئۆزال هەمان ڕێچکەی گرتەبەرو چەندین پرۆژەی پەرەپێدانی لەوێ دامەزراند.

بەلاّم ئەگەرچی دەستووری ساڵی ١٩٦١ سیستەمێکی نوێی دانا بۆ ئازادییە گشتییەکان کە تورکیا لەساڵی (١٨٧٦)ەوە واتا لەجاڕدانی مەشرووتییەت (دەستوور)ەوە لەرۆژگاری عەبدولحەمید بە خۆوەی نەبینیبوو، کە ئەویش پاڵی داوە بە هێزی هاوچەرخو زەمانەتی پراکتیزەکردنی دیموکراتی لەتورکیا بەشێوەیەکی باشو لەچوارچێوەی چەمکێکی پێشکەوتووخوازدا... کەچی ئەو دەستوورە (دەستووری ١٩٦١) خۆی گێل کرد ئاماژە بدات بە بارودۆخی کورد لەتورکیا، چونکە هیچ بڕگەیەك لەمادەکانی تاکید ناکاتە سەر مافی کەمە نەتەواییەکان، حکوومەتی کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانیش بە هیچ شێوەیەك هەموارکردنی بەسەر مادەکانی ١٤١و ١٤٢ لەیاسای سزاکانی تورکیا نەهێنا کە ڕێگری دەکەن لەدامەزراندنی پارتە کۆمۆنیستییەکانو پرۆپاگەندەی رووخێنەر. مادەی (١٦٣)یش لەهەمان یاسا ڕێگە دەگرێ لەدامەزراندنی حیزبە ئاینییەکانو پرۆپاگەندەی ئایینی بەرامبەر ئایینزاو گرووپە ئیسلامییەکانو بە هەمان شێوە بە پرۆپاگەندەی رووخێنەر دایاندەنێتو یاسا حسێبیان بۆ دەکات.

هێزە سیاسییە پێشکەوتووخوازەکانی تورکیا لەساڵەکانی شەستەوە تاوەکو ئەمڕۆ تێدەکۆشن بۆ هەڵوەشاندنەوە، یان هەموارکردنی ئەو مادانە لەیاسای سزاکانی تورکیاو لەم ڕێگەیەدا هەزاران کەسی بێتاوان بوونەتە قوربانی.

## باسی دووەم

## کوردو بزوتنەوەی چەپڕەوی لەتورکیا

عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆکی حیزبی گەلی کۆماری لە۲۰ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹٦۱و دوای هەڵبژاردنەکانی ۱٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹٦۱، جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەستو بووە سەرۆکی حکوومەتی تورکیا، (جەمال گورسێل)یش بووە سەرۆکی کۆمار.. ئینۆنۆ کۆمەڵێکی ئێجگار زۆر کێشەوگرفتی ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسی بۆ بەجێ مابوو، سەرباری خۆپیشاندانو مانگرتنو پەناگیریو فرە کێشەو گیروگرفتی تر (۸۲/۱).. ئەوە بوو پشێوی هەمیسان دووبارە سەری هەڵدایەوەو حیزبەکانیش لەجاران زیاتر بڵاوبوونەوەو حیزبی نوێ پێکهاتن، هێندێکیان هەڵگری بیروبڕوای چەپو هێندێکیشیان هەڵگری بیروبڕوای ئیسلامی بوون. کێشە ئابوورییەکانیش لەسۆنگەی سیاسەتی کراوەیی لەپەنجاکان، روویان لەپەرەسەندن کردو قەبارەی قەرزی بیانیش لەسەر تورکیا لەساڵی ۱۹٦۰ بە بڕی (۲) ملیار دۆلار چووە سەر.

حکوومەتەکەی عیسمەت ئینۆنۆ لە۳۱ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹٦۱ رووبەڕووی یەکەمین مانگرتنی کرێکاران بۆوە، وەلێ توانی ئەو مەسەلەیە بە شێوەیەکی باش چارەسەر بکات، پاش ئەوەی خاوەن کارەکان بە دەنگی هەندێك لەداخوازی کرێکارانەوە هاتن. رەنگ بێت مەترسیدارترین کێشە بەرەنگاری حکوومەتەکەی عیسمەت ئینۆنۆی (خەلیفەی ئەتاتۆركو سیاسەتمەداری زۆرزانو قاڵبووی دوو سەردەم لەتورکیا) بووبێت، خڕبوونەوەی کوتلە سیاسییە راستو چەپەکان بێت بە هەموو رەهەندە ئابووریو کۆمەڵایەتیو کلتوورییەکانیانەوە.. دەبینین لەشوباتی ساڵی ۱۹٦۲ کۆمەڵێك لەرووناکبیرە چەپەکان کۆنگرەی دامەزرێنەری پارتی کرێکارانی تورکیا (TIP) کردەوە کە هەموو بزوتنەوە چەپڕەوو پێشکەوتووخوازو سوشیالیستەکانی لەتورکیا لەخۆ گرتبوو، ئەم تێکەڵە فرە رەگەزە لەڕووی بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژییەوە، فاکتەرێکی ئەو ناکۆکییانە بوو بەرەی چەپ لەساڵەکانی ۱۹٦۳-۱۹۸۰ بە خۆوەی بینی تا گەیشتە سنوورێك یەکتر بە کرێگرتەو سیخوڕی تۆمەتبار بکەن. بەش بەحاڵی بەرەی ڕاستی تورکیاش، ئەوانیش بە پشتگیریی ژمارەیەك لەئەندامانی کۆمیتەی یەکێتیی نیشتمانی تورك ریزەکانی خۆیانیان رێك دەخست. ئەم بەرەیەش -بەرەی

راســـت- پێکهـــاتبوو لەچـــەند کۆمـــەڵێکی خـــاوەن هـــزرو بـــیرورای جیـــاواز، لەئیخوانولموسلیمینەکانەوە بگـرە تـا دەگاتـە نەورەسـییەکان (رێبـازێکی ئاینییـە، سـەعید نەورەسی کورد دایمەزراند، بانگەشە دەکات بۆ دوورکەوتنەوە لەهەر دیاردەیەکی ژیاریی نـوێ) ئەم بەرەیە ئەوانەشی لەخۆگرتبوو کـە دەیانویسـت تـەنها هاوکـاری لەگـەڵ تورکیـا بکـرێ. کۆمەڵێکیش بانگەشەی دەکرد تەنها لەگەڵ رۆژئاوادا هاوکـاری بکـەن، سـەرڕای دەرەبـەگو خاوەن کارگەکانیش.

ململانێی نێوان راستو چەپ لـەتورکیا سـەرەتا بـە دایـالۆگو لەسـەر لاپـەڕەکانی ئـەو رۆژنامەو گۆڤارانە بەڕێوە دەچوو کە ئەمانیش لەدوو بەرەدا خڕ بووبوونەوە، وەلێ ئەم دایالۆگە دیموکراتییە بە دیمەن دایالۆگێکی لەجۆرێکی دیکەی لەبنـدا بـوو، هێنـدەی نـەبرد لەشـێوەی دایالۆگێکی گەرمو بە چەقۆو دەمانچەو جارجاریش بە رەشاش سەری هەڵـدا، نـەخوازە پـاش دامەزراندنی حیزبی داد لەساڵی ١٩٦١و هەڵبژاردنی سـلێمان دیمیراڵـی - کۆنـە ئەنـدازیاری بۆری ئاوی ئەنکەرەو بەڕێوەبەری پێشووی فرۆتەنی تراکتـۆری فارگەسـۆنی ئـەمریکایی- بـە سەرۆکی ئەم حیزبە کەوا بە دەرکەوت وەك نیازی هەبێت رابەرایەتی ئەم کۆمەڵـە راسـتڕەوانە بکات، رۆژەکانی دواییش راستیی ئەم پێکهاتـە سیاسـییەیان دەرخسـت، هەرچـی گۆڕەپـانی سیاسیش بوو، ناکۆکی توندی بەخۆوە بینی بـە تایبـەت دوای هـەوڵی ئـەو کوودەتایـەی کـە (تەلعەت ئیدمیر)ی بەڕێوەبەری فێرگەی جەنگی لە٢٢ی شوباتی ساڵی ١٩٦٢ بـەرپای کـرد، کاتێکیش ئەم هەوڵەی سەری نەگرت، خۆی دایە پەنای سەرۆکی کۆمار، بەڵام کە ئەمیشـیان لێی خۆش بوو و حکوومەت بە خانەنشینکردنی دەستەبەرداری بوو، کەچی دووبـارە لـە٢٠ی مایسی ساڵی ١٩٦٣ هەوڵی کوودەتای دووەمی داو دەرەنجام لەسێدارە درا (٨٤/١).

کۆمەڵە چەپڕەوەکان بە رێبەرایەتیی پارتی کرێکارانی تورکیا (یـەکێتی یانـەکانی هـزری کلتووری FKF)یان دامەزراند، پێشتر یەکێتی قوتابیانی زانکۆی رۆژهەڵاتی ناوین لەئەنکەرە خۆیان ئەم کۆمەڵانەیان لەساڵی (١٩٦٣)وە دامەزراندبوو، لەوڕا یەکێتییەکە کۆنگرەی گشـتی خۆی لە٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ لەژێر چاودێریی پـارتی کرێکـارانی تورکیـا PIT گرێداو دەستە دامەزرێنەرەکەی بریتی بوو لە١٨ ئەندام (٥)یـان کـورد بـوون، یەکیەتییەکـە سوسیالیستی زانستیی وەك رێبازێـك بۆخـۆی هەڵبـژارد بـۆ خـەبات لـەپێناو سـەربەخۆییو دیموکراتیدا لەژێر دروشمی (شۆڕشی دیموکراتی میللی)و (٥٤) لقی لەهەر (٦٧) ویلایەتـەکانی تورکیا دامەزراندو لقەکانی ئەستەموولو ئەنکەرەو دیاربەکرو ئەرزروم، چالاکترین لقـەکانی،

یەکێتیی یانەکانی هزربوون کەوا لەمیانەی ساڵانی ٩٦٣-١٩٦٥ (واتە تا کاتی هەڵبژاردنە گشتییەکان) سەرقاڵی ڕێکخستنی ریزەکانیو رۆشنبیرکردنی ئەندامەکانی بوو بە هزری شۆڕشگێڕییانەی سوشیالیستی، لەکۆنگرەکەدا سەرۆکی یەکێتییەکە یوسف کۆبالی تاکیدی کردو گوتی:(( ئێمە شەڕی ئیمپریالیزمو نۆکەرانی دەکەین لەناوەوەی وڵات بە یەکگرتنی هەموو هێزە شۆڕشگێڕییە دیموکراتییە میللییەکان)) (٢٦٩/٢).

زۆربەی رۆشنبیرانی کورد لەژێر ئالاَی ئەم یەکێتیە خەباتیان دەکرد، بەڵام لەساڵی ١٩٦٤ بەدوا لێی جیابوونەوەو هاتنە ناو (یانەکانی کلتووری رۆژهەڵات DKO)، ئەوە بوو یانەکان پەلوپۆپیان هاویشتو ئەو (١٨) ویلایەتانەشیان گرتەوە کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردەو چڕی چالاکییەکانی لەویلایەتەکانی: وانو ئەرزرومو هەکاریو دیاربەکرو تونجلیو سعرد بوو.

یانەکانی کلتووری رۆژهەڵات خەباتی بە هاوکاریو هەماهەنگی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان دەکرد. ئەم پارتە لەساڵی ١٩٥٦ هەوڵی دامەزراندنی درا، دواجا پارێزەری کورد فایق بوجاك نوێنەری ئۆرفا لەساڵی ١٩٦٣ دایمەزراندو کۆمەڵێکی زۆر لەرۆشنبیرو لاوو کرێکارو جوتیارو تەنانەت مڵکداریش لەدەوری کۆبوونەوە، بەمەش جیاوازی هەبوو لەگەڵ هەردوو پارتی دیموکراتی کوردستان لەعێراقو ئێران، چونکە حیزبێکی بنکە فراوانی جەماوەری بوو بە پێچەوانەی ئەو دوو حیزبە کە لەدەستپێکی دامەزراندنیان پشتیان بەستبوو بە دەرەبەگو سەرانی عەشایەرەوە. بەڵام زۆری نەخایاند ئەو حیزبە چووە کۆڕی خەباتی ژێرزەمینییەوە بەهۆی راوەدوونانی لەلایەن رژێمی تورکیاوەو لەسۆنگەی پێکهاتە نەتەوەییەکەوە.

چالاکییەکانی یانەکانی کلتووری رۆژهەڵات روویان لەپەرەسەندن کرد، بۆ نموونە نووسەری کورد (مووسا عەنتەر) یەکەمین فەرهەنگی کوردی- تورکی دانا، نووسەری کوردی پێشکەوتووخوازی هاوڕێیی (محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان) زنجیرە کتێبێکی کۆمەڵایەتی لەبارەی کوردستانەوە، بە هەردوو زمانی کوردیو تورکی بڵاوکردەوە، وەك رۆمانی شەوی رەشو دووبارە بڵاوکردنەوەی داستانی مەموزینی ئەحمەدی خانی بە پیتی کوردیی لاتینیو هەروا کتێبی بزوتنەوە میللییەکان لەکوردستان بە زمانی تورکی. بەڵام دامودەزگا ئاسایشییەکانی تورکیا خێرا ئەو زنجیرە کتێبانەیان قەدەغەکرد و دەستیان بە سەریاندا گرت. نووسەری کوردی چەپیش (موزەفەر ئەردۆست) ساڵی ١٩٦٤ لەئەنکەرە خانەیەکی چەپی بڵاوکردنەوەی بەناوی (خانەی بڵاوکراوەکانی چەپ) دامەزراندو (گۆڤاری چەپی تورکی

هەفتانە)شی دەرکردو تیادا زنجیرە وتارێکی بڵاوکردەوە دەربارەی پێوەندییە بەرهەمئامێزەکان بەلای هۆزانی (شەمدینلی)یەوە ئەم زنجیرە وتارانەی (توێژینەوەیەکی ئابووریو کشتوکاڵیو کۆمەڵایەتی)یان لەخۆ گرتبوو سەبارەت بە هۆزە کوردەکانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، پاشان وتارێکی بە پێزی لەمەڕ دەرەبەگو کێشەی زەویوزار لەناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لەگۆڤاری رووناکی چەپی مانگانە بڵاوکردەوە (٣٤٥/١/٢)، ئەم گۆڤارە حیزبی کرێکارانی تورکیای تۆمەتبار دەکرد بە لەرێ لادەرو چاکسازیو کەڵك وەرگرتن لەپرەنسیپەکانی دیموکراتی فیلیپین لەکاری سیاسیو بەهەڵپەرستی لەکاری حیزبی.

کۆمەڵە راسترۆکانیش، ئەمانیش بە لای خۆیانەوە چەند کۆمەڵەیەکی رۆشنبیریی تریان پێکەوەنا بۆ دژایەتیکردنی کۆمەڵە چەپەکان بەناوی (سەنتەرەکانی نموونەی بەرز) کە بیروهزریان لەپرەنسیپی هیگلو بیروبڕوای ئیسلامییەوە، وەردەگرت. ئەم سەنتەرانە وەك رێکخراوەکانی لاوان وابوون بەلای حیزبی نەتەوەیی لادێیی کۆماری (CKMP) کە (ئەلپ ئەرسەلان تورکیش)ی رابەری نەتەوە پەرستی توندڕۆ رێبەرایەتیی دەکرد، پاش ئەوەی (١٢) نوێنەر لەپارتی دادی دەسەڵاتدار (AP) جیابوونەوەو لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٥ هاتنە ناو ئەو حیزبەوە. گۆڤاری (ئۆتوکن- خوێندە)ی راست، زمانحاڵی حیزبەکەو ئەو رێکخراوانە بوو بەر لەوەی هیچ رۆژنامەیەکی تایبەت بەخۆیان هەبێت. ئەو لاوانە لەسەرەتادا ژمارەیان لە(٥٠٠) کەس زیاتر نەبوو (١٦٦/٣). بەڵام رۆژنامە راسترەوەکان وا زێدەڕۆییان لەم ژمارەیە دەکرد تەنانەت وەك ئەفسانەیەك یا وەك دیوەزمەیەك لەتوانادا نەبێ بەرەنگاری بکرێ وایان لەقەڵەم دەدان.زۆربەی لاوەکان لەچینە رەشو رووتەکانی ناوچەکانی ناوەوەی ئەنادۆڵو لەوانەی هەڵگری بیروبڕوای وشكو توندڕۆی ئیسلامی بوونو کەوتبوونە دوای هەندێ لەو دەسکەوتە ماددییانە کە دەوڵەمەندو دەرەبەگو پیشەوەرانی سەر بەحیزبەکەو رێکخراوەکانیان بۆیانیان دابین کردبوو بەرێگەی کۆمەڵەکانی قەڵاچۆکردنی کۆمۆنیستیو یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی تورك MTTBو ئەو دوای رێکخراوە دژە بزوتنەوە چەپەکان (٢٦٦/٣).

بەتاكو ئەندامانی سەنتەرەکانی نموونەی بەرزی راسترۆیان دەگوت:(کۆماندۆ)یان (گورگە بۆرەکان)، ئەم ناوەی دوایین لەنازناوی کەماڵ ئەتاتۆرك (گورگی بۆر)ەوە، وەرگیراوە کە (هـ.س.ئارمسترۆنگ) کتێبێکی بە هەمان ناونیشان لەمەڕ مستەفا کەماڵ ئەتاتۆرك دامەزرێنەری تورکیای نوێ دانا (ئەلپ ئەرسەلان تورکیش)یش پرەنسیپەکانی ئەتاتورکی قۆزتەوە بە ئاوێتەکردنی لەگەڵ راسترەوییەکی تونداو بیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی تورانی

مەزنی هێنایە ئاراوە کە (٢٠٠) ملیۆن کەس بە رەگەز تورك لەخۆ دەگرێو لەناوچەی سانگیانگ لەباکووری چینەوە تا دەریای سپیی ناوین درێژ دەبێتەوەو بە کۆمارەکانی ئاسیای سۆڤێتی ناوەند دەڕوات.. بۆیە ئەم بیروبڕواو پرەنسیپانەی حیزبی نەتەوەیی کۆماری، هەستو هۆشی ئەو گەنجە هەرزەکارو هەژارانەی داگرتەوە کە سەنتەرەکانی نموونەی بەرز بە پارەو پوولّو چەكو تەقەمەنیو دابینکردنی شوێنو پەناگە یارمەتیو کۆمەکیان دەکردن (٣٨/٧) بە نیازی دەستدرێژیکردنە سەر هێزە چەپەکانی تورکیا.

حیزبی گەلی کۆماری بە سەرۆکایەتی عیسمەت ئینۆنۆ، لە ململانێی نێوان چەپو راست لەتورکیا بەرجەستەی لەرەوتی مامناوەند دەکرد. ئەم حیزبە رۆژنامەوانی شاعیر (بولەند ئەجەوید)ی بە ئەمینداری گشتی خۆی هەڵبژارد. ئەجەوید هەوڵیدا پرەنسیپێك یان فۆرمێکی سیاسی بدۆزێتەوە حیزبەکەی پاڵی پێوە بدات بەتایبەتی ئەم حیزبە تێکەڵەیەکی جیاجیای لەبیروبۆچوونی دیموکراتیو چەپو لیبراڵی لە خۆ گرتبوو لەدەرەنجامی مانەوەی لەدەسەڵاتدا بۆ زیاتر لەچارەگە سەدەیەك، بۆیە لەمێشکیدا ئایدۆلۆژییەتێکی نوێ سەری هەڵدا ناوی لێنا (چەپی مامناوەند) کە زۆر نزیك بوو لەسوشیالیزمی فابیی بەریتانیاوە، دیارە ئەجەوید فابییەکان کاریگەرییان کردۆتە سەر ئەو دەمەی مولحەقی رۆژنامەنووسی بوو لەباڵیۆزخانەی تورکیا لەلەندەن.

لەساڵی ١٩٦٦ ژەنراڵ (جەمال گۆرسێل)ی سەرۆك کۆمار مرد، کۆمەڵەی نیشتمانی (واتە: پەرلەمان) ژەنراڵ (جەودەت سۆنای)ی سوپاسالاری ئەو وڵاتەی بە سەرۆکی نوێی کۆمار هەڵبژارد، بەڵام (سۆنای) کابرایەکی لاواز بوو، بۆیە کاریگەرییەکی سەربەخۆ یان یەکلاکەرەوەی نەبوو لەسەر رەوتی رووداوەکانی تورکیا کە پڕبوون لەپشێویو ئاڵۆزیو بگرەو بەردەو ململانێی توندی چاوەڕوانکراو. سۆنای وای بە باش زانی خۆی بداتە پەنای (سلێمان دیمیراڵ)ی رێبەری حیزبی داد، لەبەر ئەوە پشتگیریی لەرەوتی توندڕۆی راستی لەوڵات دەکردو هانی دەدا لەسیاسەتە نێوخۆییو دەرەکییەکانی چ لەدەسەڵات یان لەئۆپۆزسیۆندا بەرەو پێشەوە هەنگاو هەڵێنێ. لەدەرەنجامی ئەمەدا ململانێی حیزبی لەجاران زیاتر سەری هەڵدایەوە لەنێوان بەرەی راستی توندڕۆ بە سەرۆکایەتی سلێمان دیمیراڵو لەنێوان حیزبی گەلی کۆماری کە پرەنسیپی چەپی مامناوەندی وەك رێبازێك بۆخۆ هەڵبژارد لەکۆنگرەی گشتی هەژدەمینییدا کە لە٢١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٦ بەسترا، ئەوە بوو (بولەند ئەجەوید)ی ئەمینداری حیزبەکەو خاوەنی بیرۆکەی (چەپی مامناوەند) توانیی کایە سیاسییەکە بۆ خۆی بباتەوە نەك تەنها لەدژی

نەیارەکانی لەناو حیزبەکە، بەڵکو لەدژی (عیسمەت ئینۆنۆ)ی ڕێبەری حیزبەکەش کـەوا ئەگـەر بە فشاری ڕێکخراوەکانی لاوانی سـەر بـە حیزبەکـە نەبوایـە، بـەم ئایدۆلۆژییەتـە تازەیـە ڕازی نەدەبوو (٨٥/١). لێرەدا وەهاو لەو لایشـەوە حیزبـە بچـووکەکان هـەوڵیان دەدا لەسـەر پـەتی ناکۆکیو بگرەو بێنەی هەردوو حیزبە گەورەکـە: حیزبـی دادوو حیزبـی گـەلی کۆمـاری، یـاری بکەن.

کورد وەکو هەموو کەمە نەتەوەییەکانی جیهان چووبوونەوە پاڵی بەرەی چەپ بـە هـەموو باڵەکانییەوەو پشتگیرییان دەکرد، چونکە نەتەوەی بچـووك یـان کەمایـەتی ناتوانـێ لەگـەڵ کلتوورەکەیدا بژیو مومارەسـەی زمانەکـەی بکـاتو ئەدەبەکەشـی گەشـە بسـێنێ، تـەنها لەکەشێکی دیموکراتی دوور لەشوفینیسـتیی نەتـەوەی گـەورەو چـاودێری هـزری توتالیتـاری دەمارگیری ئیدیۆلۆژی، نەبێت. لێرەدا کورد ڕێژەیەکی گەورەیان پێـك دەهێنـا لەئەنـدامانی هەموو ڕێکخراوە چەپو حیزبـە سوشیالیسـتیە ئاشـکراو نهێنییـەکان، بگـرە ژمارەیـەکیش لەهزرڤان و خەباتگێڕانی کورد سەرکردایەتی هەندێك لەم ڕێکخراوە سیاسـییانانەیان دەکـرد، جگە لەوە چەند ڕێکخراوێکی سیاسی تایبەت بە خۆیشیان هەبوو. لەبەر ئەمـە ڕۆژنامـەکانی تورکیا لەو سەروبەندە چەندین هەواڵو ڕاپۆرتییان بـڵاو دەکـردەوە لـەبارەی گـرتنی نووسـەرە چەپو ڕووناکبیرە سوشیالیست و ئاشتیخوازەکان بە تۆمەتی مومارەسەکردنی چالاکی لەدژی دەوڵەتو پێشکەشـکردنی کۆمـەكو پشـتگیری بـۆ ئـەو کوردانـەی تۆمـەتبار کرابـوون بـە ئەنجامدانی بزوتنەوەی جوداخوازیو مامەڵەکردن لەگەڵ حیزبی شیوعی تورکیا کە لـە سـاڵی (١٩٦٢)ەوە قەدەغە کرابوو.

بزوتنەوەی گەلی کورد لەتورکیا لەساڵی ١٩٦٧ گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆوە بـینی چ وەك بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی کورد، یان لە چوارچێوەی ئەو بزوتنەوە چەپە تورکییـەی کـە تـا ئـەو مێژووە دانی نەدەنا بەبوونی کێشەیەك بەناوی کوردەوە لەتورکیا. جـا ئەگـەر حیزبـی چـەپی تورکیا لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٥ (١٥)پانزە کورسی لەپەرلەمان بەدەست هێنا، ئـەوا (٤) ئەندامیان کورد بوون، بەڵام ئەم حیزبە تەنها (١) کورسی لەئەنجومەنی پیران بەدەسـت هێنـا، ئەویش خاتوو (حیکمەت ئیشمەن)ی ئەندازیاری کشتوکاڵی پڕی کردەوە (٢٨/٦).

ساڵی ١٩٦٧ پەرەسەندنێکی گەورەی ڕۆشنبیریی لەسـەر ئاسـتی کلتـووری هـزری چـەپی کوردیی بەخۆوە بینی، ئەوە بوو ڕۆشنبیرانی کورد توانییان چەندین ڕۆژنامەو گۆڤار دەربکەن، وەك: (دەنگی تازە)ی ڕۆژانە لەئەدەنە، خاوەنی محەمەد تاهیر بوو، ڕۆژنامەی ڕۆژانەی (قـەڵای

سەرکەش) لەلایەن فازل سیقتاش لەئاگری، ڕۆژنامەی (ئاسۆ)ی ڕۆژانە: لەلایەن محەمەد عەلی لەدیاربەکر. گۆڤاری (فوراتی نوێ)ی مانگانە لەلایەن فیکرەت مایش ئۆغلۆ لەشاری (عەزیز)، ڕۆژنامەی (شۆڕش)ی ڕۆژانە، لەلایەن خاوەنی: دوندار ئۆزدان لەئەرزروم، ڕۆژنامەی ڕۆژانەی (هوشیاری) لەلایەن ئیبراهیم خەتیب ئۆغلۆ لەهەکاری، (دەنگی فارتو) ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو لەلایەن حەسەن فیرات لەشاری موش دەردەچوو، گۆڤاری (دەنگی لاوان)ی هەفتانە، لەلایەن یوکسل سیرت لەشاری توقات (١٣٦/٨).

هەموو ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە بەزمانی تورکی دەردەچوون، بەڵام ناوبەناو چەند پارچە شیعرێکی کوردییان بەپیتی لاتینی، یان چەند لێکۆڵینەوەیەکی فولکلۆری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵو چەند وتارێك لەمەڕ بزوتنەوە ڕزگاریخوازییەکانو زەرووڕەتی ئەنجامدانی گۆڕانکاریو پەرەپێدانیان بڵاودەکردەوە لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. وەلێ گۆڤاری (یەنی ئاقش- ڕەوتی نوێ)ی مانگانە کە لە ئەنکەرە لەلایەن خاوەنەکەی (عەباس ئیزۆل)ەوە دەردەچوو لەهەر ژمارەیەکیدا چەند چامە شیعرێکی کوردیو لێتوێژینەوەی فولکلۆریو ڕاپۆرتی لەمەڕ پشتگوێخستنی ئانقەستی ناوچەی ڕۆژهەڵاتو باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵەوە بڵاو دەکردەوە و ڕەخنەی توندی دەگرتە ڕێبازە شۆفێنیستییەکەی حکومەتەکەی دیمیراڵ. لەسۆنگەی ئەمەدا کاربەدەستانی تورکیا گۆڤارەکەیان- لەپاش دەرچوونی ٧ ژمارە- لەساڵی ١٩٦٧ داخست بە بیانووی بڵاوکردنەوەی بابەتی دژ بە یەکێتی نیشتمانیو بانگەشەکردن بۆ بیروهزری جیابوونەوە لەتورکیا. ڕۆشنبیرانی کورد لەڕێگەی خانەی بڵاوکردنەوەی (کۆمەڵە)و (ئەنادۆڵ)یشەوە، چەندین بڵاوکراوەو کتێبو پەرتووکیان بە زمانی کوردیو بە پیتی لاتینی بە سوود وەرگرتن لەنەبوونی سانسۆری پێشوەخت لەسەر چاپەمەنی، بڵاودەکردەوە، هەرچەندە لەدوای بڵاوکردنەوەیان کاربەدەستانی تورك ئەو بڵاڤۆكو کتێبانەیان کۆدەکردەوە و دەستیان بەسەردا دەگرت و قەدەغەیان دەکرد.

هەر لەهەمان ساڵی ١٩٦٧یش، حکومەتی دیمیرال یاسای ژمارە (٧٦٣٥/٦) دەرکرد، بەگوێرەی ئەم یاسایە قەدەغە بوو هەر بڵاوکراوەو کتێبو کاسێتو شریتی تۆمارو فیلمێك بە زمانی کوردی بهێنرێن بۆ ناو تورکیا. ئەمەش دەنگدانەوەیەکی گەورەی لەناوەندە دادوەرییەکانی ئەورووپادا هورووژاند.

کاتێکیش ڕۆژنامە ڕاستڕۆ تورکەکانی، وەك: (دەوڵەت)و (ئوتوکن)و (هرکون) هێرشو پەلاماری توندیان لەدژی بەرەی چەپی تورکیا پەرەپێدا، بەتایبەتی لەدژی کوردەکانی ئەم

بەرەیەو تۆمەتباریان دەکردن بە کرێگرتەی شیوعیو بە گێڕەشێوێنو بەتێکدەرانی ریزەکانی گەل وەسپیان دەکردنو هەڕەشەیان دەکرد لەتورکیا دەربکرێن، کاردانەوەیەکی بەهێز بەلای رێکخراوەکانی قوتابیانەوە لە١٩ شاری کوردنشین لەویلایەتەکانی رۆژهەلآت روویدا (٢٠٨/١/٢) ئەوە بوو چەند خۆپیشاندانێکی بێدەنگیان لەتەمووزی ساڵی ١٩٦٧ ئەنجامدا. هەمان ئەو رێکخراوانەش داوایان لەهاولآتیانی هەردوو شارە گەورەکەی سیلوانو دیاربەکر کرد خۆپیشاندانی نارەزایی دەربرین بکەن. لەدوای ئەم بانگەوازە لەرۆژی ١٩٦٧/٨/٣ لەشاری سیلواس (١٠) هەزار خۆپیشاندەر رژانە سەر شەقامو لەشاری دیاربەکریش (٢٥) هەزار خۆپیشاندەر رژانە شەقامەکان وەك هەولێکی نەترسو بوێرانە بەرامبەر بە دەسەلآتو هێزە راسترۆکانی تورکیا لەلایەكو لەلایەکی دیکەشەوە بۆ پیشاندانی هێزیان لەپێشی دەولەت (١/١٠). بەلآم حکوومەتی حیزبی (داد) وەك پیشەی هەموو جارێکی بە شێوازی سەرکوتکردنو تۆقاندن رووبەروویان بۆوەو دەیەها کەسیان لەخۆپێشاندەران گرتو هەوالەی دادگایانیان کرد.

بە گشتی، ساڵی ١٩٦٨ بە خالێکی وەرچەرخان دادەنرێ لەمێژووی بزوتنەوەی هاوچەرخی کورد لەتورکیا، لەم ساڵەدا کورد کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەرییان رێکخستو بۆ یەکەمین جار وتاربێژان بە زمانی کوردی وتاریان پێشکەش کرد (٨٥/١). مشتومڕی توندی نێوان هێزە چەپەکانیش جۆرێك لەیەکڕیزی شۆڕشگێڕیی لێکەوتەوە لەنێوان خەباتی لادێییو خەباتی شار لەلایەكو لەنێوان خەباتی کرێکارانو جوتیاران لەلایەکی ترەوە، دەبینین گۆڤاری (ئایدینلیك- رووناکی)ی مانگانەی چەپ بوو بە دوو بەشەوە: گۆڤاری رووناکی شۆڕشگێڕیی پرۆلیتاری بە سەرپەرشتی نووسەری پێشکەوتووخواز جەنگیزجاندار، ژمارە (١)ی لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٨ دەرچوو، لەوڕا رۆژنامەی (روونـاهی)ی هەفتانە کە سەرنووسەرەکەی ئۆرال چالیشیر بوو لایەنگیری رەوتی مارکسیزمی دەکرد، بەلآم گۆڤاری (رووناهی)ی مانگانەی سوشیالیستی کە نووسەری چەپی کورد (دۆغۆ برنجیك) سەرپەرشتی دەکرد بەرجەستە بوو لەرەوتی مارکسی- لینینیزم. هەرچی رەوتی چەپی سێیەمیش بوو ئەو بزوتنەوە نیشتمانییە دیموکراتییە نوێنەرایەتیی دەکرد کە نووسەری پێشکەوتووخواز میهری بیللی سەرکردایەتی دەکردو هەموو رەوتێکی سوشیالیستیو دیموکراتیو چەپی نیشتمانی لەتورکیا لەخۆ گرتبوو. رۆژنامەی (کرێکارانو جوتیاران)ی هەفتەیی زمانحالی بزوتنەوەکە بوو و رێکخراوەکانی (یەکێتی لاوانی شۆڕشگێڕی تورك

(TDGF)یش سەر بە بزوتنەوەکە بوو، ئەم رێکخراوانە لەسەر داروپەردووی بەرەی یەکگرتوو BC کە چەپەکانی لەخۆگرتبوو-ماوییەکان نەبن- لەخۆ گرتبوو، بەلاّم حیزبی کرێکارانی تورکیا TIPوەك رەوتێکی چەپی چوارەم کادیرانی خۆی لەرۆشنبیرانی چەپی تورك‌و کوردی بەلای خۆیەوە پاراست، بەلاّم لەلایەن هەرسێ رەوتەکەی ترەوە بە لەرێ لادەر تۆمەتبار بوو، یەکێتی قوتابیانی تورکیش لەژێر سەرپەرشتی حیزبی کرێکارانی شیوعیی تورکیادا بوو.

ئەگەرچی، بزوتنەوەی مارکسیزمی ماوی- بەناوی ماوتسی تۆنگ- لەم ماوەیەدا بە تایبەت دوای دامەزراندنی حیزبی کرێکاران‌و گوندییانی شۆڕشگێڕ TIKP، گەشەی سەند، لێ نووسەری کوردی چەپ (دوغۆ برنجیك) کۆمیتە زانستی‌و گوندییەکانی کار لەناوچە جیاجیاکانی تورکیا بە تایبەت لەناوچەی رۆژهەلاّت پێکهێنا بە ئامانجی پێشکەشکردنی کۆمەك‌و یارمەتی بۆ جوتیارو کرێکارەکان، لەوڕا روناکبیرانی شۆڕشگێڕ ئەم ئەرکەیان لەئەستۆ گرت، خوێندکارەکانیش لەکاتی پشووەکانیاندا بەشدارییان لەم کارە کرد، لەکاتێکدا رۆشنبیرە سۆشیالیستە خەوندیدەکان لەدەوری گۆڤارەکانی: (دوریم- شۆڕش) کە گوزارشتی لەبۆرژوای بچووکی نیشتمانی دەکرد، (تولرك صولوی چەپی تورك) رۆژنامەی (قورتولوش- نووسین)ی تایبەت بە سوشیالیستە چاکسازییەکان، کۆبوونەوە.ئەم بلاّوکراوانە لاپەڕەکانیان والاّ کردبوو بۆ بلاّوکردنەوەی هەر بیروبۆچوونێکی سوسیالیستی‌و چەپڕەوی لەتورکیا.

سالّی ١٩٦٨ سالّی لاوان بوو لەتورکیاو جیهان. ئەو بزوتنەوە قوتابییەی لەفەرەنسا لەهەردوو مانگی مایس‌و حوزەیران لەو سالّە هەلاّیسا، بەرەو تورکیاش گواستییەوە، تەنانەت وەك ژانێکی لێهات بۆ سەرهەلّدانی بزوتنەوە گەلێکی توندڕۆ لەتورکیا. دەبینین لەدەستپێکی هەمان سالّ: بزوتنەوەی کرێکاری لە(زونگولّداق) تەقینەوە، لەهاوین کرێکاران دەزگاکانی کۆمپانیای (دەربی)یان داگیرکرد، کرێکارانی پیترۆکیمیاوییەکان لەئەستەموولّ دەستیان بە مانگرتن کرد، بگرەو بەردەی گوندییەکان لەگەلّ خودان زەوی‌وزارەکان لەناوچەی مالی، خەباتی دانیشتوانی شاری تەنەکە لەئەنکەرە لەدژی رووخاندنی ئەو خانووانانەیان کە بە شێوەی ناڕەوا بە دیدی حکوومەت بنیات نراون، وەگەڕنەخستنی کارگەکانی (کاول‌و ئیمتاش‌و فینفیس) لەلایەن کرێکارەکانیانەوە...هتد. هەموو ئەم رووداوانە نیشانەی گۆڕانکاری گەورە بوون بە لای بزوتنەوەی کرێکاری لەخەباتی ئابووریەوە بەرەو خەباتی

سیاسـی (٤١/١/٢). یـەکێتی هێـزە شۆڕشـگێڕەکانی تورکیـاش TDGB دامـەزرا کـە لەئەنکەرە لەنیسانی ساڵی ١٩٦٨ خۆپێشـاندانە گەورەکـەی سـازدا لـەدژی ئیمپریـالیزمو نۆکەرانی، بزوتنەوەکانی مانگرتنو داگیرکردنی قوتابخانەو زانکۆکانیش لەحوزەیرانی سـاڵی ١٩٦٨ لەلایەن خوێندکارانی چەپی خوێندنی بالا، ئەنجام درا، لەم بارەیەوە پرۆفیسۆر سولحی دونمز ئار مامۆستای جەزا لەزانکۆکانی تورکیا دەڵێت: یەکێك لەو خوێندکارانـەی لەسـاڵی ١٩٦٨ زانکۆی ئەستەموولیان داگیرکرد لەنەتەوەی کوردو تۆمەتبار کرابوو بە جوداخـوازی بەو تۆمەتەش حوکم دراو یەکێك بـوو لەژمارەیـەکی زۆر لەوانـەی رابەرایـەتی بزوتنـەوەی خوێندکارانیان دەکرد لەساڵی ١٩٦٨ (١٤٢/٩)، ئەو بزوتنەوەیەی کـە بـۆ یەکـەمین جـار هوتافی بۆ ژیانی گەلانی تورکیا هەڵدا لەبری هوتاف هەڵدان بە ژیانی گەلی تورك وەك ئەوە پێشتر ئەوەیان دەکرد.. کـوردیش نـاوی منداڵـەکانیان بـە نـاوە کوردییەکانـەوە دەنـا وەك تەحەددایەك بەرامبەر بە دەسەڵاتدارانی تورك لەلایەكو لەلایەکی تریشەوە وەك شانازیکردن بە رەسەنایەتیی نەتەوەیی گەلی کورد.. پاشانیشو لەهەمان ساڵی ١٩٦٨ بزوتنەوەگەلێکی مانگرتنو نارەزاییدەربڕینو پەناگیری لەدژی سەردانی کەشـتییە جەنگییـەکانی شەشـەمی ئەمریکا بەرەو بەندەرەکانی تورکیا لەهەریەك لەشارەکانی ئەستەموڵو ئیزمیرو سامسۆنو مەرسین لەمانگی ئاب روویاندا. هەر لـەو سـاڵەداو لـەمانگی تشـرینی دووەم دوو هـەزار جوتیار بە خۆیانو تراکتۆرەکانیانەوە لەکێڵگەکانی پەموو لەدەوروبـەری ئـەزمیرەوە بـەرەو شاری ئـەزمیر وەرێ کـەوتن. ئەنجومـەنی شـوورای پـەروەردەی شۆڕشـگێڕیش کۆبـۆوە بـۆ لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی مامۆسـتایان لـەتورکیاو داوای چـاککردنی بـاری گوزەرانیـان بـە رێگـەی مـانگرتنو خۆپێشـاندانەوە، ئەمـەش بـووە هـۆی رەوانـەکردنی ژمارەیـەکی زۆر لەئەندامانی شووراکە بۆ بـەردەمی دادگاکـانی تورکیـا (٤٢/١/٢)و چـەندین کـەس لـەو ئەندامە بەند کراوانە لەمامۆستایانی کوردی ناوچەکانی: دیاربەکرو ئەرزرومو وانو سـعردو ماردین بوون. لەولاشەوە (بولەند ئەجەوید)ی سـکرتێری گشـتیی حیزبـی گـەلی کۆمـاری سەرکردایەتیی ئۆپۆزسیۆنی دەکرد لەدژی حکوومەتەکـەی دیمیراڵو لەسـەردانەکانی دا بـۆ ناوچە لادێیەکانی تورکیا بە تایبەت لەناوچەی رۆژهـەڵات، تێدەکۆشـا بـۆ رۆشـنبیرکردنی جوتیارانی تورکیاو کۆکردنەوەیان لەدەوری حیزبەکەی بە پرەنسیپو بیروباوەڕەکـانی چـەپی مامناوەند کە حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکەی پێڕەوی دەکرد.

هەرچەندە ئەم بزوتنەوانەی کە چەپی تورکیا ئەنجامی دەدان، جۆشدانێك بوو بۆ خـەبات لەدژی ئیمپریالیزمو نۆکەرە کۆنەپەرستەکانی، ئەوا بەرەی راستی تورکیاش بە سەرکردایەتی حیزبی (داد)ی دەسـەڵاتدار هێزەکـانی کـۆ دەکـردەوەو ڕیزەکـانی خـۆی پتـەو دەکـرد بـۆ بەرەنگاربوونەوە لەچەپەکان، بە پشتگیریی کۆماندۆو حیزبی نەتـەوەیی لادێیـی کۆمـاریو یانەکانی نموونەی بەرز بۆ پەلاماردانو هێرشبردنە سەر کۆنگرەکانی چـەپی تـوركو هـەوڵی بـڵاوە پێکردنـی خۆپێشـاندانەکانیان بـە زەبـری دارو شـێوازی توندوتیـژی، بـۆ نموونـە کۆماندۆزەکانی (گورگە بۆرەکان) هێرشیان بردە سەر هەڵبژاردنی خوێنـدکارەکانی کۆلێـژی ماف لەئەستەموولّ کە لەژێر ئاڵای یەکێتی قوتابیانی چەپی تورك تێدەکۆشان. لەدەستپێکی ساڵی ١٩٦٩یش هەمان ئەو گورگە بۆرانە بـوون پـەلاماری کـۆڕی کۆلێـژی کشـتوکاڵییان لەئەستەموولّ دا (٢٦٦١/١/٢).

حیزبـی (داد)ی راسـتڕەوی دەسـەڵاتدار بـە گـرتنی ئەنـدامانی رێکخـراوە چـەپەکانو کۆکردنەوەو قەدەغەکردنی کتێبـە سـەندیکاییو سوشیالیسـتییەکانو داخسـتنی کۆمەڵـە چەپەکان بە فەرمانی ئیداری یان پراکتیزەکردنی مادەکانی ١٤١و ١٤٢ لەیاسای سـزاکانی تورکیا بە تۆمەتی نواندنی چالاکی کۆمۆنیستی، دەیەویست هزری خەڵکی ئامادە بکات بۆ جاڕدانی حوکمی عورفیو باری نائاساییو کپکردنی ئازادییە گشـتییەکان. لەهـەمان کـات نوێژی بە کۆمەڵ لەزۆربەی مزگەوتەکانی ئـەنادۆڵ دەسـتی پێکـرد، دوای ئـەوەی کۆمەڵـە ئاینییەکان هەموو موسلمانەکانیان هان دا بۆ بەستنی ئەو نوێژە بە کۆمەڵییەو نەفرەتکردن لەکۆمۆنیستی کە بەرجەستە لەبزوتنەوەی چەپ لـەتورکیا دەکـەن، نـەخوازە پـاش ئـەوەی بزوتنەوەی چەپ نێومالّی خۆی رێکخستو هێزی شۆڕشگێڕیی (Dev-Guc) پێکهێنا کـە دواتر لەمیانەی رووداوە سیاسییەکانی ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧١ رۆڵی گـەورەی گێـڕاو شـارە گەورەکانی تورکیاش شەڕو پێکدادانی خوێناوییان تیـا رووی دا لـەنێوانیانو لـەنێوان ئـەو کۆماندۆ راستڕۆیانەی کە لەلایەن کاربەدەستانی حکوومەتەوە هان دەدران.

ساڵی ١٩٦٩ دەستپێکی کۆشتنی بە تاکی بەخۆوە دی لـەنێوان بـەرەی راسـتو چـەپ لەتورکیا. قوتابیانی زانکۆی خۆرهەڵاتی ناوینیش لەئەنکەرە لە٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٩ ئوتۆمـۆبیلی بـالیۆزی ئـەمریکا (کومـەر)یان سـوتاند، کۆمـەر یـەکێك بـوو لەبەکرێگیراوانی ئاژانسـی هـەواڵگری ناوەنـدیی ئـەمریکا (CIA)و تاوانبـارێکی شـەڕی ڤیەتنامیش بوو (٢٧٠/٣)، ئەمە لەو کاتەدا روویدا ناوبراو سەردانی ئەو زانکۆیەی کرد کە

بە قەڵایەکی چەپی تورك دادەنراو سەرۆکەکەیشی پرۆفیسۆر (ئەردال ئینۆنۆ)ی کوڕی سەرۆکی ناسراو عیسمەت ئینۆنۆ بوو کە لەساڵی ١٩٨٣ بەدوا بووە رابەری حیزبی دیموکراتی سوشالیستی میللی SHP.

حکوومەتی دیمیراڵ لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٩ یاسای پاراستنی سیستمی دەستووری دەرکردبوو بە نیازی کپکردنی ئەو ئازادییە گشتییانەی کە دەستووری ساڵی ١٩٦١ فەراهەمی کردبوون، یاساکە هەمیسان بۆ تێکدانی سەربەخۆییبوونی دەزگای ئێستگەو تەلەفزیۆنی تورکیا TRT بوو کە دەستووری ١٩٦١ وەك دەزگایەکی سەربەخۆ لەدەوڵەت جیای کردبۆوە. حکوومەتی دیمیراڵ نیازیشی بوو لەپشتی یاسای ناوبراوەوە گورزێك بکێشێ بەو بزوتنەوە خوێندکارییەی زۆر پەرەی سەندبوو پاش مانگرتنی قوتابیان لەئامادەبوونی وانەکانو پەناگیرییان لەحەرەمی زانکۆدا کە بە پێی مادە (٢١) ئەو دەستوورەو پرەنسیپی سەربەخۆییبوونی زانکۆ، هێزەکانی ئاسایشی تورك نەیاندەتوانی سنووری ناو زانکۆکان ببەزێنن.

بەڵام ئامانجی گەورەی دیمیراڵ لەداڕشتنی ئەم یاسایە، ئەوە بوو هەرچ بزوتنەوەیەکی بەرهەڵستکار یان هەر کەسێکی دژ بەو رژێمە نیمچە داگیرکراوو نیمچە دەرەبەگایەتییە لەسای حکوومەتەکەیدایە لەتورکیا، بە تۆمەتی تێکدانی سیستمی دەستووری تۆمەتبار بکات وەك بیانوویەك بۆ گرتنیو لەدواییشدا رەوانەی دادگای بکات.

ئەوە بوو بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر دەرچوونی ئەم یاسایەو لەدژی پێشێلکارییەکانی حکوومەت لەهەمبەر ئازادییە گشتییەکان، (٣٠) هەزار لە کرێکارانی (سۆمەر بەنك) مانگرتنێکی گشتییان ئەنجامدا. کرێکارانی (٢٥) کۆمپانیاو کارگەش بە کۆمپانیای (سنجەر)ی درووماني ئەمریکاییشەوە مانیان گرت بۆ پشتگیریکردن لەکرێکارەکانی (سۆمەر بەنك)و داواشیان کرد بۆ زیادکردنی کرێکانیانو باشکردنی گوزەرانیان (٢٦١/١/٢).

لە١٥ی شوباتی ١٩٦٩ بەرەی چەپ، دوا بەدوای رێپێوانە ئاشتییانەکەی مامۆستایان، لەهەمان رۆژ داوای کرد رێپێوانێکی ئاشتییانە لەئەستەمووڵ ساز بدرێ. لەم رێپێوانەدا لاوانو قوتابیانو کۆمەڵێکی زۆر لەکرێکاران بەشدارییان کرد، لەبەر ئەوە چەند گرووپێك لەکۆماندۆزو راستڕەوەکان بەرەنگاری رێپێوانەکە بوونەوەو لەدەرەنجامدا دەیان کەس لەگۆڕەپانی تەقسیم لەئەستەمووڵ کوژرانو سەدانی دیکەش بریندار بوون (٨٦/١). دوای

ئەم رووداوە یەکێتی سەندیکا کرێکارە شۆڕشگێڕەکان Disk بۆ پشتگیریکردنی لاوانو قوتابیانو مامۆستایانو بۆ نارەزایی دەربڕین لەبەرامبەر بێدەنگی هێزەکانی ئاسایشو یارمەتیدانیان بۆ پێشێلکردنی دەستووری ١٩٦١ لەلایەن راستڕەوەکانەوە، جاڕی مانگرتنی گشتییان دا.

لەرۆژی ١٦ی نیسانی ١٩٦٩ بەرەی میللی پێشکەوتنخواز بانگەوازی بۆ هەموو هێزە چەپەکان کرد رێپێوانێکی گەورە لەدیاربەکر ساز بکەن، ئەوە بوو جەماوەرێکی زۆر لەکرێکارو لاوانو خوێندکارانو خەڵکی گوندیی ناوچەکانی: ئاق حەسارو ئودامشو دیاربەکرو ئەنتاکیەو ئەنکەرەو زونگڵداقو ئەستەموولْ کۆبوونەوەو رێپێوانێکی گەورەیان لەسەنتەری شاری دیار بەکر (مەڵبەندی کوردستان) دەستپێکرد بەرەو گەراجی سوگا وەك نارەزاییدەربڕینێکی هێزە دیموکراتییە میللییەکان لەدژی دەرەبەگو کۆنەپەرستیو ئیمپریالیزم (١٨/٢).

کاتێك دەسەڵاتدارانی تورکیاو ئەو حیزبانەی بە فەرمانی حیزبی (داد) دەجوولانەوە پروپاگەندەیان بڵاودەکردەوە گوایا لاوەکان بە بزوتنەوە شێتانەو نامەسۆولەکانیان هەولْ دەدەن فاشیزم بهێننە ولاتو سیستمی سوشیالیستی تێدا دابمەزرێنن، ئەوا دەیانەویست ریزی پتەوی ئەو لاوە پێشکەوتووخوازو رۆشنبیرانە تێکبدەن بە چەند بیروباوەڕێکەوە تۆمەتباریان بکەن کە لێی بێبەری بوون، چونکە ئەوان (لاوە شۆڕشگێڕەکان) پارێزەری راستەقینەی دەستووره پێشکەوتووخوازەکەی (٢٧)ی مایس بوون کە ئازادیی قسەو رادەربڕینی پێ بەخشینو ئازادیی رۆژنامەنووسیو مافی کۆبوونەوەو خۆپێشاندانو مانگرتنو ئەو دوای ئازادییە دیموکراتییەکانی زامن کرد.

حکوومەتە ئیئتیلافییەکانی تورکیا نەیانتوانی سنوورێك دابنێن بۆ ئەم بشێویو تیرۆرە بەربلاوانەی کە زۆربەی ناوچەکانی تورکیایان گرتبۆوە. بۆیە حیزبە سیاسییەکان، لایەنگیرانی خۆیانو هێزەکانیان ئامادەکرد بەرەو شەڕی هەڵبژاردن لە١٢ی تشرینی یەکەمی هەمان سالْ، وەلیْ ئاکامەکانی ئەم هەڵبژاردنە لەسەر هەردوو ئاستی سیاسیو دیبلۆماسی، بەو شێوەیە کۆتایی نەهات کە چاوەڕان دەکرا.. ئەوە بوو حیزبی (داد)ی راستڕەو بە سەرۆکایەتی سلێمان دیمیرالْ بردییەوە، دوای ئەو دووبەرەکیو ناکۆکییانەی تووشی حیزبە چەپەکانو حیزبی گەلی کۆماری لەمیانەی هەڵبژاردنەکاندا، ئەمە وایکرد چەندین خۆپێشاندانو رێپێوانو پەناگیری لەلایەن کرێکارانی ئەو کارگانەوە کە چەپەکان رێکیان

دەخستن سازبدرێ، لەولاشـەوە هێزەکـانی کۆمانـدۆ بـە پشـتگیری کاربەدەسـتانی تورکیـا لەلێدانی چەپەکان بەردەوام بوون.

لە١٦ی کانوونی یەکەم، (٦٩) ئەفسەر لەبنکەو کەرتە جیاجیاکانی هێزە چـەکدارەکانی تورکیا بەیاننامەیـەکیان لەرۆژنامەکانـدا بڵاوکـردەوە، تیـادا داوایـان لەحکوومـەت کـرد سنوورێك بۆ ئەم گێرەشێوینییە دابنێ. لەهـەمان کـات بانگـەوازێکیان ئاراسـتەی حیزبـە سیاسییەکان کرد بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی خۆیان هەڵگرن لەپێناو کۆتایی هێنان بـە شـەڕی براکوژی لەتورکیا (٨٦/١).

ئەگەرچی ئەم بانگەوازە لەنێو گرمەی تەقینەوەو گیزەی گوللەو هوتافکیشاندا بزر بوو، بەڵام کاریگەرییەکی سیاسی هەبوو، ئەوە بوو هێزە چەپەکانی تورکیـا لەپەرلـەمان خۆیـان کۆکردەوەو توانییان لە١٤ی شوباتو لەکاتی مشـتومڕو لێکۆڵینـەوە لەبودجـەی گشـتی دەوڵەت، حکوومەتەکەی دیمیراڵ بڕووخێنن. بەڵام دیمـیراڵ کـە بـە ئـەزموون قـاڵبووی نێـو سیاسەتو فرتو فێڵەکانی بوو، توانیی هاوپەیمانییەکی وەزاری لەگەڵ ژمارەیـەك لەحیزبـە سیاسییە بچووکەکان پێك بهێنێو دووبارە گەڕایەوە سەر کورسیی دەسەڵات.

## باسی سێیەم

## دانپێدانانی سیاسی بە نەتەوەی کورد لەتورکیا

پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، یەکەمین رێکخراوی سیاسی نەتەوەیی کورد بوو لەتورکیا، چونکە لەرۆژی دامەزراندییەوە کوردی بە هەموو چینو توێژێکی کۆمەڵایەتیو بیروبۆچوونێکی سیاسییانەوە لەوڵات لەدەوری خۆی کۆکردەوەو هانی دان بۆ یەکڕیزیو هەوڵدان بۆ داوای لابردنی زوڵمو زۆری کۆمەڵایەتی لەسەریانو داننان بە بوونی نەتەوەییانو پەرەپێدانی کلتووری رۆشنبیرییان، بەڵام ئەم یەکڕیزییە نەتەوەییە زۆری نەخایاند لەسۆنگەی سەرهەڵدانی فرەیی هزرو بیروڕای جیاواز کە لەدەرەنجامی پێگەیشتوویی هزری نەتەوەییو هۆشیاری کۆمەڵایەتیو شێوازی ئەو خەباتو تێکۆشانە رۆژانەیەی کورد ئاشنای بوون، هاتنە کایەوە بەتایبەتی دوای ئەو هەڵمەتە دڕندانە کەموێنەیەی راستڕۆی تورك لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ لەدژیان بەرپای کردو ئامانجی سڕینەوەی بوونی نەتەوەیی کورد بوو لەتورکیا، ئەوە بوو لەبەرامبەر ئەو کردەوە توندڕۆو دڕندانەیەدا، کوردان لەئابی ساڵی ١٩٦٧ بە خۆپێشاندانی جەماوەری گەورە وەڵامی راستڕۆ رەگەزپەرستەکانیان دایەوە.. لەدەرەنجامی ئەم پەرەسەندنو رووداوانە، لەئاخروئۆخری ساڵی ١٩٦٩ دوو بەرەکییەکی گەورە کەوتە نێو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەتورکیاو حیزب بوو بە دوو بەشەوە:

١-شوانییەکان: ئەم بەشە، هەموو هێزە چەپە کوردییەکانی لەدەوری خۆی کۆ کردبۆوە، بە تایبەت فەرمانبەرانی رۆشنبیرو کرێکاران لەشار، و جووتیارانو کاسبکارانیش لەگوندو لادێکان. ئەندامە کۆنەکانی هەردوو حیزبی کرێکارانی تورکیاو حیزبی سوشیالیستی کادیرانی ئەم حیزبە ژێرزەمینییە نوێیەیان پێکدەهێنا، وەکو: دکتۆر سەعید قرمزی تۆپراق- ناوە نهێنییەکەی شوان، ناوی حیزبەکەش لەم ناوەوە هاتووە- و سەعید ئالچیو دوغۆ برنجیكو وەهاب ئەردوغدو موزەفەر ئەردۆست.

ئەم حیزبە رێزو پایەیەکی گەورەی هەبوو لەناو رێکخراوە چەپە جەماوەرییەکانی تورکیا، وەك: هاوبەندیی دیموکراتی ژنانی تورکی شۆڕشگێڕ. هاوبەندیی مامۆستایانی شۆڕشگێڕ، یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی شۆڕشگێڕ، رێکخراوی لاوانی شۆڕشگێڕ،

یانــە رۆشــنبیرییەکانی رۆژهــەڵات. چــڕیی چالاکییەکانیشــی لەشــارە گــەورەکانی وەك: هەکاری، وان، دیاربەکر بەڕێوە دەچوو و تێدەکۆشا لەپێناو مافی نەتــەوەیی گــەلی کــورد لەچوارچێوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازیی نیشتمانی تورکیادا، لــەدوای تیرۆرکردنــی دکتــۆر سەعید (ناسراو بە شوان)ی رابەری حیزب، هەریەك لە: سەعید ئالچیو دۆغــۆ برنجیــكو موزەفەر ئەردۆستو وەهاب ئەردوغدو لەحیزبەکە جیابوونــەوە، ئــیتر ئــەم حیزبــە بــەبێ رابەرایەتییەکی بەهێز مایەوە، بۆیە کەوتە ژێر کاریگەریی حیزبە چــەپەکانی تــورك، بــە تایبەت باڵی ماوی لەحیزبی شیوعیی نهێنی تورکیاو هەندێك لەو کۆمەڵە سیاســیيانەی کە لە(پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق) جیا بووبوونەوە.

٢- کۆبانییەکان: ئەم بەشە یاخود ئەم باڵە کۆمەڵی شێخ کوبان بوون. کۆبان هۆزێکی گەورەی کوردە لەناوچەی دیاربەکر. چونکە ئەم حیزبە پێکهــاتبوو لەدەرەبــەگو ســەرانی عەشایەرو شێخو ژمارەیەك دەسترۆیشتووی خاوەن رێبازو بۆچوونی ئایینی، بۆیە لەرووی پێکهاتەکەیەوە لەحیزبی (داد)ی تورکیا دەچوو.

ململانێی نێوان ئەم دووحیزبە (شوانیو کۆبانییەکان) ململانێیــەکی خوێنــاوی بــوو، چەندەها جار مــۆرکی کوشــتنی بــە تــاكو عەشایەریشــی پێــوە بــوو. بــۆ نموونــە: لــەو شەڕوپێکدادانەی لەنێوان دوو خێڵ لەلایەنگرانی هەردوو حیزبەکــە لەشــاری مــەلازکورد قەوما (١٩) کەس کوژران (١٥٣/١١٠).

چالاکی ئەم حیزبە (کۆبانییەکان) بەزۆری لەشارەکانی: ئەرزرومو سیواسو دیاربــەکرو مەڵاتیەو مەلازکورد هەڵدەسووڕا.

پێچەوانەی کوردی ئێرانو عێراق، لەکوردستانی تورکیاو دوای بنەماڵــەی بــەدرخان، رابەرانی مێژوویی دەرنەکــەوتن تــا بتــوانن کاریگــەریی سیاســیو ئــایینی بکەنــە ســەر جــەماوەری کــورد لــەتورکیا، بــەڵام ســەرڕای ئــەوە بزوتنــەوەی کــورد لــەتورکیا زیــاتر جەماوەرییو تۆکمەتر بوو وێــڕای ململانێــی نێــوان باڵــە جیاجیاکــانی، ئەمــەش لەبــەر زاڵبوونی باری رۆحی بە کۆمەڵی (یان ئەوەی گۆستاف لۆبۆونی کۆمەڵناسی فەرەنسایی بە رۆحی گاگەلی- القگیع- ناوی بردووە) لەبەرامبەر ئەو مەترسییە هاوبــەشو گشــتییەی دەیەوێ تۆوی نەتەوەی کورد لەو وڵاتە ببڕێتەوەو قەڵاچۆیان بکات ئەویش مەترسی بەرەی فاشیزمی راسترۆی تورکە.

وادیارە، کەسـایەتییە سیاسـییەکانی کـورد لەبـەر چـەند فاکتـەرێکی ئایـدیۆلۆژیو کۆمەڵایەتی، وایان بە باشتر دەزانی لەچوارچێوەی حیزبە سیاسییەکانی تورکیا درێژە بـە خەبات بدەن لەبری ئەوەی خۆیان ڕێبەرایەتی بزوتنەوەی کورد بکەن. بـۆ نموونـە لەسـاڵی ١٩٦٨ (کامیل ئاکینجی)ی بە ڕەگەز کورد بووە سکرتێری گشتی پارتی کرێکارانی چەپی تورکیا، نووسەرو هزرەڤانی چەپڕەوی کوردیش محەمەد عەلی ئەسلان لەسـاڵی ١٩٦٩ بـە سەرۆکی هەمان حیزب هەڵبژێردرا هەر لەساڵی ١٩٦٨یش، دەبینی کەسـایەتی نـاوداری کورد یوسف عەزیز ئۆغلۆ لەهۆزی بەناوبانگی (عەزیزان)ی کورد بووە سـەرۆکی حیزبـی تورکیای تازەو ژمارەیەکی زۆر لەنوێنەرە کوردەکانی سـەربە حیزبـی دیمـوکراتی پێشـوو هاتنە پاڵی، تەنانەت ئەم حیزبە بە ڕاشکاوی بەوە تۆمەتبار دەکـرا حزبێکـی کوردییـەو بانگەشە بۆ بزوتنەوەی کورد دەکات لەبەر گرنگیپێدانی زۆری بە مەسـەلەی پەرەپێـدانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات (٩٣/١٢).

بۆ یەکەمین جار لەمێژووی تورکیای نوێو لەپاش تێپـەربوونی نزیکـەی (٥٠) سـاڵ، سەرنج دەدەین ناوەندە سیاسیەکانی تورك دان بە بوونی کەمایەتی کوردا دەنێنو جـەخت دەکەنە سەر ڕۆڵی بەرچاوی لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی لەسەروبەندی ساڵەکانی بیست. بۆ نموونە: ڕۆژنامەی (ئولوس)ی زمانحاڵی حیزبی گەلی کۆماری لەرێکەوتی (٣١ی ئاداری ساڵی ١٩٦٩)وە دەستیکرد بە بڵاوکردنـەوەی یادداشـتەکانی سـەرۆکی پێشـووتر (عیسمەت ئینۆنۆ)ی هەڤاڵی مستەفا کەماڵ ئەتاتۆركو تیادا تاکید دەکاتە سـەر ڕۆڵـی کورد لەهـەردوو کـۆنگرەی (سـیواس)و (لـۆزان)و هـەوڵو خـەباتیان شـان بەشـانی بـرا تورکەکانیان بۆ بەرگریکردن لەیەکێتی خاکی نیشتمانو ئـەو داخوازییـە نیشـتمانییانەی بەناوی هەردوو گەلی توركو کوردەوە خرانە پێش کۆنگرەی پاریس بەو سیفەتەی هەردوو هاوبەشن لەنیشتمانی تورکیادا (٣٤/٢/٢).

لەسەر ئاستی خەباتی سیاسیش دان بە کێشەی کورد نرا کاتێك نووسەری چەپی تورك میهری بیللی وانەیەکی بە ناونیشانی (هەقیقەتی نەتەوەیەك) لەگۆڤاری (ڕووناهی) چەپ بڵاوکردەوەو ویسـتی لەکۆلێـژی مـاف لەئەنکـەرە بیخوێنێتـەوە، بـەڵام کاربەدەسـتانی ئاسایشی تورك ڕێگەیان نەدا. (بیللی) لەوانەکەیدا ئامـاژە بـە کێشـەی کـورد دەداتو دەڵێ: ((لەتورکیادا کێشەیەك هەیە بە ناوی کێشەی کورد، ئەم کێشـەیە لـەوەتی تـورك لەسەر ئەم خاکە پەیدا بوون، بوونی هەیە. جا ئەگەر بزوتنەوەکەی شێخ سـەعیدی کـورد

وەك هەوڵێكی ئاشكرا بووبێت لەلایەن بەریتانیاوە بۆ دابڕینی ویلایەتی مووسڵ لەتوركیا بە مەبەستی لكاندنی بە عێراقەوە، ئەوە پێویستە ئەو بزوتنەوەیەو فاكتەرەكانی نەبنە سەبەبكاری ئەم هەموو زوڵمو ستەمو سیاسەتە بە تورك كردنەی لەتوركیا بەسەر گەلی كورد هاتووە، ئێستا كاتی ئەوە هاتووە كورد مافی بەكارهێنانی زمانی نەتەوەیی خۆیان بدرێتیو لەچوارچێوەی كۆماری توركیای عیلمانی شۆڕشگێڕا دان بە پێناسەی نەتەوەییاندا بنرێ. چارەسەركردنی كێشەی كورد لەتوركیا بە دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی لەم وڵاتە نایەتەدی، بەڵكو بە پیادەكردنی هەموو مافە نەتەوەییەكانیانو لەچوارچێوەی یەكێتی توركیا دێتە دی، بۆ ئەوەی هەردوو پێكەوە شان بەشانی یەكتر لەشۆڕشێكی نیشتمانی دیموكراتیدا لەدژی ئیمپریالیزمو چەوساندنەوەو ستەمكاری خەبات بكەین..)) (٣٧/٢/٢). لێرەدا بە تاكیدەوە دەكرێ بڵێین: بزوتنەوەی كورد پێشكەوتنێكی گەورەی وەدەستهێنا بەرەو ئامانجەكانی لەپێناو شادبوونی گەلی كورد بەمافە نەتەوەییەكانیو بیستنی دەنگی لەسەر هەردوو ئاستی سیاسیو كۆمەڵایەتی لەتوركیا. ئەمەش ئەو پرسە بوو حیزبی كرێكارانی سوشیالیستی توركیا لەكۆنگرەی چوارەمینیدا كە لە٢٩-٣١ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٧٠ گرێی دا، جەختی لەسەر كردەوە كاتێك سەركردایەتی تازەی ئەم حیزبە بڕیارێكی سەبارەت بەكێشەی كورد پەسند كرد، ئەمە دەقەكەی بوو: ((كورد گەلێكە لەرۆژهەڵاتی توركیا، بوونی هەیە)). ئەگەرچی حیزبی كرێكارانی سوشیالیستی دانی نەنا بە مافی گەلی كورد بۆ وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی، بەڵام ئەم دانپێدانە سیاسییەی بە بوونی گەلی كورد لەتوركیا، هانی بزوتنەوەی كوردی دا بەشدارییەكی كارا بكات لەژیانی سیاسی لەتوركیا، بە تایبەت پاش ئەوەی دەنگی كورد بایەخو گرنگی هەبوو لەهەڵبژاردنە نوێنەرایەتییەكاندا، دەبینی كاتێك پرۆسەی هەڵبژاردن لە١٢ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦٩ بەڕێوەچوو، حیزبی داد (٤٦,٦٪)ی دەنگەكانی وەدەستهێنا، حیزبە كێبڕكارەكەشی (واتە: حیزبی گەلی كۆماریی چەپی میانڕەو (٢٧,٤٪)ی دەنگەكانی وەدەستهێنا، بەمەش ئەم هەڵبژاردنە لەكۆی (٤٥٠) نوێنەری هەردوو حیزبی ناوبراو، (٧١) نوێنەری كوردی هێنایە ناو پەرلەمانی توركیا، ئەمە جگە لەحیزبی (یەكێتی) كە كۆمەڵێكی زۆر لەكوردە شیعە مەزەبەكانی ویلایەتەكانی: تۆنجلیو سیواسو جرومو تۆقاتی بۆ لای خۆ راكێشا. دروشمی حیزبی یەكێتی (١٢) ئەستێرە بوو دەڵێن گوایا ئەم (١٢) ئەستێرەیە بەرجەستە لە(١٢) ئیمامەكە دەكات.. لێرەشەوە ئەم

حیزبه بـه بـەکارهێنانی رێبـازی ئـایینیو ئـایینزای عەلـەوی لەبەرژەوەنـدیی ئامانجـە سیاسییەکانی، تۆمەتبار کرا (٩٩/١٢). بەڵام (حسێن پالان) سـەرۆکی حیزبـە کـە بـەم شێوەیە بەرپەرچی تۆمەتەکانی دایەوەو گوتی: لەوێ ڕا فەرقو جوداییەکی فرە هەن لـەو ناوچەیەی رۆژهەلات کە بە درێژیی نێو سەدەی رابووردوو وا پشتگوێ خراوە بە شێوەیەك دانیشتوانی بوونەتە هاولاتی پلەدوو، بۆیە حیزبەکەمان دامەزراو بەرنامەیەکی ئابووریو کۆمەلایەتی بۆ پەرەپێدانی ناوچەکە خستە بەرچاو بۆ ئەوەی بگات بە ئاستی پێشکەوتنی ناوچەکانی دیکـەی تورکیـاو جیـاوازیش وەلاوە بنـرێ. ئـا ئەمەیـە هـۆی خڕبوونـەوەی جەماوەری رۆژهەلات لەدەوری حیزبمان (١٠٥/١٢).

سالی ١٩٧٠ گۆڕەپانی تورکیا هەلاوێردەیەکی سیاسی توندی بـەخۆوە بـینی، دوای هەلبژاردنەکانی ١٩٦٩کە لەئاکامدا هیچ کام لەحیزبە سیاسییەکان زۆرینەی پێویسـتیان وەدەستنەهێنا بۆ پێکهێنانی حکوومەت. ئەوە بوو دووبەرەکییـەکی گـەورە کەوتـە نـاو (حیزبی داد)و (٩) پەرلەمانتاری دەستیان لەکار کێشـایەوەو (حیزبـی دیمـوکراتی) یـان پێکهێنا کە بەرێباز بیرۆکـەی راسـتی زانسـتی پەسـند کـرد، پاشـان (٤) نوێنـەری تـر جیابوونەوەو هاتنـە ریـزی حیزبـی بزوتنـەوەی راسـتی تونـدڕۆ. پرۆفیسـۆر (نەجمـەدین ئەربەکان)ی سەرۆکی ژووره بازرگانیو پیشەسـازییەکانی تورکیـای پێشـوویش، حیزبـی سیستمی نیشتمانی بە ریبـاز ئیسـلامی دژ بـە کۆمۆنیسـتیو زایـۆنیزمیو ماسـۆنیو ئیمپریالیزمی، دامەزراند.

بزوتنەوەی چەپیش لەتورکیا دابەش بووە سـەر چـەندین کۆمەلـەی وەك: بزوتنـەوەی شۆڕشی دیموکراتی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی میهری بیللی، بزوتنەوەکە بڕوای بە خەباتی سیاسی بوو، پاش ئەوەی هێزە چەپەکانی تورکیا گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە بە رێگـای هەلبژاردنو گەمەی لیبرالیی پەرلەمانیو بە تیۆریی (مارکسی لینینیزمی ماوی) ناتوانن دەسەلات بگرنە دەست. پاشان ئەم بزوتنەوەیەش بوو بە دوو بەشەوە (٨٧/١).

١-بزوتنەوەی گرووپەکانی لادێ: بانگەشـەی دەکـرد بـۆ کۆکردنـەوەو ئامـادەکردنی وەرزێرو جووتیاران بەرەو شۆڕشی چەکداری بە ئامانجی رووخاندنی رژێم. چەپی کورد بـە سەرکردایەتی هەردوو بەڕێزان دۆغۆ برنجیكو وەهاب ئەردوغدو کە لەئاخروئۆخری (سالی ١٩٦٩ )ەوە زیندانی کرابوو، لەگەل چەند سەرکردەیەکی تر لایـەنگیری ئـەم بزوتنـەوەیان دەکرد.

٢-بزوتنەوەی گرووپەکانی شار: ئەم بزوتنەوەیەش بڕوای بە شۆڕشی چەکداری هەبوو، بەڵام بە شێوازی تۆقاندنو کوشتنو هەڵکوتانە سەر بانكو رفاندنی بەرهەڵستکارەکانیان. ماهیرجایانو دنیز گیزمیش سەرکردایەتیی بزوتنەوەکەیان دەکردو هەردوکیان پارتی رزگاریخوازیی میللی تورکیایان پێکهێنا بە رابەرایەتی جایان، سوپا یان بەرەی رزگاریخوازی میللی تورکیاش بە سەرکردایەتی کیزمیش، هەروا رێکخراوی لاوانی شۆڕشگێڕ Dev -Gece یشیان دامەزراند کە نەجمی دیمیرو (ئالکای) خێزانیو هەردوو عومەر کۆهەنو حسێن ئیتانی بە رەگەز کوردو کامیل دەدەو چەند کەسانێکی تر سەرکردایەتییان دەکرد (٨/١٤).

کۆمەڵی دووەمی بزوتنەوەی چەپ، ئەو سوشیالیستە شۆڕشگێڕانە بوون چووبوونە ژێر ئالای پارتی کرێکارانی تورکیا، سەرکردەکانی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوون لەژمارەیەك لەمامۆستایانی پایەبەرزو ناوداری زانکۆ، وەك: بەهیجە بۆرانو محەمەد عەلی ئیبارو سەعدوون ئارنو کۆمەڵێکی زۆر لەرۆشنبیرانی چەپی کورد لەدەوری کۆ بووبوونەوە. بزوتنەوەکە بانگەشەی بۆ خەباتی چەکداری دەکرد، بەڵام تەنها بڕوای بە مارکسیزم-لینینیزم بوو.

کۆمەڵی سێیەمیش: بزوتنەوەی کادیری شۆڕشگێڕ بوو، زۆربەیان لەو چەپڕەوانە بوون بڕوایان بە مارکسیزم هەبوو، بەڵام بە راشکاوی باسیان نەدەکرد، بەڵکو لەبەر رۆشنایی پرەنسیپە چاکسازییەکانی کەمالیزم بانگەشەی شۆڕشیان دەکرد. ئەم بزوتنەوە بە رێبەرایەتی دۆغان ئاوچی ئۆغلۆ بوو کە خۆیو بزوتنەوەکەی گوزارشتیان لەبۆرژوای نیشتمانی لەتورکیا دەرکرد.

بەش بە حاڵی (بەرەی راست)یش، ئەوە وێڕای ناکۆکیو ململانێ سەختە ناوخۆییەکانی، بانگەشەی بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نەتەوەیی بەرفراوان دەکرد بە ئامانجی بەرەنگار بوونەوە لەمەترسی کۆمۆنیستیو ئارمانجی دەوڵەتی تورکیای نەتەوەیی لەسەر پرەنسیپەکانی ئایینی ئیسلامو هزری نەتەوەیی. بەرەکە پێکهاتبوو لە حیزبی بزوتنەوەی نەتەوەیی، بانگەشەی بۆ یەکپارچەیی تورکیای دەکرد لەباکووری چینەوە تا دەگاتە دەریای سپیی ناوەڕاستو کۆماندۆزی بە ئامێرێك دادەنا بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانیو رووبەڕووبوونەوە لەدوژمنانی- حیزبی (داد)ی خاوەن رەوتی ئیسلامیو هەستی لیبراڵی-حیزبی سەلامەتی نیشتمانی ئایینی بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆر نەجمەدین ئەربەکان دامەزرا

كە بەرھەڵستكاری كۆمۆنیستیو زایۆنیزمو ماسـۆنیزمو ئیمپریـالیزمی لەھـەمان كـات دەكرد.

حیزبی گەلی كۆماریش، بە پرەنسیپە مامناوەندییەكەیو بە خڕبوونەوەی لاوانی لەنێو یەكێتییە كۆمەڵە سوشیال دیموكراتییەكاندا، باوەڕی بە شۆڕش ھەبوو، بەڵام بـە ڕێگـەی ئەو چاكسازییەی پشتی بەستووە بە ژیانی پەرلەمانی دیموكراتی.

ململانێی ئایدیۆلۆژیی لەنێوان ئەم ھێزە ڕاستو چەپانە كـە لایـەنی دەرەكـی بیـانی پشتگیری لێ دەكردن، ھێندە سەختو توندوتیژ بوو، لێكحاڵیبوونی نێوانیان مەحاڵ بوو، چونكە حیزبو تاقمێكیان ھزری خۆی ڕاستو شێوازی خەباتی نموونەیی ترو ھەر خۆشـی ڕزگاركەرەو ئەوەش بڕوای پێ نییە خایەنو بە كرێگیراوەو پێویستە لەناو ببرێت (١/٨٨).

حكوومەتی سلێمان دیمیرال ھەوڵیدا بە شێوازی توند بەرەنگاری چەپی چالاك بێتەوە، لەبەرئەوە سەركردەكانی سوپای ڕزگاریخوازیی میللی توركیا (THKO)ی لەزیندانێ توند كردنو یانەكانی ھزریشی داخست، بـەڵام سـوپای توركیـا لەھەمبـەر حكوومەتـە تاكـە ڕەوتەكەی دیـمیرال ڕازی نـەبوو كـە جـەختی كردبـووە سـەر لێـدانو بەربـەرەكانیكردنی چەپەكان، چونكە سوپا دەیویست گێرەشێوێنیو بزوتنەوەی تیرۆریستی چ لەبـەرەی چـەپ یان ڕاست، لەناو ببات.

لەبەرئەوەی حكوومـەتی دیـمیرال بـاری نائاسـایی (عـورفی) لـەوڵاتا جـاڕ دابـوو بـۆ لەناوبردنی بزوتنـەوەی تێكدەرانـە، بۆیـە ھەریـەك لـەماھیر جایـانو ھـەڤالانیو دنیـز گیزمیشو ھەڤالانی ڕەوانەی دادگای عورفیی سێیەم لەئەسـتەموول كـران، بـە تۆمـەتی دامەزراندنی حیزبی ڕزگاریخوازی میللی توركیو بـەرەی ڕزگـاریخوازیی میللـی توركیـاو كوشتنی (ئەبراھام ڕۆم)ی كونسوڵی ئیسرائیل لەئەستەمووڵو ڕفانـدنی (٤) ئـەمریكایی لەگەڵ سیپەل ئەركانو دزینی دوو بانك لەئەنكەرەو ئەسـتەموولو جگـە لەدامەزرانـدنی چەند ڕێكخراوێكی نھێنی بە ئامانجی گۆڕینی ڕژێمی دەستووریی وڵات.

ئەوە بوو دادگای عورفیی سێیەم لەئەسـتەمووڵ حـوكمی لەسـێدارەدانی دەركـرد بـۆ ھەریەك لەبەرێزان: كامیل دەدەو نەجمی دمیرو ئاڵكای دمـیری خێزانـیو قەدریـە دنیـز تـوزانو ڕەجحـان مانـاس لـەو كێشـەیەی ناسـرابوو بـە كێشـەی مـاھیر جایـان بـە تۆمـەتباركردنیان بـە دامەزرانـدنی حیزبـی ڕزگـاریخوازی تـوركی THKPو بـەرەی ڕزگاریخوازیی میللی توركیا THKCو پروپاگەنـدە كـردن لەبەرژەوەنـدی كۆمۆنیسـتیو

رفاندنی (ئەبراهام رۆم)ی کونسولّی ئیسـرائیلو پاشـان کوشـتن و هەولـّدان بـۆ گـۆڕینو هەلّوەشاندنەوەی دەستووری تورکیا بە ڕێگەی بەکارهێنانی هێز. بەلاّم دواجـار، دادگـای ناوبراو حوکمی هەریەك لەئالّکای دمیرو قەدریە دنیـزو رەجحـان ماناسـی لەئیعدامـەوە گۆڕی بۆ حوکمی تاهـەتایی، لەبـەر ئـەوەی ئـافرەت بـوون.. هـەمان دادگـاش حـوکمی جیاجیای بەسەر (٦) کەسدا سەپاندو (٦) کەسی دیکەشـی ئـازادکرد چـونکە ئەمانـەی دواین هیچیان لەسەر ئاشکرا نەبوو (١٢/٥).

کە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری سالّی ١٩٧٠ مۆرکراو بە پێی ئەم ڕێککەوتننامەیە حکوومەتی عێراق دانـی بـە مـافی ئۆتۆنـۆمی بـۆ گـەلی کـورد لـەعێراق نـا، هـەردوو حکوومەتی کۆنەپەرستی ئێـرانو عێـراق تـرسو دلّەڕاوکـەی ئـەوەیان لـێ نیشـت نـەبا بزوتنەوەی کورد زیاتر تەشەنە بکاتو پەرەبسێنێ، جا بۆ خۆپاراستن لەم مەسـەلەیە، بـە هاوکاری لەگەلّ هێزە توندڕۆو فاشیزمەکان چنگی خۆیان زیاتر توند کرد بەسەر ڕۆلّەکانی گەلی کورد لەو دوو ولاّتە. بۆ نموونە حکوومـەتی دیمـیرالّ لـە٨ی نیسـانی سـالّی ١٩٧٠ هێزێکی کۆماندۆی بە پالپشتی زرێپۆشو کۆپتەر بـە بیـانووی کوشـتنی دوو پاسـەوانی شەوانە لەناوچەکە، ڕەوانەی شاری سەلوان کرد (١/١٣)، لەکاتێکدا ئامانجی حکوومەتی تورکیا لـەناردنی ئـەو هێزەبـۆ تۆقانـدنو پشـکنینی شـارەکە بـوو. کـاتێکیش هـەمان حکوومـەت (حکوومـەتی دیمـیرالّ) یاسـای سـەندیکاکانی ژمـارە (٢٧٤)و پاشـکۆکەی (٢٧٥)ی دەرکرد کە بە گوێرەی ئەم یاسایە هەموو سەندیکاکانی ولاّت (سەندیکای کاری تورك Turkis) نەبێت، هەلّوەشێنرانەوە- بە مەبەستی ئەوەی هەموو کرێکاران ناچار بن بێنە ریزی ئەمەی دوایین- ئەوە بوو کرێکاران لەهەردوو شاری ئەسـتەموولّو قـۆچ ئیلـی مانگرتنێکی گشتییان لەمەیدانی تەقسیم لەئەستەموولّ سازدا، بۆ سـەرکوتکردنی ئـەم مانگرتنـە هێـزە تونـدڕۆکانی تـورك بەتایبـەتی کۆمانـدۆکانی حیزبـی ئـەو (بزوتنـەوە نەتەوەییە)ی کە لەسەر داروپەردووی حیزبی لادێیی کۆماری دامەزراو لەشـوباتی سـالّی ١٩٦٩ (تورکیش) بووبووە ڕابەری بالاّی- خۆپێشاندانە ئاشتییانەکەیان دایەبـەر ڕێژنـەی گوللەو ژمارەیەك کوژراوو برینداری لێکەوتەوە.. پاشـانیش پۆلیسـی تـورك لـەو شـەڕو پێکدادانەی لـەنێوان کۆمانـدۆی گورگـە بۆرەکـانو کرێکـارە چـەپەکان روویـدا، خـۆی هەلّقورتاند بۆ پشتیوانیکردنی کۆماندۆ لەدژی کرێکارانی چـەپ لەمەشـدا ژمارەیـەکی زێدەتر لەکرێکاران کوژرانو بریندار بوون.. لەسۆنگەی ئەم ڕووداوە هەموو هێزە چەپەکان

داوایان کرد خۆپیشاندانێکی گشتی بۆ ڕۆژی دواتر (١٦ی حوزەیران) لەهەمان شوێن ساز بدرێ، بەڵام کە ئەمە ڕوویدا هێزەکانی ئاسایشی تورك بەرەنگاری خۆپیشاندەران بوونەوەو شەڕو بەکژداچوونێکی گەورە قەوما لەنێوان هێزەکانی ئاسایش‌و کۆماندۆ لەلایەك‌و هێزە چەپەکان لەلایەکی ترو قەسابخانەیەکی ترسناکیان نایەوە دەیەها کوژراوو بریندار تیادا بوونە قوربانی (١٩٣/٣/٢).

بۆ نارەزایی دەربڕین بەرامبەر ئەم پێشێلکارییە ئاشکرایەی دەستووری ١٩٦١و هاوکاریی حکوومەتی دیمیراڵ لەگەڵ کۆماندۆو ڕاستڕەوەکان بۆ دەستدرێژیکردنە سەر کرێکارەکان، چەندین خۆپیشاندانی گەورە لەناوچەی ڕۆژهەڵات بە تایبەت لەدیاربەکرو ئودەمیش لەمانگی تەمووزی ساڵی ١٩٧٠ ڕوویاندا، حکوومەت ئەم خۆپیشاندانانەی قۆزتەوە بۆ جاڕدانی (حوکمی عورفی) لەهەرسێ ویلایەتەکانی ئەستەموول‌و ئەنکەرەو دیاربەکر، لەپاشان بازنەی حوکمە عورفییەکەی فراوانکرد تا سێ ویلایەتی دیکەش لەرۆژهەڵات بگرێتەوە.

لەم سەروبەندەشدا، یەکێتی کۆمەڵە سوشیالیستە دیموکراتییەکان دروشمێکیان بەناوی (ماڵئاوا..چەك) بڵاوکردەوە، تیادا داوایان لەگشت کۆمەڵ‌و ڕێکخراوە نهێنی‌و ئاشکراکان کرد چەکەکان فڕێ بدەن‌و ڕوو بکەنە دایالۆگی دیموکراتییانە لەپەرلەمان بۆ چارەسەرکردنی کێشە سیاسی‌و ئابوورییەکانی وڵات. بەڵام بەرەی چەپ ئەم بانگەشەیەی وەك چۆن دەڵێن بە وێنەی چاو بەستنی گەل لەقەڵەم دا بۆ ئەوە لەگرفت‌و کێشەکانی ڕۆژانەیەوە دوور بێت (٨٩/١)، کەچی بەرەی ڕاست بە بانگەشەیەکیان دانا بۆ داپۆشینی تاوانەکانی چەپ، بۆیە کۆمەڵە سوشیالیستە دیموکراتییەکانی لایەنگری حیزبی گەلی کۆماری بوونە ئامانجی هەردوو بەرەی ڕاست‌و چەپ وەکو یەك.

لەناو ئەم شایلۆغانەدا، دیمیراڵ بە پشتیوانی‌و یارمەتی بەرەی ڕاست‌و هێزە کۆنەپەرستەکانی وڵات هەوڵی دەدا بەرەنگاری مەترسیی بەرەی چەپ ببێتەوە، ئەمە وایکرد سوپای تورك- کە ناڕازی بوو لەکارەکانی دیمیراڵ- لە١٢ی ئاداری ساڵی ١٩٧١ هۆشدارییەك بداتە حکوومەت، دەرەنجام حکوومەتی دیمیراڵ کەوت‌و ژەنراڵ (تاغماج)ی سوپا سالار جاڕی باری نائاسایی لەهەموو ویلایەتەکان داو جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست.

سوپا، پێی وابوو (سلێمان دیمیرال)ی سەرۆك وەزیـران نیـازی جیـددی نییـە بشـێویو تۆقاندن بە هەموو شێوازێکیان لەولاتا بنەبڕ بکات، چونکە تەنها سەرقالّی ئەوەیە هـەر ئۆپۆزسیۆنێك سەری هەڵبڕی، بە چەپڕەویو کۆمۆنیسـتییەوە تۆمـەتباری بکـات، جگـە لەوەش پەردە بدات بەسەر کردەوەکانی کۆماندۆو راسترۆکانو بانگەوازەکانی غەزاو شەڕی پیرۆزی دژە کافرەکان کە تاقمە کۆنەپەرستەکان بەرزیان دەکەنەوە.

کە دیمیرالّ رووخا، هێزی چەکدار جڵەوی دەسـەلاّتی دایـە دەسـت حکوومـەتی نیهـاد ئیریم، خۆیشی (واتـە: هێـزی چـەکدار) بـەرەو سـەربازگەکانی کشـایەوە، دوای ئـەوەی ئەنجومـەنی نوێنەرایـەتی هەڵوەشـاندەوە وەك رێ خۆشـکردنێك لەبـەردەم ئەنجامـدانی هەڵبژاردنی نوێ (٩٠/١).

لەکۆتایی ئەو ساڵەدا (١٩٧١) فەرید قوبادی وەزیری ناوخۆی تورکیا، لەلێدوانێکیدا لەمەڕ تیرۆرەوە گوتبووی: ((سەبەب کاری گـەورەی تـیرۆر ئـەو مافەیـە کـە دەسـتووری ١٩٦١ بە هاولاّتیانی بەخشیوەو ئەوانیش بۆ تێکدانی بـاری ئاسـایش قۆسـتوویانەتەوە، سەبەب کاری دووەمیش پێگـەی جـوگرافی ولاّتەکەمانـە کـەوا تیرۆریسـتان کـەڵکی لـێ وەردەگرن بـۆ جێبـەجێکردنی مەرامـەکانیان. ئێمـە بـە هاوکـاریی حکوومـەت لەگـەڵ هاولاّتیاندا، کـاری دەسـتەجەمعی دەکـەین بـۆ بنـەبڕکردنی تـیرۆر لەولاّتەکەمانـدا..)) (٩/١٥).

## سەرچاوەکانی بەشی چوارەم


١- إبراهيم الداقوقي: فلسطين و الصهيونية في وسائل الإعلام التركية، بغداد ,١٩٨٧

2- Aydinilik Sosyalist Dergi-3, Sayi 24, Ekim 1970.

3- Proleter Devrimci Aydinlik, Sayi 4, Subat 1969.

4- pro Dr. Tarik Zafer Tunaya: Siyasi Muesseler ve Anayasa Hukuku, 3.Baski, Istanbul 1975.

5- T.B.M.M Albumu, Ankara 1968.

6- Cumhuiyet Senatosu Albumu, 10 Haziran 1988.6.

٧- گۆڤاری الوطن العربي ژماره ١٤٩ له ١٩٧٩/٢/٢٧.

8-Turkiyede Surekli yayinlar, B.B. Arsiv Mudurlugu-ANKARA.

9- relicetezeG, roreT edeyikruT: irenimeS ickepi idbA 1980 lubnatsl :iralniyay iteyme

10- Aksam gazetesi 4-8 1967.

11- Alpay Kabacali: 1977 yilinda Sagci Basin Ne Dedi, 1st.1977.

12- Abdi ibekci: Liderler Diyor Ki, Istanbul 1969.

13- Aksam gazetesi 9-4 1970.

14- Aydinlik gazatesi 29-3 1980.

15-Yanki Dergisi, 3-9 Ocak 1972.

16- Gunes gazetesi, 5-6 1987.

17- Hurriyet gazetesi.6-6 1977.

١٨- رۆژنامەی الأنباء الكويتية، ژمارەی ١٩٨٦/٧/٢٩.

١٩- گۆڤاری الوطن العربي، ذمارة ١٤٩ له ١٩٧٩,/١٢/٢٧

٢٠- تركيا المعاصرة، دار الحكمة الموصل، لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی تورکی (کۆمەڵێك مامۆستا) ١٩٨٧.

له هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٣ هیچ پـارتێکی سیاسـی بەتـەنیا نـەیتوانی ئـەو زۆرینـە پەرلەمانیە دەستە بەر بکات، شایستە بێـت حکومـەت پێـك بهێنـیٚ، بـەلاٚم حیزبـی گـەلی کۆماری و حیزبی داد زۆرینەی دەنگەکانیان هێنا بەشێوەیەك هەر یەکەیان بتوانیٚ بە بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبێکی بچووك یان زیاتر حکومەت دابمەزرێنیٚ ، ئەگەرچی لەدەرئـەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧١و هەڵبژاردنەکانی ١٤ ی تشرینی یەکەمی سـاڵی ١٩٧٣ یـش ، حیزبەکان بە زۆرینەی دەنگ نەیانبردبۆوە ، وەلیٚ ئەوە دەرگای خستە سەر پشت بـۆ گرێـدانی هاوپەیمانی سیاسی لە حوکمڕانیدا ، ئەمە ئەو ڕەوشە بـوو تورکیـا تـاوەکو کوودەتـای ١٢ ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ بـەخۆوە بینـی. دیمـەنی گۆڕەپانەکـە لـەدوای هەڵبژاردنـەکانی ١٩٧٣ بەرجەستە بوو لەم وێنەیەی لای خوارەوە (١/٩٠):

یەکەم — لەسەر ئاستی بزووتنەوەی چەپ و سۆشیالیستی ناکۆکییەکی زۆر چ لـە ئاسـتی حیزبی و ڕێکخراوەیی یان ئایدۆلۆژی، لەئارادا بـوو لـەوڕا ئـەم حیـزب و کۆمەڵـە سیاسـیانە دامەزران :

١- حیزبی کرێکاران بە سەرۆکایەتیی بەهیجە بۆران .

٢- حیزبی سۆشیالیستی تورکی بەسەرۆکایەتیی محەمەد عەلی ئیبار .

٣- حیزبی کرێکاران و جوتیاران بەسەرۆکایەتیی دۆغۆ برینجیك .

٤- حیزبی سۆشیالیست دیموکراتەکان بە ڕێبەرایەتیی میهری بیللی .

سەرەڕای ئەو کۆمەڵە سیاسی و کوتلانەی بەو حیزبانەوە نەبەسترابوون وەکو : خڕبوونەوەی وەهاب ئاردوغدو کە لەگەڵ بزووتنەوەی کورد لە تورکیا و کۆمەڵی بارزانی لە عێراق هاوکاری دەکرد(٨).

---

٨- مەبەستی لە کۆمەڵی بارزانی (پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقە بە سەرۆکایەتی رابەری مێژوویی کورد مستەفا بارزانی .(وەرگێڕ)

دووەم — لەبەرامبەر پەرتەوازەیی بەرەی چەپ و سۆشیالیستی ، بەرەی ڕاست هەوڵی دەدا بە هاوکاری لایەنەکانی (بە حکومەتی دیمیرالیشەوە لەکاتی پێکهێنانی حکومەتەکەی بە هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبەکانی تر) خۆی کۆبکاتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە لە توندڕەوۆیی چەپ لە تورکیا ، بەرەی ڕاست پێکهاتبوو لەم حیزب و کۆمەڵانەی لای خوارەوە :

١- حیزبی داد بە ڕابەرایەتیی سلێمان دیمیرال ، بە مەیلی موحافیزکاری و هاوسۆزی لەگەڵ ئەمەریکا ناسرابوو ، حیزبەکەی بڕوای بە لیبرالیەت و دژایەتی کۆمۆنیستی دەکات ... وێڕای ڕەوتێکی ئیسلامییانەی و بانگەشەکردنی ، بۆ هاوکاری لەگەڵ عەرەبەکان ، بەبێ ئەوە داوای پچڕانی پەیوەندی بکات لەگەڵ قەوارەی زایۆنیزم .

٢- حیزبی بزوتنەوەی نەتەوەیی : بەڕابەرایەتیی (ئەلپ ئەرسەلان تورکیش) کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی کودەتاکەی ٢٧ ی مایسی ساڵی ١٩٦٠ و ئەو کەسەی ناسرابوو بە بانگەشەکردنی بۆ یەکپارچەیی تورکیا لە باکووری چینەوە تا دەریای سپی ناوین لە پێناو دامەزراندنی تورکیای گەورە، ناسراویش بوو بە دژایەتیکردنی توندی بەرامبەر بە کۆمۆنیستی و جووەکان و زایۆنیزم وەختێ دەبنە مەترسی بۆسەر تورکیا ، سەرەڕای لایەنگریکردنی لە یەکێتیی عەرەب ئەگەرچی پشتگیری هاوکاریی عەرەبی تورکی ئیسلامی دەکرد ، ئەم حیزبە چەندین ئۆردوگای بۆ ڕاهێنانی ئەندامەکانی لەسەر چەك کردبۆوە ، پاشانیش تیرۆری سیاسی بە تاکی لە ١٩ ی ئەیلولی (١٩٦٩) وە مومارەسە کرد (٩/١)، پاش ئەوەی کۆمۆندۆکانی حیزبی ناوبراو لەگەڵ پۆلیسدا هاوکارییان کرد لەو کوشتارگەرییەی لە گۆڕەپانی تەقسیم لە ١٦ شوباتی ساڵی ١٩٦٩ و دواییش لە ١٥ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٠ لە ئەستەموڵ قەوما .

٣- حیزبی سەلامەتی نیشتیمانی — لە ٨ ی شوباتی ساڵی ١٩٧٠ بە سەرۆکایەتیی پرۆفیسۆر (نەجمەدین ئەربەکان) ی سەرۆکی ژووری بازرگانی تورك لە ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٩)، دامەزرا ، ئەربەکان بە بیرو بۆچوونی ئیسلامی و هاوسۆزی لەگەڵ کێشەکانی عەرەب و دژایەتیکردنی لەهەمبەر کۆمۆنیستی و زایۆنیزم و ماسۆنی لەهەمان کات ناسرابوو ، حیزبەکەی ئەربەکان هاوپەیمانیەتیەکی لەگەڵ هەردوو حیزبی سەرەکی : حیزبی داد و بزووتنەوەی نەتەوەیی گرێدا، بۆ پێکهێنانی حکومەتی بەرەی نەتەوەیی ... ئەو حکومەتەی کە تەنها ساڵێك بەردەوام بوو بەهۆی ناکۆکیەکانی نێوان بەرەکە ، لە پاشان لەگەڵ حیزبی گەلی کۆماری هاوپەیمانیەکی بەست ، لە هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی ساڵی ١٩٧٣ بە (٤٦)

کورسی له پەرلەمان سەرکەوت ، بەمەش له پەرلەماندا بووه سێهەمین هێز لــه دوای حیزبــی گەلی کۆماری و حیزبی داد.

٤- حیزبی دیموکراتی : دامەزرێنەری ئەم حیزبه ئەو کەسانه بوون دوای هەڵبژاردنی ســاڵی ١٩٦٩ له پارتی داد جیابوونەوەو ژمارەیان (٩) نوێنەر بوو ، لەسەرویانەوه ئەمانــه بــوون : بوزییلی سەرۆکی پەرلەمان و سەعدەدین بیلکیچ وەزیری هاتوچــۆو و فــاروق ســوکان وەزیــری ناوخۆ له کابینەی سلیمان دیمریل. ئەم حیزبه لایەنگریی بۆچوونه ئایینیه توندڕەوەکانی دەکرد ، بۆیه باوەشــی بــۆ ئــەو کۆمەڵــه ڕاســتڕەوە زانســتیه کــردەوە کــه بانگەشــەیان دەکــرد بــۆ بەرەنگاربوونەوه له هزری چەپ به ڕێگای هزرێکــی ڕاســتڕۆیی زانســتیانه کــه ئیلــهامی لــه ڕێنماییەکانی ئیسلام و واقعی تورك له هەمان کات وەردەگرت، ئــەم حیزبــه لەگــەڵ حیزبــی گەلی کۆماری بۆ یەك جار چوونه ناو ئیئتلافێکی حکومییەوە ، بەڵام لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگــاردا وورده وورده پوکایــەوه و هێزەکــانی پەرتــەوازە بــوون و ئەندامەکانیشــی چــوونه نــاو ڕیــزی حیزبەکانی ترەوە .

٥- حیزبی متمانه : پرۆفیسۆر فەیزی ئۆغلۆ دایمەزراند، دوای ئەو ناکۆکییەی که له ٩ ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٦٧ له نێوان خۆی و بولەند ئەجەویــد لەســەر ســکرتاریەتی حیزبــی گەلی کۆماری ڕوویدا ، بەڵام دوا بەدوای کۆنگرەی بیستەمی حیــزب کــه لــه ٤ ی تــەمووزی ساڵی ١٩٧٠ بەسترا، بەیەکجارەکی لەو حیزبه دەرکرا ، پاشان ئــەم حیزبــەی دامەزرانــد کــه ئەمیشیان به هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبی داد چووه هاوپەیمانیەکی حکومییەوە ، حیزبی متمانــه بڕوای به هزری لیبراڵی و دژایەتی کۆمۆنیستی دەکرد ، سەرەڕای پابەندبوونی به عیلمانیەت .

بێجگه لەم حیزبه ڕاستڕەوانه لەوێ ڕا چەندین کۆمەڵی ڕاستڕەو هەبوون، گرنگترینیان :

أ- کۆمەڵی ئایینی ، حیزبی ئازادی کەبارەگاکەی لەئەردەن بــوو، تــوانیی ڕێکــی بخــاتو کۆمەکی بکات ، زۆربەی ئەندام و لایەنگرانی لەو گەنج و لاوه تورکانه بوون کــه بڕوایــان بــه ئایینی ئیسلام و به زەرورەتی ڕزگارکردنی جیهانی ئیسلامی بوو له مەینەتیەکانی .

ب- خڕبوونەوەی ئایینی لکێنراو به هاوبەندی جیهانی ئیسلامییەوە ، ئەم خڕبوونەوەیه له پشتی هاندانی فێرگەکانی ئیمام و ووتاربێژانی ئایینیەوە بوو لــه هــەموو ناوچــەکانی تورکیــا بەڵام هەمیشسه بەوە تۆمەتبار دەکرا که کۆمپانیای ئارامکۆی ئەمریکایی له ڕووی مادییەوە کۆمەکی دەکات (٩٢/١).

سێیەم/ حیزبی گەلی کۆماری : رابەرایەتیی حیزبەکان یان باشتر بڵێین سەرکردایەتی کۆمەڵەکانی مام ناوەند ، بەڵکو چەپی مامناوەندیشی دەکرد ، ئەم حیزبە واریسی سەروەریەکانی کەمالیزمە ، چونکە خودی کەمال ئەتاتۆرك دایمەزراند ، حیزبەکەش ئەو پرەنسیپانەی کە ئەو لە رۆژگاری شەڕی رزگاری خوازی جاڕی دان ، وەرگرتن و کردنی بە درووشمی خۆی ، هەر ئەم حیزبەش تاك لایەنە بە درێژایی چارەگە سەدەیەك حوکمڕانیی تورکیای کرد ، بەلاّم هەڵبژاردنی بولەند ئەجەوید بە سەرۆکی حیزبی ناوبراو لە ساڵی ١٩٧٠ خاڵی وەچەرخان بوو لە ژیانی ئەم حیزبە ، چونکە ئەجەوید توانی بیکاتە حیزبێکی سۆشیال دیموکرات و هەوڵبدات بۆ گۆڕینی واقعی سیاسیی تورکیا لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی بتوانێ سنورێك دابنێ بۆ شەڕی براکوژی ... جا بۆ بەدواداچونی بزوتنەوەی کورد لەم قۆناغە ناسکەی ژیانی سیاسی تورکیا ، بەم سێ باسەی لای خوارەوە لێی دەکۆڵینەوە :

## باسی یەکەم

## کوردو حیزبی گەلی کۆماری

حیزبی گەلی کۆماری توانی دەیەها هزرڤانی سیاسی تورك لە پێشکەوتوو خوازو چەپەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە پاش ئاشکرا بوونی ڕێبازە سیاسیەکەی و گرتنە بەری پرەنسیپی چەپی مامناوەند لە سالّی ١٩٧٠ بەدواوە و چەسپاندنی ئەم پرەنسیپە دوای هەلبژاردنی ئەجەوید بە سەرۆکایەتی حیزب لە سالّی ١٩٧٢. حیزبی گەلی کۆماری لەبەر ئەوەی ئەندام بوو لە سۆشیالیستی نێو نەتەوەیی ، بۆیە ڕەوت و بۆچوونە سیاسیەکانی لەمەڕ کێشە سیاسیەکانەوە لەژێر کاریگەریی ڕەوتی گشتی ئەو کۆمەلّە نێونەتەوەییە بوو .

سالّی ١٩٧٤ وەچەرخانێك بوو لە ژیانی سیاسی تورکیا ، بگرە سالّی یەکلاکەرەوەی سیاسیش بوو لەچاو زۆرێك لەو کێشەو گیروگرفتانەی کە سیاسەتی تورکیا بەدەردیانەوە دەینالأند ، نەخوازە پاش ئەوەی بولّەند ئەجەوید بووە سەرۆکی حکومەت، دەبینی لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆدا تورکیا توانی لە عەسکەرتاریەتی بە خورتی بۆ دانانی سوپاسالاری گشتی بە سەرۆکی کۆمار ،نەجاتی بێت. ئەوەبوو هەموو حیزبە سیاسیەکان لە دژی کاندیدکردنی سوپاسالار فاروق کورلەر ، بۆ پۆستی سەرۆکایەتی وەستان و پەرلەمان دەنگی دا بۆ پالێوراوی حیزبە ڕاسترەوەکان (فەخری کورتورك) ئەگەرچی ئەم کەسە ئەفسەری خانەنشین بوو ، بولّەند ئەجەوید ئەو دەمەی بوو بە سەرۆك وەزیران ، سیاسەتێکی نوێی بەرامبەر بە کەمینەی کورد پیادەکرد ، بۆنموونە لە ٨ ی تەموزی سالّی ١٩٧٣ لێبوردنی گشتی بۆ ئەو ڕێبەرو گیراوە کوردانە چ خوێندکار یان لاوان یان کرێکارو بەتۆمەتی سیاسی بەند کرابوون دەرکرد لە سالّی ١٩٧٤ یش (عومەر کوهەن) ی بە ڕەگەز کوردی ئازاد کرد، ناوبراو یەکێك بوو لە سەرکردەکانی ڕێکخراوی لاوانی شۆڕشگێڕ (٨/٢) و ڕەگەزنامەی تورکیایی دایەوە بە خوێندکار (حەقی کەسکین) ی سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی تورك لە ئەلمانیاو بە (٤) خوێندکاری تر لە هەڤالانی کە بەبڕیارێکی ئەنجومەنی وەزیرانی حیزبی داد لە ١٦ ی تەموزی سالّی ١٩٧٠ ڕەگەزنامەی تورکییان لێ سەندرابۆوە (٤٣٢/٣) فشاری سیاسیشی لەسەر

ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاّت کەم کردەوەو سەردانی زۆربەی ئەو ویلایەتانەی کرد بۆ گـوێگرتن لـە سکالاّی هاولاّتیان و بودجەیەکی تایبەتی تـەرخان کـرد بـۆ ئـاوەدان کردنـەوەی ئـەو ناوچـە فەرامۆش کراوە ، حکومەتەکەی ئەجەوید دیسـان بـۆ یەکـەمین جـار لـە مێـژووی تورکیـای هاوچەرخ خوێندنی بابـەتی ڕەوشـت لـە قوتابخانـەکانی پـەروەردەی بنـەڕەتی (ئامـادەکردنی مامۆستایان و ناوەندی) پیادە کرد، بەلاّم ئەم بابەتەیان بـە بابـەتی ئـایین گۆڕییـەوە کاتێـك بەرەی نەتەوەیی MC جلّەوی دەسەلاّتی گرتە دەست و پاش ئەوەی سلێمان دیمیریل لـە سـالّی ١٩٧٤ بە هاوپەیمانی لەگەلّ حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی و حیزبە ڕاستڕەوەکانی تـر، بـوو بـە سەرۆکی حکومەت (٣/٤).

حیزبە ڕاستڕەوەکان: حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی ، متمانەی دیموکراتی ، حیزبـی ڕزگـاری نیشتیمانی لە کانونی یەکەمی سالّی ١٩٧٤ بەدوا ، درێژەیان بەو توێـژەکانیان دا لـە پێنـاو پێکهێنانی بەرەی نەتەوەیی و لە ئاداری سالّی ١٩٧٥ ئەو بەرەیە جـاڕدرا کـە بیرۆکـەی ئـەو هەلّبژردنە پێشوەختە گشتییەی ئەجەویدی ڕێبەری حیزبی گەلی کۆماری بانگەشەی بۆ دەکرد قەرەبوو کردەوە ، پاشان سازشێکی گەورە کـرا لـە نێـوان حیزبـی دیمـوکراتی و حیزبـی داد ، بەوەش ڕۆلّی حیزبی دیموکراتی لەسەر شانۆی سیاسەتی تورکیـا کۆتـایی هـات لـە سـۆنگەی لەدەستدانی فراکسیۆنە پەرلەمانیەکەی لە ناو ئەنجومەنی نیشتیمانیی گەورەی تورکیا.

لە ئایاری سالّی ١٩٧٥ یەکێتیی سەندیکاکانی کرێکارنی شۆڕگێڕDISK کۆنگرەی خـۆی گرێدا ، ژمارەی ئەندامەکانی ٦٠٠ هەزار کرێکارو لایەنگری حیزبی گـەلی کۆمـاری بـوون ، ئەگەرچی سەرکردایەتیی ئەم یەکێتیە لە چەپەکان و لـە حیزبـی کرێکـارانی سۆشیالیسـتەوە نزیك بوو ، یەکێتیەکە لە تەمووزو ئابی سالّی ١٩٧٥ ووردە ووردە ڕابەرایەتی خۆپیشاندنێکی دەست پێکرد بۆ زیاد کردنی کـرێ و چـاك کردنـی بـاری گـوزەرانی ژیـان و لـە دژی تـیرۆرو سەرکوتکردنی سیاسی و زولّم و زۆرداری حکومەتەکەی دیمیرالّ.

لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەوەشدا پەیوەندیەکانی تورکیا لەگـەلّ ئەمـەریکا و بـەرێگای ئەمیشیانەوە بە پەیمانی ئەتلّەسی بوبوونە کۆسپێك لەبەردەم چارەسەرکردنی کێشەی قوبرس لە سالّی ١٩٦٥ بەدوا ئەو دەمەی قوبرسییە یۆنانییەکان دەستیان دایە بەکاربردنی توندو تیـژی دژی کەمایەتی تورك لە دورگەکەدا ، بەلاّم بولّند ئەجەویـد کـە لـە سـالّی ١٩٧٤ سـەرۆکی حکومەت بوو لەگەلّ سەرکردایەتیی سـوپا ڕێـك کـەوت بـۆ داگیرکردنـی بەشـە تورکیەکـەی دورگەی قوبرس لەو دەمەی کودەتا سەربازیەکە لە دژی مەکاریۆس لـە قـوبرس ڕویـدا پـاش

ئەوەی یۆنانیەکان هەڕەشەو گوڕەشەیان دەکرد دیسان دەست درێژی بکەنـە سـەر کەمایـەتیی تورك ، ئەگەرچی ئەجەوید زۆر دژی ئەوە بوو سوپا خۆی لە سیاسەت هەڵبقورتێنێ لە تورکیا، لەو سەروبەندەش دەنگۆیەك بلاّو بۆوە کە ئەجەوید بەو کارەی ویستویەتی متمانە بگێڕێتـەوە بۆ سوپاو ئیحاش بە سەرکردە سەربازیەکان بدات کەوا ڕۆڵی سوپا لەوەدانییـە کـە لـە ژیـانی مەدەنی خۆی هەڵبقورتێنێ، بەڵکو لەوەدایە گرنگیی بەو ئەرك و کێشە سەربازییانە بدات لـە ئەستۆی دان .

سەنگی ئەجەوید دوای داگیرکردنی قوبرس لە ناوەوەی تورکیا زۆر زیادی کرد ، بە ڕادەیەك ئۆپۆزسیۆنی بەرەی ڕاست ترسیان لێ نیشت مەسەلەکە زیاتر پەرە بسێنێ و ئەگـەری ئـەوەش هەبێت حیزبەکەی لە هەڵبژاردنی داهاتوو بە زۆرینە سەربکەوێت .

بۆیە حیزبە ڕاست ڕەوەکان کە بەهەمویانـەوە زۆرینـەی پێویسـتیان پێکـدێنا، لـە نێـوان خۆیاندا ڕێك کەوتن لە کاتی تاوتوێکردنی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لە پەرلەمان متمانە لـە حکومەتەکەی ئەجەوید وەربگرنەوە ، ئەوەبو حکومەتی ئەجەوید کەوت ، چـونکە متمانـەی بەدەست نەهێنا و پاشان سەرۆکی کۆمـار ئـەرکی پێکهێنـانی حکومـەتی تـازەی لـە ١٨ ی ئەیلولی ١٩٧٤ سـپارد بـە نوێنـەر (سـەعدی ئیرمـاك)و نـاوبراو هەوڵیـدا لـە بێلایەنـەکان دابمەزرێنێ بە شێوەیەك زیاتر پێك بێت لە حکومەتێکی تەکنۆقرات تاوەك ئەوە سیاسی بێت ، بەلاّم ئەو حکومەتەش متمانەی پەرلەمانی وەدەسـت نـەهێناو دەرەنجـام لـە ٢٩ ی تشـرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ دەستی لـەکار کێشـایەوەو تورکیـا تووشـی قـەیرانێکی وەزاری هـات نزیکەی (٦) مانگ درێژەی کێشا سـەرۆکی کۆمـار بـیری لـە هەڵوەشـاندنەوەی پەرلـەمان و هەڵبژاردنی نوێ کردەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا حیزبەکانی بەرەی ڕاست ترسان ئەجەوید بیباتەوە ، بە تایبەتی پشتگیری لەلایەن جـەماوەرەوە تـا دەهـات زیـاتر دەبـوو بـەهۆی داگیرکردنـی قوبرسەوە ، جا حیزبە نەتەوە پەرستەکان و حیزبی سەلامەتی نیشـتیمانی لـە ٢٤ ی مایسـی ساڵی ١٩٧٥ ڕێککەوتن لەسەر پێکهێنانی حکومەتی نوێ بەسەرۆکایەتی سـلێمان دیمـیراڵ ، ئەو حکومەتەی کە بەناوی بەرەی نەتەوەیی و دوای ئەو قەیرانە وەزارییە هـات کـە بۆمـاوەی (٦) مانگ لە ساڵی ١٩٧٥ تورکیا گیرۆدەی بوبـوو ، بـەلاّم نـەیتوانی ئـەرك و ڕێ و شـوێنە یەکلاکەرەوەکان بەجێ بگەیەنێ ، لەبەر ئەم هۆیانەی لای پایین(١/٩٧:

١- لاوازی پێکهاتەی کابینەکە چوونکە لە هاوپەیمانییە وەزارییەکەی دا پشتی بەستبو بە حیزبە بچووکە ڕاست ڕەوەکان .

٢- تۆمەت بارکردنی دیمیرالّ ی سەرۆك وەزیران بە گەندەڵی لە حوکمڕانی و ڕێگـەدان بـە براکانی (شەوکەت و عەلی دیمیرالّ بە بەکارهێنانی پایەکەی بۆ دەوڵەمەند بوونی نارەوا .

٣- هەوڵدانی هەر لایەنێکی ناو ئیئتیلافە وەزارییەکە (بەرەی نەتەوەیی) بۆ بـەکارهێنانی دەسەلاّت لە پێناو بەهێز کردنی پێگەی خـۆی ، گـەورترین سـوودمەندیش لـەم کابینەیـە دا (ئەلپ ئەرسەلان تورکیش )ی سەرکردەی حیزبی بزووتنەوەی نەتەوە پەرستی توندڕۆ بوو ، ئەم کابرایە بوونی لە دەسەلاّت وەك جێگری سەرۆك وەزیران بە چەترێك بەکاربرد بـۆ بـەهێزکردنی دەسەلاّتی لەناو گەنجان بۆ داپۆشـینی تاوانـەکانی کۆمانـدۆکانی حیزبەکـەی لـە تیرۆرکردنـی سیاسی و بڕینی بانك و هاوێشـتنی نـارنجۆك بـۆ نـاو بارەگاکـانی یەکێتیـەکان و ڕێکخـراوە چەپەکان .

٤- هەلاّوسانی دراوو داڕوخانی باری ئابووری لـە دەرەنجـامی مـانگرتن و خۆپیشـاندان و ڕێپێوانی کرێکاران .

٥- لەبەر ئەوەی وەزارەتەکەی دیمیرالّ نوێنەرایەتی بەرژەوەندیەکانی بـۆرژوای پیشەسـازی دەکرد نەوەك بەرژەوەندیەکانی گەل ، بۆیە دیاردەی ڕەت کردنەوەی دەسەلاّتی دیمیرالّ بە ڕوونی لەناو زانکۆو سەندیکا کرێکارییە مەیلەو سۆشیالیستەکان بە خۆپیشاندان و کاری توندو تیژی سەری هەڵدەدا ، بۆ نموونە کاتێك کرێکاران بەبۆنەی جەژنی (١) ی ئایارەوە لە سـالّی ١٩٧٦ ئاهەنگیان گێڕا ، بەهۆی گوللـەبارانی کەسـانێکی نەناسـراوەوە (٤٠) کـەس لـە ئەنـدامانی یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی شۆڕشـگێڕ ، گیانیـان لەدەسـت دا ، بـەلاّم لەبـەر تـرس و شلّەژان و هەلاّتن و توندو تیژی پتر لە (٢٠٠) کرێکاریش تیاچوون .

٦- گەڕانەوەی دیمیرالّ بۆ سەر کورسی دەسەلاّت ڕەزامەندی سـوپای وەرنـەگرت ، چـونکە خۆی واتە دیمیرالّ سەبەبکاری ئەوەبوو سوپا لە سالّی ١٩٧١ دەستێوەردان بکـات و دەسـەلاّت بگرێتە دەست.

هەموو ئەو هۆکارانـە وایـان کـرد حکومـەت بەرامبـەر بـە تـیرۆری بـەرەی ڕاسـت کـە ناڕاستەوخۆ لەلایەن حکومەتەوە پشتگیری دەکـرا دەستەوەسـتان بێـت ، تـیرۆری چـەپیش وا دەهاتە پێش چاو وەك بلّێی دەیەوێ خۆی بپارێزێ بەرامبەر تیرۆرەکەی تر (تیرۆری ڕاست) کـە لەماوەی دەسەلاّتی دیمیرالّ لە نێوان سالاّنی (١٩٧٤-١٩٧٧) وە لەماوەی جیا جیـادا پـەرەی سەندبوو و بە بەردەوامی گەڤ و هەڕەشەی دەکرد و هەوڵی دەدا بۆ ڕاگرتنی تـیرۆر بـە گرتنـی زۆرترین ژمارە لەبەری چەپ و کورد لە ناوچەی ڕۆژهەلاّت و گرتنی ژمارەیەکی کـەمیش لەبـەری

ڕاست بۆ چاو بەستنی خەڵکی ، ئەمە تا ئەو دەمە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٧ هات و بەرەی نەتەوەپەرستی ڕاست ڕەو لەو ماوەیە پێگەکانی خۆی لەناو دەسەلاْت بەکاربرد بۆ چەسپاندنی شوێن پێی خۆی لە نێو دەرگا پەروەردەیی و جێ بەجێ کاریەکانی وەك ، پۆلیس و ئاسایش و هێزی چەکدار ، حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی چالاکترین ئەندامەکانی ئەم بەرەیە بوو لە دزە کردن بەرەو ناو ئەم دەزگایانە و لە زانکۆی تەکنەلۆژیای ڕۆژهەلاْتی ناوینیش لە ئەنکەرە قسەی سوار بوو ، کە پێشتر ئەم زانکۆیە ببوە قەلاْی چەپی تورك پاش هەڵبژاردنی یەکێك لە ئەندامەکانی بە سەرۆکی زانکۆکە ، ڕێکخستنەکانی گەنجانیش واتە : حیزبی نەتەوەپەرستی توندڕۆ لە کۆمەڵی گورگە بۆرەکان لەناو ئەم زانکۆیە تەقەیان لە خوێندکاران کرد ، سەرەڕای ئەمەش کوشتنی هەرەمەکییان لە ناوچەی ڕۆژهەلاْت یان کوشتن لەسەر پێناسە لە ئەستەموڵ و ئەنکەرە ئەنجام دا .

کاتێك بوڵەند ئەجەوید لەدوای ساڵی ١٩٧٤ بوو بە سەرۆك وەزیران و فەرمانی بە سوپای تورکیا دا بۆ داگیرکردنی بەشی باکووری قوبرس ، لە تورکیادا لەهەر ڕابەرێکی تر جەماوەری زیاتر بوو ، لێهاتوویی ئەم ڕابەرە لە ڕووی وتارو لۆژیکی حەکیمانەی و کەسایەتیی بەهێزی و ویست و ئیرادەی ، وایان کردبوو ببێتە ئەو سەرکردەیەی لەتوانایدا هەبێت وێنەی واقیعی سیاسی لە تورکیا بگۆڕێت ئەگەر هەلی گونجاوی بۆ بڕەخسێت، لێرەشەوە ئەجەوید بانگەشەی بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی پێشوەخت کرد پاش ئەوەی سەردانی زۆربەی ویلایەتەکانی تورکیای کردو بەڵێنی بە دانیشتوانی کوردی ناوچەی ڕۆژهەلاْت دا بۆ لابردنی ستەم و نەهامەتیەکان و بایەخدان بە ویلایەتەکانیان و پەرەپێدانیان بەڕێگای چاکسازی کشتوکاڵی و دابین کردنی خانوو بۆ ئەوانەی خانویان نیە ، سەرەڕای بەخشینی جوتیاران لە قەرزەکانیان تا سنووری (٥٠٠) لیرەی تورکی ، نزیکەی ٦٠ دۆلاری ئەمریکی لەو دەمەدا، ئەگەر بزانین دەرامەتی تاکێکی خەڵکی لەو دەمەدا ساڵانە (١٥٠) دۆلار بوو ، مووچەشی بۆ موختاری گوندەکان بڕیەوە (٧١/٥) بۆیە کورد بەتایبەت ، شوانییەکان و چەپ و سۆشیالیست و دیموکراتەکان بۆ پشتگیری کردنی حیزبی گەلی کۆماری لە هەڵبژاردنەکانی ٥ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٧ درێغییان نەکرد ، بەشێوەیەك ئەم حیزبە (٤٤٪) ی دەنگەکانی بەدەست هێنا (١٩/٦) ، دەرەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکانیش بەم جۆرە بوو :

١- حیزبی گەلی کۆماری (٢١٣) کورسی لە پەرلەمان هێنا ، ٣٣ نوێنەری کورد بوون .

٢- حیزبی داد (١٨٩) کورسی بەدەست هێنا ، لەنێوانیاندا (٢٣) نوێنەری کورد بوون .

٣- حیزبی ڕزگاری نیشتیمانی (٢٢) کورسی هێنا .

٤- حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی (١٦) کورسی هێنا.

کەچی کورسیەکانی هەردوو حیزبی متمانەو دیموکراتی بەرادەیەکی زۆر دابەزین ، لەم لایشەوە ئەجەوید توانیی (١١) پەرلەمانتاری حیزبی داد ی فەرمانڕەوا لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ قایل بکات بێنە ناو حیزبەکەیەوە (٩/٧) بەمەش توانی حکومەتەکەی دیمیراڵ بڕوخێنێت ، هەموو بێلایەنەکانی حیزبی داد یش بە پایەی وەزاری خەلاّت کران ، لە نێوانیاندا سێ کەسیان کورد بوون ، ئەجاویدیش کابینەی نوێی لە کانوونی دووەمی ١٩٧٨ بە هاوپەیمانیی لەگەڵ هەردوو حیزبی متمانەو دیموکراتی پێکهێنا.

بەلاّم هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٧ مزگێنی چارەسەرکردنی تەنگژە سیاسی و ئابووریە سەختەکانی پێ نەبوو ، بەڵکو کێشەکانی ئاڵۆزتر کرد ، چونکە هیچ کام لە حیزبە سیاسیەکان وەك هەموو جارێك ، ئەو زۆرینەیەی بەدەست نەهێنا شایستە بێت حکومەت پێك بێنێت ، جا لێرەدا سەرۆکی کۆمار ڕایسپارد.

(بوڵەند ئەجەوید) ی سەرۆکی حیزبی گەلی کۆماری وەزارەتی نەتەوەیی دابمەزرێنێ لەبەرامبەر ئەمەدا بەرەی ڕاست شێت و دەهری بوو لە بەرەیەکی یەکگرتوودا گردبوونەوە لە دژی حکومەتی ئەجەوید کە تێدەکۆشا بۆ هێورکردنەوەی ڕەوشەکە بە هەوڵدان بۆ لێدانی توندڕۆیی لەهەر لایەنێك بێت ئەویش بە جاڕدانی حوکمی عورفی هەوەڵجار لە (٤) ویلایەت و پاشانیش لە (٦) ویلایەتی تر ، ئەمە وای کرد هەم بەرەی ڕاست ، کە لە ڕیشەدا دژایەتیی دەکرد — و هەم بەرەی چەپیش لە دژی بوەستن ، لە سۆنگەی ئەمەدا زۆر زوو کەوت ، بە تایبەتی دوای تۆمەتبارکردنی حیزبەکەی — حیزبی گەلی کۆماری — بە بەکاربردنی کۆمەڵە هەروەزیەکان بە ئامانجی فراوانکردنی بنکە جەماوەریەکەی لە لادێیەکاندا بۆیە هەمیسان زەمینەی لەبار لە پێشی دیمیراڵ ڕەخسا بۆ پێکهێنانی حکومەتی هاوپەیمانی ڕاست ڕەوی نوێ ، وەلێ ئەم جارەیان سەرنەکەوت بەهۆی پێداگرتنی هەندێ لایەن لەسەر چەند داخوازیەکی سەخت، کۆشك و سوپاش دەیانویست هەردوو حیزبی گەورە ، داد و گەلی کۆماری هاوکاریی بکەن بۆ پێکهێنانی حکومەتی نوێ بەڵکو بتوانن کۆتایی بە خوێن ڕێژی بهێنن و ڕێگە چارەی تەواویش بۆ کێشەو گرفتە دژوارەکانی تورکیا بدۆزنەوە ،بەلاّم وێڕای ئەوە هەردوو حیزبی: سەلامەتی نیشتیمانی و گەلی کۆماری ئەو حکومەتە نوێیەی کە بووە مایەی گەشبینی ناوەندە سیاسیە ڕەسمیەکان پێك هێنا تەنها سێ مانگ لە حوکمڕانی بەردەوام بوو، لەبەر جیاوازی بیرو بۆچوونی هەردوو حیزبەکە سەبارەت بە زۆربەی کێشەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی و ئابووری لە تورکیا.

## باسی دووەم

## ئاژاوەی کوشتنی سیاسی و هەڕەمەکی لە تورکیا

لە شوباتی ساڵی ١٩٧٨ شەپۆڵێك توندو تیژی سیاسی لە تورکیا هەڵایسا ، پێشتر تورکیا لەوێنەی بەخۆوە نەبینی بوو ، بەرەی نەتەوەیی بەو توندو تیژییەی ، ویستی حکومەتەکەی ئەجەوید و هاوپەیمانیە لاوازو ناتەباکەی لێك بترازێنێ. باهۆزی ئەو شەپۆلە وەها سیستمی دەستوری دەستەپاچە کرد، ئیدی دەسەڵاتی جێ بەجێکاری هیچ بڕست و کاریگەریەکی نەما و دەسەڵاتی یاسا دانانیش لە داڕشتنی ئەو یاسایانەی کە سنورێك بۆ تیرۆری چەپ و ڕاست دادەنێت ، پەکی کەوت. چونکە هیچ حیزبێکی سیاسی بەتەنیا زۆرینەی نوێنەرایەتی وەدەست نەهێنا. دەسەڵاتی دادوەریش نەیتوانی بڕیارەکانی جێ بە جێ بکات دەرهەق بە ئەنجامدەرانی تیرۆر ، لەبەر ئەوەی زۆربەی تیرۆریستان بە نهێنی و دوور لە چاوی ئەم دەوڵەتەی هیچ توانایەکی نەمابوو کاریان دەکرد ، بە تایبەت بەرەی نەتەوەپەرست پشتگیری ڕێکخراوی ئەو گورگە بۆرانەی دەکرد کە هەڵیان دەکوتایە سەر خوێندکارە چەپەکانی زانکۆو ڕێگایان لە کۆڕو کۆبوونەوە کۆمەلایەتیەکانیان دەگرت ، نەك هەر ئەمە بەڵکو وەیشومەی تیرۆریان گواستەوە بەرەو ناوچە زۆرینە کورد نشینەکە (واتە : ناوچەی ڕۆژهەلات) و لێرەدا کێڵگەو مەزرای گوندە کوردیەکانیان تێك دەداو بە ڕەمەکییانە کوردیان دەکوشت بەبێ ئەوەی بزانن قوربانیەکان چەپ یان سۆشیالیست یان دیموکرات یاخود ئیسلامین، بە نموونە : فەرهاد ئیواز کە ئەندامێکی ڕێکخراوی (گورگە بۆرەکان)و تەمەنی لە (١٧) ساڵ تێنەپڕیبوو لەپێش دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە دیاربەکر دانی پێداناو گوتی : لەگەڵ عەبدولقادری هاوڕێم لە شەقامەکانی ئەدەنە پیاسەم دەکرد کاتێك بە پەنجە ئیشارەی بۆ سێ خوێندکار کردو گوتی : ئەوانە لە چەپەکانن پێویستە بکوژرێن ، منیش ئەو ئەرکەی پێی سپاردم قەبولم کرد و لە دووری ١٥ مەترەوە گوللەکانی دەمانچەکەم لە جەستەیاندا خاڵی کرد ... دەستپێکی خەباتم بۆ ئەوە بوو ژاراوی ڕق و توڕەییم برژێنم بەسەر چەپەکاندا ، ئەوەبوو لە گەڕەکی (ئۆزیك تەپە) لە ئەستەمووڵ بۆسەیەکم دانا بۆ ئەوەی هەر کەسێکی چەپم بەرچاو بکەوێت بیکوژم ..(٥) گوللەم نا بە کەسێکەوە بەلای بۆسەکەدا تێدەپەڕی ، نەم دەزانی ناوی چی یە ، بەلام بە ڕواڵەت وا پێدەچوو لە چەپەکان بوبێت، سێ ڕۆژ دواتر لەگەڵ دوو برادەردا دەچووین

بلاْوكراوەی حیزبی بلاْو بكەینەوە، خۆمان كرد بە قاوەخانەیەكدا زۆربەی مەعمیلەكانی لە چەپەكان بوون ، بلاْو كراوەكانیان لیْ وەرنەگرتین. هاتینە دەریْ و لەناو دەرگای قاوەخانەكەوە گوللەیدەمانچەكانمان بەناویاندا ڕژاند ، دوایی زانیمان لە دەرئەنجامی تەقەكانمان كوژراویْك و (٥) بریندارى لیْكەوتۆتەوە..)) (٣٨/٨). ئەم فەرهاد ناوە لەكاتیْكدا نیازی بوو سەرۆكی شارەوانی ئەدەنە لە ڕۆژهەلاْت تیرۆر بكات دەستگیر كرا ، سەرۆكی شارەوانی ناوبراو لەو هەولْە نەجاتی بوو، بەلاْم دوایی هەمان ڕیْكخراو تیرۆری كرد .

لە ئەیلولی سالْی ١٩٧٨ كوشتارگەی سیاسی زۆرو لەناوبردنی جەستەیی لەو فەرمانگەو دەزگایانە دەستی پیْكرد كە چەپەكان تیایاندا ڕۆلْی دیاریان هەبوو ژمارەیەك لە ئەندامانی ( بزووتنەوەی حیزبی نەتەوە ی فاشیزم چەندین كوشتارگەیان لە ناوچە كورد نیشەنەكانی ڕۆژهەلاْت لە كانوونی یەكەمی ئەو سالْە نایەوە ، لە ئاكامی ئەمەدا حوكمی عورفی (١٧٧/٩) لە ١٧ ویلایەتی توركیا لەوانە ١٤ ویلایەت لە ناوچەی ڕۆژهەلاْت ، جاڕدراو حكومەتی ئەجەویدیش چالاكیەكانی یەكیْتی سەندیكاكانی كریْكارانی شۆڕگیْڕو سەركردەكانی دەستگیر كرد و قەدەغە كرد .

ئەو كوشتن و بڕینەی لە ناوچە كوردنشینەكانی ڕۆژهەلاْت قەومان و چەوساندنەوەی ڕۆشەنبیرانی كوردیش كە داوای مافی نەتەوەیی كوردو پاریْزگارییان لە بوونی نەتەوەیی كورد دەكرد ، وایانكرد خویْندكارانی كوردی دەرچووی كۆلیْژی زانستە سیاسیەكان لە زانكۆی ئەنكەرە بۆ سالْی خویْندنی ١٩٧٨ ڕاستەوخۆ لە پاش دەرچوونیان پارتی كریْكارانی كورد PKK یان دامەزراند لەسەرووی ئەو خویْنكارانەشەوە (عەبدوللاْ ئۆجەلان) ی سەرۆكی هاوبەندی قوتابیانی كورد بوو لە كۆلیْژی زانستە سیاسیەكان لە زانكۆی ئەنكەرە ، لەو ڕا ئەم حیزبە هزری (ماوی) ی كردە ئایدۆلۆژییە سیاسییەكەی و لە ناو چینەكریْكاری و ڕۆشەنبیرەكاندا بۆ پەیداكردنی هەوادارانی، پەرەی بە چالاكیەكانی دا.

پرۆسیْسی تەواوكردنی ئەو هەلْبژاردنەی لە تشرینی یەكەمی سالْی ١٩٧٩ بەڕیْوەچوو ، دەرەنجامی دۆڕانی حیزبی گەلی كۆماری لیْكەوتەوە. ئەوەبوو حكومەتەكەی ئەجەوید كەوت ، بەمەش بەرەی نەتەوەیی ئامانجی خۆی بەدەست هیْنا پاش ئەوەی هەرچی پیْی كرا ئاستەنگی خستە پیْش ڕەوڕەوەی ئەو حكومەتە وەك ڕیْ خۆشكردنیْك بۆ ڕووخاندنی ، ئەگەرچی دیمیرالْ لە ١٢ ی تشرینی دووەمی سالْی ١٩٧٩ بە ڕیْگەی هاوپەیمانییەكی ڕاستڕۆی نویْی نیْوان حیزبەكەی و حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەپەرست و ژمارەیەك لە بیْلایەنەكان ، گەڕایەوە سەر

کورسی دەسەڵات ، لێ ئەجەویدیش هەولێکی هاوپەیمانیەتیی نوێی لەگەڵ حیزبی ڕزگاری نیشتیمانی دەستپێکرد بۆ ئەوەی سنورێك بۆ ڕێکارەکانی قەدەغەکردنی ئەو ئازادییە گشتییانەی حکومەتی دیمیرال ئەنجامیدان دابنێت ، دوای ئەوەی بازنەی حوکمی عورفی لە وڵات فراوانکرد بەشێوەیەك هەموو ناوچەکانی کوردستانی تورکیا بگرێتەوە ، لەم بارەیەوە ڕۆژنامەی (گاردیان) ی بەریتانی نووسیبووی دەڵێت : (( ئەوە سەیرو عاجباتی نییە هزری شۆڕشگێڕی و سۆشیالبستی زۆر بەخێرایی لەناو گەنجەکانی ئەم ناوچانەی کە دواڕۆژێکی ڕوونیان نیە تەشەنە بکات و بڵاو ببێتەوە ، بەشێکی زۆر لە دانیشتوان یەکێتی سۆڤیەت بە دووژمنی خۆیان نازانن وەك چۆن زۆربەی تورکەکان بڕوایان بەم بیرۆکەیە بوو ، بەڵکو وەك دۆست و هاوپەیمان تەماشای دەکەن ، هەندێکیشیان بە هومێدەوە دەڕواننە چین و ژاپۆن ، ئەگەرچی بیرۆکەیەکی ڕوونیان دەربارەی سیستەمەکانی ئەم دوو وڵاتە نییە. وا دیارە حکومەتی تورکیاش ئێستا زیاتر قەناعەتی وایە ئەو دواکەوتن و نەهامەتیەی باڵیان بەسەر بەشەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵات کێشاوە تەنها ئەوە نین شێرپەنجەیەکی ئابووری پێك بهێنن و لاوازی لە قەوارەی دەوڵەت بە گشتی بڵاو بکەنەوە ، بەڵکو ئاگری شۆڕشێکیان لەژێر کادا لە دژی ستەم و دواکەوتوویی و چەوساندنەوە شاردۆتەوە ، بەمەش لەهەر ناوچەیەکی تری ڕۆژهەڵاتی ناوین زێدەتر ئەگەری هەڵایسانی ئاژاوەو شۆڕشی هەیە. لێرەدا لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕێژەی بێکاری دەگاتە (٢٠٪) و گەورەترین ڕێژەی لەدایك بوونیش تیادا بڵاو بۆتەوە ، کەچی دەرامەتی تاکی خەڵکەکەی (٣/١)ی ئەو دەرامەتەیە هاوڵاتی تورکیا لە ئەستەموڵ دەستەبەری دەکات ، جگە لەچەند کارگەیەکی بچووکی حکومی پەرت و بڵاویش لە دەرەوەی شارەکاندا ، ئەوا پیشەسازی لەم ناوچەیە بوونی نییە ، زۆربەی دانیشتوانەکەشی لە چینی هەژار و مام ناوەندن، دەوڵەمەندیش لە نێوانیاندا بە ڕەهایی شوێنەواریان نییە )) (١١/١٠) .

بەڵام حیزبی داد نەیتوانی پێشنیارەکانی لە پەرلەمان دەرباز بکات ، چونکە حکومەتەکەی دیمیرال پشتی بە زۆینەیەکی کەمی پەرلەمانی بەستبوو کە بریتی بوو لە هەردوو حیزبی بچووك: حیزبی رزگاریی نیشتمانی بەسەرۆکایەتێتی نەجمەدین ئەربەکان، خاوەنی (٢٢) کورسیو بزووتنەوەی نەتەوە پەرست بە ڕابەرایەتی ئەلپ ئەرەسلان تورکیش خاوەنی ١٦ کورسی کە مەحاڵە حیزبی داد بە (١٨٥) کورسی لە پەرلەمان کە کۆی کورسیەکانی (٤٥٠) کورسی یە ، لە دەسەڵات بمێنێتەوە ، بۆیە ناچار دەبێ لەگەڵ ئەم دوو حیزبە بچێتە زنجیرە سازشێکی سەختەوە ، چونکە هەر یەکەو ڕێبازێکیان گرتۆتە بەر و جیاوازە لەگەڵ حیزبی داد. حیزبی ڕزگاری نیشتیمانی نوێنەرایەتی سوننەی تورکیا دەکات و بڕوای بە تیورییەك هەیە دەڵێت : پیلانێکی ئیمپریالیزمی

کۆمۆنیزمی زایۆنیزمی لە ئارادایە و تورکیای کردووەتە ئامانج و نیازی وایە تورکیا لەناو ببات بۆئەوەی هیچ پێگەو پلەیەکی نەمێنێ ، چونکە گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەتی ئیسلامیە، لێرەشەوە ئەم حیزبە بەرهەڵستی لە هەردوو ڕێبازی حیزبی دادو حیزبی گەلی کۆماری دەکات لە پەیوەندیەکانیاندا لەگەڵ ئەمەریکا بەرێگەی ڕێککەوتننامەی نامەی بنکە سەربازییەکان لەگەڵیدا ،هاوکات لەگەڵ هەنگاوە ئابووریەکانی (دیمیراڵ ) یشدا ناکۆکە ، ئەو هەنگاوانەی پاڵیان داوە بەو خانە جیهانییە داراییانەی وەك شێرپەنجەن لەجەستەی دەوڵەتی تورکیادا .

بەش بەحاڵی بزووتنەوەی نەتەوەپەرستیش ، ئەوە هێلێکی تیرۆرستانەی توندڕۆی پەتی گرتۆتە بەر، زۆر نزیکترە لەبەرەیەکی عەسکەرتاری تا وەك ئەوەی کۆمەڵێکی سیاسی بێت (١١/١٤٠).

لەکاتێکدا دیمیراڵ و بەبەرەی توندڕۆی نەتەوەپەرستیشەوە پێیان وایە ئەو پانتاییە ئازادییە گشتییانەی دەستوور دەستەبەری دەکرد ، بووە هۆی تەقینەوەی شەپۆلێك توندو تیژی، کۆمەڵە چەپەکان و یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی شۆڕگێڕ بەکاری دێنن بۆ پەکخستنی بەرنامە ئابووریەکەی ، ئەوا بەرەی چەپیش کە پەرتەوازییەکی زۆر سەری تێکردووەو بەشێکیشی پەنا دەباتە بەر شێوازی ئاژاوە چییەکان بۆ سەپاندنی بوونی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی ، پەرۆشی گۆڕانکاری بنەڕەتی بوو بەخێراترین ڕێگا ئەویش تیرۆرە ، وەلێ دوورترین ڕێگاشە بەرەو گۆڕانکاری پێویست .

سەرەڕای ئەوە ڕەوشی ئابووری بەیەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی هەڵایسانی توندوتیژی لە تورکیا دەمینێتەوە ، چونکە بەهۆی داڕووخانی باری ئابووری لە لادێکاندا ، ڕەوی بەکۆمەڵی لە گوندەوە بەرەو شار ڕووی دا ، لەئاکامی ئەم ڕەوە بە کۆمەڵییەش ئەوەی بە (پشتێنەی هەژاری) ناو دەبرێ — لە گوندەکانی تەنەکە — لە دەوربەری ئەو شارانەی کە قەوارە ئابووریەکانی نەیانتوانی ئەم زیادەیە لە هێزی کار بگرنە خۆ پێکهات و ڕێژەی بێکاری لە شارەکاندا بەپێی ئامارە ڕەسمییەکان گەیشتە ١٦٪ ، واتە : (٢) ملیۆن بێکار لە کاتێکدا بازاڕی کار ساڵانە پێشوازی لە نیو ملیۆن هاتووی نوێ دەکات، ئەگەر دابەزینی بەردەوامی نرخی لیرەی تورکیشی بخەینە سەر کەوای کرد باری هەژاری سەخت تر بێت ، ئەوە ژینگەکە ئامادەبوو بۆ سەرهەڵدانی تیرۆر وێڕای ئەویارمەتیە مادیانەی تورکیا لە ساڵی ١٩٧٩ وەری گرت : ئەمەریکا بە (٤٥٠) ملیۆن دۆلار یارمەتی تورکیای دا وەك نرخێك بۆ وەگەڕخستنەوەی بنکە سەربازیەکانی لە تورکیا ، ئەڵمانیایڕۆژئاواش بە بڕی (٥٠٠) ملیۆن دۆلار یارمەتی پێشکەش کرد (١١/٤١).

له پاش هاتنی حکومەتی دیمیراڵ بۆ سەر کورسی دەسەلاَت لە ساڵی ١٩٧٩ تیرۆر لـە تورکیـا دیمەنی شەڕی ناوخۆی بچووك بچووکی گرتـە خـۆ لـەنێوان ڕاسـت و چـەپ و لـەنێوان ئایینزاکـان هەروەها لەنێوان شۆڕگێڕانی کوردو هێزی ئاسایشی تورکیا و نێـوان ژمارەیـەك لـە سـەرکردەکانی سوپا لە والی شارەکان و تێکرا تیرۆرستانی ڕاست و چەپەکانیش ، بۆ نموونە ژەنـەراڵیکی سـوپا لـە ناوچەی (فەنەرباهچە) ی پێشکەوتوویان لە ئەستەمووڵ دایە بەر ڕێژنەی گوللەو ژمارەی قوربانیانی دەستی تیرۆری سیاسی لە ماوەی (٧) مانگی دەسەلاَتی حیزبی داد گەیشتە نزیکەی ١٩٠٠ کـەس ، لەکاتێکدا ئەو بارە نا ئاساییەی سەپێنرابوو بەسەر (٢٠) ویلایەت لە کـۆی (٦٧) ویلایەتەکـەی تورکیا نەیتوانی سنورێك بۆ خوێنڕشتنی بەردەوام دابنێت ، پاش ئەوەی ململانێی سیاسی توند ئەو شارە تورکیانەی گرتەوە کە دابەش بووبوون بەسەر گەڕەکە چەپ و ڕاسـتەکان و قسـەو دایـەلۆگیان تەنها بە گوللە بوو .

ئەگەرچی چاودێرانی سیاسی لەوە دەترسـن جۆگەلـەی ئـەم شـەڕە ناوخۆییـە بچـووکانە ببنـە ڕووبارێکی گەورە تەڕو وشـك لـە وولاَتـدا لەپێشـیاندا ڕامـاڵن ، بـەلاَم لەهـەمان کـات گونـاهی تەقینەوەی شـەپۆلی تـیرۆری چـەپ ، دەخەنـە ئەسـتۆی تـیرۆری بـەرەی ڕاسـت ، نـەخوازە ئـەو ڕووبەڕووبوونەوەیە سووتەمەنیەکەی لە بازاڕی برەوداری چەك لـە تورکیـا دەبینێتـەوە ، بـۆ نموونـە لەماوەی (١٥) ساڵی ڕابردوودا دەستگیرا بەسەر (٤٥) هەزار تفەنگ و (١٥٠) هـەزار دەمانچـەو (٢٢) ملیۆن فیشەگ و تەقەمەنی ، ئەم ژمارانەش بەسن بۆ پێشبینیکردنی ژمارەی ئەو چـەکانەی نەگیراون یاخوود دەستیان بەسەردا نەگیراوە (٤١/١١) .

تێکچوونی ڕەوشی ئاسایش لە دوای تیرۆرکردنی دکتۆر (نیهاد ئیریـم) ی سـەرۆکی حکومـەتی کاتی دوا بەدوای بزووتنەوەکەی ١٢ی ئاداری ١٩٧١ — و هەروەها کوشتنی ڕۆژنامەنووسی ناسـراو عەبدی ئیپیکچی سەرنووسەری ڕۆژنامەی میللیەت ی بەناوبانگ لەلایەن محەمەد عەلی ئاغجە کە لە گرتوخانەوە بەرەو ئەوروپا هەلاَت و پاشان لە ١٣ ی ئایاری ساڵی ١٩٨١ تەقەی لە پاپا یوحـەنا پۆلسی دووەم کرد وەك هەوڵێك بۆ لەناوبردنی ، ئەمانە بوونە هۆی جـاڕدانی حـوکمی عـورفی لـە (٢٠) ویلایـەتی تورکیـا و ئەنجامـدانی ڕەشـبگیریەکی زۆریـش لـەو ولاَتـە ، بـەلاَم چارەنووسـی گەمەیەکی نوێی بۆ تورکیا ئامادە دەکرد ئەو دەمەی حیزبە سیاسیەکان لە شـوباتی سـاڵی ١٩٨٠ لەنێوان خۆیاندا ڕێك نەکەوتن لەسەر کاندیدکراوی سـەرۆکایەتی کۆمـار ، ئـەوەبوو حیزبـی گـەلی کۆماری لەدوایشیەوە هەمو هێزە چەپەکانو حیزبـی کرێکـارانی تورکیـا بەسـەرۆکایەتی بەهیجـە بۆران پشتگیری لە هەڵبژاردنی فەریقی یەکەم حەیدەر باتور دەکرد کە یەکێك بوو لە سـەرکردەکانی

بزووتنەوەکەی ١٢ ی ئاداری ساڵی ١٩٧١ کە حکومەتی دیمیرالی ڕوخاندو ناوبراو لەو دەمەوە سەرکردەی گشتی هێزە ئاسمانیەکان بوو و بەبیرو بۆچوونی سیاسییانەی میانڕەو و هاوسۆزی لەگەڵ حیزبی گەلی کۆماری ناسرابوو ، بەش بەحاڵی بەرەی ڕاستیش ، پشتگیریی لە هەڵبژاردنی فەریقی یەکەمی خانەنشین تۆرۆن دەکرد ، پاشان پشتگیری لە هەڵبژاردنی (ئیحسان سەبری چاغلیانگل) ی وەزیری دەرەوی پێشووتر و سەرۆکی کۆماری تورکیا بە وەکالەت دەکرد ، چوونکە ئەو کات بەتەمەن لەهەموو ئەندامانی دیکەی پەرلەمان گەورەتر بوو دوای تەواو بوونی ماوەی سەرۆکایەتیەکەی فەخری قۆرۆتورك و لە دەرەنجامی ڕێك نەکەوتنی حیزبە سیاسییەکان لەسەر کاندیدی نوێ بۆ سەرۆکایەتی کۆمار (٩٩/١) .

کاتێك کۆڕی ( تیرۆر لە تورکیا) لەلایەن کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی تورك لەماوەی نێوان ٣٠ ی کانونی دووەم تا ١ ی شوباتی ساڵی ١٩٨٠ لە ئەستەموول بەبۆنەی یادەوەری یەکەمی تیرۆرکردنی نووسەری ڕۆژنامەنووس عەبدی ئیپیکچی سازدرا ، هەموو بەشداربووانی کۆڕەکە چ بە توێژینەوە یان بە لێدوانەکانیان لەبارەی تیرۆرەوە لەناوچەی ڕۆوژهەلاتی تورکیا قسەیان کردو بەشێوەیەکی شاراوەو بێ ئەوەی - ناوی بێنن- ئاماژەیان دا : کورد دەستی لەو تیرۆرە هەیە کە لە تورکیا بەڕێوە دەچێ ، جەختیشیان لەوە کرد کە هۆکاری تیرۆر هەژاری و بێکاری و گۆڕانی ئابووریە ، بەلاّم کەسێکیان نەچوو بەلای ئەو فاکتەرە سەرەکیەی پاڵی بە کوردەوە ناوە بەشداری لە یاخی بوونی چەکداری بکات لە باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا ئەویش : بێبەشبوونیانە لە مافە کلتوریەکانیان و حاشاکردن لە بوونی نەتەوەییان لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە (١٤٢/١٢).

بگرەوبەردەی سیاسی نێوان حیزبەکان گەیشتە ڕادەیەك هەندێك لە هێزەکان بۆ بلاّوکردنەوەی تێروری سیاسی قۆستیانەوە و قوربانیەکانی ئەم تیرۆرە ڕۆژانە گەیشتە (٢٥) کوژراو لەبەرەی ڕاست و چەپ و مرۆڤی بێگوناه ، ئەمە هانی (چاغلیانگڵ) ی سەرۆکی کاتی تورکیای دا لەدەستپێکی مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٠ زنجیرە کۆبوونەوەیەك لەگەڵ سەرانی هەردوو حیزبە سەرەکیەکە گرێبدات ، ئەمەش لەدوای ئەوەی ژەنەڕاڵ (کەنعان ئیڤرین)ی سوپا سالاری تورکیا لە مایسی ساڵی ١٩٨٠ هۆشدارییەکی بە حکومەتی (سلێمان دیمیراڵ) ی سەرۆکی حیزبی داد دا ، هەموو دەزگا میدیا ناوخۆیی و دەرەکیەکان بلاّویان کردەوە ، تیایدا داوای لێکرد ئەو ئاژاوەو تیرۆرە لەناو برێت کە خەریکە ولاّت بەرەو شەڕێکی ناوخۆیی کاولکاری ببات ، ئەگینا هێزە چەکدارەکان بە ئەرکی دەزانن بۆ ڕزگار کردنی تورکیا لەو بارودۆخەی تێی کەوتووە دەست وەربدەن (١٠٥/١) .

کۆبوونەوەکانی (چاغلیانگل) لەگەڵ سلێمان دیمیرال ی سەرۆکی حکومەت و ڕابەری حیزبی دادی دەسەلاّتدار لەلایەك‌و لەگەڵ بولەند ئەجەویدی سەرۆکی حیزبی گەلی کۆماری ئۆپۆزسیۆن

بەو دەرئەنجامە نەگەیشتن سەرنج و بۆچوون و هەڵوێستەکانی هەردوولا سەبارەت بە کێشە گشتیەکانی وڵات نزیك بخەنەوە ، چونکە کارەکە لەدەست سەرانی حیزبە سیاسییەکان دەرچوو بوو ، ئەگەر ئەو سەرنەکەوتنەشی بخەینە سەر کە پەرلەمان بە درێژایی (٦) مانگی ڕابردوو لە هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمار بەرەو ڕووی ببۆوە ، وێڕای ئەوەی کە (٧٦) کەڕەت بۆئەو ئامانجە خستیە دەنگدانەوە ، ئەوە دەستتێوەردانی سوپا بۆ یەکلاکردنەوەی بارودۆخەکە هیچ گومانێکی هەڵنەدەگرت ، ئەوەبوو کودەتای ١٢ ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن ئەنجومەنی نەتەوەیی رووویدا کە پێکهاتبوو لە سەرکردەکانی سوپاو جەندرمە ، سەرەڕای سوپاسالاری سەرکردەی بزووتنەوەکە ، پاشان ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کەنعان ئیڤرینی سوپا سالاری بە سەرۆکی کۆمار هەڵبژارد، ئەم پۆستە زیاتر لە (٦) مانگ دوای تەواو بوونی ماوەی سەرۆکایەتی کۆرۆ تورك بە بەتاڵی مابۆوە ، سەرۆکی تازەی وڵات پێکهێنانی کابینەی نوێی لە ٢١ ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ لە کەسانی تەکنۆکرات و کارگێڕیە ناسراوەکان سپاردە بولند ئۆلسوو حکومەتەکەی لە ٣٠ ی ئەیلولی هەمان ساڵ وەك دەسەڵاتێکی جێ بەجێکاری دەست بەکاربوو ، لەکاتێکدا یاسای ژمارە ٢٣٢٤ کە لە ١٢ ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ (ڕۆژی کودەتاکە) دەرچوو ، هەموو دەسەڵاتێکی یاسادانانی دایە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کە کودەتاکەی ئەنجامدا. حکومەتی ئۆلسۆ توانی ئاسایش و سەقامگیری لە وڵات دابین بکات لە ئاکامی قەدەغەکردنی هاتوچۆی هاوڵاتیان لەلایەك و جاڕدانی حوکمی عورفی لە وڵات لەلایەکی ترەوە ، وێڕای ئەوەش هێزەکانیئاسایشی تورکیا لەماوەی تەنها یەك هەفتەدا (لە ٢٣-٣٠تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨١) ٦١٨ کەسیان دەستگیر کرد بەهۆی ئەنجامدانی چەندین تاوانی وەك کوشتن ، بڕینی بانك ، ڕێگری، هاویشتنی نارنجۆكو تەقەمەنی و دەست درێژی کردنە سەر نامووس ، هەمان ئەو هێزانەش توانیان دەست بەسەر چەندەها جۆرە چەك و ماڵ و موڵکی دزراو کە بەهایان زیاتر لە (٥٨) ملیۆن لیرەی تورکی بوو بگرن ، بەڵام ئەم حکومەتە تەنها لەماوەی (٦) مانگی دەسەڵاتیدا توانیی ئاسایش لە هەموو وڵاتی تورکیا بەرقەرار بکات و دوای ئەوەش هەموو حیزبە سیاسیەکانی لە تورکیا هەڵوەشاندەوە و دەستی گرت بەسەر ماڵ و موڵك و بارەگاکانیان (١٠٦/١).

## باسی سێیەم

## کوردو کودەتای ساڵی ١٩٨٠

سەرکردە سەربازییەکان لەسەرەتای ساڵی (١٩٨٠) وە ، سێ هۆشدارییان دابووە حکومەتی دیمیراڵ بۆ ئەوەی لە چوار چێوەی سیستمی دیموکراتی پەرلەمانیدا ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر لە دژی ئاژاوەگێڕی و تیرۆر و جیابوونەوە. لە ١٣ی ئایاری ساڵی (١٩٨٠) ش ، ژەنەراڵ کەنعان ئیڤرین سوپاسالاری تورکیا دەست بەجێ دوای گەڕانەوەی لە کۆبوونەوەی پەیمانی باکوری ئەتلەسی (ناتۆ) لە واشنتۆن، داوای کرد حیزبە سیاسیەکان بگەنە ڕێککەوتنێك لە نێوانیاندا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمار ، ئەگەر چیش ئەو هۆشدارییانەو بانگەوازەکەی ئیڤرین وەك پاساوێك بوو بۆ ئەنجامدانی کودەتای سەربازی ، وەلێ هەواڵی ئەو کودەتایەی حکومەتی دیمیراڵی لابرد، لە واشنتۆنەوە هات نەوەك لە ئەنکەرەوە، ئەوەبوو ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا بەر لەوەی ڕاگەینراوی ژمارە (١) لە ڕادیۆی تورکیاوە دەربچێت هەواڵی کوودەتاکەی بڵاوکردەوە چاودێرانی سیاسی مەسەلەکەیان - وا لێکدایەوە کە ئەو کودەتا تورکیە بەرەزامەندییەکی ئەمەریکایی – ئەتلەسی – بەرپابووە. بەلەروانگەی پرەنسیپی ترۆمان کە لەساڵی ١٩٤٧ جاڕدرا.

کورد لەهەمبەر ئەو کودەتایەگەشبین بوو و پێیان وابوو مزگێنی دیموکراتی و چارەسەری تەواوی پێیە بۆ هەموو ئەو کێشانەی ناوچەی ڕۆژهەلاتی تورکیا بەدەردیانەوە دەناڵێنێ ، بۆیە کاتێك کەنعان ئیڤرین ی سەرکردەی کودەتاکە سەردانی وان و دیاربەکری کرد بەگەرمیەوە پێشوازی لێکراو چەپڵەیەکی زۆریشیان بۆ بوڵەند ئۆلسۆ ی سەرۆکی حکومەتەکەی لێدا وەختێ هاتە شاری هەکاری کە کەوتۆتە هەژارترین ناوچەکانی تورکیاو لەنێوان عێراق و ئێراندایە ، بۆئەوەی ئێزگەیەکی پەخشی تەلەفزیۆنی تیادا بکاتەوە (٩/١٠).

کورد کە هیوای لە هەر گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی حکومەتی تازە بیکات بڕی، بە تایبەتی دوای وتارەکەی ئیڤرین لە دەستپێکی ساڵی ١٩٨١ کە تیایدا گوتی : "هەموو بیرێکی جودا خوازی بەبێ بەزەییانە پێشێل دەکەین"، (٧/١٤) ، ئاژاوە لە ناوچەی ڕۆژهەلاّت بەردەوام بوو و خەباتی چەکداری کوردیش لە دژی هێزەکانی ئاسایشی تورکیا لەوێ سەری هەڵدایەوە، مایەی سەرسوڕمان بوو بەلای ژەنەڕاڵە سەربازیەکانەوە ببینن ئۆپۆزسیۆن لق و پۆپێکی زۆرو تۆڕەکانی

تیرۆریش له چەندین بەشی ڕۆژهەڵاتی تورکیا — بە وتەی گۆڤاری الصیاد — بڵاو بوونەتــەوە بــە نموونە : لەمیانەی پرۆسەیەکی ئەمنی لە دژی بزووتنەوەیەکی جودا خوازی بەناوی (کاوە) وە کــە مەڵبەندەکەی لە (ئەدەنە ) و (مەرعەش) بــوو ، پیــاوانی ئاســایش لــە نیســانی ســاڵی ۱۹۸۱ بەڵگەنامەی چەند پلانێکیان بە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵــەتی کــوردی لــە چەشــنی مارکســی دۆزیەوە و سوپای تورکیاش دەستی گرت بەسەر بڕێکی ئێجگار زۆر لــە چــەکی شــاردراوەو فــرە کتێب و بڵاوکراوەی کوردی و دروشم بە ئاڵای دەوڵەتی کوردی جودایشەوە (۳٦/۱۳).

ئەگەرچی شۆڕشەکانی کورد چ بەشێوەیەکی تاکی یا بەشێوەی کۆمەڵ و گرووپ گرووپــی بچووك لە حەفتاکانەوە بەبێ بڕانەوە بەردەوام بوون ، وەلێ ڕێکخستنەکانی چەپیش دەورێکــی گەورەیان گێڕا بۆ گردبوونەوەی کۆمەڵە کوردیە بچووکەکان و هاندانیان بەرەو کاری خــەبات ، بەتایبەت دوای کودەتای ۱۲ ی ئەیلولی ســاڵی ۱۹۸۰ و پێگەیشــتنی زەمینــەی گونجــاو بــۆ دروستبوونی بزووتنەوەیەکی کوردی جەماوەری لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە سۆنگەی ئــەو بارودۆخە ناوخۆیی و دەرەکییانەی هاتبوونە پێشەوە. دەبینــی لەســەر ئاســتی نــاوخۆی وڵات کودەتای ۱۲ ی ئەیلولی ساڵی ۱۹۸۰ ڕووی دا و توانی خوێن ڕێژی و شەڕی ناوخۆو ململانێی نێوان چەپ و ڕاست لە تورکیا بوەستێنێ ، یاخود بەلایەنی کەم سەر لــەنوێ تەقینــەوەیان بــۆ ماوەیەکی دیارینەکراو دوابخات. لەســەر ئاســتی دەروەشــدا ئــەوە ئــەزموونی ئۆتۆنــۆمی لــە کوردستانی عێراق — وێڕای کەم و کوڕیەکانی — لە گۆڕدایەو ســەرنجی ڕۆشــەنبیرانی کــوردی ڕادەکێشاو هانی دەدان بەرەو خــەبات لــەپێناو داوای مــافی نەتــەوەیی کــورد لــە تورکیــا — بەتایبەت (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) یش وێڕای ئەو شەڕی عێراق- ئێــران هەڵایســا بوو — ئەویش تێدەکۆشا بۆ وەدەستهێنانی جۆرە ئۆتۆتنۆمییەك بۆ کوردستانی ئێران .

دوای کودەتای ۱۲ ی ئەیلولی ساڵی ۱۹۸۰ زۆربەی بزووتنــەوە نهێنییــە شۆڕشــگێڕەکانی تورکیا چالاکیەکانیان بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات گواستەوە بۆ ئەوەی دوور بن لەچاوی دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێم و چاودێری توندیان لەلایەك و هەروەها بــۆ هەماهــەنگی پرۆســەی خــەبات لەگەڵ بزووتنەوەی کورد لەلایەکی تر .

واقیعی تورکیای نوێ ، بەرەی سۆشیالیستی لە سێ بزووتنەوەی یەك ئامانج گرتــە خــۆ ، ئەویش ، دەستەبەرکردنی دیموکراتی ڕاستەقینە لە تورکیا دوور لە زاڵبوونی عەسکەرتاریەت و ڕاست و هزری فاشیزم ، لەکاتێکدا ئەو بزووتنەوانە خەباتی چــەکدارییان کــردە شــێوازێك لــە خەباتی ڕزگاری خوازی دیموکراتی. بەش بــەحاڵی بــەرەی ڕاســتی نەتــەوە پەرســتیش ، ئــەوە

کەوتبووە کۆکردنەوەی پاشماوەی هێزو هـەوادارانی خـۆی پاشـی ئـەو گـورزە گرانـەی حیزبـی بزووتنەوەی نەتەوەیی لە ئایاری ساڵی ١٩٨٠ بەری کەوت کاتێك (کۆن سازاك) ی جێگری ئەم حیزبە لەپێش ماڵەکەی لە ئەنکـەرە کـوژرا (٤١/١١)، گـورزێکی گـرانیش بـوو بـەلای دوو جەمسەرەکەی نزیك بەرەکە ، حیزبی داد بە سەرۆکایەتیی سلێمان دیمیرال کە سوپا بـۆ جـاری دووەم لە کورسی دەسـەلات دەیهێنێتـە خـوارێ ، لەکاتێکـدا دەنگـۆی ئـەوە بلاوبـۆوە کـە کودەتاکەی ١٢ ی ئەیلولی سـالی ١٩٨٠ بـۆ ئـەوە ڕووی دا سـنوورێك بـۆ ئـەو هەلکشـانە ئیسلامییە دابنێ کە حیزبی سەلامەتی نیشتیمانی بە ڕابەرایەتی نەجمەدین ئەربەکان کۆمەکی دەکرد لـەپێناو دامەزرانـدنی دەولـەتی ئـاینی لـە تورکیـا ، بـەلام ئـەو سـێ بزووتنەوەیـە سۆشیالیستیە نهێنیەی کە ناوچەی ڕۆژهەلاتیان لە سـالی ١٩٨١ کـردە مەلبەنـدی خۆیـان ، بریتی بوون لە :

### ١- حیزبی کۆمۆنیستی شۆڕگێڕی تورك (TOKP).

ئـەم حیزبـە بـەپێی بۆچـوونی ڕۆژنامـەی فیگـارۆ – پەیوەنـدیی پتـەوی لەگـەڵ حیزبـە کۆمۆنیستە ڕۆژئاواییەکاندا هەبووەو کۆمەك و یارمەتیی زۆری لێیان وەردەگرت ، بەتایبـەت لە حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنسا تاوەکو بتـوانێ چالاکیەکانی بـەڕێوە ببـات ، ئـەو حیزبانـە ئامرازو پێداویستیەکانیان بۆ ئەم حیزبە دابین دەکرد بۆ وروژاندنی ئاژاوەو هەرا... بـەلام ئـەم ئامرازو پێداویستیانە بەشی ئەوەیان نەدەکرد شەپۆلی تیرۆر لەسـەر گۆڕەپـانی تورکیـا بـەبێ هەبوونی فاکتەری بابەتیانە بووروژێنن ، دەبینـی دواکـەوتنی زۆرو پەرەسـەندنی بێکـاری و ڕەوشی سەختی ئابووری لەناوچـەی ڕۆژهـەلات (کوردسـتانی تورکیـا=وەرگێڕ)، یـەکێك لـەو فاکتەرانەیان پێکدەهێنا (١١/١٥).

یـەکێتی لاوانـی شـیوعیی تـورك TQKB بـە مەچـەکی پـۆلاینی سـەربازی حیزبـی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕی تـورك دادەنـراو گرنگـی بـە بـارودۆخی تورکیـا دەداو ڕەخنـەی لـە هەلەکانی یەکێتی سۆڤیەت دەگرت ، لێرەشەوە لەگەل ئەو حیزبە شـیوعیە تورکیـە نهێنییـە جیابوو کە بارەگای لە ئەلمانیای ڕۆژهەلات و هاوپەیمان بوو لەگەل مۆسکۆ و پڕوپاگەنـدەکانی لە ئێزگەی ڕادیۆی بەناو (ڕادیۆکەمان) لەو وولاتەو لەگەل ئێزگەیەکی بەهێز کـەرەوە کـە لـە بولگاریا بوو ، بەرنامەکانی بـۆ تورکیـا پـەخش دەکـرد ، لەگـەل حیزبـی شـیوعی لادێیـی کرێکارانی تورك TIKP ) یشدا کە بڕوای بە مارکسیزم و ماویزم هەبوو هێرشی دەبردە سـەر

یەکێتی سۆڤیەت و بە ئیمپریالیزمی سۆڤیەتی – ڕێك وەك ئیمپریالیزمی ئەمریکی، وەسفی دەکرد جیابوو .

حیزبی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕی تورك لە ساڵی ١٩٨٣ لەگەڵ حیزبی کرێکاران و جوتیاران یەکی گرت و بەهەردوکیانەوە حیزبی یەکێتی شیوعیە تورکەکانیان TBKP پێکهێنا ، هەرچەندە (٣٠) ڕێکخراوی دیکە بەناوی چەپی تورك هەبوون هەموویان لەسەر شانۆی سیاسی تورکیا تێدەکۆشان .

**٢– بزووتنەوەی چەپی شۆڕشگێڕ (Dev-Sol ) :**

ئەم بزوتنەوەیە بە واریسی هەموو ئەو بزوتنەوە چەپە شۆڕشگێڕانە دادەنرێ لە ساڵەکانی حەفتا لە تورکیا سەریان هەڵدا و بڕوایان بە خەباتی چەکداری هەبوو ، وەك حیزبی ڕزگاریی میللی تورکیاو بزووتنەوەی لاوانی شۆڕشگێڕ ، کە لەپاش کودەتای ١٢ ی ئەیلولی ١٩٨٠ یەکیان گرت و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی شۆڕشگێڕ(DKH) یان پێکهێنا. ڕێکخراوی ڕێگای شۆڕشگێڕی دایك Ana-Dev-Yol هێزی سەربازی گورز وەشێنی ئەم ڕێکخراوە بوو ، کە لەچەند شارێکی وەکو ئەستەموول ، ئەنکەرە ، ئەزمیر ، ئەدەنە) چالاکی دەنواند.

ئەگەرچی ڕێکخراوی چەپی شۆڕشگێڕ بەشێوەیەکی بەرچاو لەناو زانکۆکاندا تێدەکۆشاو سیاسەتی (لێدەو ڕاکە) ی پیادە دەکرد ، کەچی ڕێکخراوی ڕێگای شۆڕشگێڕی دایك چالاکی شۆڕشگێڕیی لەنێو کرێکاران و جوتیاران و فەرمانبەران و سەربازیەکاندا ئەنجام دەدا. ڕێکخراوەکە لەساڵی ١٩٨٢ ژمارەیەکی زۆریان لێ دەستگیرکرا بەتۆمەتی چەپ و لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵیش ٧٢٣ کەسیان ڕەوانەی پێش دادگای سەربازی لە ئەنکەرە کران بەتۆمەتی ئەندام بوونیان لەناو بزوتنەوەی چەپی شۆڕشگێڕ و کردەوەی دزی و تاڵان و هەڵکوتانە سەر ماڵ و موڵکو هاویشتنی نارنجۆك و پشت بەستن بە هێز بۆ گۆڕینی سیستمی دەسەڵات لە تورکیا (١٩/١٦). لەکاتێکدا تاوەکو ئێستاش[٩] دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئەستەموول دەڕوانێتە ئەو داوایەی لە ساڵی ١٩٨٢ ەوە لە دژی (١٢٤٣) کەس بەرزکراوەتەوە بەتۆمەتی دزی و زەوت کردن و هەڵکوتانە سەر ماڵ و موڵکی دەوڵەت و کوشتن و تیرۆر ، لەنێوانیاندا (سینان گونول) ی سەرۆکی ڕێکخراوی چەپی شۆڕشگێڕە (١/١٧).

---

٩- مەبەستی سەرچاوەکە : سەرەتای ساڵانی (٢٠٠٠)ە. (وەرگێڕ)

### ٣- بزوتنەوەی کورد :

لـە پـاش کودەتـای ١٢ ی ئـەیلولی سـاڵی ١٩٨٠ بزوتنـەوەی کـورد لـە تورکیـا تووشـی هەڵتروشکانێك هات لە سۆنگەی ڕێ و شوێنی ئەمنی توندو ئەو پشکنینە بەردەوامانـەی یەکـە سەربازییەکان لەناوچەی ڕۆژهەلاّت گرتبویانە بەر ، سەرەڕای جاڕدانی قەدەغەکردنی هاتووچـۆی شەوانەو گرتنی ڕەمەکییانە بە کەمترین شك و گومان کردن لـەهاوکاری کردنـی دانیشـتوان لـە بزوتنەوەکە ، بەلاّم وێڕای هەموو ئەو ڕێکارە ئەمنی و سەربازیانەش کۆمەڵێکی کوردی بـەناوی (کاوە)وە لە بەیاننامەیەکـدا کـە لـە ١٦ ی کـانونی دووەمـی سـاڵی ١٩٨٢ دەرچـوو ەو بـلاّو کراوەتەوە تیایدا هاتووەو دەڵێت ، ئەندامەکانی لە شەڕو پێکدادانێکدا لەگەڵ هێزەکانی تورکیـا لەناوچەی (تۆنجەلی= دەرسیمی پێشوو) توانییان ١٢ سەربازی تـورك بکـوژن و (١٨) سـەربازی دیکەش بریندار بکەن ، لەناو کوژراوەکاندا سێ ئەفسـەر هـەن ، یـەکیان بـە روتبـەی رائیـد و دووەمیان بە روتبەی نەقیب و سێهەمیشیان بە روتبەی مولازمە ، بەیاننامەکە سوپای تورکیای تۆمەتبار کردووە بەئەنجامدانی ڕەشە کوژییەك لە دژی کـورد لـە ناوچـەکە و (٤) کەسـیش لـە ئەندامانی کۆمەڵی ناوبراو کوژراون ، دوای ئەمـە سەرچـاوە ڕەسمیـەکانی تورکیـا لـە ئەنکـەرە بلاّویان کـردەوە کـە کاربەدەسـتانی تـورك سـکرتێری گشـتی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان و (٦٤)کەس لە ئەندامانی حیزبەکە دەسـتگیر کـردووە کـە لـە ڕۆژهـەلاّتی تورکیـا لـە میانـەی هەڵمەتێکی پشکنینی ڕێك و پێك و بەردەوام لە دژی ئەو حیزبـە قەدەغـە کـراوە ئەنجامـدراوە. سەرچاوەکان وتیشیان پتر لە ٤٠٠ ئەندامی حیزبەکە لە گرتوخانەدان پێشتر گیراون و ماوەی (٩) مانگە لە دیاربەکر لە ڕۆژهەلاّتی تورکیا بە تۆمەتی بانگەشە کردن بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتی کوردی سـەربەخۆو تۆقانـدنی لادێیـەکان و کوشـتنی ٢٤٣ کـەس دادگاییکردنیـان بەردەوامـە (١٨/ئەلبوم) ، دوای تێپەڕ بوونی (٢) ساڵ بەسەر دەسـتپێکی دادگـاییکردنی ئـەو کوردانـە ، دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە دیاربەکر بڕیاری دا بە لە سـێدارەدانی (٣٥) کـوردو بەنـد کردنـی ژمارەیەکی زۆریان بۆماوەی دوورو درێژ و ئەوانی تر بەبێ تاوان ئازاد کران (١٩/ئەلبوم).

چالاکیەکانی بزووتنەوەی کورد لە تورکیا لە میانەی ئەو دوو ساڵەدا بەهۆی ناکۆکیـەکانی نێوان خۆیان و فرەیی بیرو بۆچوون ، بریتی بوون لـە شـەڕو پێکـدادانی بچـووك لێرەولـەوێ و هێرشبردنە سەر ئۆتۆمۆبیلی گواستنتەوەی هەناردەی تورکیا بەرەو ئێران ، یاخوود هێرشکردنە سەر شەمەندەفەری ئازووقەو دەورییە سەربازییەکان. ئەم کردەوانە پاڵیـان بـە دەسـەلاّتدارانی تورکەوە نا چەکی ئاسمانی لە دژی بزووتنەکـە بـەکاربهێنن ، لـەو دەمـە سەرچـاوەکان ڕایـان

گەیاند ، هێزێکی ئاسمانی تورکیا کە پێکهاتووە لە (٢) یان (٣) فڕۆکەی جەنگی ، (٨) هێرشی ئاسمانی کردۆتە سەر چەند مۆڵگەیەکی کوردە جودا خوازەکان لەهەردوو ناوچەی مەهابادو سەردەشت لەنزیك سنووری نێوان ئێران و عێراق (٢/٢٠)، جەنەراڵ (کەنعان ئیڤرین) یش لە میانەی وتارێکی دا لە شاری (مانیسە) تەئکیدی کردەوە کە ڕێکخراوە تیرۆرستیەکان بەرەو هەرەس هێنان دەڕۆن پاش ئەوەی هێزەکانی تورکیا توانی دەست بگرێ بەسەر چەك و تەقەمەنیەکانیان کە بەهایان دەگاتە نزیکەی (٢٥ ) ملیۆن لیرەی تورکی (٣/٢٤).

دادگای عورفی ئەنکەرە ، بڕیاری دابوو بە سەپاندنی حوکمی بەند کردن بۆ ماوەی (٢) ساڵ (٣) مانگ بەسەر بەڕێز (شەرەفەدین ئاڵچی ) ئامۆزای (سەعید ئالچی) ناوە نهێنیەکەی شوان بوو سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا پاش ساڵی ١٩٦٨ و وەزیری نیشتەجیێ و ئاوەدانکردنەوەی پێشوو بەتۆمەتی‌ئەنجامدانی چالاکی کوردی و یارمەتیدانی بزوتنەوەی جوداخوازی کورد ، لەکاتێکدا هێزەکانی ئاسایشی تورکیا ٢٣٣١ کەسیان لە ڕێکخراوی پێشمەرگەی APO ی کوردییان دەستگیر کرد و پاشان دادگای عورفی دیاربەکر حوکمی لە سێدارەدانی بۆ (٩٧) کەسیان دەرکرد (٣/٢٤).

ئەو ڕێکخراوە کوردیانەی لەو دەمەدا لە کوردستانی تورکیا چالاکییان ئەنجام دەدا پێکهاتبوون لەم حیزبو ڕێکخراوانەی لای خوارەوە :

أ- پارتی کرێکارانی کوردستان PKK : ساڵی ١٩٧٨ دامەزراو چەندین کادری حیزبی کرێکارانی تورکیا TIP، دوای کودەتای ١٢ ی ئەیلوولی ١٩٨٠ هاتنە نێو ریزەکانییەوە ، سەرەتا ئەم پارتە حیزبێکی بچووك و چالاکیەکانی سنووردداربوون بەلاّم پاش ساڵی ١٩٨٤ و کاتێك بەشێوەیەکی باش توانیی بە ڕابەرایەتیی عەبدوڵلاّ ئۆجەلان خۆی ڕێك بخات ، کۆمەڵێکی زۆر لە گەنج و لاوانی کوردی بۆلای خۆی ڕاکێشا .

ب- ڕێکخراوی کرێکاران و جوتیارانی کورد لە تورکیا TIKKO : ئەم ڕێکخراوە درێژە پێدەری حیزبی کرێکاران و جوتیارانی تورك TIKP بوو ( باڵی چینی ماوی حیزبی شیوعی تورکیا) .

ڕێکخراوی TIKKO بانگەشەی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە تورکیا دەکرد ، عادل شاهین کە یەکێك بوو لە کادیرانی ئەم ڕێکخراوە لە میانەی دادگاییکردنەکەیدا لە ئەستەموول گوتی : شەڕی تۆڵەسەندنەوە لە هێزەکانی ئاسایشی تورك تەنها ئەو کاتە ڕادەوەستێ دەوڵەتی سەربەخۆی کورد دابمەزرێ (١١/٢١).

زۆربەی کادیرانی ڕێکخراوەکە دواتر چوونە ناو پارتی کرێکارانی کوردستانەوە.

ج- حیزبـی سۆشیالیسـتی شۆڕشـگێڕی کوردسـتان PSSK : سـاڵی ١٩٨٠ پێکهـات و ڕێکخراوی کاوە وەکو باڵی سەربازی حیزبەکە وابوو کە بڕوای بە مارکسیزم هەبوو ، بـەڵام لـە نیسانی ساڵی ١٩٨١ گورزێکی گەورەی بەرکەوت ئەو دەمەی دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێمی تورك کادیری پێشکەوتووی حیزبیان دەستگیر کرد و لە نێوانیانـدا (حەسـەن ئەسـغەر)ی سـکرتێری گشتی حیزبەکە بوو ، ناوبراو حـوکمی ئەبـەدی تـا هـەتایی بەسـەردا سـەپێنرا (٥٠/٣١) ، حەسەن ئەسغەر لە گرتووخانەی عەلەمداغی نزیك شاری ئەستەموڵ لە ساڵی ١٩٨١ بەچـاوی خۆی بینیبـووی چـۆن چـۆنی گوللـەبارانی بەندیـەکانیان دەکـرد و (٣) کەسـیان لێ کوشـتن. نووسەری کورد خاتوو (ڕەوشەن سونبول ئۆغلۆ) ئەم ڕووداوەی کرد بـە ڕۆمانێـك لـە شـێوەی لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆژنامەوانی و دواجار لە پێشبڕکێی ئەدەبی (یونس سـانە) ی سـاڵی ١٩٨٩ خەڵاتی دووەمی بەرکەوت (٥٠/٢٢).

بەڵام حیزبی سۆشیالیستی شۆڕشـگێڕی کوردسـتان لـە دوای سـاڵی ١٩٨٢ دوو بـەرەکی سەری تێکردو کۆمەڵێك لەو کادیرانەی بڕوایان بـە هـزری سۆشیالیسـتی نـەبوو ، حیزبێکـی تازەیان درووست کرد بەناوی (پارتی بوژانەوەی کـورد KAJIK بانگەشـەی بـۆ دەوڵـەتێکی سەربەخۆی کورد بەهەرسێ پارچەکانیەوە دەکرد بە ڕێگەی خەباتی چەکداری .

د- حیزبی دیموکراتی کوردستان : ئەم حیزبە لێهاتوویی خـۆی لەسـەر گۆڕەپـانی خـەباتی سیاسـی کـورد سـەلماند ، وێـڕای نـاکۆکی نێـوان ڕیزەکـانی لـە سـاڵانی حـەفتا ، نـەبوونی سەرکردایەتیەکی بەهێزو ڕووکردنی کادیرانی بۆناو حیزبـە کوردیـەکانی تـر ، نـەخوازە بۆنـاو ڕیزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان ، وایان کرد زیاتر ببێتە ڕێکخراوێکی چـەکداری تـاوەك ئەوەی حیزبێکی سیاسی پایە بەرز بێت .

هـ- ڕێکخراوی پێشمەرگە: حوسێن ییلدرم سـەرکردایەتی دەکـرد ، ڕێکخراوێکـی چـەپی کوردی بوو هاوکاری لەگەڵ ڕێکخراوی چەپی شۆڕشگێڕ Dev-Sol دەکرد ، لـق و پـۆپی لـە ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەوروپا وەك بەریتانیا، ئەڵمانیا، سوید کردەوە و بـەزۆری چـالاکیەکانی لەنێو کرێکارانی کورد لە ئەوروپا بەڕێوە دەچوو ، بۆیە شێوازی کارو ئامـانجی لەگـەڵ پـارتی کرێکارانی کوردستان جیابوو ، لەبەر ئەوەش بـوو نـاوە نـاوە هەنـدێ لـە گـرژی و ڕەخنـە و پلارتێگرتنی سیاسی دەکەوتە نێوانیان ، بۆ نموونە ڕێکخراوی APO داوای لە ئەندامانی کرد بۆ زەرورەتی پاراستنی دیسپلین(زەبت وڕەبتی) ڕێکخراوەکەیان چونکە لـەوێ کۆمـەڵێك هـەن بەرگی شۆڕشگێڕییان پۆشیوە بۆ چەواشەکردنی جەماوەر (١١/٢٥).

شایەنی گووتنە ئەم ڕێکخراوە کوردییانە ئەندام بوون لەناو (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) کە بارەگاکەی لە لەندەن و هەموو بزووتنەوە کوردیەکانی لە ڕۆژهەلاٚتی ناوەڕاست گرتبووە خۆ ، جگە لەوە ژمارەیەکی زۆریش لە نووسەرو ڕۆژنامەنووسانی پێشکەوتوخوازی تورك و کورد (کۆمەڵەی هاوکاری لەگەڵ خانەوادەی گیراوو مەحکومەکان) یان دامەزراند و بارەگاکەی لە ئەستەمبول و لق و پۆپیشی لەهەموو ویلایەتەکانی تورکیا کردبۆوە ، ئەمە دوای کودەتاکەی ١٢ ی ئەیلولی ١٩٨٠ ڕووی دا ، کۆمەڵەکە هاوکاریشی لەگەڵ کۆمەڵەکانی بەرگری لەمافی مرۆڤ لە تورکیاو مانگی سوری تورکی و ماف پەروەرانی تورك دەکرد لە پێناو پێشکەشکردنی کۆمەك و یارمەتی بە بەندکراوەکان لە تورکیاو بۆ داکۆکی لە مافەکانیان و ئەنجامدانی مانگرتن و ناڕەزایی دەربڕین بۆ وەدەست هێنانی ئامانجەکانی (٣/٢٣).

## سەرچاوەكانی بەشی پێنجەم


١- ئيبراهيم داقوقى : فلسطين والصهيونية في وسائل الاعلام التركية ، بغداد ، ١٩٨٧

2- Aydinlik gazetesi, 24-3-1980.

3- Aydinliksosyalist dergi , yil3,sayi 24,EKim1970.

4- Gunes gazetesi,5-6-1987.

5-Abdi ipekci: Liderler diyorki,istangul 1969.

6- HurrIyet gazetesi, 6-61977.

٧- ڕۆژنامەی (الٚنباو) ی كوەيتی ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٦/٧/٢٩.

٨- گۆڤاری (الوگن العربی ) ژماره ١٤٩ له ١٩٧٩/١٢/٢٧ .

٩- تركيا المعاصرة : لەلايەن كۆمەڵێك مامۆستاوە ، لـەبلاٚوكراوەكانی سـەنتەری لێكۆڵێنـەوەی توركی ، زانكۆی موصلٚ ، دار الحكمة ، موصلٚ ، ١٩٨٧,

١٠- ڕۆژنامەی (الأنباء) ی كوەيتی ، ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٠,/١٢/٣٠

١١- گۆڤاری (الوطن العربي) ژماره ١٧٧ له ١٩٨٠,/٧/١٥

12- Abdi Ipekci semineri, Turkiyede Teror, Gazetecilr Cemiyeti.

١٣- گۆڤاری الصياد )ی لوبنانی ژماره ١٩٠١ له ١٩٨١/٤/١٠.

١٤- ڕۆژنامەی (الوحدة) زەبيانی ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٣,/٦/١٦

١٥- ڕۆژنامەی (الأنباء) ی كوەيتی ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٤,/١٢/٢٤

16- Hurriyet gasetesi 20-7-1989.

17- Tercuman gasetesi 10-6-1990

18- Hurriyet gasetesi 6-1-1990.

١٩- ڕۆژنامەی (اليوم) دەمام له ١٩٨٢/١/١٧.

٢٠- ڕۆژنامەی (الوگن) ی كوەيتی ، ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٤,/٨/٨

٢١- ڕۆژنامەی الجمهورية ، القاهرة ، ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٤,/٣/١٢

22- Hurriyet gasetesi 14-12-1989

23-edogru dergisi,sayi44: 29Ekim 1989-2000.

24- Cumhuriyet gasetesi, 27-12-1989

25- Hurriyet gasetesi ,8gun,5-4-1981

26- Hurriyet gasetesi , 21-2-1989.

ئەو تاقمە سەربازییەی کودەتای ساڵی(١٩٨٠)ی بەئەنجام گەیاند هەزاران کەسی لە نەیار و بەرهەڵستکاری سیاسی و رۆژنامەڤان و ئەندامانی یەکێتیی سەندیکاکانی کرێکارانی شۆڕشگێڕ(Disk) و ئەندامانی(کۆمەڵەی مامۆستایانی شۆڕشگێڕ-Tob-Der=) یان هاویشتە کونجە تاریکەکانی گرتووخانەکانەوە، لە کاتێکدا هیچ تارماییەکی ئەوتۆ لە ئاسۆوە بە دەر نەدەکەوت ئاماژە بەوە بدات کە سەرانی کوودەتاکە ئەو دیموکراتییە پەرلەمانییە دەگێڕنەوە بۆ تورکیا کە سەریان بڕی.

رۆژئاوای ئەوروپایی، بە خۆی و رۆژنامەکانیەوە واقی وڕما و دەهری بوو کاتێك(ئەحمەد ئێسفان ) ی تەمەن ٥٨ساڵ عومدەی پێشووی شاری ئەستەموولّ و هاوڕێی بوڵەند ئەجەوید لە لێدوانێکیدا ئاشکرای کرد کە ئەو لە ماوەی بەندکردنەکەیدا بە دەست و پێی کۆتکراو و چاوی بەستراوییەوە پەیتا پەیتا لێکۆڵینەوەی لەتەکدا دەکراو لەلایەن بەرپرسانی یاسای باری نائاساییەوە ئازارو ئەشکەنجە دەدرا لە حاڵێکدا خۆی و سەدان کەس لەوانەی ئەندام بوون لە Disk فرێدرابوونە بنکە سەربازییەکانی شاری ئەستەموولەوە. رۆژنامەی گاردیان دەڵێت: ئەشکەنجەدانی سەندیکاکاران بۆ ئەوە بوو پاکانەیان پێ پڕبکەنەوە، بەو سیفەتەی ئەندامن لە حیزبی شیوعیی قەدەغەکراو..دوو هەفتەش لەمەوبەر دادگای ئەستەموولّ بڕیارێکی دەرکرد بە دووبارە گرتنی(٢٢٢) سەندیکاکاری(دیسك) بە (ئەحمەد ئیسفان)یشەوە کە هەموویان راستەوخۆ سەر لەنوێ گرتنیان بۆ ئەوە بوو نەبا نهێنی ئازارو ئەشکەنجەدانیان لە بنکە سەربازیەکانی تورك بۆ رای گشتی ئاشکرا بێت..(١/٢٥).

ئەو هەڵمەتە راگەیاندنانەی رۆژنامەگەریی رۆژئاوا لە دژی رژێمی سەربازیی تورك و پێشێلکارییەکانی لە هەمبەر ئازادییە گشتییەکان، بەرپایان کرد و هەروا داواکاریی جەماوەری تورکیا بۆ گەڕانەوە بەرەو ژیانی مەدەنی، وایانکرد: ژەنراڵ کەنعان ئیڤرین بە بۆنەی ئاهەنگەکانی سەری ساڵەوە لە ساڵی١٩٨٢، ئەم لێدوانە بدات: ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی خشتەیەکی زەمەنی داناوە بۆ گەڕانەوە بەرەو ژیانی مەدەنی، بە ئامادەکردنی رەشنووسی دەستوورێکی نوی بۆ وڵات لە کۆتایی هاوینی ئیمساڵ (واتا١٩٨٢) و لە پایزدا راپرسی لەسەر دەکرێ و لە دەستپێکی ساڵی ١٩٨٣ یاسایەکی

تازە بۆ حیزبەکان دادەنرێ، ژیانی سیاسی و پەرلـەمانی لـە وڵـات ڕێـك دەخـات، دوای ئەوەش لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٤هەڵبژاردن بەڕێوە دەچێت بـە ئامـانجی گەڕانـەوە بـەرەو حوكمی مەدەنی.

بەكردەوە، ژەنراڵەكانی سوپای تورك وتەی شەرەفی سەربازی رلستگۆی خۆیان جێ بـە جێ كرد بە گەڕانەوە بەرەو بنكە سەربازییەكان دوای بەرقەرار بوونی ئاسایش لە وڵات و سـەپاندنی دەسـەڵاتی دەوڵـەت و یاسـا بەسـەر هاوڵاتیـانی توركیـا- ئەمـەش هـەمان دەستەواژە بوو كەنعان ئیڤرین لە راگەیەندراوی یەكەمی كوودەتای ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ بەكاری برد- لەوڕا، رەشنوسی دەستوری نوێ ئامادەكراو لە ٧ تشرینی دووەمـی ساڵی ١٩٨٢ خرایە بەر راپرسی جەماوەرەوە، ئەنجومەنی ئاسایشـی نەتـەوەییش لـە ٢٥ نیسانی ساڵی ١٩٨٣ رازی بوو لەسەر یاسای تازەی حیزبـە سیاسـیەكان - كـە ئەمـەش رۆژی وەرگرتنی داواكاری بوو لەلایەن وەزارەتی ناوخۆو بۆ پێكهینـانی حیزبـە سیاسـییە نوێیەكان بە گوێرەی یاسای نوێ قەدەغە بـوو هـیچ كـام لـە ڕێبـەرانی حیزبـە سیاسـیە كۆنەكان تا ماوەی(١٠) ساڵ چالاكی حیزبایەتی ئەنجام بدەن. چەند كۆتبەندییەكی نوێیش دانرا بۆ زامنكردنی رێگرتن لە ململانێی نێوان هەموو ئەو حیزبانـەی لـە سـەر شـانۆی سیاسی سەر هەڵدەدەن و هەروا قەدەغەكردنی گواستنەوەی نوێنەران بۆ ناو حیزبەكانی تر لە كاتی دەستكێشانەوەیان لە حیزبێكی سیاسـی، دەربـرینی بـیروڕای هاوڵاتیـانیش بـە رێگەی كاری حیزبیی رێك و پێكەوە دەبێت بە مـەرجێك لەگەڵ پرنسیپەكانی كەمالیزمدا بگونجێن و نابێت ئیشارە بەسەر سەركردایەتی سەربازی دەسەڵاتدار لە توركیا بكـرێ بـە حیزبە سیاسیەكانی پێشوویشە. یاسای ناوبراو قەدەغـەكردنی كـاری حیزبیشـی سـەپاند بەسەر پیاوانی سەربازی و خوینـدكارو كرێكـار و مامۆسـتاو فەرمانبـەرانی دەوڵـەت و دەستووری نوێ جەختی كردەوە كە ئەركە یاساییەكانی ئەنجومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی توركیا یەكسەر دوای دامەزراندنی قەوارەی گشـتیی ئەنجومـەنی نوێنەرایـەتیی توركیـا كۆتایی دێت و ئەندامانی یەكەمین ئەنجومەن سەرۆكایەتی كۆمار پێك دێنن لە مێژووی هاوچەرخی توركیا و سەرۆكی كۆمار سـەرۆكایەتی دەكـات. هـەروەها دەسـتووری نـوێ ژمارەی ئەندامانی پەرلەمانی لـە(٤٥٠) نوێنـەرەوە كـەم كـردەوە بـۆ(٤٠٠) نوینـەری پەرلەمانی، بێجگە لەوەش دەسەڵاتی دایە سەرۆكی كۆمار بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و داواكردنی بۆ هەڵبژارنی نوێ لە حاڵێكدا ئەگەر تەنگژەیەكی وەزاری روو بدات زیاتر لە

٤٥ رۆژ بەردەوام بێت، ئەم هەنگاوانەش هەموو بە بەربەستێك دانران لە پێش ئازادییە گشتیەکانی وڵات.

ئەنجومەنی ئاسیشی نەتەوەیی تەنها مۆڵەتی بە (٣) حیزب دا بچنە کۆری هەڵبژاردنەوە و (١٢) حیزبی سیاسی لەم پرۆسێسە دوورخستەوە چونکە مەرج و تایبەتمەندی پێویستیان نەبوو! سێ حیزبەکەش بریتی بوون لە: حیزبی دیموکراتی نیشتیمانی بە سەرۆکایەتی ژەنراڵی خانەنشین تۆرگۆت سۆنالب کە ژەنرالەکان راستەوخۆ بشتگیریان دەکرد، حیزبی نیشتیمانی دایك بە سەرۆکایەتی ئابووریزان تۆرگۆت ئۆزال و حیزبی میللی بە سەرۆکایەتی نەجدەت چالپ.

ئەنجومەنی ئەوروپی بە ئەندامبوونی ئەم پەرلەمانە نوێیە چاوەروان کراوەی تورکیای لەناو ئەنجومەنەکەی بەو سیفەتە تورکیا ولاتێکی ئەوروپی و ئەندامە لە پەرلەمانی ئەوروپا-رەتکردەوە، چونکە بریاری دوورخستنەوەی هەندێ لە حیزبەکان لە هەڵبژاردن بریارێکی لایەندار و نا دیموکراتیە.

هەڵبژاردنی نوێ لە تورکیا، سەر لە بەیانی ٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٣ بەڕێوە چوو و دەرەنجامەکانی بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو(١٠٢/١):

١- حیزبی نیشتیمانی دایکی راستی میانڕەو بە(٢١١) کورسی لە پەرلەمان بردییەوە دوای ئەوەی(٢ر٤٥٪)ی دەنگەکانی بە دەستهێنا.

٢- حیزبی میللی هەڵگری بیری چەپی مامناوەند بە(١١٧) کورسی لە پەرلەمان بردییەوە، واتا (١ر٣٠٪) ی دەنگەکان. کورد لایەنگری ئەم حیزبەیان دەکرد، ئەوە بوو لە کۆی (١١ ئەندامی دەستە کارگێرییەکەی(٤) یان کورد و بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆری بە رەگەز کورد ئایدین کووهەن گورگان بوو.

٣-حیزبی نیشتیمانی دیموکراتی راستڕەو بە(٧٠) کورسی لە پەرلەمان بردییەوە پاش ئەوەی(٢ر ٣٢٪) ی دەنگەکانی هێنا

٤- تەنها دوو نوێنەری بێ لایەن لەم هەڵبژاردنانە دەرچوون پاش ئەوەی(٤، ١٪) ی دەنگەکانیان هێنا.

دیارە ئەم دەرەنجامانە مایەی خۆشحاڵی پیاوانی تورك نەبوون، بۆیە دەبینین ژەنراڵ( کەنعان ئیڤرین) ی سەرۆك کۆمار لە وتاری راسپاردنی تۆرگۆت ئۆزال بۆ پێکهینانی یەکەمین کابینەی وەزاریی مەدەنی لە رۆژی چوار شەممەی رێکەوتی ٧ی کانونی یەکەمی

ساڵی ١٩٨٣ جەخت دەکات و دەڵێت: ( نابێ چیتر ئەو هێزە چەکدارانەی کە ڕۆلی خۆیان بینی بۆ گێرانەوەی ژیانی دیموکراتی لە وڵات و ئیستا بەرەو سەربازگاکانیان کشاونەتەوە، ڕووبەڕووی کێشەو گرفت بکرێنەوە، پێویستیشە هەموو دەزگاکانی دەوڵەت لە چوار چیوەی ئەو هاو ئاهەنگییە کار بکەن کە بۆتە خەسڵەتێکی تورکیا پاش بزوتنەوەی ١٢ ی ئەیلوولی ١٩٨٠).

وەلێ، ڕووداوێکی کتوپڕیی تر چاوەڕوانی تورکیای دەکرد کاتێك لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانی (٢)حیزبی ئۆپۆزسیۆنی نوێ کە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێشتر ڕێگەی پێ نەدابوون بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان بکەن، لیرەدا سەرکەوتنیان بە دەستهێنا، ئەو دووحیزبەش: حیزبی سوشیالیستی دیموکۆراتی بەسەرۆکایەتی پرۆفیسۆر ئەردال ئینونۆی کوڕی بچووکی سەرۆکی کۆچکردووی تورکیا عیسمەت ئینونۆ بوو و هاو سۆزیی هەیە لەگەڵ چەپی تورك و ئەویتر حیزبی دەنگی هەق( دواتر بووە ڕێگەی ڕاست) بە سەرۆکایەتی بیلدیرم ئاوچی، پیوەندی پتەوی هەیە لەگەل سەرۆك وەزیرانی موحافیز کاری پێشوو سلێمان دیمیرال. دەرەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی شارەوانیش بەم شێوەیە بوون(١، ١٠٣):

١-حیزبی نیشتیمانی دایك (٥، ٤٥٪) ی دەنگەکانی هێنا.

٢- حیزبی سۆشیالیستی دیموکراتی(٥، ٢٣٪) ی دەنگەکانی هێنا.

٣- حیزبی دەنگی حەق(١٥٪) ی کۆی دەنگەکان

٤- حیزبی میللی (٩) ی کۆی دەنگەکان .

٥- حیزبی دیموکراتی نیشتیمان(٧٪) ی کۆی دەنگەکانی هێنا.

ئەگەر چی بردنەوەی حیزبی نیشتیمانی دایك لەم هەڵبژاردنانەشدا، بەمانای جێگرتنەوەی هاو سەنگی هات لە نێوان هەردوو دەسەلاتی یاسادانان و جێبەجێکاری، بەڵام گەیشتنی هەردوو حیزبی: کۆمەڵایەتی دیموکراتی و دەنگی هەق بەرەو پلە دوو و ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، بە واتا: هەردو حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکەی پەرلەمان، حیزبی دیموکراتی نیشتیمانی و حیزبی میللی، ڕاستگۆیی خۆیان لەپێش پەرلەمان لەدەستدا. سەرەرای ئەوەش بردنەوەی دوو حیزبی ئۆپۆزسیۆن لە دەرەوەی پەرلەمان ئەو شك و گومانانە دەڕەوێنێتەوە کە بەلای هاو پەیمانە ڕۆژئاواییەکانەوە بوون سەبارەت بە هەڵبژاردنەکانی تورکیا کە بە نادیموکراتی و شانۆگەرییەکی ئاشکرایان دانا بوو.

بەڵام، بردنەوەی ئەم دوو حیزبە لەم هەڵبژاردنانەدا، جێگرەوە(ئەرلتەرناتیڤ) بۆ حیزبی نیشتمانی دایك دروست ناکات چ بە لای چەپیەوە بێت یان بەلای راستیەوە، بەڵکو رەنگە ببێتە فاکتەرێکی هاوسەنگی و سەقامگیری لە ژیانی سیاسی تورکیاو لە وەیشوومەی باهۆزی هارو لەو گەمە سیاسیە دیموکراتییە بێهوودەیە بیپارێزێ کە وایکرد رووبەڕووی شەپۆلی توندو تیژی سیاسی و پاشان کودەتای سەربازی بێتەوە. چەسپاندنی سەرکەوتنەکانی (تورگۆت ئوزال) و حیزبەکەشی(حیزبی نیشتیمانی دایك) لەوانەیە باشبوونی پێوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ رۆژ ئاوا- کە لە دوا کوودەتا سەربازییەکە داڕووخان- ببەزێنێ بەرەو رەهەندگەلێکی هەرێمی لە ناوچەی رۆژ هەڵاتی ناوین، لەوڕا لێرە بەدوا دەکرێ پێشبینی ئەو رەهەندە عەرەبی و هەرێمییانە بکرێ کە دەشێ حووکومەتێکی تورکیایی بە هێز لە میانەی پێوەندییە ئیسلامیەکانی و ئەندامبوونی کاریگەری لەسەر هەردوو ئاستی ئەوروپایی و ئەتلەسی بیانگێڕێ(١٠٤/١).

بزوتنەوەی نەتەوەیی گەلی کوردیش لە ساڵی ١٩٨٤ پەرەسەندن گەلێکی گەورەی لەسەر هەردوو ئاستی تورکیا و نێو نەتەوەیی بە خۆوە بینی کەوا لەم سێ باسەی لای پایین لێ دەکۆڵینەوە:

## باسی یەکەم

## ڕێکخستنی نوێی پارتی کرێکارانی کوردستان

ئەو دەمەی حوکمی عورفی لە ویلایەتەکانی هەکاری و سعرت و ماردین لە ساڵی ۱۹۸۳ جاڕدرا، خەباتی چەکدارییی کورد لەو پەری باری لاوازیدا بوو لە سۆنگەی ئەو ناکۆکی و دوو بەرەکییانەی کەوتبوونە جەستەی بزووتنەوەی کوردلە لایەك و لەلایەکی دیکەشەوە جونکە هێزێکی سەربازی گورز وەشێن و سەرکردایەتیەکی بە هێزی نەبوو، بۆیە کار و چالاکیەکانی بزوتنەوەکە لە تورکیا، تەنها بریتی بوون لە هەندێك لەو چالاکییانەی رێکخراوی پارتی کریکارانی کوردستان pkk ئەنجامی دەدان دوای ئەوەی ریزەکانی خۆی کۆکردەوەو چیاکانی (جوودی) ی لە ویلایەتی هەکاریی کە چڕی دانیشتوانی کوردن، کردە مەڵبەندی خۆی.

لە تەمووزی ساڵی١٩٨٤ حسێن ییلدیرم سەرۆکی ریکخراوی پێشمەرگە، هاتە پاڵ پارتی کرێکارانی کوردستان بە سەرۆکایەتی عەبدوڵڵا ئۆجەلان و هەردوو پێکەوە یەکەمین جوڵانەوەی چەکدارییی هاوبەشیان لە ١٥ی ئابی ساڵی ١٩٨٤ ئەنجام دا.

ئەم جووڵانەوەیە لە شێوەی هێرشێك بوو بۆ سەر شارەکانی: شەرناخ و ئارۆخ و شیروان لە ویلایەتی سعرد و شارۆچکەی شەمدینلی لە ویلایەتی هەکاری دوای ئەوەی گشت پێوەندییەکی تەلەفۆنیان لە ناوچەکە بڕی. ئەم پرۆسەیە ناوی لێنرا( تەقە بکەو راکە)،چەند راگەیەنراوێکیشیان بڵاو کردەوە دەستەواژەی(ئەوان لە ناویان نەبردین)یان لەسەر بوو(٨/٣).

ئەم پرۆسێسە هەژانێکی سیاسی و سەربازیی لە تورکیا نایەوە، بەرادەیەك خودی(کەنعان ئیڤرین)ی سەرۆکی تورکیا هاتە شەمدینلی و وتارێکی بڵاوکردەوە. رادیۆی ئەنکەرە گواستییەوە/ گوتی: ئەم کردەوانە لە پیلانێك بەو لاوە هیچی تر نین، دەسەلاتەکانی بیانی دایانڕشتوون، ئامانجیان دابەش کردنی تورکیایە بەرێگەی هەندێك لەو ناپاکانەی بۆ دەرەوەی وڵات هەڵاتوون و دەستیان خستۆتە ناو دەستی بێگانەوە بە خەیاڵی خاویان دەیانەوێ تورکیا بگێڕنەوە بۆ بارودۆخی پێش کوودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠، بەڵام ئێمە لێرەوە جاڕ دەدەین دەوڵەتەکەمان بە هێزەو خۆی نادا بەدەست تاقمە تیرۆریستیەکانەوە..،(١٩/٤). ئەگەر چی ئیڤرین لە وتارەکەیدا ناوی ئەو هێزە بیانیانەی نەهێنا کە هاوکاریی شۆڕشگێرانی کورد

دەکەن، وەلیّ رۆژنامەی(حورییەت) ی تورکیایی زۆر بەروونی چەختی کردەوە کە مەبەست لەو هێزانە، سوریاو لیبیایە(١٩/٤). سوپای حەوتەمی تورك کە لە رۆژی جاڕدانی حوکمی عورفییەوە لە ساڵی ١٩٨٣ بارەگاکەی لە دیار بەکر بوو، لە ٢٠ ی ئابی ساڵی ١٩٨٤، هەڵمەتێکی سەربازی فراوانی بەناوی پرۆسەی(هەتاو) لە ناوچە شاخاویەکانی سێگۆشەی(هەکاری- سعرد-ماردین)لە دژی شەرکەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان ئەنجامدا( دوای ئەو کردەوەیەی چەنگاوەرانیpkk بە هاوبەشی رێکخراوی پێشمەرگە ئەنجامیان دا). ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی سوپای تورك پەلیان هاویشت بەرەو دەرەوەی سنوورەکانی تورکیا بۆ ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران و باکووری عیراق. لەم لایەنەوە راپۆرتەکان ئاماژەیان دا کە هێزەکانی تورکیا بە قووڵایی ٢٢ کیلۆ مەتر چوونەتە نێو خاکی ئێران و بە هەمان مەوداش چوونەتە قووڵایی خاکی عیراق(١/٥) و بەرەزامەندی هەردوو حکومەتی ئێران و عێراق (٦/٨) چونکەpkk توانیویەتی چەند سەربازگەیەك بۆ مەشق و راهێنانی جەنگاوەرانی لە گوندە کوردنشینەکانی ئێران و عیراق دابمەزرێنێ لە کاتێکدا هێزەکانی سووریاش بە هاوکاری لایەنە پێشکەوتووخوازەکانی بزوتنەوەی بەرگری لوبنانی لە ناوچەی(بیقاع) لە لوبنان مەشقیان پێ دەکەن. جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان کە لە سووریا مەشق دەکەن و ژمارەیان دەگاتە نزیکەی(٥٥٠) جەنگاوەر، لە رێگەی (ماردین) ەوە بەرەو تورکیا دزە دەکەن ئەو جەنگاوەرانەشیان کە لە عێراقن و ژمارەیان(٤٠٠) کەسە لە رێگەی(هەکاری) یەوە دێنە ناو تورکیاوە، کەچی ئەوانەش لە ئێران مەشق دەکەن و ژمارەیان(٤٥٠) جەنگاوەرە لە رێگەی(وان) ەوە دزە دەکەن(١٩/٧).جەنگاوەرانی pkk دوای ئەنجامدانی کردەوە سەربازییەکانیان لە دژی هێزەکانی سوپای تورك و پارێزەرانی ئاسایش لە ناوچەی شەڕگەکاندا پەنا دەبەنە بەر گوندە کوردنشینەکان لە باکووری عیراق و رۆژئاوای ئێران، پاشان هەر لەو رێگایانەوە کە ئاماژەمان پێدان- و بست بە بستی شارەزان، جارێکی تر دەگەڕێنەوە بۆ ناو خاکی تورکیا.

دوای ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییە فراوانەی هێزە سەربازییەکانی تورك‌و جەندرمەو هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ بە هاوکاری کۆپتەری جەنگی ئەنجامیان دا، (٤٥) جەنگاوەریان کوژران و (٨٦) کەسی دیکەشیان رەوانەی دادگای سەربازی لە دیار بەکر کران، سەرەڕای گلدانەوەی٦٧٢ هاوڵاتی کورد کە تۆمەتبار کرابوون بە یارمەتیدانی پارتی کرێکارانی

کوردستان و حەوانەوەیان، یان بە تۆمەتی بانگەشەکردن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی و کوشتنی(٢٩) کەس لە هێزەکانی ئاسایشی تورکیا.

کاربەدەستانی تورك هەڵمەتێکی توندیان دژی ئەوانەی ناویان لێنابوون تیرۆریست و خەڵکێکی زۆریان دەستگیرکرد، دەست پێکردبوو دواییش ژمارەیەکی زۆریان لێ ئیعدام کردن و گرتووخانەکان پر بوون لەو کەسانەی کە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەی پۆلیس و سوپادا بۆ ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی دادگایکردن بوون، دەسەڵاتدارانی فەرمی دانیان نا بە بوونی(٣٥) هەزار بەندکراو لە گرتووخانەکانیان(٣٣/١٠).

لە سونگەی هەموو ئەم بارە نا ئاساییانەدا (١٢٦٤) نووسەرو هونەرمەندو رۆژنامەڤان و پارێزەر و مامۆستای زانکۆ، لە دەستپێکی ساڵی ١٩٨٤ یاداشتێکیان بۆ بارەگای سەرۆکایەتی کۆمار بەرز کردەوە، تیادا داوایان کرد بەزەروورەتی مومارەسەکردنی تەواوی دیموکراتی لە تورکیاو گۆڕینی ژمارەیەك لە بەندەکانی دەستووری نوێ و هەڵوەشانەوەی ئەو رێ و شوێنانەی دژ بە دیموکراتین و هیشتا لە تورکیا کاریان پێ دەکرێ ئەگەر چی لەتشرینی دووەمی ساڵی(١٩٨٣) وە، وڵات گەڕاوەتەوە بۆ حوکمی مەدەنی(٢٥٤/٨).

پارتی کرێکارانی کوردستان لە دوای ساڵی ١٩٨٥ ناوچەی هەکاری و دەوروبەری کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن و چواریەکی کوردی تورکیا پێکدێنێ و ناوچەیەکی سەخت و قایمە و پڕە لە رێڕەوی چیایی کە تیادا دەکرێ تەنها جەنگاوەرێك رووبەڕووی تیپێکی سەربازی بێتەوە، کردە مەڵبەندی چالاکییەکانی، لەپاشان ئەم پارتە لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات کەوتە کۆکردنەوەی ریزەکانی خۆی بەم شێوەیەی لای خوارەوە:(٩/سەرچاوەی هەمە لایەن)

یەکەم- رێخکخستنی ناوخۆی پارتی کرێکارانی کوردستان:

لە ٢٦ هۆبە پێك هاتبوو،گرنگترینیان:

١- کۆمیتەی پروپاگەندەو بڵاوکردنەوە، ئەرکی ئەم کۆمیتەیە دەرکردنی رۆژنامەی(سەربەخۆییبوون) ە کە بە شێوەیەکی رێك و پێك و بەردەوام لە ساڵی(١٩٨٥)ەوە، دەردەچێت.

٢- هۆبەی رێکخستنی گوندەکان: یەکێك لە کادیرانی حیزب ئەرکی کۆمیساری سیاسی هەر گوندێك دەگرێتە ئەستۆ کە لە ژێر دەسەڵاتی حیزبەکەدایە و ئەو کادیرە وەك دادوەری سەربازی دادەنرێ بۆ گوندەکان لە چوارچێوەی ناوچە رزگارکراوەکەدا.

٣- هۆبـــەی ناوچـــەی ئـــازاد: پـــارتی کرێکـــارانی کوردســـتان، ئـــەو ناوچـــەیەی شارۆچکەکانی:(ئولودەرەو ماڵی لاوان لە ویلایەتی هەکاری و ئیروح و شیرناك و بـەرواری لـە ویلایەتی سعرد و سیلوپی و (جزیرەی ئیبن عومـەر) لـە ویلایـەتی مـاردین) ی گرتۆتـە خـۆ بەناوچەی کوردنشینی رزگارکراوی دادەنێت کە ملکەچی دەسـەلاتی ناوەنـدیی تورکیـا نیـە. پارتەکە ئەم ناوچەیەی دابەش کردووە بۆ (٣) بەش و هەر یەك لە(نیزامەدین و ئیبراهیم قلـیج و ساری سنان)ی بە دادوەر لەسەریان داناوە.

٤- کۆمیتەی ریکخراوە پیشەییەکان.

٥- کۆمیتەی رێکخراوە کرێکارییەکان.

٦- کۆمیتەی رێکخستنی شارە گەورەکان: ئەم کۆمیتەیە ئەڵقـەی پیوەندییـە لـە نێـوان سەرکردایەتی pkk و ئەو رێکخراوە چەپانەی لە شارەکان کار دەکـەن و هاوسـۆزییان لەگـەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان هەیە، کۆمیتەکە هەروا تێدەکۆشـی بـۆ پەیـدا کردنـی دۆسـت و لایەنگر و ئەندامی نوێ لەناو لاوان و قوتابیان بە ئامانجی هاتنیان بۆ رێزەکانی pkk.

رۆژنامەکانی تورکیا ناوە ناوە هەوالی گرتنی ژمارەیەك لە جەنگاوەرانی بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان لە شارە گەورەکانی وەك: ئەنکەرە، ئەسـتەموولّ، ئیـزمیرو ئەدەنـە لـە لایەن دەزگاکانی ئاسایشی تورکیاوە بڵاو دەکەنەوە، هەرچەندە ئەو شـارانە دوورن لـە بازنـەی چالاکیەکانی حیزبەکەوە. بۆ نموونـە رۆژنامەی(حوررییـەت) لـە ١٦ ی مایسـی سـالّی١٩٩٠ هەوالّی دەستگیرکردنی (١٩) کەسی لەئەنکەرە بڵاو کردەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجـەکانی ئـەم کۆمیتەیە تێکۆشاون.

دووەم / ریکخستنی دەرەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان:

حسێن ییلدیرم وتەبێژی فـەرمی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان بـوو لـە ئـەوروپا، بـەڵام ناکۆکییەك لە نێوان خۆی و سەرۆکی حیزب( عەبدڵلآ ئوجەلان) رووی دا و لەم ئەرکە دەسـتی کێشـایەوە و رازی بـوو سـەرکردایەتیی رێکخسـتنی دەرەوەی pkk بگرێتـە ئەسـتۆ. ئـەم رێکخستنە پێکهاتووە لـە(١٣) هۆبـە هـەموو جیهـانی گرتۆتەوەـ پایتەختـەکانی دەوڵەتـە گەورەکان و ئەو دەوڵەتانەی وەك بەشێك لە مافی مرۆڤ بایەخیان بە کێشەی کـورد داوە- ئـەو هۆبانەش بریتین لە هۆبەکانی: فەرەنسا، بەریتانیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەکێتی سۆڤێت، نەمسا، ئەڵمانیای فیدراڵ، ئیتالیا، دانیمارك، سوێد، نەرویژ، هۆڵەندا و سویسرا.

پارتی کرێکارانی کوردستان لەگەڵ هەردوو ڕێکخراوی: یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کە بارەگاکەی لە (لەندەن)ە هەروەها لەگەڵ ئینیستیتۆتی کورد لە پاریس و پەیمانگەی لێکۆلینەوەی کورد لە بەرلین هاوکاری دەکات.

ئەگەر چی (ئۆپەراسیۆنی هەتاو) کە لە دژی pkk پراکتیزە کرا بە بەکار هێنانی سوپای(٧) ی تورك و تا ساڵی ١٩٨٥ درێژەی کێشا، بەڵام حکوومەتەکەی تورگۆت ئۆزال کە لە ساڵی ١٩٨٣ بەدواوە بووە سەرۆك وەزیران- خۆی لە قەرەی باسکردنی ئاژاوەی بەربڵاوی ناوچەی ڕۆژهەڵات نەدەدا کە بووبووە گۆرەپانێکی ڕاستەقینەی شەڕ و پیکدادان تیادا پتر لە (١٥٠) هاوڵاتی کورد و تورك تیاچوون، بەعومدەی شاری دیاربەکریشەوە کە بە دەستی چەند چەکدارێکی نەناسراو تیرۆر کرا(٣٩/١١). حکوومەتی ئوزال لە ١٥ حوزەیران، پرۆژە یاسایەکی بەرز کردەوە لە پێناو دانی دەسەلاتێکی زیاتر بە دەزگای پۆلیس بە حونجەتی کۆتاییپێهێنان بە باری نا ئاسایی وەك پاساویك بۆ بریار دان لەسەر یاسای ناوبراو کە بە گوتەی ڕۆژنامەی (حورییەت) هەموو چالاکییەکی هونەری و ڕۆشنبیری و بۆنەیەکی خۆش دەبی پێشوەخت مۆڵەتی پۆلیسیان لەسەر وەربگیرێ، جاڕدانی بریار دان لەسەر یاسای نوێ هاوکات بوو لەگەڵ ناردنی هێزی سەربازی گەورە بەرەو هەرێمەکانی باشور و ڕۆژهەلات کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن، تەنانەت هیچ گومانێك لەوەدا نەبوو کە( تورگۆت ئوزال) ی سەرۆك وەزیران بەو کارە دەیەوێ دەولەتێکی پۆلیسی لە جێی دەولەتی نا ئاسایی دابنێ- بەوتەی نوینەرێکی ئۆپۆزسیۆن لە پەرلەمانی تورکیا- پاش ئەوەی دەسەڵاتی پۆلیس پەلی هاویشت بۆ سەر ژیانی تایبەتی خەڵکی، سەرباری ژیانە سیاسی و کۆمەلایەتی و دیموکراتییەکە لە تورکیا بە تایبەتی لە ناوچەکانی باشوورو ڕۆژ هەڵات لەوێ کە سەرکوتکردن و ستەم زیاتر لە هەموو شوێنێکی تری ئەم وڵاتە چۆکی داداوە بەسەر دانیشتوانەکەیدا.

پارێزەری بەرەگەز کورد(سیراجەدین قایا) ی بەرگریکار لە گیراوە سیاسیەکانی کورد، باس لەوە دەکات چۆن و بەچ شێوەیەك هێزە نیزامییەکانی تورك بەژمارەی یەجگار زۆر وزیاد لە ژمارەی دانیشتوانی ئەم گوندە کارەساتبارە یان ئەویتریان جارێك بەتۆمەتی جودا خوازی و جارێکیشیان بە تۆمەتی کۆمۆنیستییەوە ئابلوقە دەدەن. بە نموونە لە١٩ ی شوباتی ساڵی ١٩٨٥ دادگای سەربازی حوکمی لە سێدارەدانی بەسەر (٢٢) کەس لە ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان سەپاند بە عومدەی شاری دیاربەکریش تەنها لەبەر ئەوەی بە (زمانی کوردی قەدەغەکراو) لەگەڵ هاوڵاتیانی شارەکەدا قسەی کردووە، بەپێی یاسای

ژماره(۲۹۳۲)كه له ١٦ ی تشرینی یه‌كه‌می ۱۹۸۳ ده‌رچووه، تووشی به‌ند كردن بوو، سه‌ره‌رای ئه‌وه‌ش ده‌بینین(تورگۆت ئوزال) سه‌رۆك وه‌زیرانی توركیا له‌ لێدوانیكیدا له‌۱۹ ی حوزه‌یران ده‌ڵێت: له‌توركیا نه‌ كێشه‌یه‌ك هه‌یه‌ به‌ناوی كێشه‌ی كورد، جیاوازی هه‌یه‌ له‌ نێوان كورد و توركدا(۲۹/۱۱). له‌ ساڵی ۱۹۸۵ سه‌دان رۆڵه‌ی كورد ره‌وانه‌ی دادگای سه‌ربازییه‌ عورفییه‌كان كران، ده‌بینی دادگای سه‌ربازی دیاربه‌كر له‌كۆی (۳۰۳) تۆمه‌تباری كورد، حوكمی له‌سێداره‌دانی بۆ(۲۹) كه‌سیان ده‌ركرد، له‌كاتێكدا دادگایه‌كی سه‌ربازی له‌ ئه‌ده‌نه‌ رۆژی ٢٤ی حوزه‌یرانی هه‌مان ساڵ كۆتایی هێنا به‌ كێشه‌ی(۳۹) هاوڵاتی كورد، ژماره‌یه‌كیان حوكمی له‌ سێداره‌دانی به‌سه‌ریاندا سه‌پاند و ژماره‌یه‌كی دیكه‌شیان به‌ كاری دژوار. له‌و لاشه‌وه‌ دادگای پێداچوونه‌وه‌ی سه‌ربازی تورك له‌ ئه‌نكه‌ره‌ی پایته‌خت پشتگیریی له‌ بریاری حوكمی له‌ سێداره‌دانی ده‌رهه‌ق به‌(٥) ئه‌ندامی پارتی كرێكارانی كوردستان كرد(۱۰/۱۳). زۆربه‌ی گیراوه‌ كورده‌كان له‌ گرتووخانه‌یه‌كی سه‌ربازی له‌ دیاربه‌كر توند كران، له‌وێ ژماره‌یه‌كیان له‌و ساڵه‌دا پێشتر له‌خواردن مانیان گرت وه‌ك نارِه‌زایی ده‌ربرینێك به‌رامبه‌ر به‌ ئه‌شكه‌نجه‌دان و مامه‌ڵه‌ی خراپی كاربه‌ده‌ستان و رووداوی دڵته‌زێن یان رووداوی مردنی ناو گرتووخانه‌كه‌(۸/١٤).

نووسه‌ری كورد( ئومێد زیلتلی) كتێبیكی به‌ ناونیشانی(بكوژه‌) بڵاو كرده‌وه‌ تیادا باسی له‌و پیشێلكاری و زوڵم و ئه‌شكه‌نجه‌دانه‌ كردووه‌ كه‌ سه‌ربازانی تورك له‌دژی خه‌ڵكی بێ دیفاعی پارێزگای تونجلیی كوردنشین له‌ سه‌روبه‌ندی ساڵی۱۹۸۵-۱۹۸٦ ئه‌نجامیان داوه‌، له‌وێ به‌كه‌مترین گومان كوردیان ده‌گرت و رایانده‌گواستنه‌وه‌ به‌ بیانووی حه‌وانه‌وه‌ی پێشمه‌رگه‌كانی پارتی كرێكارانی كوردستان یاخود یارمه‌تیدانیان، كاتێكیش له‌ده‌ستی سه‌ربازه‌كان له‌ ترساندا رایانكردبا ده‌ستبه‌جێ ته‌قه‌یان لێ ده‌كردن(٦٨/۲۲).

رابه‌رانی حیزبه‌كان-ئه‌و حیزبانه‌ی كه‌ رابه‌ره‌كانیان چالاكی سیاسییان تا ساڵی۱۹۹۲ لێ قه‌ده‌غه‌ كرابوو- جارێكی تر چالاكانه‌ گه‌رانه‌وه‌ سه‌ر شانۆی سیاسی توركیا دوای ئه‌و لێبوردنه‌ی حكوومه‌تی ئوزال له‌ ساڵی ۱۹۸٦ ده‌ریكرد به‌ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی مه‌رسوومی ژماره‌(٤۲). ده‌بینین( سلێمان دیمیراڵ)ی رابه‌ری حیزبی داد سه‌ردانی هه‌موو ناوچه‌كانی توركیای كرده‌ له‌ میانه‌ی سه‌ردانه‌كانی چاوی به‌ هه‌واداراانی خۆی كه‌وتو به‌ ئازادانه‌ له‌گه‌ڵیاندا قسه‌ی كرد پاش ئه‌وه‌ی به‌ گه‌رمیی له‌ هه‌موو شوێنێك پێشوازی لێكرا.. سه‌ردانه‌كه‌ی ده‌ریخست دیمیرال هێشتا رۆڵێكی به‌ هێزی هه‌یه‌ له‌ژیانی سیاسی توركیادا، بۆیه‌ زۆر به‌ خێرایی

گەڕایەوە سەر رێبەرایەتیی حیزبی(ریگای راست) کە یەکێك لە هاوەڵە پێشووەکانی لە ساڵی ١٩٨٣ دایمەزراندبوو. دووهەمین جەمسەر کە گەڕایەوە ناو کۆڕی چالاکیی سیاسی، بۆلند ئەجەویدی رابەری حیزبی گەلی کۆماری بوو، ئەجەوید گوزارشتی لە چەپی مامناوەندو موحافیزکارە عیلمانییە تەقلیدییەکان دەکرد رەتی کردەوە حیزبی رووبەرووبوونەوە دابمەزرێنیو رازی بوو تەنها رابەرایەتی حیزبی چەپی دیموکرات بکات کە خاتوو(رەهشان) ی خێزانی بە هاوکاری هەوادارانو لایەنگرانی ئەجەوید لە ساڵی(١٩٨٥) دایمەزراند، ئەجەوید(٤) کەڕەت رەوانەی دادگا کرابوو بە تۆمەتی پێشێلکردنی حورمەتی ئەو یاسایەی قەدەغەی کردبوو سەرۆکانی حیزبە سیاسیە هەڵوەشاوەکان لێدوانی سیاسی بڵاو بکەنەوە.

بەڵام گەڕانەوەی ئەو دوو رابەرە بۆ ناو گۆرەپانی سیاسی تورکیا، هیچ دستپیشخەرییەکی پیێ نەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە ناو کۆڕو ناوەندە سیاسیەکانی تورکیا، بۆیە عەبدوڵلا ئۆجالان سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە لێدوانێکیدا بۆ گۆڤاری(بەرەو ساڵی ٢٠٠٠) گوتی: من پێم وانیە کێشەی کورد لە تورکیا بەرێگەی پیاوانی سیاسی یان رابەرانی حیزبە سیاسیەکانەوە چارەسەر بکرێت، چونکە ئەوان زۆر لەوە لاواز ترن بێچگە لەوە ئەوانیش دژایەتیمان دەکەن وەك چۆن رژێمی دەسەڵاتداری تورکیا دژایەتیمان دەکات(٢١/٢٠).

ناوندە سیاسیەکانی تورکیا بەرامبەر بەهەڵوەشانەوەی بەشێك لە حوکمە عورفییەکانی ساڵی ١٩٨٦ لەلایەن حکومەتی ئوزالەوە گەشبین بوون. وێرای هیشتنەوەی ئەو حوکمانە بەسەر (٦) ویلایەتی کوردنشین لە رۆژهەلات: سعرد، ماردین، دیار بەکر، بدلیس، مووش. بەڵام ژمارەی ئەو ویلایەتە رۆژ هەڵاتییانەی یاسای حوکمی عورفییان بەبریاری ژمارە(٤١٣) لە ١٨ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧ گرتەوە، گەیشتە(١١) ویلایەت، ئەمانە بوون: هەکاری، سعرد، ماردین، دیاربەکر، بدلیس، مووش، وان، بینگول، ئادی یامان، عەزیز(ئازینگ)و تۆنجلی(دەرسیمی پێشوو) بوون، کە(٦) ویلایەتە کەی یەکەمیان کران بە یەك پارێزگا ناویان لێنا پارێزگای ناوچەی حوکمی عورفی و (خەیری قۆزاقچی) یان تیادا بە پارێزگار دانا بۆ ئەوەی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی یاسا نائاسایيەکان وبڕگە یاساییەکانی حوکمە عورفییەکان بکات لەو ناوچانە وەك هەوڵێك بۆ کپکردنی بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان . بڕیاری ناوبراو دەسەڵاتێکیی زۆری دایە پارێزگاری حوکمی عورفی لە روی سانسۆر و پشکنین و گواستنەوە و راگواستن لە چوارچێوەی ویلایەتەکە یان لە دەرەوی بە شێوەیەکی کاتی یان هەمیشەیی و دەزگا پێوەندارەکان پێویست بوو لەسەریان بەبێ دوا کەوتن جێبەجێی

بکەن،مادەی(٥) یشی تاکیدی کردە سەر پێکهینانی دادگـا تایبەتیـەکانی بـەناو دادگاکـانی ئاسایشی دەوڵەت کـە ئـەرکیان تەماشـاکردنی کێشـەکانی ناوچـەی حـوکمی عـورفی و ئـەو ناوچەکانی ترە کە پارێزگار پێی وایە مەترسییان هەیە بۆ سەر ئاسایش و سیستەمی گشتی لە ناوچەی حوکمە عورفییەکان(١١/١٦).

ئەو هێزە سەربازی و چەکدارییانەی لە پارێزگای حـوکمی عـورفی لـە رۆژهـەڵات مۆڵیـان خواردبوو بریتی بوون لە(٣) تیپی سەربازی لە(٦) ویلایەتەکەی یەکەم و بە زۆری لە ویلایەتی دیاربەکر دامەزرابوون، نزیکەی (١٥٠) هەزار سەرباز لەگەڵ لیوای جەندرمەی ٢٣ی سنوور و (٦) فرۆکـەی کۆپتـەری جـەنگی و چـەندین زرێپـۆش سـەرِرای ١٧ هـەزار لـە پارێزگـارانی گوندەکان، ئەمانە بە یاسای (هەموار کردنی یاسای پاسـەوانانی گونـدەکان ژمـارە(٤٤٢) ی ساڵی ١٩٨٧) پێکهینرابوون. بە پێی یاسـاکە حکوومـەت ئـەو کوردانـەی سـەر بـە پـارتی کرێکارانی کوردستان نین یان سەر بە بزوتنەوە کوردییەکانی تر نـین لـەم تیپانـە بەمـەعاش و مووچەی باش-نزیکەی نیو ملیۆن لـیرەی تـورکی، واتـە بەمووچـەی دەرچـووانی زانکۆکـانی تورکیا- دادەمەزران و ئەرکیان چاوساغی لەشکری تورك بـوو لـە کـردەوە سـەربازییەکانیان، جگە لەوەش پاسەوانێتیی گوند و لادێیـەکان و رەزو باغـەکانیان لـەکاتی ئاسـاییدا دەگرتنـە ئەستۆ(٥/١٥).

ژەنراڵ(ئیسماعیل سەلەن) سەرکردەی هێزە سەربازییەکانی ناوچەی حوکمی عورفی بـەلێنی دا لەماوەی (٨٤)رۆژدا لە زستانی ساڵی ١٩٨٨، بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردسـتان لـە ناو دەبات.

بەڵام (٦) مانگ دوای کردەوە سەربازییەکانی لە دژی کورد و پاش ئـەوەی (٦٩) کـوژراو لە هێزەکانی کەوتنەوە دانی بەسەرنەکەوتنی خۆی دانا، لـە سـونگەی ئەمەشـدا حکومـەتی ئەنکەرە برِیاری دا بە گواستنەوەی بـۆ وەزیفەیـەکی مـەدەنی ژەنـراڵ (حیکمـەت کوگـال) ی سەرۆکی دەزگای تویژینەوە ستراتیژییەکان و مێژووی جەنگ لە سەرۆکایەتی ئـەرکانی گشـتی لە جێی ئەودا کردە سەرکردەی گشتیی ناوچەی حوکمی عورفی لە رۆژهەڵات(١٩/٧).

بۆ داپۆشینی ئەو نوشوستییە سەربازییە ئوزال لـە لێدوانیـدا لـە بـەردەم رۆژنامەنووسـان گوتی: رێکخراوی پارتی کرێکـارانی کوردسـتان لـە دەرەوەی وڵاتـەوە هـاتوون و یارمـەتی و کۆمەکی دارایی لەچەندین وڵاتی بیانیەوە وەردەگـرن(١٩/١٧) لەولایشـەوە(خەیری قۆزاقچـی ئۆغلۆ) ی پارێزگاری حوکمی عورفی لە لێدوانیدا لە پێش رۆژنامەنووسان، گوتی: ئێمە هیشتا

کۆنترۆڵی ناوچەی (بۆتان)مان نەکردووە(١١/١٨) ئەو ناوچەیەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان بە ناوچەیەکی کوردیی رزگار کراوی دادەنێن لە تورکیادا و ناوچەیەکی شاخاوی فرە سەختەو دەکەوێتە سێگۆشەی لای بەیەکگەیشتنی سنووری(عیراق-سوریا-تورکیا). لەوڕا بەیاننامەی پارتی کرێکارانی کوردستان لەبارەی ناوچەکەوە دەڵێت: بۆتان و چیای جوودی ئەمێستا بە خاکی نیشتیمانی رزگارکراوی خۆمان دەژمێردرێن. پارتەکەمان پارتی کرێکارانی کوردستان بە خەباتی بێوچانی لە میانەی شەش ساڵی رەبەق و بەشەڕی رزگاریخوازی میللی، توانی دەسەڵاتی دادوەری خۆی تیادا بنیات بنێ(١٩/١٩)

رۆژنامەی (سەربەخییبوون)ی ئۆرگانی پارتی کرێکارانی کوردستانیش، وتارێکی بڵاو کردبۆوە بە ناونیشانی(سەرهەڵدانی نوێ لە جودی) تیادا باسی لەهەمان بارودۆخ کردووە و دەڵێت: جودی یەکێکە لە قەشەنگترین و رازاوەترین چیاکانی ناوچەکەمان، سنووریکی سروشتیی لە نێوان سیلووپی و جزیرە و شیرناك هەیە، لێرەشەوە پێگەیەکی گرنگی لە خەباتی نەتەوەیی رزگاریخوازیماندا پێکهێناوە لە سۆنگەی شوێنە ستراتیژی و دیموگرافییەکەیدا. لە باکوری رۆژهەڵاتەوە بەستراوە بە کوردستانی باشوور کە داگیرکەران دابەشیان کردووە بەهەمان شێوەی دابەش کردنی گەلەکەمان. جا لەبەر ئەوەی (جودی) دەکەوێتە شوێنی بەیەکگەیشتنی خالی سنووری نێوان تورکیاو سوریاو عێراق، ئەوا گرنگیەکەی لە خودی ئەم خاڵە سەرچاوەی گرتووە..)(١/٢٠)

## باسی دووەم

## هزرڤانانی تورك سەرلەنوی کیشەی کورد لەسەر گۆڕەپانی سیاسی دەهورووژێنن

ناوەندە رۆشـنبیری و سیاسـییەکانی تورکیـا لـە سـاڵی ۱۹۸٦ بـەو پـەری خۆشـحاڵی و دۆستایەتییەوە پێشوازییان لە گۆڤاری(بەرەو ساڵی ۲۰۰۰) کرد، چونکە لەرووی لێتوێژینـەوە و لێکۆڵینەوەکانی، گۆڤارێکی بابەتی و بژاردەیەك لـە تێکۆشـەرانی تـورکی خـاوەن بـیروڕای سۆشیالیستی نووسینیان تیادا بڵاودەکردەوە، بۆیە هەر لـەژمارەی یەکەمیـەوە هـەموو ئـەو روناکبیرانەی لەدەوری خۆی کۆ کردەوە کە گرنگییان دەدا بە کاروباری گۆرەپـانی سیاسـی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری لەتورکیا، بە شێوەیەك لە ماوەیـەکی کەمـدا وایلێهـات بەلای رۆشنبیرانەوە هامتای نەبێت. سەرەرای بایەخدانی چڕو پڕیشـی بـە کاروبـاری ناوچـەی رۆژهەڵاتی تورکیا، ئەم گۆڤارە ناوازەیە لە ژمارەی(۳۲) یەوە کە لە ۹ی ئـابی سـاڵی ۱۹۸۷ دەرچووە دەستیکرد بە ئەنجامدانی راپرسییەك لە نێو بیرمەندانی تورك سەبارەت بـە کێشـەی گەلی کورد لە تورکیا بەم مانشێتە هورووژێنـەرەی کـە دەڵێت(رێگـە چـارەی گـەلی کـورد-بڕیاری دژوار) بۆ ئەم راپرسییەش هەر یەك لەم هزرڤـان و هونەرمەنـدو نووسـەرانە وەڵامیـان لەسەر داوەتەوە: عەزیز نەسین سەرۆکی سەندیکای نوسەرانی تـورك، نووسـەر محەمـەد عـەلی ئیبار سەرۆکی پێشووی حیزبی کریکارانی سوشیالیستی. بیرمەند موراد بلکـەە، هونەرمەنـد ئیمیل غالب ساندالچی، نووسەر ئەغور موجۆ، هونەر مەند یەلماز ئوسولوار، نووسەر ئەحمـەد ساربو مەحموود ئالتوون ئاقار. هەموو ئەو بەرێزانە جەختیان کردەوە کـە کـورد لـە تورکیـا بوون و زمانی تایبەتی بەخۆی و کلتووری تایبەت و بونی نەتـەوەیی خـۆی هەیـە و پێویسـتە کێشەی کورد پێش هەموو شتێك بەرێگەی دانپێنان بە بوونی نەتەوەیی ئـەم گەلـە چارەسـەر بکرێت ودوایەش مافی رۆشنبیری و پەرلەمانیی لە چوارچێوەی یەکێتیی تورکیـا بـۆ فەراهـەم بێت. ئەم وەڵامانە لەلایەن رۆناکبیران و تویژەرەوانی تورکەوە وەك تەقینەوەیـەك وابـوو لـەناو ناوەندە کۆنە پەرست و رەسمیەکانی تورکیا. بۆیە دامو دەزگا ئاسایشییەکانی تورکیا دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکە لە بـازار، دوای ئـەوەش هـەردوو نووسـەری ناوداری چەپ: عەزیز نەسین و محەمـەد عـەلی ئیبـار درانـە دادگـای ئاسایشـی دەوڵـەت لـە

ئەستەموولْ سەرەرای فاتیمە یازجی بەرێوەبەری بەرپرسی نووسینی گۆڤارەکە بە پێی بڕگە(٣) ی مادەی(١٤٢) لە یاسای سزاکانی تورکیا بە تۆمەتی تێکدانی ریزی نیشتیمانی و لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتی، ئەمە لە رۆژی٢٥ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٧ روویدا، بەڵام دادگای ناوبراو لەهەمان رۆژ بڕیاری دا کە ناشێت هەموو ژمارەکانی گۆڤاری(بەرەو ساڵی ٢٠٠٠) کۆبکرێتەوە یاخود قەدەغە بکرێ، بەش بەحاڵی وەڵامەکانی بیرمەندانی تورکیش، ئەوا ئەو مەسەلەیەی بەتاوانێك نەزانی یاسا سزای لەبارەیەوە دەربکات، بۆیە ئەو کیشەیەی هەواڵەی پسپۆریکی یاسایی کرد بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە ئایا وتاری گۆڤاری ناوبراو هیچ پروپاگەندەیەکی تێدایە بۆ کێشەی کورد یان نا(٤٣/٢٣).

ئەگەر چی دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئەستەموولْ بڕیاری بێتاوانی بۆ عەزیز نەسین و محەمەد عەلی ئیبار لەو تۆمەتەی رووبەرویان کرابۆوە، دەرکرد، وەلێ گۆڤاری (بەرەو ساڵی ٢٠٠٠) لە ژمارە ٣٥ ی رۆژی ٣٠ ئابی ١٩٨٧ بۆمبیکی تری لە بارەی هەمان کێشە تەقاندەوە ئەویش: کاتێك نووسەری کورد(مووسا عەنتەر) توانی ئەو دیکۆمێنتە مێژووییە بدۆزیتەوە کە تاکید دەکاتە سەر ئەوەی مستەفا کەماڵ بەبۆنەی ئازادکردنی شاری ئەزمیز لە کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی لەشەوی ١٦-١٧ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ گرێی دابوو- واتا بەر لەجاڕدانی کۆماری تورکیای تازە دامەزراو- بە ئامادەبوونی سەرنووسەرانی رۆژنامەکانی ئەو دەمە کە بریتی بوون لەم ئەدیب و نووسەرە ناودارانە: عەدنان ئادیوار، خالیدە ئەدیب، سوبحی نووری، فالح رفقی، یەعقوب قەدری و ... هتد، لەوێ بەڵێنی دا ئۆتۆنۆمی بدرێ بە کوردی تورکیا. ئەم بەڵێنەی مستەفا کەماڵ وەك وەڵامێك بوو بۆ ئەو پرسیارەی (ئەحمەد ئەمین) ی سەرنووسەری رۆژنامەی (کات) کە داوای لێکرد رای خۆی لەبارەی کێشەی کورد روون بکاتەوە، مستەفا کەماڵ لە وەڵامدا دەڵێت : ((کیشەی کورد بەلای ئێمەوە-ئێمەی تورك- ئەو کێشەیە نیە زیان بە بەرژەوەندییەکانمان بگەیەنێت، چونکە ئەو تۆخمە کوردەی لە ناو ولاتەکەماندان، لە زۆر ناوچە بە چری دانیشتوون، وەلێ لە شوێنەیلی دیکەش بە تێکەڵاوی لەگەڵ تورکدا دەژین، بۆیە ئەگەر بمانەوێ هێلێکی جیاکەرەوە لە نێوان کورد و تورك دابنێین، ئەوە بەو کارەمان تورکیاو تورك لە بوون و وجوود دەسڕینەوە، چونکە ئەم هێڵە- گەر ویستمان ناوچەی کورد دیاری بکەین - پێویستە روو بکاتە ئەرزروم و ئەزربایجان و سیواس و خەربووت پێویستیشە ئەو کوردانەی لە ئاقاری( قۆنیە) دەژین بەهەند وەربگرین. بۆیە ناکرێ وێنای کورد بەدەر لە تورك بکەین، نەخوازە یاسای تەشکیلاتە

بنەڕەتییەکان (واتە: دەستوور) دان بە دامەزراندنی جۆرێك لە ئیدارەی ناوخۆیی دەنێت،لەم حالەتەشدا ئەو لیوایەی زۆرینەی کوردە ئۆتۆنۆمی پێ دەدرێ، چونکە کە دەڵێین گەلی تورکیا، ئەوە(کۆڕی نیشتیمانی گەورەی تورکیا) (وات پەرلەمان= وەرگێڕ) ئیمڕۆ لە نوێنەرانی کورد و تورك پێکهاتووە، ئەم دوو نەتەوەیە کەوا بەرژەوەندییەکان و چارەنووس لەگەڵ یەکتردا گرێی داوە، چونکە هەردووکیان دەزانن ئەمە چارەنووسی هاوبەشیانە بۆیە سنووردانانی نێوانیان کارێکی دروست نیە)) (١١/٢٤).

ئەو دەمەی دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئەستەمبووڵ بڕیاری بێتاوانیی بۆ(موسا عەنتەر) دەرکرد لە تۆمەتی بڵاو کردنەوەی پڕوپاگەندە بۆ کێشەی کورد لەبەر ئەوەی رووداوەکانی کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی مستەفا کەمال بڵاوکردەوە سەبارەت بە کێشەی کورد و بڕیاری قەدەغەکردنیشی لەسەر ژمارە(٣٥) ی گۆڤاری (بەرەو ساڵی ٢٠٠٠) کە ئەو دیکۆمێنتەی بڵاو کردەوە، هەڵگرت، ئەوە بوو گۆڤارەکە دووبارە دوکیۆمێنتەکە و حوکمی بێتاوانی گۆڤارەکەی لە ژمارە(٤٦) ی رۆژی ٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٨ و بەم مانشێتە وورووژێنەرە لەسەر بەرگەکەی:(ئەتاتۆرك بەڵێنی ئۆتۆنۆمی بە کورد دەدات) بڵاو کردەوە، نەك هەر ئەوە بەڵکو لە هەمان ژمارەش راپرسییەکی لەنێو کۆڕی مێژووی تورکی پێشوو و دواتر رێکخست سەبارەت بە راستی ئەو دیکۆمێنتەو هۆی بڵاوکردنەوەی لەو کتێبەی بەناوی(نوتق) ەوەیە و گوتارەکانی مستەفا کەماڵ و دیکۆمێنتەکانی شەڕی رزگاریخوازی میللی لە خۆ گرتووە، لەبارەی ئەم پرسەشەوە پرۆفیسۆر(یەشار یوگل) سەرۆکی ئێستای کۆڕی مێژووی تورك لە وەڵامدا بە تاکیدەوە دەڵێت(نێوەڕۆکی ئەو دیکۆمێنتە راستەو رۆژێك دوای کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی مستەفا کەماڵ، لە رۆژنامەکان بڵاوکراوەتەوە. بەڵام بەرپرسانی پێشووی کۆڕ هەم دیکۆمێنتەکە و هەم چەند بەڵگەنامەیەکی تری لە کتێبەکە دەرهێناوە، وەك نیازێك-چۆن دەڵێن-لە دڵی یاقووبدایە..))

کەچی پرۆفیسۆر( شەرەفەدین تۆران) سەرۆکی پێشووی کۆری میژووی تورك لە وەڵامی راپرسیەکەدا دەڵێت: ئەو دیکۆمێنت و بەڵگەنامانەی خاتوو ئاری بۆ چاپکردنیان لە کتێبی(نوتق) ی مستەفا کەماڵ کۆی کردبوونەوە، لەسەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپاو کۆشکی کۆمارییەوە پێمان گەیشتوون، ئەو دوو لایەنە پێشتر ئەو بەڵگەنامانەی دەخرێنە ناو کتێبەکەوە بژارکردووە....)) زیاتریش لەسەری دەڕوا و دەڵێت: من بە بۆنەی یادەوەریی سەد ساڵەی لە دایکبوونی مستەفا کەماڵ لە ساڵی ١٩٨١ پێشنیارم کرد بەبێ هەڵاوێردە-

استپناو- هەموو ئەو دیکۆمێنت و بەڵگەنامانەی پەیوەستن بە کلتووری مستەفا کەماڵـەوە، بڵاو بکرێنەوە))(١٣/٣٤).

سێیەمین و دواتـرین بـۆمبی گۆڤاری(بـەرەو سـاڵی٢٠٠٠) لـە مـەڕ کێشـەی کـوردەوە، گەیشتنی نووسەری کورد دوغۆبیرنجیك بوو بەرەو قەڵا سەختەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە چیاکانی جودی-ئارارات- و دیداری لەگەڵ عەبدوڵڵا ئۆجەلان سـەرۆکی حیـزبو پرسـیاری دەربارەی خەباتی گەلی کورد لە تورکیا بۆ سەلماندنی بـوونی نەتـەوەییان و هەڵوێسـتی هێـزە سیاسییەکانی تورکیا و ناوەندە رەسمیەکانی بە سوپاشەوە، سەرەڕای راو بۆچوونی سەبارەت بـە دوا رۆژی خەباتی کورد لە تورکیا؟

عەبدوڵڵا ئۆجەلان زۆر بە راشکاوی و بـە وردی و بـڕوا بـە خۆبـوون و بـە سـەرکەوتوویی کێشەکە، وەڵامی پرسیارکانی(دوغۆ بیرنجیك) ی دایەوە.. پاش ئـەو پێشـوازییە سـەربازییە گەرم و گوڕ و شکۆدارەی لە ناوبراو کرا لە لایـەن هێـزە کوردیـە چـەکدارەکانەوە بـە چـەکی سەرشانیان و بە ئاڵای کوردیی سەربەخۆ کە لەسەر چـەکەکانیان دەشـەکایەوە پێکهـاتبوو لـە هەردوو رەنگی پرتەقاڵی و شین بە لاکێشەیی و لە ناوەراستی ئەستێرەی سـوور و لـە شـێوەی سێگۆشەیەکی قووچەکی بوو.

بیرنجیك دیدارەکەی لەگەڵ ئۆجەلان لە (٣) ژمـارەی گۆڤارەکـە لـە ژمـارە (٤٢) ەوە کـە لە١٥ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٩ دەرچوو، بڵاو کردەوە. بەڵام ئـەو بەشـەی لـە دوایـن ژمارە، واتە ژمارە(٤٤) کە لە تشـریتی دووەمـی ١٩٨٩ دەرچـوو، وەك بەیاننامەیـەکی سیاسی پارتەکە وابوو بە ناونیشانی( بۆ دەجـەنگین) تیـادا دەڵێـت: (( .. پـارتی کرێکـارانی کوردستان لەپێناو سەلماندنی هەقیقەتی بوونی نەتەوەیی کورد لـە ئـەنادۆل دەجـەنگێت، ئـەو هەقیقەتەی کە پێش ئەوەی تورك بێنە ئەم وڵاتـە و تیـا نیشـتەجێ بـن بـوونی هەیـە-ئێمـە دەمانەوێت ئەو راستیە بۆ ژەنراڵـەکانی سـوپای تـورك و بـۆ رژێمـی پۆلیسـی حـاکم بەسـەر تورکیاوە تاکیـد بکـەین بـە رێگـەی خـەباتی رەوای گەڵەکـەمان کـە بـۆ ئـەو دەسـەڵاتدارە ناواقیعییانە کە لەرۆحی زیندووی سەردەم تێناگەن ‌دەسەلمێنێ کە شەڕی بەناو پیرۆزیان لە دژی گـەلی کـورد لـە ئـەنادۆل شـەڕێکی بێهوودەیـە پـاش ئـەوەی کـورد لـە دەوری بزوتنـەوە تێکۆشەرەکەی کۆبووەوە و بە شێوەیەك ئەو دەسەڵاتدارانە روبـەڕووی ئـەم هەقیقەتـە پەتییـە بوونەتـەوە کـە دەڵێـت: گـەلی خـەباتگێری کوردسـتان- وەك گـەلێکی زینـدوو و ئـازاد دەمێنێتەوە.. ژەنراڵەکانی سوپای تورکیا دانیان بەم راستییەدا نا کاتێـك لـە نێـوان خۆیانـدا

گوتەی سەرۆکەکەیان دووپات دەکردەوە کە دەڵێت: (( ئەوەی ئیمڕۆ لە دژی کورد دەیکەین دوورە لەو دیموکراتییەی بانگەشەی بۆ دەکەین‌و شایستەی مرۆڤی سەردەم نیە، بۆیە دەبێت دان بە بوونی کورد بنرێ وهەندێك لە مافەکانیان بۆ دەستەبەر بکرێ)) لێرەشەوە، من پێم وایە کێشەی کورد لەلایەن پیاوانی سیاسی یان رابەرانی حیزبەکانەوە چارەسەر نابێ، چۆنکە ئەوان زۆر لەوە لاوازترن، بەڵکو لە رێگەی خودی ژەنراڵەکانەوە، نەخوازە سەرۆکانی ئەرکانی گشتی و بەم سیناریۆیە چارەسەردەکرێت: سوپاسالار راپۆرتێك بەرز دەکاتەوە بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی تورکیا تیادا تاکید دەکات تا چ رادەیەك سەرکردەکانی سوپای تورك وەڕس و نیگەرانن چونکە نەگەیشتوونەتە دەرەنجامی هەستپێکراو لە شەڕی دژە کورد، ئەو کات ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییش بابەتەکە تاووتوێ دەکات پاشان هەواڵەی پەرلەمانی دەکات، پەرلەمانیش چەند دانیشتنێکی رووکەشی گرێ دەدات و پاشان بەیاننامەیەك دەردەکات و تێدا چەخت لەسەر بریاری مێژویی خۆی دەکات بە دانی هەندێك لە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد.

سیاسەتمەدارانی تورك و زۆربەی ژەنراڵەکانی سوپاش خەسڵەتی سەرکردایەتیکردنی بوێرانەیان بە لاوە نییە، لەوانەیە یەکێکیان ببێتە سەرۆکی کۆمار یان سەرۆکی وەزیران یان وەزیر، بەڵام لە هەل و مەرجی دژوار، نەخوازە لای کێشەیەکی فرە زیندووی وەکو کێشەی کورد لە تورکیا، نابنە سەرکردەو خاوەنی بڕیار. ئێمە لە دژی دایالۆکی سیاسی نین بەمەرجێ ئەو دایالۆکە سوودبەخش بێت. نەخوازە ئێمە بڕوامان بە بەرپەرچدانەوەی هێز بە هێز نییە. وێڕای ناهاوسەنگی گەورەی نێوان هێزە کێبڕکارەکان، ئەوە ئێمە ناچار بووین چەك هەڵبگرین بۆ بەرگریکردن لە بوون و شەرەف و مرۆیی خۆمان پاش ئەوەی هەم رژێم و هەم ئۆپۆزسیۆن پێیان وابوو چارەسەرکردنی کێشەی کورد تەنها لە رێگای لەناوبردنی کوردەوەو بە لەناوبردنی بزوتنەوە پێشڕەوەکەیان- بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان - دێتە دی، جا ئایە دەکرێ لەوێرا رێگاچارەیەکی سیاسی هەبێت لەحاڵێکدا هەردووکیان(واتا: رژێم و ئۆپۆزسیۆن)بڕوایان بەم چەمکە شۆفێنیستییە قێزەونە هەیە؟ ئەوان خۆیان لە بەکار هێنانی هێز لە دژمان دەستپێشخەربوون، پاشانیش شەڕیان لە دژی ناوچەی کورد جاڕداو ئێستاش بەردەوامن لە سەر درێژەدان بە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان و کردەوەی لەناو بردن و راگواستن و گرتنی لە خۆڕایی و تیرۆر.. جا، چما ئیدارەیەکی وەها و ئەم هزرە نا مرۆڤایەتییە لە مامەڵەکردندا لە ئاخرو ئۆخری سەدەی بیستەم بۆ دەوڵەتێکی وەك تورکیا، کارێکی شیاوو ماقووڵە؟!

ئێمە دانوستانی سیاسی ڕەت ناکەینەوە و لە خەباتی سیاسی خۆمان بەردەوام دەبین تا ئەو دەمەی دەسەڵاتدارانی تورکیا دان بە بوونی گەلی کورد دەنـێن و ڕێـز لـە ویسـت و ئـیرادەی دەگرن لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـیدا و دانـیش بـەو بریـارەی دەنێن کە لە خواست و پێداویستیەکانی گەلی کورد لە وڵاتی ئەنادۆڵەوە سەرچاوەی گرتووە)).

لە وەڵامی پرسـیارێکی تـری گۆڤاری(بـەرەو سـاڵی٢٠٠٠) سـەبارەت بۆچـوونی لەسـەر ئەنجامدانی راپرسییەك لە کوردستانی تورکیا بۆ زانینی داخوازییەکانی گەلی کورد، عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەڵێت:

ئێمە پشتگیری لەو جۆرە راپرسییە دەکەین بـە مـەرجێك پێشـتر ئازادییـە گشـتیەکان و ئازادی کاری سیاسی فەراهەم بن و ئاگربەست لە کوردستانی تورکیا جـاڕ بـدرێ و بەنـدکراوە کوردەکان ئازاد بکرێن و راگوێزراوەکانیش بگێردرێنەوە بۆ سەر شوێنەکانی خۆیان، ئەو کاتـە ئێمەیش هانی گەلەکەمان دەدەین بەشداری لەو راپرسییە بکات لە پێناو بریاردان لەسەر مافی چارەنووسی بە شێوەیەکی ئازادو بەبێ دەستێوەردان، لەم بارەشـدا گەرەکـە دەوڵـەت نـە بـە شێوەی راستەوەخۆ یان ناراستەوخۆ لە رێگەی هێزە چەکدارەکانییەوە یان لە رێگەی سـیخوڕو کرێگرتە ناوخۆییەکانیەوە لە پرۆسیی راپرسێسی دەست وەرنەدات. بەڵام مـن پـێم وایـە ئـەو راپرسییە نایەتە دی، واتە: ئەم جۆرە راپرسیە ئـازاد و خاوێنـە تـەنها لـە حاڵێکـدا دەبێـت، ئەویش بەهاتنە سەر دەسەڵاتی حکوومەتێکی دیموکراتی لە تورکیا، چونکە ئەم حکوومەتـەی ئێستا هێشتا بڕوای بە سڕینەوەی پێناسەی کورد لەسەر نەخشەی تورکیا هەیە، هەرکاتێکیش ئەو سیستەمە دیموکراتییە لە تورکیا دابمەزرێت، ئەوا یـەکێتیی راسـتەقینەی نێـوان هـەردوو گەلی کورد و تورك دیتە دی و کۆڵەگـەکانی دەوڵـەتی تورکیـاش لەسـەر بناغـەی دادوەری و یەکسانی و هاوبەشی تەواو لە هەموو دەزگاکان دەچەسپێن. ئێمە ئیمڕۆ لە پێناو بـەدیهێنانی ئەو سیستەمە دیموکراتییە لە تورکیای هاوچەرخ خەبات دەکەین(٢٢/٢٤).

هەفتەیەك پێش ئەوەی پەرلەمان خولی ئاسایی خۆی بۆ سـاڵی ١٩٨٩ بکاتـەوە، حیزبـی دیموکراتی سۆشیالیستی میللی کۆنگرەیەکی لە شێوەی کۆنگرەی رۆژنامەوانی لە ٢٢ی ئـابی ساڵی ١٩٨٩ گرێ دا، لە میانەی کۆنگرەکەدا جەختی کردەوە کـە حکوومـەت بەشـێوەیەکی ناواقیعی دەڕوانێتە رووداوەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا- واتە بزوتنەوەی گـەلی کـورد- ئەگەر ئەو (حکوومەت)ە بەراستی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە هەوڵ بدات، پێویستە ئـەم کارانە بکات:

١- هەڵوەشاندنەوەی لیواكانی پارێزەرانی گوندەكان، چونكە ئەو لیوایانــە لــەبری ئــەوەی كورد هیور بكەنەوە، دەیانهورووژێنن.

٢- پێویستە بە تێڕوانینێكی ئابوورییانە تەماشای كێشەی كورد بكرێ، واتە: چاكســازی ئابووری لە ناوچەكە بكرێت.

٣- بەگژداچوونی تیرۆر لە ناوچەكە بە رێگای هێزی دەوڵەتەوە ئــەنجام بــدرێ، نــەوەك بــە رێگای پارێزەرانی گوندەكان یا جەندرمە.

لەبەر نەشارەزایی دەوڵەت لەسەر ماكی كیشەكە لە ناوچەی (رۆژهەلات)، ئەوا ئێمە داوا دەكەین ئەم كێشەیە لە ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورەی توركیا(واتە: لە پەرلەمان) لــە هــەمو روویەكییەوە لێی بكۆڵدرێتەوە و پاشان بڕیاری گونجاو لە بارەیەوە بدرێت (٢٦/٩٩.

كە پەرلەمان لە (١)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٩ كرایەوە، گورگان و كۆمەڵەكەی بانگەشەیان بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە كرد :

١- زەروورەتی دەستلەكاركێشانەوەی حكومەتی حیزبی نیشتیمانی دایــك لــە دەســەلات، چونكە لە هەمبەر چارەسەركردنی كێشە درێژ خایەنەكانی توركیا و ئەنجامــدانی هەڵبــژاردنی پێشوەخت، نوشوستی هێنا.

٢- زەروورەتی تاوتوێكردنی رووداوەكانی باشووری رۆژهەلاتی توركیا لە پەرلەمان.

٣- چاكسازیكردن لە بەندیخانەكان و دەركردنی لێبوردنی گشتی بۆ بەند كراوەكان.

٤- باسكردنی كێشەی كەمایەتی تورك لە بولگاریا.

٥- بایەخدان بە كێشەی قوبرس بە شێوەیەك مافی تورك لەو دوورگەیەدا زامن بێت.

حكوومەتی(ئوزال) ی سەرۆك وەزیرانی ئەو دەمە، مەشقی بە تیپە كۆماندۆ تایبەتــەكانی لە پۆلیسی ناوخۆ و جەندرمە دەكرد بۆ شەڕی دژ بە هێزەكانی پارتی كرێكارانی كوردستان لە ناوچەكانی رۆژ هەلات و باشووری رۆژ هەلات، وەجبەی یەكــەمی ئــەو تیپــە مەشــقپێكراوانە بریتی بوو لە(٣٠٠)شەڕكەر لەدەســتپێكی زســتانی ســاڵی ١٩٨٩ لەگــەڵ(١٠) ئۆتۆمــۆبیلی سەربازی بارهەڵگری چەك بە پەلە رەوانە كران بۆ بەشداری كردن لە گەڵ سوپای(٧) لە هێرشی بەهاری رێكەوتی ١ی مایسی١٩٨٩ بۆ سەر بنكەكانی pkk. هێزەكانی تورك لە بەرە بەیانی رۆژی ١١ی تەمووزی١٩٨٩ لەسەر چیاكانی جوودی هەرگوڵد دابەزین بــە نیــازی لــەناوبردنی یەكەی دایكــی پــارتی كرێكــارانی كوردســتان ، فڕۆكــە كۆپتــەرە زرێپۆشەكانیشــیان ناوچــە سنوورییەكانی توركیا لە گەڵ عیراق بۆ هەمان مەبەست پاك كردەوە (١١/٢٧).

لە میانەی ئەو ئۆپراسیۆنە سەربازییەدا(٤٤٢٧)هاوڵاتی کورد گلدرانەوە و لێپرسینەوەیان لە گەڵدا کرا و بەڕیوەبەری گۆڤاری( نەوەی نوێ) ی هەفتانەش کە لە مەڵاتیە دەردەچوو لە لایەن هەمان ئەو هێزانەوە دەستگیر کرا و دەسەڵاتدارانی حوکمی عورفی لە ناوچەکە بەرێوەبەری نووسینی گۆڤاری( هەنگاوەکان) ی هەفتانەی بە مەیل و بۆچوون کورد کە لە ئەدەنە دەردەچوو، دەستگیر کرد و نووسەرانی گۆڤاری(نەوەی نوێ) ی هەفتانەش کە لە مەڵاتیە دەردەچوو گلدانەوە و سەرنووسەری بە ڕەگەز کوردی گۆڤارەکەشیان بە(٤) ساڵ و (٢) مانگ زیندانی کرد بە تۆمەتی هاندانی جەماوەر بەرەو یاخیبوون و بە بڵاوکردنەوەی وتاری زیانبەخش بە یەکێتی نیشتیمان(٣/٢٨).

حکوومەتی تورکیاش بڕیارێکی دەرکرد بە راگواستنی ئەو کوردانەی گومانی لێدەکردن لە ناوچەکەیانەوە بەرەو ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتوانیان تورکن و ژمارەیەکیش لە گوند و رەز و باغی کوردیش چۆڵ کران، چونکە بەرپرسانی ئیداریی تورك پێیان وابوو بەو کارەیان دەتوانن بە تەنها یەك ساڵ ناوچەکە لە جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان پاك بکەنەوە(١/٢٩).

بەڵام وێرای ئەوەی دوو ساڵ بەسەر ئەو هێرشە گەورەیەدا گوزەری کرد، کەچی جەنگاوەرانی کورد لە شوێنەکانی خۆیان مانەوەو هێزە چەکدارەکانی تورکیش لەم شەڕە خوێناوییە دۆڕاوەدا قوربانییان دەدا.

کەف و کوڵی سیاسی سەری کردەوە ناو حیزبی دیموکراتی سۆشیالیستی میللی کاتێك دەستەی کارگێڕی ئەندامییەتی(٧) نوێنەری کوردی ناو حیزبەکەیان راگرت، چونکە لە کۆنگرەی پاریس کە لە ١٤ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ بەسترا. ئامادە بوون.

ئەم بریارە، راستەوخۆ دوای گەرانەویان بۆ تورکیا لە ١٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٩ دەرچوو. بۆ پشتگیریکردن لەو (٧) نوێنەرە، هەر (٩) نوێنەرە کوردەکەی تری ناو ئەو حیزبە لە ٩ی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ دەستیان لە کاری ناو حیزبەکە کێشایەوە.

بۆ رۆژی دواتر، ئەردال ئینونبۆ سەرۆکی حیزبی دیموکراتی سۆشیالیستی میللی وتارێکی بڵاو کردەوە تییدا باسی لە کێشە سەرەکیەکانی تورکیا کرد و لە بارەی کۆنگرەی پارسیشەوە گوتی: لەبەر ئەوەی کۆنگرەی پاریس لەو رەهەندە کلتوورییە لایدا کە کۆنگرە لە پێناویدا بەستراو ئەو رەهەندە سیاسیانەی پیادەکرد کە ناکۆکن لە گەڵ دەوڵەتی یەك پارچە، بۆیە ڕیگریمان گرد لە ئامادەبوونی نوێنەرانی حیزبەکەمان لەو کۆنگرەیە، بەڵام ئەوان وێرای ئاگادار

کردنەوەکەمان، چوونە کۆنگرە بۆیە سزای ئیداریمان لە بەرامبەریان وەرگرت بە راگرتنی ئەندامییەتیان لە حیزب، وەلێ ئەم مەسەلەیە بە دەستی ئەنقەست بە چەواشەیی لێکدرایەوە. ئێمە لە نێوان هاولاتیاندا بە هۆی پێناسەی رەگەزی یان ئایینی یان زمان و ئایینزاوە هیچ جیاوازییەك ناکەین، بەڵکو لە دژی ئەوانە دەوەستین هەوڵی ئەو جیاوازییە دەدەن و تا هەتایەیش لە دژیان دەوەستین. زمانی رەسمی لە تورکیا زمانی تورکیە، زمانی فێربوونیش هەر بە تورکیە، ئەو هاولاتیەی دەیەوێ لەگەڵ هاودەم و هاوەلانی بە زمانی دایك باخێوێ بێگومان دەتوانێ و پێویستە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی یاسایی لە پێش ئەم مومارەسەیە نەبێت(١١/٣١).

نوێنەری کورد(ئایدن کووهەن گورگان) یش، لە راپۆرتی دەستلەکارکێشانەوەکەی لە حیزبی ناوبراو، گوتی: ((.. ئەو حیزبە بەو بەها کۆن و رزیوانەی کە زەمەن بەسەریاندا تێپەڕیو باویان نەما، هەوڵی کاری سیاسی دەداو کێشە دیموکراتی و سۆشیالیستییەکانی لە تورکیا نەگرتۆتە خۆ، بەڵکو هەندێك لەو وەهم و کارە یاساغانەی داهێناوە کە لەکاری سیاسیدا مایەپووچ و بێ سوودن و بایەخی پێویستیشی بە کێشەی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا نەداوە(١٩/٣٢).

(دەنیز بایکاڵ) ی سەرۆکی باڵی راست و سکرتێری گشتیی حیزبی دیموکراتی سۆشیالیستیی میللی: دوای گرێدانی کۆبوونەوەی دەستەی گشتیی بچووکی حیزبەکە لەلێدوانێکیدا، گوتی: ئەوە هەقیقەتێکی ڕاستەقینەیە کێشەیەك لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا هەیە، دانپێنەنان بەم هەقیقەتەش کێشەکە چارەسەر ناکات. هەروا ئاخاوتنی مرۆڤ بە زمانی دایك و هەوڵدانی بۆ پێشخستن و دەوڵەمەندکردنی کلتووەکەی مافێکە لە مافە بنەرەتییەکانی مرۆڤ. هەر کاتێکیش حیزبەکەمان دەسەلات لە تورکیا بگرێتە دەست، هەموو ئەمانە بەهەند وەردەگرین و کێشەکە چارەسەر دەکەین. بۆیە دەستەی کارگێڕی بچووکی حیزب کە دوێنێ کۆبووەوە بەو پەڕی پەژارەوە دەڕوانێتە دەستلەکارکێشانەوەی(١٦) نوێنەرەکەو ژمارەیەك لە ئەندامانی حیزب. بەلام دەبێ ئەوان بزانن هێزو سەربەرزی بۆ ئەم حیزبەی ئێمەیە کە لە گەڵ داخوازییەکانی میللەت یەکی گرتووە و ئەم دەستلەکارکێشانەوانەش وەکو زەبرێکە لە حیزبەکەمان بدرێ و کردەوەیەکی ناشیرنە، بۆیە حیزبی ئێمە لە دژی وەستا(١٩/٢٣).

شایەنی گوتنە، ئەو١٦ نوێنــەرە کوردانــەی لــە حیزبــی دیمــوکراتی سوشیالسـتی میللـی دەستیان کێشایەوە، ئەم بەیاننامەیەی لای خوارەوەیان لەو کۆنگرە رۆژنامەوانییە بڵاو کردەوە کە لە رۆژی٩ی کانوونی یەکەمی١٩٨٩ گرێیان دا:

ئێمە تاکید دەکەین کە نزیکبوونمان لــە کێشــەی کــورد، ئەوەیــە ئــەم کێشــەیە کێشــەی هاوبەشی هەموو دانیشتوانی تورکیایە و راو بۆچوونمان لەسەری بەم خاڵانەی لای خوارەوە روون دەکەینەوە:

١- پێویستە کێشەی کورد بە شێوەیەکی دیموکراتی و لە چوار چێوەی یەکێتی نیشتیمانی چارەسەر بکرێت.

٢- نابێ وا تەماشای کێشەی کورد بکرێ کە تەنها کێشــەیەکی تایبــەت بــە هاوڵاتیــانی کوردە، چونکە ئەم تێروانینە بە مانای لێدانی یەکێتی نیشتیمانو بروانەبوون بە دیمــوکراتی و رێزنەگرتن لە مافی مرۆڤ و رەتکردنەوەی دەوڵەمەندبوونی کۆمەڵایەتی دێت.

٣- پێویستە مەسەلەی چارەسەرکردنی کێشەی کورد تەنها بۆ هاوڵاتیانی بەرەگــەز کــورد جێ نەهێلرێ، بەڵکو وا تەماشا بکرێ کێشەیەکی تایبەتە بە سەرلەبەر دانیشتوانی تورکیاوە

٤- پێویستە رەهەندە کۆمەڵایــەتی و ئابوورییــەکانی کێشــەی کــورد هــەمان گرنگییــان بدرێتێ کە بەم کێشەیە دراون، ئەویش بە چارەسەرکردنی هۆکارەکانی ئەو خەباتە چەکدارییەی رۆژانە لە شەڕو پێکدادان و پێشێلکارییەکانی بەردەوامی مافی مرۆڤ و زەبــرو زەنــگ، دەیــان قوربانی لەناو هاونیشــتمانیانی لــێ دەکەوێتــەوە و پێویســتە ئــەم رەوشــە بــە گیــانێکی پــڕ بەرپرسیارییەتییەوە چارەسەر بکرێ. لێرەشەوە گەرەکە کێشەی کورد لە بازنەی بــەکار بردنــی چەك لە دژی دراوسێیەکانی تورکیا یاخود لە دژی عەشایرەکانی تر، دەربهێنرێ، چونکە ئێمە پێمان وایە دەوڵەت مافی خۆیەتی دەسەڵات و ئەرکی بە گوێرەی هەل و مەرجی دەورووبەرەکەی مومارەسە بکات، بەڵام پێویستە بە پێی پرەنسیپەکانی دیموکراتی و سانسـۆری یاسـایی ئــەم ئەرکە جێ بە جێ بکات.

٥- پێویســتە چاوپۆشــی نــەکرێ لەبــەکاربردنی کێشــەی کــورد وەك ئامرازێــك بــۆ یەکلاکردنەوەی دەستکەوتەکانی نێوانیان، ئەگەر چی بە داخەوە دەبینین پێشبڕکێیەك هەیەلــە نێوان هەندێ دەوڵەت بۆ ناونانی هەر بزووتنەوەیەك لە تورکیا داوای دیموکراتی دەکات بە جودا خوازی و دابەشکردن، لە کاتێکدا ئێمە پێمان وایە چارەسەرکردنی کێشــەی کــورد تــەنها بــە ویست و ئیرادەی هاوبەش و بڕیاری دروستی گەلەکەمان دێتە دی.

٦- ئێمە پێمان وایە بەرگریکردن لە بیرۆکەی تورکیای تاکە نەتەوەو دانانی زمانی تورکیش بە تاکە زمانی فەرمی وڵات بە کۆسپ و تەگەرە دەژمێردرێن لە پێش چارەسەرکردنی کێشەی کوردبەرێگەیەکی دیموکراتی و بەڵکو رەتیشی دەکەینەوە، چونکە ئەوە بەشێکە لە باوەڕبوونمان بە ئازادیی هزرو بیروباوەڕ.

لە پێناو چارەسەرییەکی عادیلانە و هەمیشەیی بۆ کێشەی کورد بەر لەوەی کار لەکار بترازێ. داوا لە حیزبە سیاسیەکان دەکەین لەم کێشەیە بپێچنەوە وەك رێخۆشکردنیك بۆ هێنانی بە پوخت و پاککراوی بۆ بەردەمی پەرلەمان بە ئامانجی تاوتوێکردن و باسکردنی.

ئەم بەیاننامەیە کە رۆژنامەی(حورییەت) بە بەیاننامەیەکی سەرسورهێن و ئاکام خراپ ناوی برد، هەر یەك لەم بەرێزانە ئیمزایان کردبوو: عەبدوڵلا باش تورك، فەهمی ئیشیقلەر،ئەحمەد تورك، ئیسماعیل سەفی ئونال، کەنعان قوچاق، حوسنی ئوقچی ئۆغلۆ، محەممەدعەلی ئارتن، سالح سۆمەر، مەحموود ئیلیناق، محەممەد قەهرەمان و عارف ساغ.

بەیاننامەی ناوبراو لە ناوەندە سیاسیەکانو رۆژنامەکانی تورکیا، دەنگدانەوەیەکی گەورەو جیاجیای لێکەوتەوە. دەبینی لەکاتێکدا رۆژنامەگەریی بەرەی راست وای لێکدایەوە ئاکامی خراپی دبێت و هەوڵێکە بۆ خولقاندنی کێشەیەك لە تورکیا بوونی نییە(١٩/٣٤)، پرۆفیسۆر دکتۆر(تۆقتاش ئاتاش) یش لایەنگری هزری شۆفێنیزم بە توندی هێرشی کردە سەر(١١/٣٥)،کەچی ناوەندە پێشکەوتووخوازەکانی تورکیا ئەو بەرێزانەی کە واژوویان لە سەر بەیاننامەکە کرد بە بوێری و ئاز. لە قەڵەم دا و گاڵتەیان بەو پیاوە سەربازی و سیاسیانەی تورك هات کە دەیانەوێ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە رێگەی بەزۆر دەمکوتکردنی خەڵکییەوە بکەن. لەو لایەنەوە سیاسەتمەداری ناسراو محەممەد عەلی براند لە گۆشە رۆژانەکەی لە رۆژنامەی (میللیەت) دا، نووسیویەتی دەڵێت: لە کاتێکدا کێشەی کورد لە ریزەکانی پێشەوەی خشتەی کاری ئەو کۆنگرە نێونەتەوەییانەن کە لە مافی مرۆڤ و مافە کەمایەتیەکان دەپێچنەوە، لێ هیشتا بەلای دەسەڵاتدارانی تورکیاوە، ئاماژەدان بەم کێشەیە یان بڵاوکردنەوەی هزرو بیرو بۆچوون لەسەری لە رووی یاساوە بە تاوان دەژمێردرێ و هەوڵ دەدەن بە رێگەی سەربازی چارەسەری بکەن، ئێمە بەم کارە هەوڵ دەدەین تەنها خۆمان هەڵخەڵەتێنین(٧/٣٦).

ناوەندە پیشکەوتووخوازەکانی تورکیا رەخنەیان لە حیزبی دیموکراتی سۆشیالیستی میللی گرتبوو، چونکە بایەخی تەواوی بەکێشەی کورد نەدا. بۆ نموونە ئەرتۆغرول ئوزکوك لەگۆشە

ڕۆژانەکەی لەرۆژنامەی (حورییەت) دەڵێت: ئـەردالْ ئینونـۆ لەباسـکردنی لـە مـەڕ ڕاگـرتنی ئەندامێتیی نوینەرانی کورد لەناو حیزبەکەی نە هەستی بە زەروورەتی جەخت کردن لە بـوونی کورد کرد بە پێدانی گرنگی زیاتر پێان لەلایەن تورکەوە. ئەو ڕەوشی هاوڵاتیـان لـە باشـووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە بازنەی ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و سنووری ئەو دیموکراتییـە ڕێ پێـدراوە، هەڵدەسەنگێنێ)) لەم بارەیەوە ئەردال ئینونۆ دەڵێت: ئێمـە داکـۆکی دەکـەین لـە زەرووەتـی مومارەسەکردنی هەموو مافێکی سیاسی یەکسان و مافی ئازادی لە لایەن هاوڵاتیانمانـەوە لـە چوارچێوەی پێکهاتەی کۆماری تورکیای یەکگرتوو و یەك پارچەدا(٩/٣٧).

ئەگەر چی ناوەندە پێشـکەوتووخوازەکان بینییـان لـەوێ دا دووفاقیـەك هەیـە لـە نێـوان هەڵوێستی حکومەتی تورکیا بەرامبەر هەردوو کەمایەتی تورك لە هـەر یـەك لـە قـوبرس و بولگاریا و بانگەشە کردنی بۆ دانی مافی نەتەوەییان و لابردنی سـتەمی سیاسـی لەسـەریان و هەروا لە نێوان هەڵوێستی بەرامبەر بە کوردی تورکیا کە نایەوێ دان بە بوونی نەتەوەییان بنێ و مافە نەتەوەییەکانیان مسۆگەر بکات، وەلێ ئەم ناوەنـدە پێشـکەوتووخوازانە پێیـان وایـە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەم وڵاتە بە ڕێگەی فیدراڵی دەستەبەر دەبێت، بە نموونە محەمەد عەلی ئارەن ئەو نوێنەرەی کە لە حیزبـی دیمـوکراتی سۆشیالیسـتی میللـی دەسـتی لـە کـار کێشایەوە جەختی لەسەر پێویست بوونی دامەزراندنی یەکێتییەکی فیدراڵی لە نێوان هـەردوو نەتەوەی کورد و تورك لە تورکیا بە هەمان ئەو شێوە فیدراڵییەی تورکیا دەخوازی لـە نێـوان تورك و یۆنانیەکان لە قوبرس دابمەزرێت(١٦/٣٨).

هزرڤانی پێشکەوتوو خوازی تورکیا(عەزیز نەسـین) ئـەو نووسـەرەی کێشـەی کـوردی لـە تورکیا هوروژاند وتووشی گەلێك دەردەسەری و کێشمەکێش هات لە سونگەی تۆمەت و داوای دادگاکانی تورکیا لەبەر ئەوەی تێکۆشاوە بۆ سەلماندنی بـوونی نەتـەوەی کـورد لـەم وڵاتـەو دانپێنان بە بوونیانو مافە کلتووری و ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کورد، ئاماژەی بەم دوو فاقییـە لە هەڵوێستی ڕەسمی تورکیا لە و کتێبەی بـەناوی-تـورکی بولگاریـا و کـوردی تورکیـا) دا، کاتێك لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی کە لە ڕۆژی ١٥ی شوباتی سـاڵی ١٩٨٩ بەسـتی-و لـە پێشەکی کتێبەکەی دایناوە- جەخت دەکاتە سەر ئاشکراکردنی ئەو چەواشـەکردنە مێژووییـە کە ناوەندە کۆنە پەرست و شۆفێنیستیە کـانی تورکیـا لـە بـارەی کـوردی تورکیـا و تـورکی بولگاریاوە موما رەسـەی دەکـەن، دەڵێـت: ((لەکاتێکـدا هەنـدێك بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کێشەیەك بەناوی کورد بان گەلێك بەناوی کوردەوە لە تورکیا بوونی نیەو کـورد بـە ڕەچـەڵەك

دەگەڕێنەوە سەر تورك، لە بولگاریاش بە هەمان شێوە ئاوازی ئەوە دەژەنن کە لـە بولگاریـا ڕەگەزێك نیە بەناوی تورکەوە، بەڵکو بە ڕەچەڵەك لە بولگارن وپاش ئیسلامبوونیان بوونە بـە تورك. بەمەش دەیانەوێ بە سڕینەوەی پێناسە نەتەوەییە تورکیەکەیان بیانکـەن بـە بولگـار. هزری نەتەوەیی هاوچەرخ چەخت دەکات کە ئەوانی تر پێناسـەی نەتـەوەیی کەسـەکان چ بـە ڕووداوی مێژوویی ڕاستەقینە یان بە درۆو چەواشەکاریی، دیاری ناکەن... چونکە تاکی مـرۆڤ لە دیاریکردنی پێناسەو ئینتیمابوونی ئازادە، هەر خۆشی بریار دەدات سەر بەکام نەتەوەو کام لەولاتەیە کە تیادا هاولاتییـە. مومارەسـەی دەوڵەتـەکانیش بـۆ چەواشـەکردنی مێـژوو یـان ڕووداوەکان بە ڕێگەی فشار و زۆر لێکردن بۆ گـۆڕینی پیناسـەی نەتـەوەیی کەمایەتییـەکان، هەولێکی نامرۆیی و وەحشیگەرانەیەو پێچەوانەی لۆژیکی هاوچەرخە))(٢٥/٢٣).

ئەگەر چی حکوومەتی تورکیا بڕوای بەوە نییە لە تورکیـا کێشـەیەك هـەبێت بـە نـاوی کێشەی کوردو پێشی وایە ئەو بزوتنـەوە چـەکدارییەی لـە باشـووری ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا لـە ساڵی(١٩٨٤) ەوە هەلایساوە و بەردەوامە، بزوتنەوەیەکی تیرۆرستییەو ئەندامەکانی لە یاسـا لایانداوە! وابوو، سەرۆکی کۆمار(تورگۆت ئوزال) بیر لە چی دەکاتەوەو رای چییە بەرامبەر بە کێشەی گەلی کورد ؟! ئوزال لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانیی لە گـەڵ گۆڤـاری( خـاك= نوختـە)ی هەفتانە لە دوای هەڵبژاردنی بە سەرۆك کۆمار لە ساڵی١٩٨٩ لەوەلامی پرسیاری گۆڤارەکـە، ئایە نیگەران نابێت کاتێك گوێی لێ بێت کەسێك بە کوردی بـاخێوی، ئـوزال بـە شـێوەیەکی ناراستەوخۆ لە وەلامدا دەڵێت: کاتێك سەرۆکی وەزیران بووم سەردانی شاری (هەکاری) م کرد (کامەران ئینان) ی والی ئەو دەمەی(هەکاری)م لەگەڵدا بوو کە ئێسـتا وتەبێـژی فراکسـیۆنی پەرلەمانیی (حیزبی نیشتیمانی دایك)ە و بەرەگەز کورد و لە بنەماڵەیـەکی ناسـراوە، لـەوێ خەڵك بە چەپڵەوە پێشوازییان لێ کردین، کۆمەڵێك ئافرەت لە نیۆ خۆیانـدا قسـەیان دەکـرد، وەك ئەوەی بیانەوێ شتێکمان پێ بڵێن، یەکێك لە ئافرەتەکانم بانگ کـردو لـێم پرسـی چـیت دەوێ؟ قسەیەکی کرد نەمزانی مانای چـییە... سـەیرێکی (کامــەران)م کـرد بـۆ ئـەوەی لـە مەسەلەکە تێبگەم. گوتی: ئەو ژنە بە کوردی دەدوێ.. فلانە شت و فیسارە شتی دەوێ..

ئەوە شتێکی مەنتقییە هەر یەکەو بە زمانی خۆی باخێوێ، قسـەکردنی هاونیشـتمانییەك بە کوردی نیگەرانم ناکات، ناشێ وێنای ئەوەش بکەم ئەوە قەدەغە بکرێ. من پێم وایـە ئـەم مەسەلەیە- واتا ڕێگەدان بە کورد بە زمانی خۆیان بدوێن- پێویستی بە جۆرێك ڕێکخسـتنی هاوچەرخ هەیە، لێرەشدا ئەم کارە تۆزێك پشووی دەوێ..(٢٥/٣٩).

ئەم لۆژیکە ئیحا ئامێزەی سەرۆکی کۆمار- کەوا گرێمانە دەکرێ بە پێی دەستووری تورکیا بێلایەنی تیا بێت لە هەمبەر کێشە ئەتنیکی و ئایینزاو حیزبییەکان- پشتگیرییەکی هێمادار بوو بوو بۆ بزوتنەوەی رۆشنبیرانی تورك سەبارەت بە باسکردنی کێشەی کورد لە تورکیا چ لەسەر ئاستی جەماوەری یان لەسەرئاستی پەرلەمانی تورکیا  تا دەگاتە دان نان بە مافی کلتووری و پەرلەمانی بە کورد بە پێی رۆحی سەردەم و ئەو گۆڕانکارییە سیاسیانەی لەسەر نەخشەی ئەم جیهانە پێی ناوەتە سەدەی بیست و یەکەمین، سەدەی ئازادی و دیموکراتی و داماڵینی تۆزو گەردی رووی کەمایەتیە بەناموبووەکان، هاتوونەتە پێشەوە.

لە پەرەسەندنێکی تر لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆی تورکیا، سەرانی حیزبی شیوعی نهێنیی تورکیا لە پاش کاری ژێرزەمینی ئەو حیزبە کە لە ساڵی(١٩٢٢) ەوە بەردەوام بوو، لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٨٩ کۆنگرەیەکی رۆژناوانیی ئاشکرایان لە ئەستەموڵ گرێ دا، بریاریان دا بە شێوەیەکی ئاشکراو لەچوار چێوەی بزوتنەوەی چەپی تورکیا بچنە کۆری هەڵبژاردنی ئازادەوە و گوتیان: دوای پەند و وانە وەرگرتن لە چالاکییەکانی رابردوو، ئێمە پابەندبوونی خۆمان بە شێوازی دیموکراتی لە کاری سیاسی دوور لە تیرۆرو چاودێری هزری رادەگەیەنین و داوا لە هەموو ئەندامانی خۆمان دەکەین بەرەو یەکریزی و خەباتی دیموکراتی لە پێناو تورکیایەکی خۆشگوزەران و بەختەوەر. (١/٤٠) . بەڵام دام و دەزگا ئەمنیەکانی رژێمی تورکیا(ئاور جۆشقۆن) ی سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی یەکگرتووی تورکیایان گلدایەوە و داواکاریی گشتی کۆماری دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئەستەموڵ دەستیکرد بە لێپرسینەوە لە گەڵ خۆی و(نەرمین جۆشقون) ی خێزانی کە ئەمیشیان ئەندامی ئەو حیزبە بوو کە لە رۆژی پینج شەممەی رێکەوتی ٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی بەست و بۆ جاڕدانی ناوی تازەی حیزب و بوو بە حیزبی شیوعی یەکگرتووی تورکیا و باسی لە چالاکیەکانی خۆشی کرد. وەك زانراوە مادە(١٤١) لە یاسای سزاکانی تورکیا چالاکی حیزبی شیوعی قەدەغە دەکات، چونکە بە پێی ئەم مادەیە حیزبی ناوبراو لەسەر هزری سەروەریی چینێکی کۆمەلایەتی دیاریکراو بەسەر چینەکانی تری کۆمەڵگاوە بنیات نراوە. بەڵام کاربەدەستانی ئاسایش دوا جار هەموو ئەوانەیان کە بە هۆی گرێدانی کۆنگرەکەوە گلدابوونەوە، بەرڵلا کرد(١٩/٤١).

کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی حیزبی شیوعیی تورکیا، کاردانەوەی جیا جیای هوروژاند لە ناوەندی رۆژنامەگەریی حیزبەکانی تورکیا(١٩/٤٢) ، دەبینی لە کاتێکدا نووسەری

ڕۆژنامەنووس(توغرول ئوزکوك) جەختی لەوە دەکرد کە جاڕدانی دامەزراندنی حیزبی شیوعی یەکگرتوو لەلایەن شیوعییەکانی تورکیاوە، رەوشێکی هاودژی لە تورکیا درووست کرد، چونکە یاسا رێگە بەم حیزبە نادات چالاکی بنوێنێت، کەچی شیوعییەکان کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی دەبەستن بۆ جاڕدانی بە ئاشکرا چاکی نواندن .

(سلێمان دیمیرالّ)ی ڕابەری حیزبی رێگای راست و یەکێك لە سەرۆکانی پێشووی وەزارەتەکان لە تورکیا پشتگیریی خۆی دەربڕی بۆ دامەزراندنی ئەم حیزبە شیووعییە و گوتی: ئێمە لایەنگری فرەیی دەکەین، لەبەر ئەمە پێویستە لەوێ دا فرەحیزبی هەبێت بۆ راپەڕاندنی ئەم سیستەمە، من خۆم دەگەڕێم بۆ کەسێك لەگەڵمدا جیاوازبێت، کەسی جیاوازیش لەرووی هزرەوە چەپەو هەرچەند ئەو کەسە جیاوازە لەرووی هزرەوە بەهێزبێت، منیش چەندم لەباردابێت تێدەکۆشم بەهێزبم و شان لە شانی بدەم، لەوێشدا شتێك نییە لە پێش دامەزراندنی حیزبی شیوعیی ئاشکرای تورکیا ببێتە رێگر، چونکە هەردوو مادده ١٤١ و ١٤٢ لە یاسای سزاکانی تورکیا جەخت دەکەنە سەر سزادانی ئەوانەی بانگەشە بۆ ململانێی چینەکان دەکەن و پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم دوو مادەیە..)).

(ئومور قومباراچی)ی بریکاری سەرۆکی فراکسیۆنی حیزبی دیموکراتیی سوشیالیستیی میللی ئۆپۆزسیۆنیش لە پەرلەمان، گوتی: هیچ رێگرییەك لەوێ دا نییە بۆ دامەزراندنی حیزبێکی شیوعیی ئاشکرا لە تورکیا، داواش دەکەین هەموو ئەو یاسایانە هەڵبوەشێنرێنەوە کە دەبنە ئاستەنگ لەپێش ئازادیی بیروڕا لەتورکیا، لەم لایەنەشەوە حیزبەکەمان پڕۆژە یاسایەکی داوەتە پەرلەمان)).

بەش بە حاڵی حیزبی نیشتمانیی دایکی دەسەڵاتداریش ئەوا (خەلیل ئوزسۆی)ی یەك لە یاریدەدەرانی سەرۆکی ئەم حیزبە لەسەر هەمان بابەت لێدوانی داو گوتی: نە شیووعییەکان و نەحیزبی شیوعیی تورکیا کێشەیەکی ناوخۆییان لەم وڵاتە دروست نەکردووە، چونکە ئەم حیزبە هەمیشە لە دەرەوەی بازنەی حیزبە نەتەوەییەکان یان حیزبە نیشتمانییەکان ماوەتەوە و لە ئایندەشدا هەروا دەمێنێتەوە)). بەڵام (ییلدیرم ئاقبولوت) سەرۆکی وەزیران و رابەری حیزبی نیشتمانی دایك لەمەڕ بابەتەکەوە گوتی: ((ئەگەر لەوێ دا حاڵەتێك هەبێ لە ڕوانگەی یاساوە بە تاوان بژمێردرێ، ئەوا داواکاری گشتیی کۆماری لەو ئەرکە دەپێچێتەوە، هەموو کەسێکیش مافی هەیە لەچوارچێوەی یاسادا مومارەسەی مافی خۆی بکات)).

پێشتر کاربەدەستانی ئاسایشی تـورك لـە ٩ی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٨٧ هـەردوو سەرکردەی حیزبی شیوعیی نهێنیی تورکیا (حەیدەر قوتلو)ی بەرەگەز کورد و (نیهاد سارغین) یان لەکاتی گەڕانەوەیان لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتـەوە، کـە بارەگـای حیزبەکـەیانی لێبـوو، لـە فڕۆکەخانەی ئەستەموڵ دەستگیرکرد.

لە پاش چەند دادگاییکردنێك کە بۆ (٣٢) دانیشتن درێژەی کێشا و لە میانەیاندا هـەردوو سەرکردەی حیزبـی نـاوبراو بڕیـاری مانگرتنیـان لـەخواردن تـا مـردن دا هـەتا ئـەو کاتـەی حکوومەتی تورکیا مادەکانی ١٤١ و ١٤٢ هەڵدەوەشـێنێتەوە کـە بـە گوێرەیـان قەدەغەیـە حیزبی شیوعیی ئاشکرا لە تورکیا دابمەزرێت و هەموو هزرێکی سیاسـیی توندڕۆش لـە دژی ڕژێمی تورکیا بە تاوان دەژمێردرێ و بە کۆمۆنیستی تۆمەتبار دەکرێ، داواشییان کرد مادەی ١٦٣ی دەستوور کە ڕێگـرە لـە پـێش دامەزرانـدنی حیزبـە ئایینییـەکان بـە هـەمان شـێوە هەڵبوەشێتەوە.

ئەم مانگرتنـە لـە ٧ی نیسـانی سـاڵی ١٩٩٠ دەسـتپێکردبوو و کۆمەڵـە و سـەندیکا و یەکێتییەکانی کرێکـاران و ڕۆژنامەنووسـان و نووسـەرانی پێشـکەوتووخوازی تورکیـا لـە ٢٠ ویلایەتی تورکیا لە کۆی ٧٢ ویلایەتەکەی تورکیا پشـتگیریی خۆیـان لەبەرامبـەر دەربـڕی و داوایان کرد دەسەڵاتداران لەو مەسەلەیە بکۆڵنـەوە و هـەردوو سـەرکردەی حیزبـی شـیوعیی تورکیاش لە گرتووخانە ئازاد بکرێن.

وەزیری دادی تورکیا سەبارەت بەم مەسەلەیە لە لێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەی (بەیرام جـەژن) لە ٢٦ی نیسانی ١٩٩٠، گوتی: ((حکوومەت بەجیددی دەیەوێ بڕوانێتـە هـەمواركردن یـان هەڵوەشاندنەوەی ئەو ماددانە بە جۆرێکی وا هـەموو بیروبـاوەڕ و تیۆرییـەك، ئـازادیی کـارو ڕێکخستنیان بۆ بڕەخسێت(١/٤٣).

لە ٤ی مایسی ١٩٩٠ یشدا، دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئەنکەرە بڕیـاری بـەردانی بـۆ هەردوو سەرکردەی حیزبـی شـیوعیی یـەکگرتووی تورکیـا دەرکـرد، لـە بڕگـەکانی حـوکمی بەردانەکەدا هاتبوو: ((لەبەر ئەوەی هزرو بیروڕا بە ئامرازێك دانانرێن بۆ تاوان و هەموو حیزبە سیاسییەکانیش لەگەڵ ئەوەدان مادەکانی ١٤١ و ١٤٢ و ١٦٣ لە (یاسای سزاکانی تورکیا)ی تایبەت بە قەدەغەکردنی چالاکیی توندڕۆ، هەڵبوەشێنرێتەوەو بە کردنی بـۆ جێبـەجێ کردنـی ئەو بابەتە دەستیپێکردووە، بۆیە بڕیارماندا هەردوو تۆمەتبار بەڕەڵڵا بکرێن(١٩/٤٤).

ئەم بڕیارە بە سەرکەوتنێك دانرا بۆ دادوەریی تورکیا و بەڵگەیەك بوو بۆ سەربەخۆییبوونی دادوەریی لەم وڵاتە و ڕێزگرتنی لە دیموکراتی. بە جاڕدانی ئاشکرابوونی حیزبی شیوعیی تورکیاش، ژمارەی حیزبە سیاسییەکان لە تورکیا گەیشتە ۱۸ حیزب، کە ئەوانیش بریتی بوون لەم حیزبانەی لای خوارەوە:

۱ـ حیزبی نیشتمانی دایك (موحافیزکار) بە سەرکردایەتیی ییلدیرم ئاقبولوت.

۲ـ حیزبی دیموکراتی سوشیالیستیی میللی بەسەرکردایەتیی ئەردال ئینونۆ.

۳ـ حیزبی ڕێگای ڕاست (ڕاستڕەو) بە سەرکردایەتیی سلێمان دیمیراڵ.

٤ـ حیزبی کۆششی سوشیالیستیی چەپ (حیزبێکی کوردی بوو) بە سەرۆکایەتی ئایدن کووهەن گورگان.

٥ـ حیزبی کاری نەتەوەیی (ڕاستڕەوی نەتەوە پەرست) بە سەرۆکایەتی ئەرسەلان تورکیش.

٦ـ حیزبی ڕوفاهییەت (ئیسلامی بوو) بەسەرۆکایەتی نەجمەدین ئەربەکان.

۷ـ حیزبی چەپی دیموکراتی بە سەرۆکایەتیی بۆڵەند ئەجەویدا.

۸ـ حیزبی گەل (چەپڕەو) بە سەرۆکایەتیی سەلاحەدین بنگول.

۹ـ حیزبی ژیاری (چەپ و ژینگەیی) بە سەرۆکایەتیی جەمال ئارتوغ.

۱۰ـ حیزبی کاری دیموکراتی (حیزبێکی چەپڕەو و کوردی) بوو بە سەرۆکایەتیی یەشار قایا.

۱۱ـ حیزبی بوژانەوەی نوێ (ئایینی).

۱۲ـ حیزبی ئابووریی کشتوکاڵیی شارستانی بایەخی بە پاراستنی ئاژەڵ دەدا.

۱۳ـ حیزبی دیموکراتیی ڕادیکاڵی (حیزبێکی لیبراڵی بوو).

۱٤ـ حیزبی دیموکراتیی ناوەندی (لیبراڵی بوو).

۱٥ـ حیزبی زانست (ئایینی لیبراڵی).

۱٦ـ حیزبی ئەنادۆڵی گەورە (موحافیزکار).

۱۷ـ حیزبی شیوعیی یەکگرتووی تورکیا.

۱۸ـ پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەم حیزبە دان نانێت بە حکوومەتی تورکیادا، وەلێ لە کۆی ۷۳ ویلایەتەکەی تورکیا دەستی دەڕوا بەسەر (۲۰) ویلایەتی تورکیادا و هەوادار و لایەنگرانی لە شارە گەورەکانی تورکیادا هەن. عەبدوڵڵا ئۆجەلان سەرکردایەتی دەکات و حیزبێکی سوشیالیستیە و پیڕەوی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم ـ ماویزم دەکات.

که له ئاخر و ئۆخری نیسانی ساڵی ١٩٩١ هەڵبژاردنی حیزبی نیشتمانی دایك بەڕێوەچوو، (مەسعوود یەلماز)ی وەزیری دەرەوەی پێشووتر و کەسێك لە جەمسەرەکانی حیزبی نیشتمانی دایك، بووە سەرۆکی حیزب، لە پاشان بڕیاردرا وادەی هەڵبژاردنی گشتی بۆ رۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩١ پێش بخرێت، بەمەش ریزبەندیی سیاسی لە نێوان ١٨ حیزبە تورکییەکە دەستیپێکرد بۆ کۆکردنەوەی ریزەکانیان لە پێگەی هێز و دەسەڵاتی سیاسییەوە بەرەو هەڵبژاردنی داهاتوو، ئەوە بوو حیزبە بچووکەکان بەتایبەت ئەو حیزبانەی لە ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکیا نوێنەرایەتیی پەرلەمانیان نییە، چونکە ژمارەی نوێنەرەکانیان لە (١٠) کەمترە، لەنێو خۆیاندا یەکیان گرت و چەند حیزبێکی تازەیان دروست کرد، بەڵام حیزبە سیاسییە گەورەکان پیگەکانی پێشووی خۆیانیان پاراست، بەو جۆرەش ئەم (٦) حیزبە سیاسییانەی لای خوارەوە دەچنە ناو هەڵبژاردنەوە:

١ـ حیزبی نیشتمانی دایك ANAP بە سەرۆکایەتیی مەسعوود یەلماز.
٢ـ حیزبی دیموکراتیی سوشیالیستیی میللی SHP بە سەرۆکایەتیی ئەردال ئینونۆ.
٣ـ حیزبی ریگای راست DYP بە سەرۆکایەتیی سلێمان دیمیراڵ.
٤ـ حیزبی روفاهییەت RP بە سەرۆکایەتیی نەجمەدین ئەربەکان.
٥ـ حیزبی دیموکراتیی چەپ DSP بە سەرۆکایەتیی بولەند ئەجەوید.
٦ـ حیزبی سوشیالیست SP بە سەرۆکایەتیی دوغو بیرنجیك.

رەنگە، دیارترینی ئەو حیزبە نوێیانە، حیزبی سوشیالیست بێت کە نووسەر و رۆژنامەنووسی کوردی پێشکەوتووخواز دوغۆبیرنجیك سەرۆکایەتیی دەکات و بە واریسی هەموو هێزە چەپ و پێشکەوتووخوازەکانی تورکیا بێجگە لە شیوعییەکان دەژمێردرێ و رۆشنبیرانی کوردیش رێژەیەکی باشیان لە ناویدا پێکهێناوە.

چاودێرانی سیاسی پێشبینیان کرد کە ئەم حیزبە رێژەیەك کورسی لە پەرلەمانی تورکیا بەدەست بێنێ، بەتایبەت پاش ئەوەی دروشمی: (رێزگرتن لە مافی مرۆڤ بۆ هاونیشتمانی و رەخساندنی کار بۆ هەموو بێکاران)ی هەڵگرت، بەمەش رەنگە بە هاوکاری لەگەڵ حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان بتوانێت لە خولی داهاتووی پەرلەمانی تورکیا کێشەی کورد بخاتە بەر باس. بەڵام بە ئەنجامگەیاندنی ئەم هەڵبژاردنەو دەرەنجامەکانی وایان نەکرد کێشەکە چارەسەر بکرێ یان تەپ و تۆزی لەسەر لا ببرێ یاخود هیچ نەبێ لە پەرلەمان گفتوگۆیەکی لەسەر بکرێ، چونکە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کورد تەنها بە دوو رێگا دەبێت:.

١ـ بەڕێگای بڕواهێنانی سەرانی سوپای تورك كە ڕێگەچارەی سەربازی هیچ سوودێكی نییە.

٢ـ بەڕێگای ئەو فشارانەی ئەنجومەنی ئەوروپی دەیانخەنە سەر حكوومەتی توركیا.

بەڵام ئەو كتو پڕییەی لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٩١ رووی دا، سەركەوتنی (١٥) نوێنەری كورد بوو كە لەسەر لیستی پارتی كاری دیموكراتی و لە چوارچێوەی حیزبی دیموكراتیی سوشیالیستی چوونە هەڵبژاردنەوە. وەلێ پێداگرتنی (لەیلا زانا)ی نوێنەری كورد لەسەر خوێندنی سوێندە دەستوورییەكەی لە پەرلەمان بە زمانی كوردی لە بری زمانی توركی، بووە هۆی جیابوونەوەی نوێنەرە كوردەكان لە حیزبی دیموكراتی سوشیالیستی بۆ دووبارە پێكهێنانی حیزبەكەیان لە پەرلەمان.. لە سۆنگەی ئەمەشدا نوێنەرەكانیان بەوە تۆمەتباركران كە لە رووی سیاسییەوە بە فیتی پارتی كرێكارانی كوردستانی قەدەغەكراو رەفتار دەكەن، دوای ئەمەش حەسانەتی پەرلەمانییان لێ سەندرایەوە و گیران و پاشان درانە دادگای ئاسایشی دەوڵەت و دادگا لە ساڵی ١٩٩٤ هەر یەكەو بۆ ماوەی ٦ — ١٥ ساڵ حوكمی بەندكردنی بەسەریاندا سەپاند، سەرەڕای داخستنی پارتی كاری دیموكراتیش.

ئەو (١٥) كورسییەی حیزبی كاری دیموكراتی لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٩١ لەسەر ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی توركیا بردییەوە، هانی كوردی دا حیزبێكی تایبەت بەخۆیان لە ساڵی ١٩٩٥ بەناوی پارتی دیموكراتیی میللی دابمەزرێنن، ئەم حیزبە نەچووە هەڵبژاردنەكانی ساڵی (١٩٩٥)ەوە، بەڵكو لە دوای داخستنی پارتی كاری دیموكراتی، سەرقاڵی پڕكردنەوەی بۆشاییە سیاسییەكەی بوو وەك ڕێخۆشكردنێك بۆ هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٩، بەڵام نەیتوانی لە بازگەی (١٠٪)ی پەرلەمانیی دەربازبێت، ئەگەرچی توانیی سەرۆكایەتیی شارەوانییەكانی: دیاربەكر و مووش و وان و تۆنجلی و چەندین شارۆچكە و ناحییەی تر وەدەست بێنێ.

# باسی سێیەم

## هەوڵی زەمینە خۆشکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد

کێشەی گەلی کورد لە ساڵی ١٩٩٠ بەدوا لەسەر ئاستی هێزە کاریگەرییە رەسمییەکانی سەر گۆڕەپانی تورکیا بەرە بەرە بەرەو بەکاربردنی توندوتیژی و زەبر و زەنگ بەڕێوە دەچوو، ئەو هێزە رەسمییانەی تورك وا بەدەرکەوتن وەك بڵێی نایانەوێ بەرێگایەکی سیاسی کێشەکە چارەسەر بکەن، لەکاتێکدا هێزە سیاسییەکانی ئەم وڵاتە فشارەکانیان لەدژی حکوومەت پەرەپێدا بەرێگەی بەرهەڵستکارییان لە هەنگاوە سەربازییەکانی حکوومەت دژی بزووتنەوەی گەلی کورد کە ئەمیشیان (واتە: بزووتنەوەکە) پەرەی بە چالاکییەکانی دا بەشێوەیەك بوونە جۆرێك لە تۆڵەسەندنەو دژی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی دەوڵەت مەبەستمان لە هێزە کاریگەرییەکانی سەر گۆڕەپانی تورکیا:

١ـ سوپای تورك: توخمی هاوسەنگیی سیاسی لە تورکیا.

٢ـ حکوومەتی تورکیای خاوەن زۆرینەی پەرلەمانی لە ناو ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکیا.

٣ـ سەرۆکی کۆماری تورکیا، کەوا دەخوازێ بێلایەن بێت بەو سیفەتەی لەسەرەوەی حیزبە سیاسییەکانە، تاوەکو بتوانێ بەشێوەیەکی ورد و بابەتیانە هاوسەنگیی لەنێوان کێشەکاندا بکات... دەبینین (نەجیب توورومتای)ی سوپاسالاری تورکیا بە بۆنەی ساڵی تازەوە پەیامێك ئاراستەی جەندرمەی تورك دەکات تیادا جەخت دەکاتە سەر زەروورەتی بە ئەنجامگەیاندنی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی چڕوپڕ لە ناوچەی رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا لەو ناوچانەی بنکە سەختەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانیان گرتۆتەخۆ بە ئامانجی تێك و پێکدانیان و پووچەڵکردنەوەی پلانەکانی تیرۆریستانی کورد، لە پەیامەکەیدا کە ئاراستەی موشیر (حیکمەت کوگال)ی سەرکردەی جەندرمە و ئاسایش لە ناوچەکە کردووە، دەڵێت: پێویستە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان پەرەیان پێ بدرێ لە دژی پارتی کرێکارانی کورد لە مانگەکانی زستان بە شێوەیەك کاریگەرتر بن لەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییانەی کە لە ئەیلوولی

ساڵی (١٩٨٩) ئەنجام دران، نەخوازە رۆژانە (٢٥) تیرۆیستی کورد دەکوژرێن یان خۆیان دەدەنە دەست هێزەکانی جەندرمەوە)) (١/٤٥).

کاتێك هەڵمەتی زستانەی سەربازی لە رێکەوتنی ١ی ئاداری ساڵی ١٩٩٠ دەستیپێکرد، هێزەکانی جەندرمە و ئاسایشی تورك توانییان (٢٠) هاوڵاتیی کورد لە هەوادارانی بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان دەستگیر بکەن و (٢٠) جەنگاوەری دیکەی بزوتنەوەکەشیان لە (عەزیز) کوشت بە تۆمەتی کوشتنی (٩) هاوڵاتی لە قەزای (بالو) و هەمووشیان لە شەڕڤانانی پارتی کرێکارانی کوردستان و بریتی بوون لە:

١ـ محەمەد عەلی رەزا ئۆغلۆ (کوڕی نوێنەری شاری عەزیز لەسەر لیستی حیزبی رێگای راست).

٢ـ عەلی قەراتابان موختاری گوندی چتورتجیك.

٣ـ عەلی بایرەق و حەسەن قلیج، کە هەردووکیان مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوون.

٤ـ محەمەد عەلی ئاران، کارگوزار(فەراش)ە قوتابخانەی سەرەتایی لە یوغونبیلك.

٥ـ ئەو دوایشیان بریتی بوون لە (١١) هاوڵاتی جوتیاری گوندەکانی دەوروبەر.

لە شاری (ئەنکەرە)ش، دەزگاکانی ئاسایش و پۆلیسی سیاسی تورك (١٩) کەسیان لە ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەستگیرکرد، بە تۆمەتی هەوڵدانیان بۆ پەیداکردنی لایەنگر و ئەندامی نوێ لەنێو چینی قوتابیان و کرێکاران بە ئامانجی راکێشانیان بۆ ناو ریزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان (١٩/٤٧). دەسەڵاتدارانی پارێزگای حوکمی عورفیش (٤٧) هاوڵاتیان لە گوندەکانی پارێزگای هەکاری گلدابوونەوە بە تۆمەتی هاوکاریکردنیان لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان و پێشکەشکردنی کۆمەك و یارمەتی بۆ بزوتنەوەی کورد (١١/٤٨). لەلایەکی تریشەوە، پۆلیسی سیاسی لە شاری ئەستەمووڵ و پاش زانیارییەکی ورد لەلایەن هەواڵگرییەوە (٥) کەسیان دەستگیرکرد، گومانی ئەوەیان لێ کرا کادریان کۆکردۆتەوە بۆ ناو ریزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان (١٩/٤٩).

ئەگەر چاوێك بگێڕین بەناو لیستی ئەوانەی هاوکاریی پارتی کرێکارانی کوردستانیان کردووە، یاخود هاتوونەتە ریزی بزووتنەوەکەوە، دەبینین گوزارشت لەهەموو چین و توێژە جیاجیاکانی گەلی کورد دەکەن: دەوڵەمەند و هەژار، کوڕی نوێنەری پەرلەمان و جوتیاری سادە و هەژار... ئەمەش باشترین بەڵگەیە بۆ جەماوەرێتیی پارتی کرێکارانی کوردستان و

کۆکردنەوەی هەموو چینەکانی گەلی کورد لە دەوری خۆی، بەشێوەك ئەم بزوتنەوەیە وایلێهات لە ئارمانجەکانی جەماوەری کورد و خواست و ئاواتەکانیان بەرجەستە بێت.

جا، ئەگەر دەرەنجامی دروێنەی هەڵمەتی زستانەی هێزەکانی تورك کە لە ماوەی نێوان (١)ی ئاداری ساڵی ١٩٩٠ تاوەکو نیسانی هەمان ساڵ بەردەوام بوو (١٦٢) کوژراوی لەناو بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستانی لە ویلایەتەکانی (ماردین و دیاربەکر و سعرد)ی لێکەوتبێتەوە (١/٤٦)، ئەوا ژمارەی کوژراوەکانی هێزەکانی جەندرمە و ئاسایشی تورك و پارێزگارانی گوندەکان لە عەشایەری کوردی ئالقە لەگوێی تورك، لەژمارەی قوربانیانی PKK کەمتر نەبوو، چونکە پارتی کرێکارانی کوردستانیش لەلایەن خۆیەوە چالاکی و پەلامارە تۆڵە ئەستێنەکانی لە دژی جەندرمە و پارێزەرانی گوندەکان چڕو خەستتر کردەوە. بە نموونە گەریلایەکی پارتی کرێکارانی کوردستان کە بە تۆمەتی کوشتنی (٩) فەرمانبەری دەزگای (رەز)ی تورکی لە ١٩٩٠/٤/٢٠، لەلایەن هێزەکانی ئاسایشی تورکیاوە دەستگیرکرابوو، گوتی: (ئێمە ئەم کارەمان لە تۆڵەی ١٣ جەنگاوەر لە هەڤاڵانمان کە لە ماردین و نەسیبین بەدەستی دەسەڵاتدارانی ئاسایشی تورك و پارێزگارانی گوندەکان کوژران، بە ئەنجام گەیاند، ئێمە مرۆڤی بیگوناه و کرێکار ناکوژین، بەڵکو ئەوانە دەکوژین کە دەیانەوێ لەناومان ببەن)) (١/٥٠).

لەساتە وەختێکی درەنگی شەوی ٢٥ نیسانی ساڵی ١٩٩٠ کۆمەڵێك لە گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، توانییان بارەگای پارێزگارانی گوندەکان لە ئاوایی (قایی) کۆنترۆڵ بکەن و دەستیان گرت بەسەر (١٧) تفەنگ (١٩/٥١) و موختاری ئاوایی (دوکۆن یوردو)ی سەر بە قەزای (ئاروخ) لە ویلایەتی سعرد بەخۆی و باوك و کوڕەکەیەوە بکوژن، لەبەر ئەوەی چاوساغی جەندرمە بوون لە ناوچەکەدا (١/٢٥).

لە ماوەی تەنها (٢٤) سەعاتیشدا شەڕڤانانی پارتی کرێکارانی کوردستان (٦) کەسیان لە پارێزگارانی گوندەکانی سەر بەهێزەکانی تورکیان لە ویلایەتەکانی: هەکاری و قارس و سعرد، کوشت (١٩/٥٣). ئەو شەمەندەفەرە بارهەڵگرەشیان دایە بەر رێژنەی گوللە کە لە (عەزیز)ەوە بەرەو (بدلیس) دەڕۆیشت و توانییان شوفێری شەمەندەفەرەکە و یاریدەدەرەکەی بکوژن، پاشانیش ئاگریان لە ژمارەیەك لە فارگۆنەکانی شەمەندەفەرەکە بەردا، لە کاتژمێر (١٠,٣٠)ی شەوی ١٠ی نیسانی ساڵی ١٩٩٠ یشدا ویستیان ئەو شەمەندەفەرەی کە لە (تاتوان)ەوە روویکردبووە شاری (عەزیز) رابگرن، بەڵام نەوەستا، بۆیە تەقەیان لە شۆفێرەکەی

کـرد و دەسـتبەجێ مـرد، وەلێ یاریـدەدەری شـوفێرەکە شـەمەندەفەری ئـاژۆت و تـوانیی بیگەیێنێتە وێستگەکەی تر (١/١٥٤). دوو چەکداریش هێرشیان بردە سەر وێستگەی بەنزینی ویلایەتی ئایدین لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و پاسەوانی وێستگەکەیان کوشـت و یەکێکی دیکەشیان بریندار کرد، بریندارەکـە ڕەوانـەی خەسـتەخانە کـراو لـەوێ گـوتی: دوو چەکدارەکە گوتیان ئێمە لە جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستانین و ئەو پاسەوانەمان لـە تۆڵەی کوشتنی براکانمان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و لە تۆڵەی ئەو هەڵمەتە لەناوبردنەی حکوومەت لە دژی کورد مومارەسەی دەکات، کوشت (١١/٥٥).

حکوومەتی تورکیا، بەنیازی کۆنترۆڵکردنی شەڕگاکانی پارتی کرێکارانی کوردسـتان، دوو ڕێ و شوێنی ئیداری گرتەبەر.

یەکەم/ لە ٢ی مایسی ساڵی (١٩٩٠)ەوە، هەردوو قەزای (شیرناك و باتمـان)ی کـردە دوو پارێزگای تازەی سەر بە پارێزگای حوکمە عورفییەکان، بەمەش ژمارەی پارێزگاکـانی تورکیـا بووە (٧٣) پارێزگا، ئەو پارێزگایانەش حوکمی عـورفی دەیانگرێتـەوە بوونـە (٨) پارێزگـا و مەڵبەندی حوکمە عورفییەکانیش لە دیاربەکرەوە گواسترایەوە بەرەو شاری (باتمان)ی سەنتەری پارێزگا تازەکە، لەبەر ئەم هۆیانەی لای پایین (١٩/٥٦):

١ـ باتمان فڕۆکەخانەی سەربازی تێدایە، لەبەر ئەمە فڕۆکە کۆپتەرە جەنگییەکانی بومـاو کورکی دەکرێ لێوەی بفڕن بۆ لێدانی بنکە و جم و جووڵەکانی گەرێلاکانی پـارتی کرێکـارانی کوردستان.

٢ـ لەم پارێزگایەدا دەکرێ (٥٠) هـەزار لـەو هێـزە جەندرمانـەی کـە فەرمانـدەی لیـوا حیکمـەت کوکسـال سـەرکردایەتیان دەکـات بحەوێنـەوە، بـۆ ئـەوەی لـە ناوەنـدی بڕیـاری سەرکردایەتیی هێزە چەکدارەکانی پارێزگای حوکمە عورفییەکانەوە نزیك بن.

٣ـ باتمان زۆر نزیکە لە ناوچەی ئۆپەراسـیۆنە سـەربازییەکانی دژ بـە شـەڕکەرانی پـارتی کرێکارانی کوردستان و لە سنوورەکانی هەریەك لە ئێران و عێراقیشەوە نزیکە.

دووەم/ دەرکردنی بڕیارگەلێکی ئیداری هێزی یاسایان هەن، دەسەڵاتی نائاسایی دەبەخشنە پارێزگاری پارێزگای حوکمە عورفییەکان بەشێوەیەکی وا هەردوو دەسەڵاتی جێ بـەجێکاری و دادوەری لەو (١٨) ویلایەتەی حـوکمی عـورفی دەیانگرێتـەوە، لـەژێر دەسـتیدان، تەنانـەت ڕۆژنامەکانی تورکیا ناوبراویان بە (سوپەر پارێزگـار) نـاوبرد، چـونکە هـەموو دەسـەڵاتێکی (سانسۆرو پشکنین و گواسـتنەوە و ڕاگواسـتن)ی لەچوارچـێوەی پارێزگاکـە و لەدەرەوەیشـیدا

بەلاوە بوو بەپێی بڕگە (غ) لە مادە (٤) لە بڕیاری ئیداری ژمارە (٤١٢) کە دەقەکەی بەم جۆرەیە: (پارێزگار مافی هەیە داوا بکات بە گواستنەوەی ئەو فەرمانبەرانەی بوونیان لە کارەکانیان مەترسییە بۆ سەر ئاسایش و سیستمی گشتی لەو ویلایەتانەی ناوچەی حوکمی عورفی دەیانگرێتەوە، لە ویلایەتێکەوە بۆ ویلایەتێکی تر یان بۆ دەرەوەی ناوچەکە بەشێوەیەکی کاتی یان هەمیشەیی و پێویستە لەسەر دەزگاکانی پێوەندیدار دەستبەجێ ئەم داوایە جێ بەجێ بکەن).

ئەمە لە کاتێکدا دەقی مادەدە (٥) لە بڕیاری ئیداریی ناوبراو جەخت دەکاتە سەر (پێکهێنانی دادگایانی تایبەت بە ناوی دادگاکانی ئاسایشی دەوڵەت PCM کە تایبەتن بۆ تەماشاکردنی ئەو کێشانەی لە ناوچەی حوکمە عورفییەکان و ناوچەکانی تر هەن و پارێزگار بەمەترسییان دادەنێت بۆ سەر ئاسایش و سیستمی گشتی، تەنانەت ئەگەر ئەو کێشانە لە دەرەوەی ناوچەی حوکمە عورفییەکانیش روویاندابێت)(١٩/٥٧).

ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکیاش لەلایەن خۆیەوە بڕیاری ژمارە (٤٢٤)ی دەرکرد، بەگوێرەی بڕیارەکە، بڕگە (غ) لە مادەی (٤)ی بڕیاری (٤١٣)ی هەموارکرد و مادەدە هەموارکراوەکە دەسەڵاتی دایە ناوچەی حوکمی عورفی بە (مافی سزادانی ئەو تاك و کۆمەڵانەی پشتگیری یان یارمەتیی یان دالّدەی شەڕکەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەدەن: بە راگواستنیان لە ناوچەکانیانەوە بەرەو ویلایەتەکانی تر لە پارێزگاکانی ناوچەی حوکمی عورفی یان بەرەو دەرەوەی ئەو ناوچەیە بەپێی بەرژەوەندیی ئاسایش و سیستمی گشتی.

هەرچی بڕیاری (٤٢٥)یشە، ئەوا مافی دایە دەست پارێزگاری ناوچەی حوکمی عورفی بە: داوای گواستنەوەی ئەو حاکم و دادوەر و داواکارە گشتی و پیاوە ئیداری و سەرکردە تیپە سەربازییانەی لە ناوچەکەدان جگە لە جەندرمە، بەرە و ئەو شوێنانەی خۆی دیاری دەکات لە پارێزگاکانی ناوچەی حوکمی عورفی یان لە دەرەوەی بە پێی بەرژەوەندیی گشتی چ بەشێوەی کاتی یان هەمیشەیی و پێویستە لەسەر دەزگا پێوەندیدارەکان دەسبەجێ ئەم داوایە جێ بەجێ بکەن (١/٨٥).

دەرکردنی هەردوو بڕیاری کارگێڕیی ژمارە ٤٢٤ و ٤٢٥ لەلایەن حکوومەتەوە بە هەموارکردنی بڕیاری ژمارە ٤١٣ ی تایبەت بە دامەزراندنی پارێزگای ناوچەی حوکمی عورفی، کاردانەوەی توندیان لە ناوەندە سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان لە تورکیا لێکەوتەوە، ئەم ناوەندانە پێیان وابوو حکوومەت بەم دوو بڕیارەی زەبرێك لە دیموکراتی لە

تورکیا دەوەشێنێ و لەهزری دەوڵـەتی یاسـا پاشەکشـە دەکـات و لـە دەقـەکانی دەسـتووری تورکیاش لادەدات.

ئۆپۆزسیۆنی تورکیاش لەمـەڕ ئـەم بابەتـەوە خـۆی کرکـرد یـاخود گـوتی ئـەو بڕیارانـە سەرپێچییەکی یاساییە، نەوەك سەرپێچی دەستووری.

بەڵام سەرۆکی حکوومەت ییلدیرم ئاقبولوت ئەم تۆمەتانەی ڕەتکردەوە و تاکیدی کرد کـە ئەو ڕێ و شوێنانەی حکوومەت گرتنیەبەر هەمووی لەو یاسا حوکمە عورفییەدا هەن کـە لـە ساڵی ١٩٨٣ بڕیاری لەسەر دراوە، و ئێمە هەر بەچـەك بەرپەرچـی چـەك دەدەینـەوە و لـە و بڕیارانەی خۆیشمان کە لە بارەی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵات ی ئەنادۆڵەوە داومانە، پاشـگەز نابینەوە" (١/٥٩).

لێرەشدا وەك ناڕەزایی دەربڕینێك بەرامبـەر بـە بڕیـارە ئیدارییـەکانی حکوومـەت (١٨) نوێنەری کوردی بێلایەن بەر لەوەی حیزبەکەیان دابمەزرێنن، لە نێویانیشـدا ئـاکینی دیکمـەن نوێنەری حیزبی دیموکراتیی سوشیالیستیی میللی بوو لە بینایەی پەرلەمان سەر لـە بـەیانیی ڕۆژی ١٩ی نیسانی ١٩٩٠ پەناگیرییەکیان ڕاگەیاند و تا سەر لەبەیانی ڕۆژی دواتـر بـەردەوام بوو و بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە تیادا داوایانکرد بڕیاری ئیداریی ژمارە (٤١٣) بخرێتە پێش ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکیا بۆ تاوتوێکردن و بڕیار لەسـەردانی و گوتیـان: کاتێـك حکوومەت بە بیانووی قەڵاچۆکردنی تیرۆر لە ناوچەی باشووری ڕۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ، یاسـای کارگێڕیی ژمارە (٤٣) دادەڕێژێ ، ئەوە بەمە دەیەوێ دەستوور و پەرلەمان هـەردوو پێکـەوە یەکبخات و بەم کارەشی هـەوڵ دەدا بـۆ لـە نـاوبردنی ئـازادیی ڕۆژنامەگـەری و ڕادەربـڕین، سەرەڕای هەڵپەساردنی ئەو دیموکراتییە ڕواڵەتییەی کە کودەتای ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ هێنایە کایەوە، ئەوەش لادانە لە پرەنسیپی سەروەریی گەل لە کاتێکدا گەل داوای پانتاییەکی زێدەتر لە دیموکراتی و ئازادیو ئاشتیی کۆمەڵایەتی دەکات (١/٦٠).

لەلایەکی دیکەشەوە، نوێنەرە کوردەکانی ناو حیزبی نیشتمانی دایك کە ژمارەیـان (٣١) نوێنەربوو، هەڕەشەی کشانەوەیان لە حیزبی دەسەڵاتدارکرد لە حاڵێکدا ئەو بڕیارە ئیدارییانەی کە حوکمی یاسایان هەن، هەڵنەوەشێنرێنەوە، بەڕێز (کەمال بیرلك) نوێنەری سعرد و وتەبێژی فراکسیۆنی ڕۆژهەڵات، گوتی: (ئێمە داوای سیستمێك دەکەین خزمەتی گەل بکات لە ناوچەی ڕۆژهەڵات و بەدەنگی داخوازییەکانیەوە بێت و بەرهەڵستیی لەو بڕیارە کارگێڕییانە ناکەین کە تەنها بە ئامانجی بەرهەڵستکاری دەرچوونە. چونکە ئێمـە داخـوازیی عادیلانـە و زەروورییـی

خۆمان هەن، جا ئەگەر ئەو داخوازییانە جێ بەجێ نەکرێن، ئەوا ئێمەش لەبەر ویستو ئارەزووی گەل دەست لەکار دەکێشینەوە، چونکە سانسور هەواڵە ناڕاستەکان قەبەتر دەکات و پڕوپاگەندەش زیاتر دەبێت و وادەکات رووداوە ناواقیعییەکان وەك بڵێی لە واقیعدا روویاندابێ، هەرچی راگواستنیشە، ئەوە رێگە چارەی ماقووڵ نییە بۆ کێشەی ناوچەکە) (١٩/٦٠).

ئەمە وەهاو لەولایشەوە، هەردوو نوێنەر: نورەدین یەلماز نوێنەری دیاربەکر و محێدین موتلو نوێنەری بدلیس سەبارەت بەم مەسەلەیە سەردانی تورگوت ئوزالیان لە کۆشکی کۆماری کرد و دیدارەکەیان لەگەڵ سەرۆکدا دوو کاتژمێری خایاند و دوا بەدوای سەردانەکەیان، هەردوو نوێنەر دڵنیایی خۆیان راگەیاند لەهەمبەر قسەکانی سەرۆکی کۆمار لەبارەی پراکتیزەنەکردنی سانسۆر لەسەر رۆژنامەنووسی و رانەگواستنی هاوڵاتیان لە ناوچەی رۆژهەڵات، چونکە سەرۆکی کۆمار وەك هاونیشتمانی جیاوازیی ناکات لەنێوان کورد و تورك و ئەم قسانەیان گەیاندە هەڤاڵە پەناگیرەکانیان لە پەرلەمان، ئەوانیش لەسەر ئەم قسانە کۆتاییان بە پەناگیرییەکەیان هێنا (١٩/٦٠).

جگە لەوەش (١١) سەندیکای گەورە بە سەندیکای رۆژنامەنووسانیشەوە، رەتیانکردەوە دان بنێن بەو بڕیارە ئیدارییانەو بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکانیان لە تورکیا لەقەڵەم دا.

لەسەر ئارەزووی سەرۆك وەزیرانی تورکیاش (ییلدیرم ئاقبولوت) بۆ دڵدانەوەی ئەو کوردە بیلایەنانەی کە هەر هەموویان بڕیارە ئیدارییەکانی حکوومەتیان ڕەت کردەوە ییلدیرم ئێوارە خوانێکی لە ئەنکەرە بۆ نوێنەرانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات: ئەرتقین، بوردور، ئوردو، ریزە، وان، زونگولداق، ئەرزروم، مرعش، مەڵاتیە، سازدا. لە ئێوارە خوانەکەدا هەریەك لە: (یوسف ئوزال)ی برای سەرۆك کۆمار و مەسعوود یەلمازی وەزیری دەرەوەی پێشوو، ئامادە نەبوون، چونکە لە دەرەوەی وڵات بوون. ئامانجی سەرۆك وەزیران لە سازدانی ئەم ئێوارە خوانە بۆ نوێنەرانی حیزبەکەی لە ناوچەی رۆژهەڵات، ئەوەبوو دڵنیایان بکات کە ئەو بڕیارە ئیدارییانە ئامانجیان راگواستنی هاوڵاتیانی کورد نییە لە ناوچەی رۆژهەڵات و جەختیشی کردەوە کە ئەم بڕیارانە رەنگە هەرگیز جێ بەجێ نەکرێن.چونکە لەوانەیە بارودۆخ پێویست بەجێ بەجێکردنیان نەکات (١/٦١). ییلدیرم بەتوندیش هێرشی کردە سەر سەرانی ئۆپۆزسیۆن و گوتی: کاتێك چەند جمو جوولێك لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ روویدا و ئامانجی پارچە پارچەکردنی یەکێتیی خاکی نیشتمان بوو، حکوومەت بە سەرۆکایەتی سەرۆك کۆمار لەگەڵ سەرانی ئۆپۆزسیۆن کۆبووەوە و لەو کۆبوونەوەیە رێککەوتن لەسەر چەند بڕیارێکی ئیداری لەبارەی ناوچەی حوکمی

عورفییەوە بۆ پاراستنی شەرەف و ماڵ و موڵکی هاونیشتمانییان لەلایـەك و بـۆ بەرقـەراربوونی ئەمن و ئاسایش لەلایەکی ترەوە،بەلاّم ڕێبەرانی ئۆپۆزسیۆن ئێستا ئـەو بڕیارانـە ڕەتدەکەنـەوە و ئیددیعا دەکەن گۆایا ئەو بڕیارانەمان بەبێ تاوتوێ کردن لـە پەرلـەمان، دەرکـردووە و بەمـەش ڕۆڵی پەرلەمانمان لە ژیانی سیاسی تورکیا هەڵوەشاندۆتەوە، لە کاتێکدا ئەوان یەکەم کەس بـوون پەرلەمانیان پەك خست و ڕۆڵیان لە ژیانی دیمـوکراتی هەڵوەشـاندەوە کاتێـك نەیانویسـت بێنـە پەرلەمان و گفتوگۆ لەسەر کێشەی دیاریکردن و هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار بکرێت) (١/٦٢).

پێشتریش، هەریەك لە قایا ئەردەم سـەرۆکی ئەنجومـەنی نیشـتمانیی گـەورەی تورکیـا و ئەردال ئینونۆ سەرۆکی حیزبی دیموکراتی سوشیالیستیی میللـی و سـلێمان دیمـیرال سـەرۆکی حیزبی ڕێگای ڕاست، ڕەخنەیان لە هەڵوێستی حکوومەت گرت چونکە ئەو بڕیـارە ئیدارییانـە پێش دەرچوونیان لە پەرلەمان گفتوگۆیان لەسەر نەکرا، سەرۆکی دادگای دەستووریش ڕەخنەی لە بڕیارەکان گرت و بەلادان لە دەستوور و یاسا کارپێکراوەکان لە قەڵەمی دان (١٩/٦٢).

کاتێك، ڕۆژنامـەی (بـەیرام = جـەژن) ڕاپرسـییەکی لـە نێـو سیاسـەتمەدارو لایەنـەکانی ئۆپۆزسیۆن لەمەڕ کاروباری گشـتیی تورکیـاوە بـە ئـەنجام گەیانـد، کـە ئەمـەش نەریتێکـە کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی تورك پێڕەوی دەکەن و لە پشووی جەژندا ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانـە بـە نـاوی (بـەیرام = جـەژن)ەوە دەردەکـەن بـۆ ئـەوە جێگـای هـاوین لـە جەژنـدا بگرێتـەوە، (ئاقبوولوت)ی سەرۆك وەزیرانی تورکیا لە وەلاّمـی پرسـیاری ڕۆژنامەکـەدا، گـوتی: (پلانـی ئاوەدانکردنەوەی باشووری ڕۆژهەلاّتی ئەنادۆڵ سەرکەوتنی دیاری وەدەستهێناوە لە ناوچەکەدا: ڕێگاوبانەکان قیرتاوکراون و خزمەتگوزاریی کۆمەلاّیەتیی زۆرو خانووی بە کۆمەڵ و کۆمەڵەی هەرەوەزی و بـانکی زۆر دامـەزراون لـە پێنـاو خزمـەتکردنی هاولاّتیـانی ناوچـەکە، ئەمـە پێشکەوتنێکی سەرانسەرییە و بەرجەستەیە لە بڕوابوونمان بە ئازادیی هزرو ڕاو ئابووریی ئازاد و هیچ هێزێکیش ناتوانێ ئەم پێشکەوتنە ڕابگـرێ، بۆیـە هـەوڵ و تەقـەللای شـەڕانگێزانەی جیاخوازان، ئەوانەی لە دەرەوەی ولاّتەوە پشتگیریی دەکرێن و لە ناوچەی باشووری ڕۆژهـەلاّتی ئەنادۆڵ ئاژاوە دەنێنەوە، بێهوودەو مایە پووچ دەبێت، ئێمە بەو هەنگاوە گەورانەی ناومانە لە دەرکردنی ئەو بڕیارە ئیدارییانەی پاڵیان داوە بە دەستوور و یاسای حوکمی عورفیی ناوچەکە، دەستمانکردووە بە ڕیشەکێشکردنی تیرۆریستە جیاخوازەکان لە ناوچەی باشـووری ڕۆژهـەلاّتی ئەنادۆڵ و ئەو ڕێکارە ئیدارییانە دەستی هاولاّتیانی ناوچەکە دەگرن بە مافەکانی خۆیـان شـاد

بن و گورزێکی کوشندەشە بەرامبەر جیاخوازان و کردەوەکانیان و هەوادارانیان، لەبەر ئەوە نابێ بەرامبەر ئەم هەنگاوانە نیگەران بن)) (٦٣/١).

(ئەردال ئینونۆ)ی رێبەری ئۆپۆزسیۆنیش، بۆ رۆژنامەی (بەیرام = جەژن) تاکیدی کرد و گوتی: ((خەڵکی رۆژەکانی جەژنیان بە قورگی پڕ گریان و غەم و کەسەرەوە بەسەر دەبەن لە سای هەڵوێستەکانی حیزبی نیشتمانی دایك کە تا ئێستا سوورە لەسەر مانەوەی لە دەسەڵات ئەگەرچی متمانەی گەلی لەدەستداوە، ئەوانەی درۆیان لەگەڵ هاولاتیان کردو بەواتەی خۆیان گۆیا هەلاوسان بەرەو ١٠٪ کەم دەکەنەوە، ئەمە تەنها بۆ ئەوەی دەنگیان پێبدەن، ئێستا گشت بەیانیانێك پاداشتی هاولاتیان بەجۆرە باجێکی نوێ دەدەنەوە، تەنانەت ژیان وایلێهاتووە زۆر سەخت و لە کێشدا نەبێت، وێڕای هەوڵ و کۆششەکانیشمان تورگۆت ئۆزال بەدەنگەکانی حیزبی نیشتمانی دایك کە خۆی دایمەزراند پێی داگرت: خۆی ببێتە سەرۆکی کۆمار، بەمەش لەو عورفە دەستوورییە لایدا کەوا باوە سەرۆکی کۆمار بێلایەن و لەسەرەوەی حیزبەکانەوە بێت بۆیە ئەو ئیمرۆ وەك سەرۆکی دەوڵەت رەفتار ناکات، بەڵکو تەنها وەکو سەرۆکی حیزبی دەسەڵاتدار رەفتار دەکات، ئێمە بەرهەڵستیی لە هەموو رەفتارە نا دەستوورییەکانی سەرۆکی کۆمار دەکەین و جەختیش دەکەینەوە کە ئەو بڕیارە ئیدارییانەی حکوومەت بە پشتگیریی ئوزال - کە رێگەیەکی ناراستی لە حوکمڕانی گرتۆتەبەر دەریکردوون - بڕیاری ستەمکارانەن من وەك رابەری ئۆپۆزسیۆن بە توندی ئەوە رەتدەکەمەوە لەبەر هەر بیانوویەك بێت زۆر لە هاولاتیان بکرێ زێدو هەوارگەی خۆیان بەجێ بهێڵن و بەرەو ناوچەکانی تر رابگوێزرێن، لە دژی هەموو ئەو بڕیار و رێکارانەشین کە رۆژنامەگەری دەبەستنەوە و ئازادیی بیروڕا لە تورکیا دەمکوت دەکەن، بەگژاچوونی تیرۆریش پێویستە بەو شێوەیە بەڕێوەبچێت لە وڵاتە ئەوروپاییەکاندا باوە و ئاسایش و سەقامگیری و ئاسوودەیی بۆ هاونیشتمانییان دەستەبەر بکات، نەوەك دەوڵەت دەربەدەریان بکات و رایانبگوێزێ، حکوومەتی حیزبی نیشتمانی دایك کە (٧) ساڵە حوکمڕانیی تورکیا دەکات متمانەی گەلی دۆڕاندووە، بۆیە هاولاتیان بەو پەڕی بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانن هەڵبژاردنی پێشوەخت بەڕێوەبچێت بۆ ئەوەی ئەم حکوومەتەیان لەکۆڵ بێتەوە)).

(سلێمان دیمیراڵ)ی رابەری حیزبی رێگای راستیش، گوتی: (ئێمە وەك ئۆپۆزسیۆن روونمان کردەوە کە پشتگیریی لەو بڕیارانە دەکەین لە دژی مافی مرۆڤ نین لە تورکیا و لەچوارچێوەی یاسادان، ئێستاش لەسەر رای خۆمانین، ئێمە دەمانەوێ رێکاری توند بگیرێتەبەر بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخی تورکیا، وەلێ پێویستە ئەو رێکارانە دەرەنجامی باشیان هەبێت و درزی

نویَ نەخەنە سەر ئەو درزە کۆمەڵایەتییانەی هەن، نەخوازە گەر بزانین پێشتر تاقی کراونەتـەوە و بێ سوود بوون، دەبینی لە کاتێکدا دەکرێ لێپرسینەوە لەگەڵ بکوژدا بەرێگەی یاسـاوە بکـرێ و رێ و شوێنی دادوەری لە دژی تێکدەرانی ئاسایش ئەنجام بدرێ، ئەو گرتنەبەری هەندێ هەنگاوی تر بۆ چارەسەرکردنی ئەم جـۆرە کێشـانە بـەهیچ جۆرێـك مەسـەلەکە یـەکلا ناکاتـەوە، ئێمـە دەمانەوێ یارمەتیی هاولاّتیان بدەین و ئەمن و ئاسایشیان بۆ دابین بکـەین نـەوەك رووبـەڕوویان ببینەوە و دژایەتیان بکەین و ئاسایش و سەقامگیرییان لێ هەراسان بکەین، بەکورتی: دەوڵـەتی عوسمانی و ئیدارەی کۆماریش کاتێك راگواسـتنیان تـاقی کـردەوە لـەم کارەیانـدا سـەرنەکەوتن چونکە پرۆسێسی راگواستن دەبێتە ماکی چەندین زوڵم و ستەمکاری، دەوڵەت خـۆی دەبینێتـەوە هیچ توانایەکی نییە بەرامبەر ئـەو تۆمەتانـەی نـەیارەکان ئـاڵ و گۆڕیـان دەکـەن و ناشـتوانێ جیاوازی بکات لە نێـوان هـەق و ناهـەق و دادو سـتەم و هێـز و تواناکـانی پەرتـەوازە دەبـن و دەرەقەتی چارەسەرکردنی نامێنێ و دەبێتە ئامرازێك بۆ زوڵم و ناهەقی، مێژووی تورکیاشمان پڕە لە زۆرێك لەم نموونانە، پێویستە تورکیا تەکانێك بەخۆی بدات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە پـێش ئەوەی هەنگاو هەڵێنێ بۆ راگواستن و نیشتەجێکردنی زۆرە ملێی هاولاّتیان چونکە قوربانیدان بە کۆمەڵێك هاونیشتمانی نابێ ببێتە شێوازێك بۆ راگرتنی خوێنرێژی. گەرەکە حکوومەت چـاوێك بخشێنێ بەو رێکارە ئیدارییانـەی تایبـەتن بـە ناوچـەی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ و بگـرە هەڵیشیانبووەشێنێتەوە، ئەگـەر هـەر پێویستیشـی کـرد بـە پیـادەکردنی هەنـدێك رێکـار بـۆ بەگژداچوونی تیرۆر لە ناوچەکە، ئەوە پێویستە رێکارەکان لە رێگەی پەرلەمانـەوە بێـت، نـەوەك حکوومەت، تاکـە رێگـای چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـانەش بـە دەردیانـەوە دەنـاڵێنن رێگـای دیموکراتییە بەپێی پرەنسیپەکانی ئازادی و بڕوابوونی رەها بەو پرەنسیپانە (١/٦٣).

ئەردال ئینونۆ پاش گەڕانەوەی لە سـەردانە (٥) رۆژییەکـەی لـە (٥ — ١٩٩٠/٥/٩) بـۆ ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، کۆنگرەیەکی رۆژنامەڤانی بەست، لەمیانەیـدا جـەختی کرد، ئەو لەو ناوچەیەوە بەوێنایەکی رەشبین و بەهەستکردن بە تاوان و بەغەم و پەژارەیەکـەوە گەڕاوەتەوە لەو سەردانەدا ئەم خالاّنەی بۆ ساغ بۆتەوە: جمـو جـۆڵی راگواسـتن بـەبێ بڕانـەوە بەرێوە دەچێت، بێکاریش زۆر تەشەنەی کردووە (٤٩٠) قوتابخانە داخراون، خـەڵکی ناوچـەکە بـەهۆی فـەرمانی دەربـەدەرکردن و راگواسـتنی رەمـەکی و لـە کەشـێکی تـیرۆر و فشـار و نارەحەتیدان و لە سای نا سەقامگیری و باری گوزەرانی دژوارەوە لە ترس و لەرزو دڵەراوکـەدا دەژین.

لە بێکاری و قاتو قڕی و ڕاگواستندا دەژین، بە تایبەتی لەو ناوچانەی کردەوەی تیرۆریستی دەیانگرێتەوە و تێدا خەڵکی ڕووبەڕووی فشاری سیاسی زۆر و بێمانا بوونەتەوە، دەسەڵاتە کارگێڕیەکان بەچاوی پڕ گومانەوە دەڕواننە هەر جمو جۆڵێکی خەڵکی و وەك تۆمەتبار و گوناهبار مامەڵە لەگەڵ هاوڵاتیاندا دەکەن، ئەمە وایکردووە جۆرێك لە بێهوومێدی لە ناوچەکەدا بڵاوبێتەوە و زۆریش وەڕز و بێزارن لە کردەوە نامەسئوولەکانی پارێزگارەکانی گوندەکان و پێشێلکاری و ڕەفتارە کوێرانەکانیان کە بارەکە ئاڵۆزتر دەکەن لەم دەڤەرە هەژار و پڕ نەهامەتییەی نیشتمانەکەماندا کە هاونیشتمانییەکان تیادا وا هەست دەکەن بوونەتە خەڵکێکی ناشایستە، چونکە دەیانەوێ لە ژیاندا پەراوێز یان بخەن و دوای ئەوەش ناچاریان بکەن چەك هەڵگرن بۆ بەرگریکردن لە مرۆیی و مافی ژیانیان، حکوومەتی نیشتمانی دایك خۆی بەرپرسیارە لە هەموو ئەو ئازار و مەینەتییانەی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ڕوودەدەن من داوا لە سەرۆك وەزیران بیلدیرم ئاقبولوت دەکەم سەردانێکی ئەو ناوچەیە بکات تا بەچاوی خۆی ببینێت چۆن ئەو هەموو سەروەت و سامانەی دەوڵەت لەوێ تەخشان و پەخشان دەکرێن و هەوڵەکانیش بۆ ئامانجی تر بەفیڕۆ دەدرێن، بۆ ئەوەی قەناعەت بێنێ بە بێهوودەیی ئەو بڕیارە کارگێڕییانە کە حوکمی یاساییان هەیە و حکوومەت بەبێ گەڕانەوە بۆ پەرلەمان بۆ ئەوە دەریکردوون بە ئارەزووی خۆی و بە پێچەوانەی مافی مرۆڤ و هزری دەوڵەتی یاساو پرنسیپەکانی دیموکراتی، سزای هاونیشتمانیانی ئەم ناوچەیەی پێ بدات.

لە کاتێکدا دەبینی شنەبای ئازادی هەڵیکردووە و دیموکراتی لەهەموو سوچێکی جیهاندا سەرکەوتنی گەورەی وەدەستهێناوە، کەچی ئەم حکوومەتەی تورکیا دەیهەوێ لەوێدا ئامرازەکانی خۆی هان بدات بۆ پیادەکردنی دەسەڵات بەگوێرەی هاوکێشەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، ئەوە کارێکی سروشتییە هێزەکانی ئاسایش چەك بەکاربهێنن لە وڵاتێکدا زۆرێك لە چەمك و پرەنسیپەکان مانای ڕاستەقینەی خۆیان لەدەستداوە))(٢/٦٣).

لەناو شایلۆغانی ئەم هەموو لێدوان و کاردانەوە توندو نارەزایی دەربڕین و تۆمەتبارکردنانەدا، پرسیارێك خۆی هەڵدەقورتێنێ: ئایا هەڵوێستی سەرۆکایەتیی کۆمار، یان خودی سەرۆکی کۆمار وەك هێزێکی کاریگەر لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی تورکیا، لە بارەی هەموو ڕووداوەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتەوە چییە؟!

ئەو دەمەی شەڕوپێکدادانی خوێناوی لە ناوچەی ڕۆژهەڵات لەو هەڵمەتەکەی کە لە بەهاردا حکوومەتی تورکیا لەنێوان هێزەکانی خۆی و هێزی بزووتنەوەی پارتی کرێکارانی

کوردستان گەرم بوو، تورگۆت ئۆزال سەرۆکی کۆمار بانگهێشتی ئەو حیزبە سیاسییانەی کـرد کە فراکسیۆنی پەرلەمانیان لە ئەنجوومەنی نیشتمانیی گـەورەی تورکیـا هەیـە لـە کۆشـکی (جانقایا) بارەگـای سـەرۆکایەتیی کۆمـار کۆببنــەوە بـۆ تـاوتوێکردنی بـارودۆخی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ، ئـەوەبوو لـە رۆژی دووشـەممەی رێکـەوتی ۲ی نیسـانی سـاڵی ۱۹۹۰ لوتکەیەك بەسترا بە ئامادەبوونی هەردوو رێبەری ئۆپۆزسیۆن ئەردال ئینونۆ و سلێمان دیمیراڵ، سەرەڕای ئامادەبوونی (ییلدیرم ئاقبولوت)ی سەرۆکی حکوومەت و سەرۆکی پارتی نیشتمانی دایـك، لـەم کۆبوونەوەیـەدا، رای ئامـادەبووان لەسـەر پێویسـت بـوونی بەرەنگاربوونـەوەی بزووتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان بە چەك لەلایەن هێزەکانی ئاسایش و جەندرمەوە کۆك بوو وێڕای ئەوە هەردوو سەرانی ئۆپۆزسیۆن بڕوایان بە متمانەی گەلە بە دەوڵەت لەناوچەکە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی فرمانی لەناوبردنی بزوتنەوەی ناوبراو، لەبەر ئـەوەی ئـەوان (ئۆپۆزسـیۆن) پێیان وایە حکوومەتی ئاقبولوت توانای بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکەی نییە، بۆیە هەردوو رابـەر (ئەردال ئیننۆ و دیمیراڵ) داوایان کرد هەڵبژاردنی پێشوەخت بەر لە ساڵی ۱۹۹۲ بەڕێوەبچـێت بۆ هەڵبژاردنی حکوومەتێکی بەهێز تا لە توانایدا بێت میللەت لەدەوری خـۆی کۆبکاتـەوە و رووبەڕووی پارتی کرێکارانی کوردستان بێتەوە کە لە دەرەوەی وڵات کۆمـەك و پشـتگیری لێ دەکرێ))(۱/٦٦)، بەڵام حکوومەتی ئاقبولوت لەدژی هەڵبژاردنی پێشـوەختەو دەڵێـت، ئـەو دەتوانێـت بزوتنەوەکـە لـەناو ببـات، سـەرۆکی کۆمـاریش بـە پشـتگیریی لـە سـەرۆکی حکوومەتەکەی دەکرد بۆ بە ئەنجامنەگەیاندنی هەڵبژاردنی پێشوەخت، چونکە بیروبۆچـوونیان سەبارەت بەم پرسە، یەك بوو، بـەڵام دیـارە ناکۆکییـەك لەنێوانیانـدا سـەری هەڵـدا بـەهۆی کۆبوونەوەی سەرۆکی کۆمار لەگەڵ ژمارەیەك لە وەزیرەکان و گفتوگۆکردنی لەگەڵیان دەربارەی دەرکردنی ئەو بڕیارە کارگێڕییانەی کە لە حوکمی یاسادان و تایبـەتن بـە ناوچـەی باشـووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵەوە) ئەوەدەمە، ئاقبولوت لەگەڵ ژمارەیەك لەوانەی لێوەی نـزیکن، گـوتی، ئەو زۆر نیگەرانە لە رەفتاری جەنابی سەرۆکی کۆمار، نیگەرانیشە بەرامبەر بەدەرکردنی ئـەم بڕیارە کارگێڕیانە)) (۱۹/٦۷).

وا دیارە خـودی سـەرۆك کۆمـاریش نیگەرانـە لـە قسـەکانی سـەرۆك وەزیـران لـەبارەی نیگەرانیبوونی لـەدەرکردنی بڕیـارە ئیدارییـەکان، چـونکە ئـەو واتـە: سـەرۆکی کۆمـار لـە کۆبوونەوەی پیشەسازیکاران و پیاوانی کـاری تورکـدا، گـوتی: حـەزناکات لـەبارەی ناوچـەی رۆژهەڵاتی تورکیاوە پرسیاری ئاراستە بکرێ) لەم لایەنەشـەوە درێـژەی دایـە و گـوتی: ئێمـە

هەنگاوی زۆرمان ناوە لە بارەی باشووری رۆژهەلاتی ئەنادۆڵەوە، نەوەك تەنها ئەو بڕیارە ئیدارییانەی کە لە حوکمی یاسادان، بەڵکو چەندەها بڕیاری تریشمان دەرکردووە کە لێرەدا ئاشکرایان ناکەم، ئێمە لە دژی تیرۆریستان و ئەوانەش پشتگیرییان لێ دەکەن دەجەنگین، بەلام بەگیانێکی میهرەبانییەوە مامەڵە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەدا دەکەین، بە پشتبەستن بەو رێکارانەش، ئەوا خەباتمان لە دژی تیرۆریستان درێژە دەکێشێ، وەلێ ئێمە سانسۆرمان نەخستۆتەسەر رۆژنامەگەری بەڵکو دەرفەتمان بە رۆژنامەگەری داوە خۆی چاودێریی خۆی بکات، ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان دانیشتوانی ناوچەکە و ناوچەکانی تری تورکیا، بە پێچەوانە، ئەوان وەزیر و نوێنەری پەرلەمان و ئەفسەریان تێدا هەڵکەوتووە، پێوەندیی کۆمەلایەتیی توندوتۆڵمان لەگەڵیاندا هەیە... رەنگە ئێمەش هەڵەمان هەبێت، بەلام ئەمە وا ناکات ببێتە مایەی تیرۆر و کوشتن)(١/٤٧).

لەمیانەی پێشوازیکردنی لە پەیامنێرانی بیانی لە ئەنکەرە، بە بۆنەی جەژنی منداڵ و سەروەریی نەتەوەییەوە لە **٢٣**ی نیسانی ساڵی ١٩٩٠ و لە وەلامی پرسیاری یەکێك لەو رۆژنامەنووسە بیانییانە سەبارەت بە کێشەی کورد، بەڕێز ئوزال گوتی: (کورد لە تورکیا کەمایەتی نین، بەڵکو بەشێکن لە تورکیا جیا نابنەوە و ئەو ناوچانەی کوردیان تیا نیشتەجێیە، وەکو هەموو ناوچەکانی تری ئەنادۆڵ پێشکەوتنێکی سەرتاسەری بەخۆیانەوە دەبینن، وەك چۆن ئامانجی بزوتنەوەی کەمالیزم پێگەیاندنی نەتەوەیەکی تورکی بوو بەیەك زمانی هاوبەش بدوێ) (١/٤٦).

سەرۆکی کۆمار ئەم دەستەواژەیەی دواییی (پێگەیاندنی نەتەوەیەکی تورکی بەیەك زمانی هاوبەش بدوێ) بەم شێوەیە لێك دایەوە و گوتی: (کۆمەڵگەکەمان بۆ چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی، ئاتاجی بە دیالۆگێکی گشتی و دانوستاندنی بنیاتنەر هەیە چونکە کۆمەڵگەی تورکی لەرووی ئەو فرەییەی وڵاتەکەمان پێوەی جیاوازە، وەك هەردوو کۆمەڵگەی ئەڵەمانی و فەرەنسایی نییە، لەبەر ئەوە ناکرێ هیچ تیۆرییەکی رەگەز پەرستی یاخود شۆڤینیستی تیادا پراکتیزە بێت، چونکە هەمە جۆرییەك و تێکەلاوییەك لە کۆمەڵگەی تورکیاییدا هەیە، مستەفا کەماڵیش ئەو دەمەی گوتی: (چەند ئەوە خۆشە کەسێك بڵێ من تورکم) مەبەستی لەو قسەیە ئەوە نەبووە تورك بە باشتر دابنێ بەسەر ئەو نەتەوەکانی تری دانیشتوانی ناو تورکیای تازە دامەزراو، بەڵکو مەبەستی لەم دەستەواژەیە پێکهێنانی گەلێکی یەکگرتووی نوێ بووە، یان پێکهێنانی دەوڵەتێك بە گەلێکی یەکگرتووەوە. ناکرێ بەهێز کێشەکان چارەسەر بکرێن، بەکوتەگیش ئەو کێشە گەورەو زیندووانە چارەسەر نابن کۆمەڵگەی تورکیا

بەدەردیانەوە ئازار دەچێژی و لە ئاکامی پێڕەوکردنی ئەو سیاسەتە لە سەردەمە کۆنەکانەوە پێمان گەیشتووە، کێشە کۆمەڵایەتییەکان و کێشە هەڵپسارداوەکانی ناو تورکیا دەکرێ بە ئاسانی بە دایالۆگ و لێکترحاڵیبوون چارەسەربکرێن، بۆیە فێرکردن و کلتوور و ماریفەت و تەلەفزیۆن بۆ نزیکخستنەوەی راو بۆچوونەکان گرنگیی گەورەیان هەیە و بۆ لێك نزیك کردنەوەی تاکەکانیش لەگەڵ یەکتر گرنگیی گەورەیان هەیە، خۆشەویستی و ڕێزگرتن لەیەکتر و لێکحاڵیبوونیش کۆمەڵگەی بەهێز دروست دەکات) (١٩/٦٨).

جا، لەحاڵێکدا ئەگەر سەرۆکی کۆمار بانگەشە بۆ لێکترحاڵیبوون و ڕێزگرتن لەیەکتر بکات و سەرۆك وەزیرانیش نیگەران بێت لەهەمبەر دەرکردنی ئەو بڕیارە کارگێڕییانەی حوکمی یاسایان هەس. ناوەندە سەربازییەکانیش پێخۆشحاڵ نین دەسەڵاتی کارگێڕی و سەربازی فراوان بدرێ بە پارێزگاری ویلایەتی حوکمی عورفی و نیگەرانی خۆیان دەردەبڕن بۆ دەرچوونی ئەو بڕیارانە کە سەرۆکی کۆمار لە بارەیانەوە گوتی وەك کوتەگ وایە و ئەو کێشانەی تورکیا بە دەردییانەوە دەناڵێنێ چارەسەر نابن، لێدوانی وەزیری رۆشنبیری تورکیاش کاتێك دەڵێت: هەموو هاوڵاتییەك مافی خۆیەتی بەو زمانەی خۆی بیهەوێ بەوپەڕی ئازادییەوە باخێوێ و ئەوە کارێکی هەڵەیە هەندێ لە هاوڵاتیان تۆمەتبار بکرێن لەبەر ئەوەی بەکوردی قسە دەکەن (١/٦٧)، جەختکردنی رۆژنامەگەریی چەپیش لە تورکیا لەسەر پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن حیزبی دەسەڵاتدارەوە و داواکردنی بۆ هەڵوەشاندنەوەی مادەکانی ١٤١ و ١٤٢ و **١٦٣** لە یاسای سزاکانی تورکیا کە کۆت و ئاستەنگ دەخەنە پێش ئازادیی بیروڕا، هەروا داواکردنی ئەنجومەنی ئەورووپی لە حکومەتی تورکیا بۆ زەروورەتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا پێش ساڵی **١٩٩٣** بۆ ئەوەی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپی ببێتە ئەندام کە ئەمەش دوای تاکیدکردنی رۆژنامەکانی رۆژئاوا، بە تایبەتی رۆژنامەکانی ئەورووپا سەبارەت بەوەی کورد لە تورکیا دووچاری فشار و ستەمێکی زۆر بوونەتەوە، ئەمانە هەمووی یانی چی؟!

ئێمە پێمان وایە: بانگەشە و لێدوان و تاکیدنامە و داواکارییەکان هەمووی، تەنها و تەنها بریتی بوون لە دەرەنجامگەلێك بۆ گرتنەبەری هەنگاوی ئەرێنی و ئەکتیڤانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد و ڕێ خۆشکردن بەرەو چارەسەرکردنی ئاشتییانەی کێشەکە، نەخوازە چەند سازشێك لە ئاسۆوە بەلای هەردوو لایەن: لایەنی ڕەسمیی تورکی و لایەنی بزووتنەوەی کورد بەرەو ئەم ئاراستەیە، سەریان هەڵدا، دەبینین حکوومەتی تورکیا لە رۆژی دووشەممە ڕێکەوتی

٤ی شوباتی ساڵی ١٩٩١ یاسای زمانە ناوچەییەکانی خستە بەردەم سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکی بۆ بڕیارلەسەردانی و دوای تاوتوێکردنی پەرلەمان بڕیاری یاسایی لەسەردا، یاسای ناوبراو جەختی کردە سەر مافی قسەکردنی هاونیشتمانییەکان بەزمانی تر بێجگە لە زمانی تورکی و تۆمارکردنی گۆرانی و کاسێت بەو زمانانە، بەو پێیە زمانی تورکی بە زمانی فەرمیی دەوڵەت بمێنێتەوە و هەموو مامەڵەیەکی رەسمیی و خوێندن و فێرکردنیش هەر بە تورکی بمێنێتەوە.

بە پێی یاساکەش نابێ قوتابخانە بۆ خوێندنی زمانە ناوچەییکان بکرێنەوە و سزای پێویستیش دانرا بۆ جێ بەجێکردنی ئەم یاسایە.

بۆ رۆژی دواتر سەرۆکی وەزیران ییلدیرم ئاقبولوت، لە لێدوانێکیدا، گوتی: (حکوومەتی پارتی نیشتمانی دایك، دوای ئامادەکردنی ئەم یاسایە لەلایەن خۆیەوە، هەر خۆیشیی پێشنیاری کرد بخرێتە بەردەمی پەرلەمان، ئەمەش لەروانگەی هەستکردنی بە زەرووەرەتی پیادەکردنی کۆمەڵێکی زۆر لە هاولاتیان مافەکانیانی بۆ دەربڕینی بیروهزرەکانیان بە زمانی خۆیان و پێشنیاری یاساکەش لەژێر فشاری هیچ کۆمەڵ و گرووپێك و تەنانەت ئۆپۆزسیۆنیش نەهاتۆتە بەرهەم)(١/٦٩).

لەبەرامبەر ئەو نیاز پاکییەی کە حکوومەتی تورکیا پێشانیدا بەدانپێنان بە بوونی نەتەوەیی کورد و رێگەیشی دا بەزمانی خۆیان باخێون و کلتووری فۆلکلۆریان دەوڵەمەند بکەن، بزوتنەوەی کوردیش لەلایەن خۆیەوە هەنگاوێکی چالاکی بەرامبەر هەنگاوە دروستەکەی حکوومەت هەڵێنا، ئەوەبوو عەبدوڵلا ئۆجالان رابەری پارتی کرێکارانی کوردستان لە رۆژی شەممەی رێکەوتی ٢٣ی ئاداری ساڵی ١٩٩١ لە لێدوانێکدا گوتی ئەو ئامادەیە بۆ چارەسەکردنی کێشەی کورد لە تورکیا، بە شێوەیەکی ئاشتییانە، دانوستان لەگەڵ بەرپرسانی تورك بکات (١٩/٧٠).

ئەوە یەکەمین لێدوانی بەڕێز ئۆجالان بوو لەمەڕ کێشەی کورد بە رێگەی ئاشتییانەوە، چونکە ئەو پێشتر لە لێدوانەکانیدا بۆ گۆڤاری (دیرشبیگل)ی ئەڵمانی رۆژئاوایی و گۆڤاری (بەرەو ساڵی ٢٠٠٠)ی تورکی تاکیدی کردبوو کە پێی وایە ناوەندە سیاسییەکانی تورك کێشەی کورد چارەسەر ناکەن و کوردیش مافی خۆی بەچەك وەردەگرێ مادامێك هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەیانەوێ کورد لەناو ببەن و تەفروتوونایان بکەن (٢٢/٣٨).

دیاره، لێدوانە ئەرێنییە نوێیەکەی رابەری بزووتنەوەی کورد لە تورکیا، کاریگەریی هەبوو بەسەر ناوەندە رەسمییەکانی تورك ئەوە بوو حکومەتی تورکیاش هەنگاوێکی ئەرێنیانەی تری هاوێشت بە بەرزکردنەوەی یاسای قەلاچۆکردنی تیرۆر لەرۆژی دوو شەممەی رێکەوتی ٨ی نیسانی ساڵی ١٩٩١ بۆ پێش پەرلەمان بە ئامانجی بڕیار لەسەردانی. ئەم یاسایە بڕیار لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ماددەکانی ١٤٠ و ١٤٢ و ١٦٣ لە یاسای سزاکانی تورکیا دەدات کە کۆتبەندی دەخە نەسەر ئازادی ڕادەربڕین و دامەزراندنی حیزبە کۆمۆنیستی و ئاینییەکان، ئەو یاسا بەناو (یاسا خیانەتە نیشتمانییە)ش هەڵدەوەشێنێتەوە کە بە پێی بڕگەکانی، هەر کوردێك داوای مافی نەتەوەیی بکات بە خیانەتی نیشتمانی و هەوڵدان بۆ لەتکردنی وڵات تۆمەتباری دەکات، جگە لەوە یاسای زمانەنا تورکییەکانیش کە رێگربوو لە پێش قسەکردن یان پەخشکردن بە زمانی کوردی، هەڵدەوەشێنێتەوە.

بەلام ئەم ماددە نوێیە چەند پرەنسیپێکی تازە دادەنێت بەپێی دەقە دەستوورییەکان بۆ بەگژداچوونی تیرۆر لە وڵات.

ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکیا لە رۆژی چوارشەممە رێکەوتی ١٠ی نیسانی ساڵی ١٩٩١ یاسای ناوبراوی پەسندکرد، بەو پێیە لە رێکەوتی رۆژی هەینی ١٢ی نیسانی (١٩٩١)ەوە بچێتە واری جێ بەجێکردنەوە.

ئەم یاسایە (یاسای قەلاچۆکردنی تیرۆر) لەلایەن پەرلەمانی تورکیاوە، ئازادی زیاتری بۆ رادەربڕین فەراهەم کرد و هەموو ئەو کۆت و ئاستەنگانەش خرابوونە سەر رۆژنامەگەری، نەخوازە لەسەر هەواڵەکانی ناوچەی حوکمی عورفی، هەڵی وەشاندنەوە و نزیکەی (٤٣) هەزار بەندکراو و حوکمدراو کە (٣/٢) یان کورد بوون لە بەندیخانە ئازادکران، سەرەڕای جێ بەجێنەکردنی حوکمی لەسێدارەدان لە رێکەوتی ٨ی نیسانی ساڵی (١٩٩١)ەوە.

لە ئاکامی دەرچوونی ئەم یاسایە کە چەند رۆژێك بەر لە جەژنی رەمەزان دەرچوو، ئاهەنگ و خۆشی هەموو شوێنێکی تورکیای گرتەوە و هەموو ئەو گیراوانەی تا ١٩٩١/٤/٨ حوکم درابوون لە گرتووخانە بەردران، لەگەڵ چەند مەرجێك بە هەلاوێردەکردنی (استپناو) ئەوانەی بە تاوانی سەربازی و ئاسایشی دەوڵەت و مادە بێهۆشکەرەکان و تاوانی گۆڕینی دەستوور بەزەبری هێز و دەستدرێژیکردنە سەر نامووس حوکم دراون، (یاساکە ئەم کەسانە ناگرێتەوە). لەلایەکی ترەوە یاسای ناوبراو تیرۆریستی وا وەسپ کردووە: (ئەو کەسەی ریزی نیشتمانی تێك دەدات و هەوڵ دەدات بۆ دابەشکردنی وڵات و بە ئەنجامگەیاندنی کردەوەی

تیرۆریستی بەرێککەوتن لەگەڵ کەسێك یان زیاتر، لەم بارەشدا حوکمی بەندکردن لە (٥ — ٨) ساڵ یان بە غەرامەیەکی دارایی لـە (٥٠٠ — ٣٠٠٠) لـیرەی تـورکی، دەیگرێتـەوە و نابـێ هەرگیز تۆمەتبار بە (ئیحتیرازی) رابگیرێت واتە: تەوقیف بکرێت.

ئەم هەنگاوە باشانەی کە حکوومەتی تورکیا و بزوتنـەوەی کـورد نایـان، پێویسـتیان بـە هەنگاوی زێدەتر هەیە بۆ سەلماندنی نیازپـاکی و گێڕانـەوەی متمانـە لـەنێوان هـەردوولا وەك رێخۆشکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا بەشێوەیەکی بنەڕەتییانەی دیموکراتی و رەخساندنی ئاسۆیەکی فراوان لەچوارچێوەی یەکێتی نیشتمانیی تورکیا، ئەمەش ئەو پرەنسیپە بوو (ئوزال) گرتبوویە ئەستۆ بەگواستنەوەی تورکیا بەرەو قۆناغێکی پێشکەوتوو لە کرانەوەی دیموکراتی و سیاسی، بەڵکو یەکەمین سەرۆکی مەدەنیش بـوو لەمێـژووی تورکیـا، فـەرمانی خانەنشینکردنی سوپاسالار (نەجیب تۆرومتـای) کـە یـەکێك بـوو لـە بـەهێزترین ئـەو (٥) ژەنراڵەی ئەنجومەنی ئاسایشی تورك، لە سۆنگەی نـاکۆکیی نێوانیـان (واتـە: نێـوان ئـوزال و تورمتـای) دەرکـرد سـەبارەت بـە بەشـداریکردنی سـوپا لـەهێزی هاوپـەیمانیی نێودەوڵـەتی لەسەروبەندی شەڕی دووەمی کەنداودا کاتێك ئوزال داوای لێکرد باکووری عێراق داگیر بکات، بـەڵام تۆرومتـای ئـەوەی رەتکـردەوە، چـونکە وەك گـوتی: (سـوپا ئەوکاتـە دەکەوێتـە نـاو زۆنگاوێکەوە ناتوانێ لێی دەرباز بێت)، نەك هەر ئەوەش بەڵکو ئـەو (واتـە: ئـوزال) هـەموو بڤەیەکی تێکشکاند و بانگەشەی علیمانییەتبوونی دەوڵەتی کرد و مادامێـك ئـەم پرەنسـیپە بەرهەڵستکاری هەن، بانگەشەی بۆباسکردنی بیرۆکەی دامەزراندنی سیستمی فیـدراڵی نێـوان کورد و تورکیشی کرد لـە تورکیـا، ئەمـەش کاتێـك لـە سـاڵی ١٩٩٣ ڕایسـپارد (جـەنگیز جاندار)ی راوێژکاری رۆژنامەوانییەکەی بڕوات پێوەندیی بە (عەبـدوڵڵا ئۆجـالان)ی -رابـەری PKK و شۆڕشگێڕ لە دژی دەوڵەت لە (١٩٨٤)ەوە و ئەو کەسەی کە دەیهـەوێ کۆمـارێکی کـوردیی مارکسـیزم ـ مـاویزم دابمـەزرێنێ- بکـات بـۆ دانوسـتان لەگەڵیـدا بـە ئامـانجی چارەسـەرکردنی ئاشـتییانەی دۆزی کـورد هەرچـەندە هێـزە چـەکدارەکانی تورکیـا دژی ئـەم مەسەلەیەن و پێیان داگرتووە بۆ بەگژداچوونی تیرۆری PKK بەزەبری چـەك تـا ئـەو کاتـەی ئۆجالان خۆی دەدات بەدەستەوە)(٢٢).

لە روانگەی ئەم بانگەشەیەی (ئوزال)یش بۆ باسکردنی بیرۆکەی یەکێتیی فیـدراڵی نێـوان کورد و تورك، عەبدوڵڵا ئۆجالان سەرۆکی PKK لە ١٥ی ئـاداری سـاڵی ١٩٩٣ یەکلایەنـە

ئاگربەستی راگەیاند، بۆ رەخساندنی هەل لەپێش سەرۆك (ئـوزال) تـا بتوانـێ لەسـەر پـڕۆژە ئاشتییانەکەی لەمەڕ کێشەی کورد بەردەوام بێت (٢٣).

ئەم بانگەشە ئۆزالیزمییە بەشێك بوو لەو بیرۆکە (عوسمانییە نوێیە)ی کـە تێـدا ئامـانجی ئەوەبوو: ناوچەی ئۆراسیا بە کورد و تورك و عەرەبییەوە لە بەلقانەوە بەرەو رۆژهەڵاتی ناوین و ئەنجا قەفقازیا و وڵاتانی ئاسیای ناوین بگێڕێتەوە بۆ ژێر سەرکردایەتیی تورکیا، لەبـەر ئەمـە ئێمـە پێمـان وایـە ئـەم بانگەشـەیەی ئـوزال بـووە هـۆی ئـەوەی هاوپەیمانـە ئـەمریکایی و ئیسرائیلییەکانی وا بکەن کاری پاترییـە بەهێزکەرەوەکـەی دڵـی (ئـوزال) بەرێگـەی مانگـە دەستکردەکانەوە پەکبخەن دوای ئەو نەشتەرگەرییە قەسـتەرییەی کـە لـە دەسـتپێکی سـاڵی ١٩٩٣ بۆی کرا تاوەکو بە مردنێکی کت و پڕ لە ١٧ی نیسانی ساڵی ١٩٩٣ گیانی لەدەست بدات، ئەمەش لەبەر مەترسیی ئەوەی نەبا بگات بەخەونی خۆی بۆ دامەزراندنی یەکێتییەکی ئیسلامیی نوێ لەم ناوچە زیندووەی جیهاندا.

# سەرچاوەكانی بەشی شەشەم


١- گۆڤاری(الدستور) ژمارە(٦) شوباتی ساڵی ١٩٨١

٢- ئیبراهیم داقوقی(فلسطین والصهیونیه في وسائل الإعلام الترکیه) بەغدا ١٩٨٧

٣- رۆژنامەی (الوطن) ی كویتی، ١٩٨٤/٨/١٨

4-hurriyet ga zetesi 24-7-1989

٥- رۆژنامەی(الأنباء) ی كویتی،ژمارەی ١٩٨٤/٨/٢٥

٦- رۆژنامەی(القبس)ی كوێتی ژمارەی رۆژی١٨/١٠م١٩٨٤

7-Hurriyet gazetesi 17-7-1989

٨- ئیبراهیم داقوقی( الصحافة في تركیا) (كتاب تركیا المعاصرة)زانكۆی مووسڵ ١٩٨٧

9- Hurriyet gazetesi 17-7-1989

Milliyet gazetesi 21-7-1989

Tercuman gazetesi 17-6-1989

Cumhuriyet gazetesi 11-8-1989

١٠- گۆڤاری(الاسبوع العربي) ژمارەی رۆژی ٢٣-٧-١٩٨٤

١١- گۆڤاری( فلسطین الثورة) ژمارەی رۆژی ٢٩-٦-١٩٨٥

١٢- رۆژنامەی(الوطن) ی كوێتی ژمارەی رۆژی ١٧- ٤- ١٩٨٥

١٣- رۆژنامەی(الوطن) ی كوێتی ژمارەی رۆژی١٦-٨-١٩٨٥

١٤- رۆژنامەی(الأنباء) ی كوێتی ژمارەی رۆژی ١٠-٧-١٩٨٥

15- Pazar Express Dergisi 22- Nisan 1990

16- Hurriyet gazetesi 17-5-1990

17- Hurriyet gazetesi 20-6-1989

18- Hurriyet gazetesi 23-6-1989

19- Hurriyet gazetesi 17-6-1989

20- Hurriyet gazetesi 23-6-1989

٢١- جەنگیز جاندار، زنجیرە وتارێك لەبارەی دۆزی كورد لە توركیا، رۆژنامەی(الصباح) ی توركی لە(١٩٨٥/١٢/١٧)ەوە.

22- Hurriyet gazetesi 11-6-1989

٢٣- د. ئیبراهیم داقوق- صورة الاتراك لدى العرب/ مركز دراسات الوحدة العربیة بیروت/٢٠٠١.

24- 2000e dogru dergisi, sayi 44, 29 Ekim 1989.

25- Umit zileli; Vur Emri, kaynk yayinlari, 1088.

26- ziz Nesin; Bulgaristanda Turkiede Kurter, Istanbul 1989.

27- 2000e dogru degisi, sayi 46, 6 Kassim 1988.

28- Hurriyet gazetesi, 11-4-1989.

29- Hurriyet gazetesi, 23-8-1989.

30- Gunaydin gazetesi, 12-7-1989.

31- Cumhuriyet gazetesi, 27-12-1989.

32- Hurriyet gazetesi, 20-7-1989.

33- Hurriyet gazetesi, 10-12-1989.

34- Hurriyet gazetesi, 11-12-1989.

35- Hurriyet gazetesi, 14-12-1989.

36- Hurriyet gazetesi, 12-12-1989

37- Hurriyet gazetesi, 11-12-1989.

38- Hurriyet gazetesi, 26-12-1989.

39- Milliyet gazetesi, 27-12-1989.

40- Hurriyet gazetesi, 11-12-1989.

41- 2000e dogru, Sayi 48, 27-12-1989.

42- Nokta derisi, sayi 50, 17-12-1989.

43- Hurriyet gazetesi, 9-12-1989.

44- Hurriyet gazetesi, 12-12-1989.

45- Hurriyet gazetesi, 10-12-1989.

46- Bayram gazetesi, 27-4-1990.

47- Hurriyet gazetesi, 5-5-1990.

48- Hurriyet gazetesi, 1-1-1990.
49- Hurriyet gazetesi, 24-4-1990.
50- Hurriyet gazetesi, 16-5-1990.
51- Hurriyet gazetesi, 8-4-1990.
52- Hurriyet gazetesi, 21-4-1990.
53- Gunaydin gazetesi, 23-4-1990.
54- Hurriyet gazetesi, 26-4-1990.
55- Hurriyet gazetesi, 11-1-1990.
56- Hurriyet gazetesi, 10-5-1990.
57- Hurriyet gazetesi, 11-5-1990.
58- Hurriyet gazetesi, 23-5-1990.
59- Hurriyet gazetesi, 17-5-1990.
60- Hurriyet gazetesi, 13-5-1990.
61- Hurriyet gazetesi, 12-5-1990.
62- Gunaydin gazetesi, 15-4-1990.
63- Hurriyet gazetesi, 20-4-1990.
64- Gunaydin gazetesi, 21-4-1990.
65- Bayram gazetesi, 20-4-1990.
66- Bayram gazetesi, 27-4-1990.
67- Gunaydin gazetesi, 10-5-1990.
68- Hurriyet gazetesi, 10-5-1990.
69- Hurriyet gazetesi, 16-5-1990
70- Hurriyet gazetesi, 3-3-1990.
71- Hurriyet gazetesi, 19-4-1990.
72- Hurriyet gazetesi, 26-6-1990.
73- Hurriyet gazetesi, 5-2-1990.
74- Hurriyet gazetesi, 23-3-1990

هەروەها ئێستگەی مۆنتی کارلۆ ( کاتژمێر ٨ بەکاتی بەغداد) ئێوارەی ڕۆژی شەمە ١٩٩١/٣/٢٣ و دەنگی بزوتنەوەی کورد سەرلە بەیانی ڕۆژی شەمە ١٩٩١/٣/٢٣.

تێگەیشتنمان لە مێژووی گەلانو توێژینەوە لە ململانێ نێودەوڵەتییـەکان، هەقیقـەتێکی ڕۆشنمان بۆ دەسەلمێنن، ئەویش: بوونی بۆشاییەکی ئابووری یان سیاسی یان کۆمەڵایەتییە لـە ناوچەکانی ئەو ململانێیانەی جیهاندا یاخود بە بۆچوونێکی تر: لەوێ دا، نا چوونیەکییەك لـە نێوان واقیعی ئەو گەلانە و نێوان خواست و ئاواتەکانی دوارۆژیاندا، هەیـە. ئەمـەش هـەمان مەسەلەیە لە سەر ڕەوشی کورد لە تورکیا، دەقی گرتووە. ئەو سیستەمە دەستوورییەی تورکیا کە تورکیای کردووە بە دەوڵەتی یاسا، دان بەبوونی نەتـەوەیی کـورد نانێـت، دیموکراتییـەتی تورکیش مافی ڕادەربڕین نادات بە پتر لە ١٢ ملیۆن هاوڵاتی کورد لـەم وڵاتـەی تورکیـا کـە ئەوە زیاتر لە ٣٥ ساڵە هەوڵ دەدات ببێتە دەوڵەتێکی ئەوروپایی هاوچەرخ لە ڕێگەی چـوونە ناو ئەنجومەنی ئەوروپی و لە چوارچێوەی یەکێتی ئەوروپیدا. جا، لەبەرچی تورکیای عیلمانی و دیموکراتی پەرلەمانی دان نانێت بە بوونی نەتـەوەی کـورد لـەم وڵاتـە؟ بۆچـی تورکیـا بـاڵی دیموکراتییەکەی و فرەییەکەی ناکاتە چەترێك بەسەر هاوڵاتییە کوردەکانی خۆی؟! بۆچی، ئەقڵ دەگرێ لەوێ دا دەوڵەتێکی ئەوروپایی هاوچـەرخ هـەبێت. کـە بـەو نزیکانـە تورکیـا پێکـی دەهێنێت، مافی ڕادەربڕین بە هاوڵاتیانی نـەدات؟! ئێمـە هـەوڵ دەدەیـن بـەم باسـانەی لای خوارەوە، وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە:

## باسی یەکەم

## کلتووری کورد لەتورکیا

واقیعی کلتووریی هەر نەتەوەیەك بریتییە لە دەرەنجامی کۆتایی واقیعی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەییی ئەو نەتەوەیە، بۆیە ئەگەر بمانەوێ باس لە کلتووری کورد لە تورکیا بکەین، پێویستە لە هەموو روویەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردە و فێرکردنەوە-ئەگەر بە شێوەیەکی کورتیش بێت- لە کۆمەڵگەی کوردی بکۆڵینەوە، بۆ ئەوەی بیرۆکەیەك بخەینە روو لەمەڕ واقیعی کلتووریی کورد لە تورکیا.

وێڕای ئەوە کورد لە تورکیا حیزبێکی سیاسی ئاشکرای تایبەت بە خۆیان نییە، وەلێ بۆ باشترکردنی گوزەرانی ژیانیان لە نێو حیزبە سیاسییەکانی تورکیا و هەروا لە نێو حیزبە چەپە سوشیالیستییەکاندا، درێژەیان بە خەباتی خۆیان داوە.

بەڵام ئەوەی لە رووی سیاسییەوە جێگیرە و هیچ گومانێکی تێدا نییە، لە رابوردوو و ئێستاشدا کورد نزیکەی ١٥-١٨٪ی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیایان لە خولە پەرلەمانییەکانی لە ساڵی (١٩٢٠)ەوە تا بە ئیمڕۆ، پێکهێناوە هەرچەند کورد لە میانەی خەباتی سیاسییاندا بە راشکاوی ئەم هەقیقەتە نەتەوەیییەیان نەدرکاندووە.

لە رووی ئابووریشەوە، کوردی تورکیا بژێوی خۆیان بە کشتوکاڵی و ئاژەڵداری دابین دەکەن. بە پێی لێتوێژینەوە لە لیست و ئاماری مڵکی دانیشتوانی ناوچەی رۆژهەڵات کە وەزارەتی کاروباری گوندەکانی تورکیا ئامادەی کردووە، (٤٥٪)ی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە وەکو کرێگرتەی کشت وکاڵی لەزەوی و زاری دەرەبەگەکاندا لەو (١٨) ویلایەتەی کورد تیا نیشتەجێن، کار دەکەن. ئیمڕۆیش ئەو (١٨) ویلایەتە بۆتە (٢٠) ویلایەت پاش ئەوە (٢) ویلایەتی تازەی تریان لەو ناوچەیە لە ساڵی ١٩٩٠ زیادکرد، بریتی بوون لە شەرناخ و باتمان، (٢٠) ویلایەتەکەش ئەمانەن: ئەرزنجان، ئەرزروم، قارس، ئاگری، تونجلی، بینگول، مووش، بدلیس، وان، ئادی یامان، مەلاتیە، ئازیغ (عەزیز)، غازی عینتاب، ئۆرفە، دیاربەکر، ماردین، هەکاری، سعرد، شیرناك، باتمان. ئەوسا، (٣٤,٦٪)ی دانیشتوانەکەی لە نێوان یەك دۆنم زەوی تا (١٠) دۆنم زەوییان بە موڵك بەردەکەوێ کە (٥٤,٧٪)ی کۆی زەوی و زاری ناوچەکەی پێکهێناوە، کەچی (٥٥,٦٪) لەوان لە نێوان (١) تا (٢٥) دۆنم زەوی مڵکی هەیە. ئەم زەوی و زارانە هێندە کەمن بەشی ئەوە ناکەن تەنانەت بژێوی تاکە خێزانێکیش دەستەبەر

بکەن، لە کاتێکدا دەبینی دەرەبەگ و ئاغاکـان خـاوەنی مـەزرا و کێڵگـەی گـەورەی وەهـان رووبەری هەریەکەیان دەگاتە زیاتر لە ٢٠٠ دۆنم و مڵکەکانیان دەگاتە نزیکەی ٣٣٪ لە کـۆی ئەو زەوی و زارانەی بۆ کشتوکاڵی دەستدەدەن، ئەگەرچی ئەم ئاغـا و دەرەبەگانـە کـەمتر لـە (٤٪)ی دانیشتوانی ناوچـەکە پێکـدێنن، ئـامێرە کشـتوکاڵییەکانی ناوچـەکەش بـریتین لـە (٢٠١٤) تراکتـۆر بەرامبـەر بـە (٣٩٩) هـەوجاڕی دەسـتی یـان ئـەو هەوجاڕانـەی وڵاخ رایاندەکێشێ. پەروەردەکردنی ئاژەڵیش هێشتا بـە شـێوازی فـرە کـۆن وەڕێوەدەچێت لەبـەر نەبوونی لەوەڕگای تایبەت و توێژینەوەی زانستی و بەیتاڵی هاوچەرخ بـەئامانجی پەرەپێـدان و چارەسەرکردنیان، بۆیە زۆربەی ئاژەڵەکان بە زستانان لەبەر بێبایەخی و کەمی ئالف لەناوچەکە مردار دەبنەوە (٧٠/٣٧).

وێڕای ئەوەی کە چەندین کانزای بەنرخی وەك: زیو و مس و نەوت و فرە کانزای گرانبەهای تر لە کوردستانی تورکیا هەن. وەلێ تەنها (٥,٦٪)ی لە دامـەزراوە و کارگـەی پیشەسـازیی لێیە، کە زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆ ساڵەکانی سییەکانی سەدەی ڕابوردوو ئەگەرچی دەوڵەت لـە ساڵانی هەفتا هەندێ پیشەسازی خۆراکی لە ناوچەی ڕۆژهەڵات دامەزراند، سـەرەڕای ئـەوەی کۆمەڵگەی (کیبان) وزەی کارەبایی بۆ ناوچەی پیشەسازی ڕۆژئـاوای تورکیـا، دابـین کـردووە (کۆمەڵگەی (کیبان) دەکەوێتە سەر چۆمی فورات لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ).

لەگەڵ ئەوەی ڕێژەی کرێکاری کورد تا ساڵانی شەستەکان لە (٤٪)ی تێنەدەپەڕاند، بـەڵام ئەم ڕێژەیە لە ناوەڕاستی هەفتاکان زیادی کرد تا گەیشتە (١٠) هـەزار کرێکـاری کـورد لـە پیشەسازییە کانزایی و نەوتییەکان و چنین و گواسـتنەوە کاریـان دەکـرد. پـارتی کرێکـارانی کوردستان پێی وایە ژمارەی کرێکارانی کورد لـەم ڕۆژگارەمانـدا لـەتورکیا دەگاتـە نزیکـەی ملیۆنێك کرێکار بەو کرێکارە کشتوکاڵیانەشەوە کە بەکرێ (سەپانی) لـە تورکیـا لـە زەوی و زاری شێخ و دەرەبەگەکان (فیودالەکان) کار دەکەن، سەرباری بوونی زیاتر لە چارەگێك ملیۆن کرێکاری کورد لە ئەڵمانیای فیدراڵ و هۆڵەنـدا و سـوێد و فەرەنسـا کـار دەکـەن (١٩,٣٤)، ئەمانە لەبەر ئەو بێکارییە هەڵاتوون کە ئەوڕۆ ڕێژەکەی دەگاتە (١٦٪)ی هێزی کاری تورکیا کە بریتییە لە (٥) ملیۆن کرێکار.

هەرچەندە، حکومەتی کوودەتای (١٢ی ئـەیلوولی ١٩٨٠) یاسـای پەرەپێـدانی ناوچـەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆل، (Gap)ی لە ساڵی ١٩٨٧ دەرکـرد، بـەڵام ئـەم یاسـایە تـەنها بەمەرەکەبی سەر کاغەز دادەنرێ، مادامێك ڕژێمی فیـۆداڵی بـە بەخشـینی تـۆ و پێشـینەی

قەرزی کشتوکاڵی بەشێخ و ئاغا و دەرەبەگەکان، ئامانجی بەدەستهێنانی دەنگی دەنگدەرانە بە شێوەیەکی وا ناوچەکە بۆتە سەرچاوەیەك بۆ بەکارهێنانی زوڵم و ناهەقی و کۆکردنەوەی سامان لە بری ئەوەی بۆ بەرژەوەندی جەماوەرە رەش و رووت و زەحمەتکێشەکەی پەرەی پێ بدرێت و پێشبکەوێت (٨٣/٣٩).

هەرچی پێوەندیی بە واقیعی فێرکردنیشەوەیە، لە بارێکی ئەوەندە دواکەوتوودایە بە شێوەیەك دەزگا پەروەردەییەکانی تورك شەرم دایاندەگرێ ئامارێکی لە بارەوە بهێننەوە. دەبینی لە کۆی (٩٦٧٦) گوندی ئەو ویلایەتانەی باشووری ڕۆژهەڵات، (٤٦٧١)ی گوندیان تەنها یەك خوێندنگەی بنەڕەتییان تێدایە، واتە (٥١,٧٣٪)ی گوندەکان لە خوێندن بێبەشن، بۆیە ڕێژەی نەخوێندەواری لە ناوچەکە دەگاتە نزیکەی (٨٢,٨٨٪)ی کۆی دانیشتوان، لە کاتێکدا ئەو رێژەیە لەگوندەکانی رۆژئاوای تورکیا (١٠٠٪)ی دانیشتوان دەگرێتەوە و رێژەی نەخوێندەواریشیان ناگاتە (١٠٪)ی کۆی دانیشتوانەکەی (٧١/٣٨). لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە جیاوازی کۆمەڵایەتی لە نێوان ناوچە کوردنشینەکان و نێوان ناوچە تورکنشینەکان جیاوازییەکی زۆر گەورە و فراوانە. لەم رووەشەوە، بەرپرسێکی گەورەی تورك، ئەویش سەرۆك کۆماری پێشووی تورکیا بە وەکالەت ئیحسان سەبری چاغلیانگل بوو دانی بەم هەقیقەتە تاڵەدا نا، کاتێك گوتی: (تورکیا لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بووە بە دوو بەشەوە، بەشێکی دەوڵەمەندە تارادەی ئاوسان و بەشێکیشی هەژارە تا رادەی مردن) (٢/٤٠).

بەش بەحاڵی ڕۆشنبیریی کوردیش لە تورکیا، توێژەرەوان و زمانناسانی تورك و ڕۆژهەڵاتناسانی بیانی کۆکن لە سەر ئەوەی کە زمانی کوردی و فارسی لەزمانەکانی رۆژئاوای ئێرانن، بەڵام بەماك و پێکهاتە زمانی کوردی لەزمانی فارسی جیاوازە و بەتەواوی لەم زمانە سەربەخۆیە و زمانەکانی ڕۆژئاوای ئێران- بەدیدی ژمارەیەك لەرۆژهەڵاتناسان- دەبنە دوو بەشەوە: بەشی باکوور و بەشی باشوور. هەرچەندە لە نێوان هەردوو زمانی کوردی و فارسی وێکچوون و نزیکی و تێکەڵاوییەکی گەورە هەیە، لێ جیاوازیگەلێکی روون لە نێوانیان هەیە کە دەبنە بەڵگە بۆ سەربەخۆیی هەریەکەیان لەویتر. جا ئەگەر بزانرێ ئەو بەڵگەنامە کوردییانەی کە لەبەردەستماندان و تا ئێستا ناسراون، کۆنترن لەبەڵگەنامەکانی (سەردەمی فارس)ی زمانی فارسی کە تیادا توانی قەوارەی خۆی بپارێزێ، ئەوا جیاوازی بنەڕەتی نێوان هەردوو زمانەکە وەك رۆژی رووناك دەردەکەوێت (٣١٣/١). جیاوازی زەقی نێوان هەردوو

زمانیش (واتە: کوردی و فارسی) دەکرێ لە (٥) رووەوە دیاری بکەین: درکە (تلفظ)، پێکهاتە (بنیە)، دارشتە (صیغە)، دەستووری سەرف و دەستووری ڕێزمان.

زانا و مێژوونووسی کورد، خوالێخۆشبوو محەمەد ئەمین زەکی ئەو جیاوازییانە، بەم شێوەیە شرۆڤە دەکات و دەڵێت: جیاوازی لەفزی بەزۆری لەنێوان هەردوو پیتی (ر) و (ل)ی سووك و قەڵەودا و هەروا لەنێوان (د) سووك و قەڵەودا هەن. جیاوازی بنەڕەتیش لە گۆڕینی لەفز و وشەکان دەبینین، وەك: واژەی (ئاتەش)ی فارسی کە بەرامبەرەکەی واژەی (ئاگر)ی کوردییە. جیاوازییەکانی: دارِشتە (صیغە) و دەستووری ڕێزمان و سەرفیش لەتەسریف و پێکهاتەی واژە و کار و رستەکاندا دەبێت. وەك (فەرستاد)ی فارسی کە لەکوردیدا بەمانای (ناردی، شاردی) دێت و هتد... (٣١٣/١).

لە دەرەنجامی پێوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و ئاینییەکانیش ژمارەیەکی زۆر لە واژەی: عەرەبی و فارسی و تورکی و ئارامی و ئەرمەنی و کلدانی هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە، ئەمەش وایکردووە زمانی کوردی هەم دەوڵەمەند و هەم خەڵکی کوردزمانیش ئاتاژی لە ژیانی ڕۆژانەیان لە هەموو سووچێکی کوردستان بۆ فەراهەم بێت و کاریگەری نەبێت بۆ سەر ماکی زمانی کوردی و پێکهاتە سەربەخۆییەکەی هەرچەندە زاراوەی جیاجیا هەن. لەم لایەنەشەوە گەڕیدەی ناسراوی تورك، ئولیا چەلەبی ئاماژەی داوە کەزمانی کوردی دابەش دەبێتە سەر (١٥) شێوەزار، ئەوانیش: (٧٥/٢).

ڤاڤا (زازا)، لولو، عونیکی، مەحموودی، شیروانی، جزیرتوی، باتی، سنجاری، حەریری، ئەردەلی، سۆرانی، خالدی، جەکوانی، عیمادی، رۆژێکی. کەچی زانای کورد محەمەد ئەمین زکی- بە گواستنەوەی لە گارزۆنییەوە، چەند شێوەزارێکی تری خستۆتە سەر ئەم (١٥) شێوەزارانە، بریتین لە : کوار، بدلیس، جولەمیرگ، سلێمانی، بۆتان (٣١٨/١)، وەلێ زمانناسانی کورد کۆکن لە سەر ئەوە کە (٤) شێوەزاری سەرەکی لە زمانی کوردیدا هەن بەم شێوەیەی لای خوارەوە (٢٦/٣):

١- شێوەزاری زازا (ڤاڤایی) کوردی دیاربەکر و ئەرزەنجان و هەروا ناوچەکانی (زەهاو و کرماشان)ی ئێرانیش پێی داخێون.

٢- شێوەزاری کرمانجی رۆژهەڵات: شێوەزارەکانی سۆرانی و بابانی و موکری و ئەردی و کەڵوڕی و گۆران، دەگرێتەخۆ.

٣- شێوەزاری کرمانجی باکوور و رۆژئاوایی، ئەو شێوەزارانە دەگرێتەخۆ کە کوردی زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی تورکیا، وەك: بۆتانی، بادینی، شەمدینی، بایەزید و هەکاری و هەروا ناوچەکانی باکووری سووریاش، پێی داخێون.

٤- شێوەزاری لوڕی: بەختیاری، لەك، فەیلی.

لە بارەی شێوەزاری ئەدەبیشەوە، ئەوا توێژەرەوان و زمانناسانی کورد رێککەوتنێکی وایان لە نێودا نییە بۆ ئەم مەسەلەیە، چونکە ئەدیب و رۆشنبیرانی کورد بەرهەمەکانیان بەشێوەزارە سەرەکییە جیاجیاکان و هەریەکەو بەگوێرەی شوێنە جوگرافییەکەی، یاخود بەهاندانی حوکمڕان و فەرمانڕەواکانیان، دەنووسن. بە نموونە: فەرمانڕەوای گشتی میرنشینی ئەردەڵان، لە کۆشکەکەی خۆیدا هانی شیعر گوتنی بە شێوەزاری هەورامی (گۆران) دەدا، فرە چامە شیعری دڵداری بەرز و چیرۆکە شیعری تەڕ و لەبار و دانسقە بەم شێوەزارە، دۆزراونەتەوە (١/٣٢٠). لە کاتێکدا دەبینین کلتوورێکی ئەدەبی باشیش بە شێوەزاری هەکاری بوونی هەس، لەم لایەنەوە شاعیری ناودار و بەناوبانگی کورد ئەحمەدی خانی شوێنەوارێکی ئەدەبی بەهادار و پڕ بە نرخی بەجێ هێشتووە (١/٤٢٠)، لێ کوردی کوردستانی تورکیا لەئێستادا وایان پێ باشتر بەرهەمە ئەدەبییەکانیان بە شێوەزاری کرمانجی و زازایی بنڤیسن (٤/١).

بەش بەحاڵی کوردی عێراقیش، ئەوان ئاسەوارە ئەدەبییەکانیان بەشێوەزاری سۆرانی- کرمانجی خواروو، دەنووسن ئەم شێوەزارە لەعێراق نەخوازە لە بیستەکانی سەدەی رابوردووەوە و هەر لە ڕۆژگاری حکوومەتی شێخ مەحموودی حەفیدەوە، بۆتە زمانی ئەدەبی کوردی و زیاتریش دوای دانپێنان بە مافی نەتەوەیی گەلی کورد لە عێراق لەساڵی ١٩٧٠ و (دامەزراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عێراق) پەرەی سەند، بەتایبەتیش کاتێك زمانی کوردی بووە زمانی فێرکردن و خوێندن و پتر لە (٩٠) کتێبی قوتابخانە بەم شێوەزارە دانرا، سەرەڕای ئەوەش ئەدیب و رۆشنبیرانی کورد لە چوارچێوەی یەکێتییەکەیاندا لە هەولێر بەرهەم و دانراوەکانیان بە شێوەزاری سۆرانی (کرمانجی خواروو) بڵاو دەکەنەوە، هەرچەند ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە بە کەمایەتییەکی کوردی دەژمێردرێ لە چاو زۆرینەی کورد بە شێوەزاری کرمانجی سەروو داخێون تاببێتە زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کەزۆرینەی کورد لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی گەورە پێی دەنووسن.

هەرچەندە ئێمە لە بارەی ئەدەبی کلاسیکی کوردییەوە بەر لە ئیسلام، شتێك نازانین، بەڵام بێگومان کوردیش وەك گەل و نەتەوەکانی دیکەی جیهان، خاوەنی فۆلکلۆر و هونەری میللی و

مۆسیقا و ئەفسانە نەتەوەییەکانی خۆیانن، لەوانە ئەفسانەی زوحاکی خوێنمژمان پێگەیشتووە. زوحاك- (یان سەهاك= وەرگێڕ) پادشایەکی ئێرانی بووە، ئەفسانەکە دەڵێت: پادشا ئالوودەی نەخۆشییەکی سەیر دەبێت، گۆیا بە سەر هەر شانێکییەوە، مارێك دەردەچێت، حەکیمەکان لەقەرەیاندا نابێت شیفای بۆ بدۆزنەوە، جا، شەیتان دەچێتە ژێر کلێشەی و بەگوێیدا دەچرپێنێ رۆژانە هەتوانێك- مەرهەم= وەرگێڕ- لەمێشکی دوو لاو بەکاربێنێ بۆئەوەی ببێت بەخۆراکی هەر یەك لەو دوو مارە، تا ئازارەکانی هێور ببنەوە. پادشای ستەمکاریش فەرمان دەدا رۆژانە دوو لاو بۆ ئەم ئامانجەی بکرێنە قوربانی. بەلاّم جەللاد بەزەیی بەیەکێك لەو دوو لاوە دەهات و بەنهێنی بەرەڵلای دەکرد و لە جیاتی ئەو مێشکی مەڕێکی بەکار دەبرد، ئیدی ئەوانەی نەجاتیان دەبوو، هەڵدەهاتن و پەنایان دەبردە بەر ئەو چیا دوورە دەستانەی کەس نەیدەتوانی پێیان بگات، لەوێش ژمارەیان زیادی کرد تا گەلێکی گەورەیان پێکهێنا و ناوی گەلی کورد[10] بوو کە بە سەرۆکایەتی کاوەی ئاسنگەر لە دژی زوحاك راپەڕی و کوشتی و بەو جۆرە گەلی کورد رزگاری بوو کە ئیمڕۆ ژیانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بەسەردەبات و بە نەبەردی و ئازایەتی ناسراوە وعاشقی جوانی و چیا و شاخ و باخ و رەنگی ئاڵ و والاّ و سەوزییە. ئەم ئەفسانەیە وەك ئەفسانە دێرینەکانی دیکەی دنیا، یەکێکە لە ئەفسانەکانی ئەفراندن گەلان لەدێر زەومانەوە زانیویانە و بەرجەستە لە شانازی نەتەوەیی بەپێناسەی گەلی کورد و گرنگی و رۆڵ و فامی قووڵی لە هەمبەر ژیان و بەها بەرزەکانی چاکە و کرداری چاك دەکات، ئەمەش بە روونی لەو پەندە میللییە کوردییانە بەدەر دەکەوێ کەمانای قووڵیان پێداگرتنە لە سەر کار و کۆشش و هاندانی خەڵکی بەرەو ئەم ئاراستەیە (١/٥).

ئەدەبی فۆلکلۆری گەلی کورد، جۆرێکی تری شیعری میللی بە خۆوەی بینی، پێی دەڵێن (بەیت)، زۆربەی ئەم (بەیتە) وەك ئەودوای ئەدەبی میللی کورد، دانەرەکەی نەناسراوە. لەگەڵ ئەوەی ژیانی کورد پڕە لە رووداو و دیرۆکی گەورە و گران لە (کوردستان)ی نیشتمانی رەسەنی خۆیان، وەلێ کورد نەهاتوون ئەو رووداو و دیرۆکانە تۆماربکەن، ئاسەوارە ئەدەبییەکانیشیان

---

١٠- گێڕانەوەی ئەم ئەفسانەیە هەڵەی تێکەوتووە، چوونکە پێش زوحاکیش کورد هەر میللەت بووە، بەلاّم لێرە وا پیشان دراوە وەك پەرچە کردارێك دژی زوحاك یەکیان گرتووەتەوە و میللەتی کوردیان پێکهێناوە.(وەرگێر و پێداچۆرەوە)

پشتگوێ خستووه و هیچ کامێکیان پێمان نەگەیشتووه، ئەگەرچی ئەدیب و نووسەرانی کورد پاشماوەی ئەدەبی زیندووی خۆیان بە چەند زمانێکی تر- غەیری زمانە کوردییەکەیان- بۆ بەجێ هێشتووین، بە شێوەیەکی وا ئەوانە بەو زمانانە داخێون، ئەم ئەدیب و نووسەرە کوردانەیان بەرۆڵەی خۆیان (نەتەوەکانی خۆیان) داناون و وایان هەژماردوون تێکەڵاوی نەتەوەکانیان بوونە، من پێم وایە هیچ مافێکمان نییە سەرزەنشتیان بکەین، چونکە بە کەمزانینی زمانە نەتەوەییەکە لەلایەن زانایان و ئەدیبانی کوردەوەو گرنگی نەدانیان بەکلتوور و ئەدەبە رەسەنەکەیان وایانکردووە ئەو مێژووناس و زانایانەی مافیان بەخۆیان داوە هەقیقەتەکان تۆمار بکەن لە تێگەیشتنی هەقیقەتی رەچەڵەکی ئەو رۆشنفکرە کوردانە گومڕابن. لەبەر ئەوە پێویستە لێبورەییمان هەبێت بەرامبەر ئەوانەی لە کوردبوونی ئەو زانایانە گومانیان کردووە. بەنموونە: مەلیك تاجولمولوك ئەبو سەعید بووری کەیەکێك بوو لە پادشاهانی ئەیوبیە لەساڵی ٥٧٩ك-١١٨٣ز کۆچی دوایی کردووە. ئیبن موستەوفی ئەربیلی لە ساڵی ٦٣٧ك-١٢٣٩ز کۆچی دوایی کردووە. ئیبن خەلەکان ساڵی مردنی ٦٨١ك-١٢٨٢ز. سەیفولدین ئەبوبەکر ئەیووبی ساڵێ مردنی ٧٢٧ك-١٣٢٧ز. ئەبوفیدا ئەیوبی ساڵی مردنی ٧٣٢ك-١٣٣٢ز. مەولانا ئیدریس بدلیسی ساڵی مردنی ٩٢٦ك-١٥١٩ز. موفتی پهقەلەین ئەبو مەسعوود عیمادی ساڵی مردنی ٩٨٢ك-١٥٧٤ز. ماە شەرەفخان- مەستوورە کوردستانی- ئەردەلانی ساڵی مردنی ١٢٦٣ك-١٨٤٧ز. عایشە تەیموری ساڵی مردنی ١٣٢٠ك-١٩٠٢ز (١/٣٣٣). مەحموود تەیموور چیرۆکنووس و زانای فۆکلۆری میسر و نووسەری تورکیا دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت و زۆری تر لەوانەی بەرهەمەکانیان بەغەیری زمانی کوردی نووسیوە[11]

لەلێکۆڵینەوەی توێژەرەوانی کورد وا دەردەکەوێت، شیعر یەکەمین تۆمارکراوی کوردی بووە کە لەسەدەی چوارەمی کۆچی بەرامبەر بەسەدەی دەیەمی زایینی- دەستیپێکردووە. شاعیری سۆفینیزم بابا تاهیری هەمەدانی (٤٠١ك-١٠١١ز) یەکەمین شاعیری کورد بوو شیعرە غەزەلی و لاهووتییەکانی بەشێوەزاری گۆران و لەشێوەی ٦٢ چوارینە شیعر نووسراون،

---

١١- لەم لایەنەوە گەلێك کەڵە ئەدیب و نووسەری بەرەچەڵەك کورد هەڵکەوتوون، وەك شاعیری گەورەی میسر ئەحمەد شەوقی و قاسم ئەمین، هونەرمەند، مەحمود ملێحی..هتد. وەك رۆماننوسی گەورەی تورکیا یەشار کەمال و سەلیم بەرەکات و عەلی ئەشرەفی دەروێشیان و زۆری تریش.(وەرگێڕ)

زۆربەیان تایبەتمەندی ئەندێشەی بەرز و جوانی ئیلهام و گڕی سۆز و هەستناسکییان پێوەهەن، بەڵام فەلسەفەی بابا تاهیر لەرووی رۆح و ژیانەوە بەتەواوی لەگەڵ فەلسەفەکەی عومەر خەیام، جیاوازە (٣٣٤/١). (عەلی تەرمۆکی)یش دووەمین ئەدیبە مێژووی ئەدەبی کوردی ناوی بەنەمری پاراستووە، ئەم زانا کوردەش کە لەسەدەی چوارەمی کۆچی ژیاوە، یەکەمین کتێبی لەبارەی دەستووری سەرف و رێزمانی کوردی ئێستاوە داناوە، بەڵام کتێبەکە پێمان نەگەیشتووە، بەڵکو تەنها ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامی ناوی بردووە، سەرەڕای چەند چامە شیعرێکی بەزمانی کوردی، لەساڵی ١٩٣٧ وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فەرەنسی و لەپاریس بڵاوکراونەتەوە.

توێژەر و مێژووناسی ناسراوی کورد محەمەد ئەمین زەکی، ناوی (٥٠) ئەدیب و زانای ناوداری کوردی ژماردووە، بەرهەمەکانیان بەزمانی کوردی دایك لەسەرانسەری کوردستان لەسەدەی دەیەمی زاینییەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەجێ هێشتوون، لەسەرووی هەموویانەوە: مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و نالی و حاجی قادری کۆیی و مەولەوی و شێخ رەزای تاڵەبانی و جەمیل سدقی زەهاوی و ...هتد (٣٥٠/١). تەنها لەشاری سلێمانیش و تا پەنجاکانی سەدەی بیستەم (٨٧) شاعیر و ئەدیب و زانای کورد هەڵکەوتوون و بەرهەمەکانیان بەزمانی کوردی داناوە (٢٩٦/٦).

چاکەی پێشکەوتنی رۆشنبیری کوردی لەتورکیا، دەگەڕێتەوە بۆ سەر دەستی بنەماڵەی پێشووی بەدرخانیەکان، ئەوەبوو مەدحەت بەدرخان پاشا. یەکەمین رۆژنامەی کوردی (کوردستان)ی دەرکرد، عەبدولرەزاق بەدرخانیش یەکەمین قوتابخانەی کوردی لە (خوی) لەساڵی ١٩١٣ دامەزراند و جەلادەت بەدرخانیش یەکەمین کتێبی بۆ ئەلفبای کوردی دانا (٥٥/٣٨).

ئەگەرچی، ئەدەبی کوردی توانی بازنە ناوچەییەکانی ببەزێنێ بەرەو پانتاییە بەرینەکانی جیهان، ئەویش کاتێك ئەدیبی فەرەنسی رۆجێە لیسکۆ لەساڵی ١٩٤٢ هەڵسا بەوەرگێڕانی شاکارە بەناوبانگەکەی ئەحمەدی خانی (داستانی مەم و زین) کەوا بەچیرۆکە شیعرێکی دانسقە و جوان و رەوانو سەرنجڕاکێش و ناسك و پڕ سۆزی گەرم دادەنرێ، بۆسەر زمانی فەرەنسی، هەروا (بەدەوی ئەلجەبەل)یش شاعیری لوبنانی لە شانۆگەرییەکی شیعری تەڕ و جوان و دڵڕفێن هەمان داستانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام چەندین نموونەی شیعری لە ئەدەبی کوردی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، وەرگێڕدرابوونە سەر زمانەکانی: ئینگلیزی و

ئەڵەمانی و فەرەنسەیی بەتایبەت شیعرەکانی شاعیری ناسراوی کورد مەلای جزیری (٨/٧).
لەورا، بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەگەری کوردی لەدوای کوودەتای عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨[١٢]
فاکتەرێکی گرنگ بوو بۆ بڵاوکردنەوەی نموونەکانی ئەدەبی کوردی. دەبینی تەنها لە شاری
(ئەستانە) (٥) ڕۆژنامەی ڕۆژانە بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەردەچوون و چەندین
رۆژنامەی کوردی- فارسیش لە ئێران و هەروا لە بەغداش چەند رۆژنامەیەك بە هەردوو زمانی
کوردی و عەرەبی لە دەستپێکی سەدەی بیستەمەوە، دەردەچوون، هەر لە شاری بەغداش
رۆژنامەی (هدیە کوردستان- دیاری کوردستان) بە هەرسێ زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی
لە ساڵی ١٩٢٥ دەردەچوو (٣٥٣/١).

وێرای فرەیی و بڵاوبوونەوەی رۆژنامەی کوردی لە دەوڵەتی عوسمانی و پاشانیش لە
کۆماری تورکیا لە ساڵانی هەوەڵێدا، بەڵام لە ناو کوردی تورکیادا ئەدیب و شاعیری گەورە
هەڵنەکەوتن. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ستەم و زۆرداریییەی رژێمەکانی تورکیا-
لەوەتی دەوڵەتی تورکیا دامەزراوە- لە دژی کورد و کلتوور و رۆشنبیری کورد لە تورکیا
پیادەی دەکەن. بە نموونە سەرباری قەدەغەکردنی ئاخاوتن و نووسین بەزمانی کوردی لە تورکیا
لە ساڵی (١٩٢٦)ەوە، لێ ئەو بەرنامە گۆرانییە فۆلکلۆرییەی بەناو: "چەند ئاوازێك لە
وڵاتەکەمەوە" کە رادیۆکانی تورکیا بڵاوی دەکەنەوە، تەنها گۆرانی و سترانی فۆلکلۆری
تورکی لەو پارێزگایانەوە پێشکەش دەکردن کە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان کوردن، بەم
هەوڵەشیان پەردەیەکی تاریکیا بە سەر فۆلکلۆری کوردیشدا دەدا لە تورکیا لە بری ئەوەی
هانی پەرەسەندنی ئەم کلتوورە بدەن. بەڵام سەرەڕای ئەوەش لاوانی ڕۆشنبیری کورد لە ساڵانی
شەستەوە دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی شیعری کودی لە ڕۆژنامە پێشکەوتووخوازە
کوردییەکاندا، نووسەری کوردی پێشکەوتووخوازیش (موزەفەر ئەردۆست) خانەی
بڵاوکردنەوەی چەپی دامەزراند و بە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ خانەی (کۆمەڵە) چەندین
کتێب و دانراوی کوردی لە چاپدا، وەك: فەرهەنگی کوردی- تورکی و رۆمانی (شەڤارەش) و
داستانی (مەم و زین) بە زمانی کوردی و بەپیتی لاتینی. ئەو نووسەر و ئەدیبە هاوچەرخانەی
بە زمانی کوردی لەم وڵاتە دەنووسن، وەك: مووسا عەنتەر و محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان و

١٢- پێش کودەتای ئیتحاد و تەرەقی ١٩٠٨ ڕۆژنامەی کوردستان لە ساڵی ١٨٩٨ بە زمانی کوردی لە
قاهیرە دەرچوو.٠(وەرگێڕ و پێداچۆرەوە)

موزەفەر ئەردۆست و حەسەن حوسنی دیمیراڵ و ئومید زیلەلی و هەردوو رۆمـانـنووس: یەشـار کەماڵی لەمێژینە پاڵێوراو بۆ وەرگرتنی پاداشتی نۆبڵ لە ئاداب و محەمەد ئوزون و هەر یـەك لەم ئەدیبە گەنجانە: حسێن ئالمالی و لەیلا زانا و سۆزان سامانچی و جەمیلە چـاكار و عـەلی مەناز و راغیب زراقولو و یەشار قایا و جەمیل باقی، سەرەڕای ئەم شاعیرانە: حەسەن ییلـدیز و عەونی ئوزدەمیر و محەمەد چـەتین و ئەحمـەد عـارف و غونچـای غونكـور و جگـەرخوێن و نووسەری سینەماكار یەلماز گۆنای، لە ریزی پێشەوەی ئەو رۆشنبیرانەوەن كە بە لێكۆڵینەوە و توێژینەوە ورد و بڵاوكراوەكانیان ژیانی كورد و ئێش و ئازار و غـەم و خواسـتەكانی ئاینـدە و خەباتی نەتەوەیی كوردیان بەرجەستە كردووە لە توركیا لە هەموو روویەكەوە، جگـە لـەوەش چەندین هونەرمەندی كوردی وەك: شڤان پەروەر و بەدری ئەیالی و حەسـەن حوسـنی و عـارف ساغ و ...هتد گۆرانی فۆكلۆری كوردییان لە ئاهەنگە تایبەت و گشتییەكان گوتـووە، وێـرای ئەوەی بەرپرسانی تورك ئەمەیان لێ قەدەغەكردووە. بەنموونە: بەرپرسانی ئاسایشی تـورك لـە دیاربەكر گۆرانیبێژی میللی كورد (بەدری ئایالی)یان بـانگ كـرد و لێكۆڵینـەوەیان لەگەڵـدا كرد، چونكە چەند گۆرانییەكی بە كوردی لەو ئاهەنگە ئێوارە خوانەی لە سەر شەرەفی (ئەردال ئینۆنۆ)ی سەرۆكی حیزبی دیموكراتی سوشیالیستی میللی بە بۆنەی سەردانەكەیەوە بۆ ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە یەكێك لە میوانخانە گەشتیارییەكانی شاری دیاربـەكر لـە ٩ی مایسی ساڵی ١٩٩٠ سازدرا، پێشكەش كرد و گۆرانییەكان بەوپەڕی خۆشـی و بەگەرمییـەوە لەلایەن ئامادەبووانەوە پێشوازی لێكرا (٢٢/٨).

داواكاری گشتی كۆماری دادگاكانی ئاسایشی دەوڵەتیش لەئەنكەرە، مانگێك دوای ئەوە، لێكۆڵینەوەی لەگەڵ نوێنەری ویلایەتی ئیجل (ئیستمیحان تالای) بەرەگەز كورد كرد كە دواجا پۆستی وەزیری رۆشنبیری لەحكوومەتە ئیئتیلافییەكەی ئەجەوید وەرگرت چـونكە بانگەشـەی كردبوو بۆ ئەوەی ئازادیی پەخشكردنی رادیۆیی بە زمـانی كـوردی لـە رادیۆكـانی توركیـاوە فەراهەم بێت (١٩/٩). نەك هەر ئەوە بگـرە دام و دەزگـا ئاسایشـییەكانی رژێمـی توركیـا، هەموو ئەو كتێب و بڵاوكراوە كوردییانەیان یەكسەر دوای دەرچوونیان لە بازاڕ و كتێبخانەكان كۆدەكردەوە، بۆیە كوردیش، بەتایبەت رۆشنبیرەكان ناچار دەبوون خۆیـان دەسـتاو دەسـت بـە سەر هاوڕێ و خوێنەر و ناسراوەكانیاندا بڵاویان بكەنەوە. هەر لە سـەر زێـدەڕۆیی بەرپرسـانی توركیش بۆ كپكردنی دەنگی كورد لە توركیا، وەزارەتی ناوخۆ هەردوو گۆڤاری (بـەرەو سـاڵی ٢٠٠٠)ی هەفتانە و رۆژنامەی (هەقیقەت)ی میللی رۆژانەی داخست و بۆ یەكجاری قەدەغەی

کرد دەستا و دەست بکرێن و بڵاوببنەوە. ئەم بڕیارەش لە سەر داوای والی پارێزگـای ناوچـەی حوکمی عورفی لە ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠ دەرچوو و بڕیاری داخستنەکە بە هەریەك لە محەمەد سەبونچی خاوەن ئیمتیازی گۆڤـاری (بـەرەو سـاڵی ٢٠٠٠) و (عیسـمەت ئاتـەش)ی خاوەن ئیمتیـازی رۆژنامـەی (هەقیقـەت)ی میللـی راگەیـەێنرا. وەزارەتـی نـاوخۆ هۆکـاری داخستنی هەریەك لەو دوو گۆڤار و ڕۆژنامەیەی گەڕاندەوە بۆ ئەوەی گۆیا: بـە بڵاوکردنـەوەی هەواڵە چەواشەکاری و نادروستەکانیان لـەبارەی ئەشـکەنجەدان و چەوسـاندنەوە و راگواسـتنی دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان و هاندانیان بەرەو یاخیبوون و بەرخودان لـە دژی هێزەکـانی حکومەت و ئاسایش، لەو ناوچەیە کەشێکی ناسەقامگیرییان دروست کردووە، ئەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی  باری گشتی و وادەکات هێزەکانی ئاسایش لە ناوچەی باشـووری رۆژهـەڵات نەتوانن بەرێك و پێکـی ئەرکـەکانیان بـەجێ بگەیـەێنن. بـەڵام سـەبەبکاری راسـتەقینە لـە پشتەوەی داخستنی ئەو دوو بڵاوکراوەیە، بەتایبەت گۆڤاری (بـەرەو سـاڵی ٢٠٠٠) ئـەوەبوو: سەرنووسەرەکەی نووسەرێکی کوردی چەپی ناسراوە، کە ئەویش بەڕێز (دوغۆبیرنجیك)ە و گۆیا بە رێگەی دۆزینەوەی ئـەو دیکۆمێنتـە کـە مسـتەفا کـەمال ئـەتاتۆرك دوای دامەزرانـدنی تورکیای تازە ئیجاد بەڵێنی دابوو مافی ئۆتۆنۆمی بە کورد بدات، کێشـەی کـورد لـەتورکیا دەهورووژێنێ، سەرەڕای ئەوەش چووە لێکۆڵینەوەیەکی رۆژنامەوانی فراوانی لەگەڵ عەبـدوڵڵا ئۆجـالان سـەرۆکی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان ئەنجامـداوەو کـاتی خـۆی ئـەو دیـدارە رۆژنامەوانییە فەرتەنەیەکی گەورەی لەناوەندە رۆژنامەنووسی و سیاسییەکانی تورکیا، نایەوە.

سەرۆکی کۆمەڵەی رۆژنامەنووسانی تورك ئۆرهـان ئـاریچ، بەرامبـەر بـە بڕیـاری ژمـارە (٤٢٤)ی (٨)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠ نارەزایی دەربڕی کەمافی بەوەزارەتی ناوخۆ داوە- لە سەر داوای پارێزگاری ناوچەی حوکمی عورفی- رۆژنامەکان دابخات بە بیانووی بڵاوکردنـەوەی یان ناراستگۆیی هەواڵ و دوور لە ڕاستی و گەورەکردنی هـەواڵ و رووداوەکـان و گـوتی: ئـەم بڕیارە زەبرێکی گورچکبڕە لە هەمبەر ئازادی رۆژنامەنووسی لە تورکیا و کـۆتکردنی ئـازادی رادەربڕینی گەلی تورکیاشە (١/١١). لە هەمان کات، ئوکتـا ئاکشـی سـەرۆکی ئەنجومـەنی رۆژنامەگەری رەخنەی لەبێدەنگی حیزبە سیاسییەکان لە سەر دەرچوونی بڕیارەکـە لـە لایـەن حکومەتەوە گرت و گوتی: "کاتێك ئەو حیزبانە بە رێگەی رۆژنامەگەریی ئازادەوە پێویستیان بـە بـەرگریکردن لـە خـۆ هـەبێت، ئـەوە کـاتی بەسەرچـووە" (١/١٢). بـەڕێز ئاکشـی سەروتارێکیشـی لـە رۆژنامـەی حورییـەت، بـەو سـیفەتەی سەرنووسـەری رۆژنامەکەیـە،

بڵاوکردەوە، تیادا گوتی: "ئەو کەسانەی دەپرسن چۆن دەکرێ سیستمی دیکتاتۆری لەوڵاتێك بەرپابێت، پێیان دەڵێین لێرە و لەوێ بۆ ئەوە مەگەڕێن، چونکە وڵاتەکەمان بە هەنگاوی خێرا بەرەو ئەو ئاقارە دەڕوات. کە دەشپرسن چۆن؟! دەڵێین: ئەگەر کەسێکی سیاسی وەکو وەزیری ناوخۆ چاپخانەکان دابخات و دەرچوونی رۆژنامە و گۆڤارەکان هەڵبوەشێنێتەوە، مەگەر کەسێك دەتوانێ نەهێڵێ سیستمێکی دیکتاتۆری لەم وڵاتە بەرپابێت؟! بیروبۆچوونی گۆڤاری (بەرەو ساڵی ۲۰۰۰) و دیدی سەبارەت بە کێشە گشتییەکان هەرچۆنێك بن، بۆچوونی رۆژنامەی هەقیقەتی میللیش هەرچۆنێك بێت، ئەوا داخستنی هەردووکیان نموونەیەکە بۆ ئەم ئاراستە کەڵەگایەتییە (دیکتاتۆرییە) لە تورکیا. دەڵێن پارێزگاری ناوچەی حوکمی عورفی خۆی لەو کارە بەرپرسیارە. یانی پارێزگار دەیەوێ بێژێ: یان ئەوەتە بە ئارەزووی ئێمە بنووسن و ستایشی کار و سەرکەوتنەکانمان لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بکەن، یانیش ئەوەتە کڕ و بێدەنگ و بە سەرکوتکردن و لەناوبردن رازی بن (۱۹/۱۳).

هەرچەندە، حکومەتی تورکیا لە ساڵی ۱۹۹۱ دانی نا بە مافی قسەکردن بە زمانی کوردی و پیادەکردنی چالاکی فۆکلۆری، بەڵام ئەم مافە مەسەلەی بڵاوکردنەوە و راگەیاندنی نەدەگرتەوە، لەبەرئەوە دەبینین دەزگاکانی ئاسایشی رژێمی تورکیا لە ۲۸ی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۹۱ دەرهێنەری سینەماکاری کورد (سلێمان تورگۆت) کە مانگێك بوو سەرقاڵی دەرهێنانی فیلمی (دوو ئەڤینداره کوردەکە) بوو دەستگیر کرد، بە بیانووی لێکۆڵینەوە.. رەشنووسی فیلمەکە و وێنەگیراوەکانیشی هەمووی دەستیان بە سەرداگیرا. کەچی دواجار پۆلیسی تورکیا بێئاگایی خۆی لە بارەی مەسەلەی گرتنەکەوە دەربڕی، دەرهێنەری کوردی بەستەزمانیش چووە ناو لیستی ونبووەکانەوە و فیلمەکەشی شوێن بزر بوو و هەردوو ئەویندارى کوردیش هەتا نهۆ چاوەڕوانی رۆڵ بینین لە فیلمی ناوبراودا.

لەساڵی ۱۹۹۲ بەدواوە، گۆڤاری (رۆژی وڵات) و ئەنجا (وڵات) و پاشان (ئۆزگور گویندم) دەرچوون، بەڵام وەزارەتی ناوخۆ بە تۆمەتی جوداخوازی هەمووی داخستن. دوای ئەوە خانەی بڵاوکردنەوەی (دنك) رۆژنامەی (ئۆزگور باقیش)ی دەرکرد، ئەمیشیان بە دەردی ئەوانیتر داخرا، دواجاریش (ئۆزگور پولتیکا) لە ئەستەموول و بەرلین لەگەڵ پاشکۆی (هیوا)ی ئەدەبی دەرچوو و ئێستاش بەردەوامە و بەرهەمی ئەدیب و شاعیران لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و سیاسی رۆژانە بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی بڵاودەکاتەوە، بێجگە لەمە گۆڤارێکی دیکەش بە ناوی (سەر بە خۆییبوون) بە زمانی کوردی دەردەچێت.

## باسی دووەم
## دوارۆژی دیموکراتی لەتورکیا

شۆڕشی چاکسازی کەمالیزمی کە لەساڵی (١٩٢٨)ەوە دەستیپێکرد، زیاتر شۆڕشێکی رۆشنبیری بوو نەك شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بنەڕەتی، چونکە ئەو ریفۆرمە گشتگیرییەی (کەمال ئەتاتۆرك) هێنایە کایەوە، وایکرد بە درێژای نیو سەدەی رابوردوو تورکیا بکات بە وڵاتێك بە دوای رواڵەتدا نەك چەشنە ئەوروپاییەکە هەڵپە بکات، چونکە ئەو ریفۆرمە لە دەرەنجامی پەرەسەندنێکی سروشتییەوە نەهات، بەڵکو بە رێگەی هێز و لە سەرەوە سەپێنرا. ئەتاتۆرك بەڵێنی دا لەو رابوردووە عوسمانییە دابڕێ کەنزیکەی (٦) سەدە درێژەی کێشا، بۆ ئەوەی بێتە ریزی جیهانی نوێوە و تورکیا لە داب و نەریتی ئیسلامی ریشەکێش بکات و خەلافەت هەڵبووەشێنێتەوە فێس بۆ شەپقەی رۆژئاوایی بگۆڕێ و ئەنکەرەی گەوری دێ بکاتە پایتەختی تورکیا و دەزگای ئەرتەشی تورکی کردە سانسۆر و ئەمیندار بە سەر جێبەجێکردنی باشی ئەم چاکسازییانە کە توانی چەندەها جار هاوسەنگی بگێڕێتەوە بۆ کۆمەڵگەی تورکی و لە سەر رێچکەی کەمال ئەتاتۆرك بەرەو پێشەوە هەنگاو هەڵێنێت. بەڵام ئەو بۆشاییە گەورەیەی شۆڕشی رۆشنبیری کەمالیزم، لە نێوان بژاردەی رۆشنبیری خاوەن بیروڕای عیلمانی و نێوان جەماوەری لکێنراو بە چەمك و بەهاکانی ئیسلامییەوە کردییەوە، لە میانەی (٨٠) ساڵی رابوردوو، ئەمەندە فراوان بۆوە بە رادەیەك بووە جۆرێك لەجیابوونەوەی زەقی نێوان هەردوو لایان، تەنانەت جووتیارەکان، ئەو چەپە تورکانەی کە زۆربەیان لە چینی رۆشنبیر و خوێندکاری زانکۆ بوون، یان دەیانکوشتن یاخود دەیاندانە دەست دەسەڵاتدارانی رژێمی تورکیاوە، گۆیا ئەمانە بە وتەی ناوەندە راستڕەو و رەسمییەکان کافرن و بڕوایان بە ئایینی ئیسلام نییە، ئەگەرچی ئەو خەباتگێڕانە لە پێناو خودی چینی رەش و رووتی جوتیار و رەنجدەران تێدەکۆشان، بەڵکو گیانیشیان دەکردە قوربانی لە پێناو رزگارکردنیان لە کۆیلایەتی و دەرەبەگ و چەوساندنەوەی سوودخۆران و سەرمایەدار و زوڵم و زۆرداری حکوومەتە کۆنەپەرستە راستڕەوەکان.

تورکیای ئەمڕۆ، بە دوای پێناسە ونبووەکەی خۆیدا دەگەڕێت، پاش ئەوەی بە هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت و دوورکەوتنەوەی لە هزری یەکێتی ئیسلامی، رۆحە عوسمانییەکەی

بەلاوە نا.. بۆ گەیشتنیشی بە کاروانی ئەوروپای پێشکەوتوو ئەتاتورکیزم ئاواتەکانی بۆ وەدی نەهێنا، لێرەشدا ململانێی ئێستای سەر گۆڕەپانی تورکیا لە بازنەی چەند کێشەیەکی سەرەکی دەخولێنەوە، ئەوانیش بریتین لە:

## یەکەم: ململانێی ئاینی– عیلمانی:

لە دەستپێکی هاوینی ساڵی ١٩٢٠ (ساڵی دووەمی جەنگ لە دژی داگیرکەران)، مستەفا کەمال دەستی بە لێتوێژینەوەیەکی قووڵ و چڕ و پڕکرد لە بارەی ئایینی ئیسلام و چەندین سەردانیشی بۆ لادێی تورکیا بە ئەنجام گەیاند، فرە کەڕەت رووی دەکردە بەجێگەیاندنی فەرزی نوێژی هەینی و دەچووە سەر مینبەر و بە شێوەی زارەکی بۆ کۆمەڵی ئامادەبووان لە میانەی وتارەکانیدا باسی لەمەڕ گرنگترین ئەو چاکسازییە ئایینیانە دەکرد کە پێویستە لە پاش کۆتایی هاتنی شەڕ جێبەجێ بکرێن. ئەوی ڕاستیش بێت دوای سەرکەوتنی گەورەی مستەفا کەمال لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٢١ بە سەر یۆنانییەکاندا، ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیا نازناوی (غەزاگێڕی سەرکەوتوو لە شەڕی پیرۆز)ی پێ بەخشیو (١٠/١١) کردی بە (ئەتاتورك) واتە: باوکی تورك و رابەری نەمر لەگەڵ ژیان.

ئەگەرچی مستەفا کەمال بۆ کۆنگرەی ئیسلامی گشتی لە شوباتی ساڵی ١٩٢١ لە شاری (قۆنیە) و رازی بوو، لە سەر ئەو سروودە نیشتمانییە تورکییەش کە (محەمەد عاکف)ی شاعیری ناسراو بە بۆچوونی ئیسلامی دایناپوو هەروەها ئەنجومەنی نیشتمانی تورکیا لە ساڵی یەکەمیدا بڕیاری حەرامکردنی مەی و قوماری دا و یەکەمین کابینەی حکوومەتی مستەفا کەمال وەزیرێکی شەریعە و لێژنەیەکی شەریعەتی لەخۆگرتبوو بۆ بەدواداچوونی هەموو یاساکانی تورکیا بۆ جەخت کردن لەسەر لە گونجانیان لەگەڵ شەریعەتی ئایینی ئیسلام و ئایینی ئیسلامیشی بە ئایینی رەسمی دەوڵەت ناساند، بەڵام لە هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت سڵی نەکردەوە، هەرچەندە لێژنەی شەریعەت بە توندی بەرهەڵستی لەو کارەی کرد، دیسا خانەقا و تەکیە و کۆلێژە ئایینییەکانی داخست و بانگی نوێژەکانی لە عەرەبییەوە گۆڕی بۆ تورکی و فەرمانیدا قورئانی پیرۆزیان گۆڕییە سەر زمانی تورکی و رۆژی یەکشەممەکانیشیان لە بری رۆژانی هەینی کردە پشووی رەسمی دەوڵەت و مزگەوتی (سانتاسۆفیا= ئایەسۆفیا)شی کردە مۆزەخانە و دانی نا بەزەواجی مەدەنی و بەوەش موسلمان سەرپشك بێت ئایینی خۆی بەو ئایینە بگۆڕێت ئارەزووی دەکات.. سەرباری هەموو ئەم کارانەشی لە ساڵی ١٩٣٧ بە

ڕەسمی لە دەستووری تورکیا بڕیاری بە عیلمانییەتبوونی دەوڵەت درا وەك یەكێك لە پرەنسیپە بنەڕەتی و گەوهەرییەکانی دەوڵەتی تورکیای هاوچەرخ.

وەلێ ئێمە پێمان وایە ئەم هەنگاوانەی بۆ ئـەوە نـەبوو دژایـەتی ئیسـلام بکـات، یـاخود ماسۆنی بووبێـت، -پێشـتر لـە کتێبەکـەمان (فەڵەسـتین و زایـۆنیزم لەمیـدیاکانی تورکیـا) دژایەتیکردنی مستەفا کەمالمان لەبەرامبەریان سەلماند- بەڵکو ئامـانجی جیاکردنـەوەی ئـایین بوو لە دەوڵەت دوای ئەوەی سیستمی خیلافـەت بـووە ئامرازێـك بـەلای هێـزە کۆڵۆنیالییـە ئەوروپاییەکانەوە، پیاوانی ئایینیشی لە دەسەڵات دوورخستەوە لەبەرئەوەی بووبوونە ماشە بە دەستی داگیرکەری بیانییەوە، بە تایبەتی پـاش ئـەوەی شیخولئیسـلامی دەوڵـەتی عوسمـانی مەحموود سەبری ئەفەندی چـووە ریـزی کۆمەڵـەی هـەوادارانی ئینگلیـز و چـەندین فـەتوای بـەکافربوونی مسـتەفا کـەمال و بزوتنەوەکـەی بڵاوکـردەوە و کوشتنیشـی بـەرەوا لـە رووی شەرعەوە زانی، چونکە رشتنی خوێنی ئەو کەسەی لەدژی سوڵتان شەڕ دەکات لە رووی شەرع و ئایینەوە حەڵاڵە، ئەمە لە کاتێکدا رووی دا مستەفا کەمال شەڕێکی سەختی لەغەزایـەکی پیرۆزدا لە دژی داگیرکەران بەرپاکردبوو، نەك تەنها موسڵمانانی تورك پشـتگیرییان لێـدەکرد، بەڵکو هەموو موسڵمانانی رۆژهەڵاتی ناوینیش، تەنانەت موسڵمانەکانی هیندستانیش کۆمەك و یارمەتییان بۆ بزوتنەوە نیشتمانییەکەی دەنارد (١٤/١٠).

ئێمە لەو بڕوایەداین مستەفا کەمال ئەتاتورك شۆڕشگێڕێکی ئازاد و بـڕوای بـەدیموکراتی هەبوو و لەگەڵ خۆی و بیر و باوەڕەکانی ڕاستگۆ بووە، چونکە دەیتوانی سیسـتمی خیلافـەت نەخوازە پاش ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی نەما، وەك ئامرازێك بەکاربێنێ بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی تورك لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا، بگرە دەشیتوانی پاش ئەوەی بووە پاڵەوانی رزگاریخواز و رزگارکەر و دامەزرێنەری تورکیای تازە، ناوی خـۆی بـە خەلیفـەی موسـڵمانان جـاڕ بـدات، بەمەش ئیمپراتۆرییەتێکی تورکیایی نوێی لە چەشنی ئیمپراتۆرییەتە پێشووەکانی رۆژهەڵاتی ناوین دادەمەزراند. بەڵام ئەتاتۆرك هەموو ئەو هەلانەی رەتکردەوە کە پاڵیان پێـوە دەنـا بـۆ دووبارەکردنەوەی ئەزموونی ئیمپراتۆرییـەتی عوسمـانی، چـونکە تـەنها خواسـتی ئـەوە بـوو دەوڵەتێکی تورکی نوێ لە چەشنی ئەوروپی دابمەزرێنێ. لێرەشدا پرنسیپە روون و راشکاوەکەی خۆی بڵاوکردەوە: (ئاشـتی لـەوڵات و لـەجیهان) واتـە: دابـین کردنـی ئـەو خواسـتە لـە نـاو چوارچێوەی تورکیای ئێستا. بەمەش دوو چۆلەکەی بە بەردێك پێکا، یەکەم: دوورکەوتنەوە لە هزری یەکێتی ئیسلامی، چونکە هەر نەتەوەیەکی موسلمان خەسـڵەت و تایبەتمەنـدی خـۆی

هەیە و لەوانیتر جیاوازە. دووەمیش: ئەو بیرۆكە تۆرانیزمەشی پێڕەو نەكرد كـە بانگەشـە بـۆ كۆكردنەوەی هەموو تورك دەكـات لـە بـاكووری چـینەوە تـا دەریـای سـپی نـاوین لـە ژێـر سەركردایەتی توركیای تازە دامەزراو.

كەمال ئەتاتۆرك رەخنەی زۆری لێگیراوە، وەك: پیـادەكردنی سیسـتمی تاكـە حیزبـی لـە وێنەی ئەڵمانیای نازی و وەرگرتنـی مادەكـانی ١٤١ و ١٤٢ و ١٦٣ لـە مـادە و بڕگـەكانی یاسای سزاكانی ئیتاڵیای فاشیزمی ساڵی ١٩٣٣ كە كۆتبەندی دەخەنە سەر ئازادی رادەربڕین و دژایەتی هەموو هزرێكی پێشكەوتووخواز، بەتۆمەتی كۆمۆنیستییەوە، پاشگەزبوونەوەی لە بەڵێنی خۆی بەرامبەر بە كورد سـەبارەت دانپێنـانی بـە مـافی نەتـەوەییان لـە ئیرادەیـەكی ئۆتۆنۆمی بۆ دەستەبەركردنی یەكێتی نیشتمانی.

بەڵام كەمال ئەتاتۆرك بە تایبەتی پاش ئەوەی لە دژی هێزە ئەوروپیەكان وەستا و هەیبەت و رێزی توركیای بـەرزكردەوە، كەسـێك ناتوانـێ تۆمـەتباری بكـات بـە بـەكاربردنی پایـە و دەسەڵاتی بۆ كۆكردنەوەی سامان و دەوڵەمەندبوونی شەخسی خۆی، یان وەدەستهێنانی سـوود و قازانج بۆ كەس و كار و خزمەكانی یاخود بۆ بەتاڵانبردنی ماڵ و سامانی گەل و دانانیان لـە بانكەكانی سویسرا لە سـەر حیسـابی خـۆی، بـۆ كڕینـی دوورگـەی گەشـتیاری لـەدەریای كاریبیدا. بەڵكو لە ماڵێكی خاكەڕاو لە گەڕەكێكی پایتەختەكەی لە (ئەنكەرە) ژیـا و تاكـە ئۆتۆمۆبیلێكی مارسیدسی هەبوو كە ئـەدۆلف هیتلـەر لـە سـاڵی ١٩٣٣ پێشكەشـی كـرد. هیتلەر هەمان جۆرە ئۆتۆمۆبیلیشی بە شا (غازی)ی یەكەم پێشكەش كردبوو، ئێسـتاش ئـەو مارسیدیسەی ئەتاتۆرك لە مۆزەخانەی ئەتاتۆرك لە (ئەنكەرە) پارێزراوە.

هیچ گومانێك لەوەدا نییە، مستەفا كەمال، هەڵەی سیاسی و ئـابووری و كۆمەڵایـەتی خـۆی هەیە وەك هەموو ئەو سەرۆكانەی ویستوویانە بەتاكڕەوی دەسەڵات پیادە بكەن، بەڵام ئەو هەڵانـەی لە هەمبەر خەسڵەتە كەسایەتییەكانی و جۆشی نیشتمانپەروەری و دڵسۆزی بۆ بـیر و باوەڕەكـانی و خۆشەویستی وڵات و نەتەوەكەی، لە ژمارە نایەن. ئەمە ئەو هەڵانەن كە گەلی تـورك دەركـی پـێ كردبوون و هەستی دەكرد تا چەند مەترسییان بۆ دروست كردوون و ئـەمڕۆ گەیشـتۆتە قەناعـەتێك راستیان بكاتەوە و دەرەنجامەكانیان بۆ سەر ئایندەی خۆی و ئایندەی وڵات وەلاوەنێت.

دەستپێشخەرییەكانی ئەم رابوونە ویژدانییەش لـە سـەروبەندی شـەڕی دووەمـی جیهـانی سەریان هەڵدا كاتێك دەسەڵاتی دەوڵەت و فەرمانڕەوایی بەسـەر گەلەكەیـەوە سـووك بـووەوە كەبەهەست و هوشیارییەكی بەرزەوە پەرۆشی گەڕانەوە بوو بەرەو داب و نـەریتی ئیسـلامی..

ئەوە بوو لە دەستپێکی ساڵی ١٩٤٥ تورکیا پێی دەنایە قۆناغێـك لـە ئـازادی و بوژانـەوەی سیاسی و ئایینی، کاتێك سەرۆکی تورکیا (عیسمەت ئینۆنۆ) بلاَوی کردەوە پێشوازی لە فـرە حیزبی دەکات، پاش ئەوەی حیزبی گەلی کۆماری تاکە حیزب بوو لە دەستپێکی دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە تا ساڵی ١٩٥٠ جڵەوی دەسـەڵاتی گرتبـووە دەسـت، بۆیـە کۆمـەڵێك لـە ئەندامی رۆشنفکری بە بیر و بۆچوونی ئیسلامی ناو ئەو حیزبە حیزبێکی نوێ بە ناوی حیزبی دیموکراتییەوە دامەزراند، ئەم حیزبە لە بەرنامـە نوێیەکەیـدا رەتـی کـردەوە عیلمانییـەت وا شرۆڤە بکرێ لە دژی ئایینە جگە لـەوە وەك ئـەو دوای ئازادییـە سیاسـییەکان دان بـەئازادی ئایینیدا دەنێت وەکو مافێکی مرۆیی پیرۆز و داواشی کرد لیژنەیەك لە پسپۆر و زاناکان پێـك بێت بۆ تەماشاکردنی مەسەلەی فێرکردنی ئـایینی و سـەرلەنوێکردنەوەی کۆلێـژی خوێنـدنی ئایینی لە زانکۆی ئەنکەرە (١٠/١٤).

حکوومەتی ئەنکەرە لەو دەمەدا هەسـتی بـەو تـوورەیی و بێزارییـە کردبـوو کـە لـە سـنگی جەماوەردا پەنگی خواردۆتەوە، بۆیە دەستیکرد بە سازشێکی زۆر و ئەوەبوو وەزارەتی فێرکـردن لـە سـاڵی ١٩٤٧ بڕیـاری لـە سـەر سیاسـەتێکی نوێـدا بـە ئامـانجی خوێنـدنی ئـایین لـە دەرەوەی قوتابخانەکاندا و لە ساڵی ١٩٤٨یش بۆ یەکەمین جار لەوەتی کۆماری تورکیا دامەزرابوو، رێگە درا بە گۆڕینی پارەی بیانی بۆ ئەوانەی دەیانەوێ ئـەرکی حـەج بـەجێ بگەیـەنن، دەرگـای مەزارگـەی پیاوچاکانیش بۆ زیارەتچیەکان خرایە سەرپشت، سەرەڕای تەرخانکردنی خولێکی دوو سـەعاتی لـە ئێوارانی رۆژانی شەممەی هەموو هەفتەیەك لە قوتابخانە بنەڕەتییەکان بـۆ پێناسـەکردنی ئیسـلامی نوێ و کردنەوەی (١٥) خولی راهێنان بۆ پێشـنوێژ و وتاربێـژانی مزگەوتـەکان و دووبارەکردنـەوەی کۆلێژی (ئیلاهیات) لە زانکۆی ئەنکەرە بۆ خوێندنی مێژووی ئاین و ئایینزاکان.

حیزبی دیموکراتی لە ساڵی ١٩٥٠ بە پێی بەرنامە سیاسییە ئاشکراکەیەوە، چـووە کـۆڕی هەڵبژاردنی گشتییەوە و بە زۆرینەی دەنگەکان لە یەکـەمین هەڵبـژاردنی ئـازاد و خـاوێن لـە تورکیای کۆماری، بە سەر حیزبی گەلی کۆماریدا سەرکەوت.

یەکەمین کاری دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتەدەست: گێڕانـەوەی بـانگی نوێـژەکان بـوو بـە زمـانی عـەرەبی و دانـانی پرۆگرامێکـی ئـایینی بـۆ پـەروەردەی ئیسـلامی لـە قوتابخانـە بنەڕەتییەکان و نوێژەنکردنەوەی مزگەوت و دروسـتکردنی مزگـەوتی نـوێ و ئاسـانکاری بـۆ ئەوانەی دەیانەوێ حەج بکەن، سەرەڕای خوێندنی چەند ئایەتێکی کورت لە قورئانی پـیرۆز و شرۆڤەکردنی لە تۆڕەکانی ئێستگە رادیۆیەکانی تورکیا.

بەڵام هەموو ئەم دەسکەوتە ئایینییانە. نەیانتوانی هەنگاوە سەرنەکەوتووەکانی حیزبی دیموکراتی لە رووی کارگێڕیەوە لە پێناو بەدیهێنانی ئاستێکی ئابووری باشتر بۆ هاوڵاتیان بپۆشن، ئەمەش بووە هۆی هورووژانی ئاژاوە و پشێوی لە وڵات و پاڵی بە حکوومەتەوە نا پەنا بباتە بەر رێ و شوێنی سەرکوتکردن و فشار خستنەسەر ئازادییە گشتییەکان و دەمکوتکردنی رۆژنامەگەری. لە ئاکامی ئەمەدا هێزە چەکدارەکانی تورکیا- پارێزەری پرەنسیپەکانی ئەتاتۆرك- بۆ رووخانی حکوومەتی عەدنان مەندەریس و لە پێناو پاراستنی دەسکەوتەکانی کەمالیزم، جووڵان. سەرۆکی نوێی دەوڵەت و رابەری کوودەتا جەمال گورسێل لە لێدوانێکدا گوتی: ئەوانەی هۆی دواکەوتنمان دەگێڕنەوە بۆ ئایینی ئیسلام، بە هەڵەداچوون. چونکە فاکتەری گەورەی دواکەوتنمان ئەو کەسانەن بە خراپی ئایینیان بۆمان شرۆڤە و روونکردۆتەوە. ئیسلام مەزنترین و بەهێزترین و پیرۆزترین ئایینە لە جیهاندا. ئەو کەسانەش بڕوایان بەم ئایینە هەیە، کۆشش و هەوڵ و دانایی زیاتری دەوێ. پێشتر و بۆ چەند سەدەیەکی دوور و درێژ بە شێوەیەکی نەگەتیڤ و نادروست ئیسلامیان بۆ شرۆڤە دەکردین. ئەمەش بووە هۆی دواکەوتوویمان لە قافڵەی گەلانی تری دنیا (١٤/١٠). ئەم لێدوانەی گۆرسێل لە سونگەی دەرچوونی چەند توێژینەوەیەکی ئەکادیمییەوە هات جەختیان کردۆتەسەر ئەوەی کە عیلمانییەت تورکیای گەیاندۆتە تەنگژەیەکی ئەخلاقی و بۆشاییەکی گەورەی دروستکردووە لە پێش بەردەوامبوونی کلتووری تورك لەگەڵ کلتووری ئیسلامیدا. بەڵام وێڕای ئەوە کوودەتاچییە نوێیەکان کارگێڕی کاروباری ئایینییان کردە دەزگایەکی رەسمی پاش ئەوەی کە نیمچە سەربەخۆبوو لە ئەحکامی کۆنترۆڵکردنی ئیسلام.

کوودەتای **٢٧**ی مایسی ١٩٦٠ هەوڵێك بوو بۆ نوێکردنەوەی هزرە کەمالیزمییەکان و دەوڵەمەندکردنیان بەو تازەگەرییانەی لەگۆڕەپانی نێو دەوڵەتی هاتوونەتەکایەوە، بەپێی پرەنسیپە بۆرژوازیەکان و چۆنێتیی مومارەسەکردنی ئازادییەکان و زامنکردنیان بەرێگەی دامەزراوە دەستوورییەکانەوە، تا وایکرد تورکیا ببێتە پێشەنگی دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوین و لە هەموویان نزیکتر بێت لەئایدیۆلۆژییەکانی دەوڵەتانی ئەوروپای رۆژئاوا.

بەڵام بەکاربردنی ئەم دیموکراتییە لە لایەن هەردوو بەرەی راست و چەپ لەتورکیا و شرۆڤەکردن و پراکتیزەکردنی بە گوێرەی بۆچوون و خواستی هەریەکەیان، وایکرد جۆرێك لە ئاژاوەی سیاسی، هەڵایسێ کە تورکیا لەوێنەی نەبینیبوو بە تایبەتی دوای سەرکەوتنی حیزبی داد لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٥ لە دەرەنجامی لایەنگریی پیاوانی ئایینی و کۆمەڵە

ئاینییەکان بۆ ئەم حیزبە بەهۆی ئەو دروشمەی لە هەڵبژاردنەکاندا بەرزی کردبــۆوە: "بــۆ هــەر گوندێك مزگەوتێك و بەهێزکردنی پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبیدا".

ئەگەرچی حیزبی (داد)ی- میراتگری دیموکراتی- لــە هەڵبژاردنەکانــدا لــە ســەر بنــەمای بەرنامە ئایینییەکەی سەرکەوت، وەك چۆن حیزبی دیموکراتی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠ سەرکەوت، وەلێ مــاوەی ســاڵەکانی شەســت جیــاوازی چــالاکییەکانی ریبــازە ســۆفییەکانی لــەخۆگرتبوو کــە بــە هێرشــی ئاشــکرا لــە دژی ئــەتاتۆرك دەســتیان پێکــرد و هەنــدێ لــە پەیکەرەکانیان لەشارەکانی تورکیا تێکشکاند و بگرە (سەعید نەورەسی)ی پیــاوی چاکســازی ئایینی بەرەگەز کورد، خۆی بە رزگارکەری ئیسلام لە تورکیا جاڕدا و بە راشکاوی بانگەشــەی کرد بۆ گەڕانەوەی خیلافەت و دامەزراندنی دەوڵەت بە پێی بنەماکانی شــەریعەتی ئیســلام و گێڕانەوەی بە کارهێنانی پیتی عەرەبی بۆ نووســینی تــورکی. بــەڵام بانگەشــەکانی بزوتنــەوە سۆفیگەرییە تیجانی و نەقشبەندی و سلێمانییە ئایینییــەکان و هەوڵــدانیان بــۆ پیــادەکردنی رۆڵێکی دیار و ئاشکرا لــە ژیــانی سیاســی و کۆمەڵایــەتی لــە تورکیــا، لــە لایــەن ناوەنــدە عیلمانییەکانەوە، کاردانەوەی توندیان لێکەوتەوە، لەوێڕا کــۆڕی زمانــەوانی تــورکی کــە بــە مەڵبەندی عیلمانی لە تورکیا دادەنــرێ، زنجیرە کتێبێکــی دەربــارەی هــزر و بیروباوەڕەکــانی ئەتاتۆرك و هزرە عیلمانییەکانییەوە دەرکرد، کۆمەڵێك لە نووسەر و زانایانیش لە زانکۆکانی تورکیا چەندین وتار و لێکۆڵینەوەیان بڵاوکردەوە بــۆ بەرپەرچــدانەوەی بانگەشــەکانی ڕێبــازە سۆفییەکان و بۆ شرۆڤەکردنی ئامانج و خواستەکانی عیلمانی، لە سەرووی هەموویشــیانەوە، هەریەك لە: مومتاز سویساڵ و بولەند نوری ئەسەن و بەحرییــە ئــوج ئــۆق و مــەتین تۆکــەر و عەبــدی ئیپیکچــی و ســووربوون لەســەر ئــەوەی کــە: "بــیر و بــڕوای ئــایینی هەڵبــژاردن و قەناعەتهێنانە و خەڵکی لەمەدا ئازادن، چونکە عیلمانی- بەبۆچوونی ئــەوان- پرەنســیپێکی مرۆییە، هەوڵ دەدات بــۆ چارەســەرکردنی کێشــەکانی خــەڵکیو بــە ویســتی خۆیــان، بــەبێ ملکەچبوون بۆ ئەحکامەکانی تر" (١٥٥/١٥).

حکوومــەتی ســلێمان دیمــیرال ئاســانکاری و ئیمتیــازێکی زۆری بــۆ موحافیزکــارە ئیسلامییەکان رەخساند، وەك: دامەزراندنی چەند پەیمانگەیەکی ئیسلامی باڵا لەئەستەموڵ و قۆنیە کە مامۆستایان بۆ قوتابخانەکانی پێش نوێژ و وتاربێژان دابین دەکرد و ئەمــەش بــووە هۆی باشبوونی رەوشی فێرکردنی ئیسلامی (١٠/١٤). لە دەرەنجامی ئەمەشــدا ســێ هێنــدە ژمارەی مزگەوتەکان لە تورکیا زیادی کرد، پاش ئەوەی ژمارەی قوتابیانی ئایینی و زانســتی

فقه گەیشتە (٤٢٠٠) قوتابی لە (١٩) خوێندنگەی ئایینیدا (٣١/١٦). لە ساڵی ١٩٦٧یش (١١٧٦) خولی فێربوونی قورئانی پیرۆز لە (٦٣) ویلایەت کرایەوە (٥٠) هەزار قوتابی لەو خولانەدا دەیانخوێند. زانکۆ ئایینییەکانیش خولی ئایینییان لەگوند و لادێیەکان بە سەرپەرشتی پیاوانی ئایینی و بەکۆمەك و یارمەتی دانیشتوانی ئەو ناوچانە، کردەوە. لە ساڵی ١٩٦٨یش پتر لە (٢٥٠) ئاڵقەی ئایینی بەستران نزیکەی (١٠٠) هەزار گوێگر ئامادەیان بوون، حکوومەتیش زیاتر لە ١٤ ملیۆن دۆلاری لە بودجەی ساڵی ١٩٧٠ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئایینی، تەرخان کرد.

هەرچەندە حکوومەتی کوودەتا سەربازییەکە لە میانەی ساڵانی نێوان ١٩٧١-١٩٧٣ هەوڵی دا سنوورێك بۆ چالاکی ئایینی لەتورکیا دابنێت، بەڵام نەیتوانی لەم هەوڵەیدا سەر بکەوێت، چونکە کات بەسەرچووبوو پاش بەهێزبوونی بزووتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا لە ساڵەکانی هەفتا و لە دەرەنجامی ململانێی نێوان هەردوو بەرەی راست و چەپ لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە بە هۆی سەرهەڵدانی هزرێکی ئیسلامی بەهێز هەوڵی دەدا قورسایی خۆی وەك سێهەمین رێگا لە دژی ئیمپریالیزم و شیوعیو ماسۆنیزم تێکڕا بسەلمێنێ، خاوەنی ئەم هزرەش بەڕابەرایەتی پرۆفیسۆر (نەجمەدین ئەربەکان)ی رابەری حیزبی سیستمی نیشتمانی بوو، ئەم حیزبە پاش ئەوەی ناوەکەی گۆڕا و بووە (حیزبی رزگارکەری نیشتمانی)، (٣٧) کورسی لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٧٣ لە پەرلەمانی تورکیا وەدەستهێنا، بەمەش ئەم حیزبەی کەوا رابەرایەتی بزوتنەوەی ئوسولی ئیسلامی لە تورکیا دەکرد، شایستە بوو رۆڵێکی سیاسی گرنگ لە ژیانی گشتی تورکیا بگێڕێت بە هاوبەشبوونی لەو هاوپەیمانییە وەزارییانەی دوای هەڵبژاردنەکان پێکهاتن، بە شێوەیەکی وا ئەربەکان لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧-١٩٨٠ دوو جار بووە جێگری سەرۆك وەزیرانی تورکیا. هەر لەبەر ئەمەبوو دەزگاکانی میدیای رۆژئاوا دەستیاندایە هەڵمەتێکی باس و هەواڵ لەمەڕ رابوونی سیاسی و ئایینی لە تورکیا و ئەربەکانیان بە (خومەینی دووەم) ناوبرد ، ئەگەرچی بە رواڵەت و بابەت لەرووی ئایینی و سیاسییەوە، جیاوازی لە نێوان ئەو دوو رابەرەدا هەبوون.. ئەمە وەك هەوڵێك هات بۆ مەترسی لە شەپۆلی ئیسلامی و نیشتمانی لە تورکیا، هەڵمەتەکەش دوای ئەوە دەستیپێکرد کە حیزبی ناوبراو توانی متمانە لە وەزیری دەرەوەی تورکیای ئەو دەمە بکێشێتەوە بە هۆی هەڵوێستە دوژمنکارییەکانی بەرامبەر بە بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و تەنانەت لە کۆنگرە ئیسلامییەکانیشدا (٥/١٧).

ئەو هەڵمەتە راگەیاندنانـەی رۆژئـاوا و هانـدانی پیـاوانی سـەربازی تـورکیش لـە لایـەن ئەمریکاوە، هۆکاری راستەقینە بوون بۆ بەرپابوونی کوودەتا سـەربازییەکەی ١٢ی ئـەیلوولی ساڵی ١٩٨٠.

بەڵام، حیزبەکەی ئەربەکان تـوانی ژمارەیـەکی زۆرتـر لـە سـەرۆکایەتی ئـەو ئەنجومەنـە شارەوانییانەی حیزبی (نیشتمانی دایك)ی دەسەڵاتدار وەدەستی هێنا، دەستەبەر بکـات. بـەم سەرکەوتنەش حیزبی (گەشەپێدان)ە بە سەرۆکایەتی ئەربەکان بووە چوارەمین حیزبی سیاسی لە تورکیا دوای حیزبەکانی: دیموکراتی سۆشیالیستی میللی و رێگای راسـت و نیشـتمانی دایـك لەو هەڵبژاردنە ناوچەییانەی لەمانگی ئاداری ساڵی ١٩٨٩ بەڕێوەچوون لە دەرەنجامی گوتـارە بەرەوت رەوتە ئایینییەکەی بە لای تورك و لە دەرەنجامی بەرهەڵستیکردنیشـی بەرامبـەر بـە هەوڵەکانی ئوزال بۆ بەئەندامبوونی لە ئەنجومەنی ئەورووپی "چونکە ئەم مەسـەلەیە زیـان بـە پێناسە ئیسلامییەکەی تورکیا دەگەیەنێت". بەرهەڵستی لە بەئەندامبوونی تورکیاش دەکات لە ناو رێکخراوی پەیمانی ئەتلەسی و هەروا تورکیـاش دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری سـندووقی دراوی نێو دەوڵەتی کەزایۆنیزم بەسەریدا زاڵە (١٧/٢٧).

سـەرکردەی کوودەتاکـە (ژەنـراڵ کـەنعان ئیڤـرین) وەك زۆربـەی سـەرانی سـوپای تـورك، ئەتاتۆرکییەکی دەمارگیر و عیلمانییەکی مولتەزیم و سیاسییەکی هەڵکەوتوو بوو. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانی کێشە سیاسییەکانی تورکیا بگێڕێتـەوە سـەر ئـاوەڕۆی خۆیـان، بەشـێوەیەکی نیمچە کۆتاییش ململانێی نێوان راست و چەپی لەناوبرد بە قەدەغەکردنی مـانگرتن لـە کـار و قەدەغەشی کرد سەرانی حیزبە سیاسییەکان درێژە بە کاری سیاسـییان بـدەن وەك ئامرازێـك بـۆ شەڕی ژێراوژێریان لە دژی بزوتنەوەی دیموکراتی. تەنانەت هەنـدێك پێیـان دەگـوت (ئـەتاتۆرکی سەردەم) چونکە هەوڵی دەدا بۆ نوێکردنەوەی هزرەکانی کەمالیزم بە ئامانجی رزگارکردنی تورکیا لە باری گێرەشێوێنی و ئاژاوەی سیاسی و شەڕی بچووکی براکوژی ئێرە و ئەوێ.

ئەگەرچی سـوپا لـە سـاڵی ١٩٨٢ەوە، رازی بـوو لەسـەر گەڕانـەوەی بابـەتی ئـایین لـە خوێندنگەکان و لێبوردەیی بەرامبەر بـە شـەپۆلی ئـایینی میـانڕەو لـە تورکیـا، بـەڵام دژی توندڕۆیی ئایینی ناوخۆیی و دەرەکی وەستا. وێڕای گەشەسەندنی خێرای بزوتنـەوەی ئـایینیش لە تورکیا، ئەوا ژمارەی کۆلێژە ئایینییەکان و زانستی فیقە لە (٢) کۆلێژەوە بـۆ (٨) کۆلێـژ زیادی کرد و سەرۆك وەزیرانی موحافیزکاریش (تورگـۆت ئـوزال) سـاڵی ١٩٨٧ رەزامەنـدیی خۆی دەربڕی تـەنها بـۆ وانـەکانی ئـایین (٧٠) ملیـۆن دۆلار خـەرج بکرێـت، خوێنـدکارانی

مەسیحیش دەبوو بەخورتی لەخوێندنگەکانی تورکیا، لە وانەکانی ئایین ئامادەبن (٣٠/١٦). ژمارەی قوتابخانە ئایینییەکانیش بۆ راهێنانی پێشنوێژی مزگەوتەکانی گەیشتە ٤٠٠ قوتابخانە و ژمارەی ئەو خوێندکارانەی لەدواناوەندییە ئیسلامییەکان ناونووس کرابوون گەیشتە ٢٣١٦٥٠ خوێندکار و ژمارەیەکی زۆریش لە کتێب و گۆڤار و رۆژنامە و کاسێتی ئیسلامی لە تورکیا بڵاوبووەوە (١٣/١٨). بەڵام لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٧ لە کاتێکدا (٥٠٠) خوێندکاری کوڕ و کچ لە (ئەنکەرە)ی پایتەخت خۆپیشاندانێکیان بەسەرۆکایەتی (نەجمەدین ئەربەکان)ی سەرۆکی حیزبی (گەشەپێدان) کە حزبی ئوسوڵییە ئیسلامییە میانڕەوەکان بوو، سازدا و "داوایانکرد تورکیا ببێتە دەوڵەتێکی ئیسلامی و پەچە و عەمامە بگێڕدرێتەوە ناو حەرەمی زانکۆ، لە بەرامبەردا حکوومەت زۆر بەتووندی بەرەنگاریان بۆوە. پێشتریش (٢٨) زانکۆ لە تورکیا بەپێی فەرمانی دەزگای خوێندنی باڵا چەند بڕیارێکیان دەرکرد بۆ" قەدەغەکردنی عەمامە و پەچەو هێشتنەوەی ردێن لە ناو حەرەمی زانکۆ، چونکە هێمای دەمارگیری ئایینی کۆنەپەرستین و هەرکەسێك پابەندی ئەم بڕیارانە نەبێت لە ئامادەبوونی وانەکان بێبەش دەکرێ و پاشانیش لە زانکۆ دەردەکرێ.

دادگای دادوەری کارگێڕی ئەو خۆپیشاندانە ئایینییەی بە هەڕەشەیەکی ئاشکرا زانی بۆ سەر کۆماری تورکیا و سیستمە کەمالیزمییەکانی. سەرۆکی کۆماری تورکیاش (کەنعان ئیڤرین) سیاسەتی بەرەنگاربوونەوەی لە دژی ئەم شەپۆلە ئیسلامییە رەچاوکرد، کاتێك گوتی: "بزوتنەوەی ئوسوولی لەتورکیا بەهێزە و بزوتنەوەیەکە بە لای دەوڵەتە عیلمانییەکەمانەوە هیچی کەمتر نییە لەمەترسی فاشیزم و کۆمۆنیستی"(٣٠/١٦). (ئیڤرین) لەو روانگەیەوە، رێکاری توندی لەدژی (٩٦) خوێندکاری کۆلێژی سەربازی لە کۆی ٨١٣ خوێندکاری ئەو کۆلێژە جێ بەجێ کرد- بەو سیفەتەی سەرەڕای پایەکەی وەك سەرۆکی کۆمار، سوپا سالاریشە- و فەرمانیدا لە سونگەی بیروبڕوا ئایینییە توندرۆکانییانەوە، لە کۆلێژ دەربکرێن. ژەنراڵ (نەجدەت ئورۆغ)ی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی تورکیاش لە لایەنی خۆیەوە، بڕیاریدا بەدەرکردنی (٦٦) قوتابی سەربازی لە (٣) ئەکادیمیای سەربازی بەتۆمەتی دامەزراندنی رێکخستنێکی توندڕۆی ئیسلامی (١٣/١٨).

بەش بەحاڵێ ئەو شەپۆلە توندڕۆ ئایینییە دەرەکییەش، ئەوا لە هەردوولای ڕۆژهەڵات و رۆژئاوەوە، بەرێگەی ئەو ئێستگە رادیۆیانەی بەرەو تورکیا ئاراستەکرابوون، دەهات. دەبینی لە رۆژهەڵاتەوە (دەنگی کۆماری ئیسلامی ئێران) رۆژانە پەخشی بەرنامەکانی دەکرد بۆ

هانـــدانی جـــەماوەری موســـڵمانی تورکیـــا بـــەرەو "خـــەبات لـــەدژی ئـــەتاتۆرکی و هـــزرە عیلمانییەکەی‌و لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لـە تورکیـا ". بانگەشـەکارانی کۆماری ئیسلامی ئێـران، بـە نووسـین و وتارەکانیـان لـە ٣ گۆڤـاری ئیسـلامی مانگانـە و ڕۆژنامەیـــەکی ڕۆژانـــە بـــەناوی ڕۆژنامـــەی (هـــزری نویێ)گـــەرم و گوڕییـــان بەخشـــیبووە چالاکییەکانیان ڕێکخراوی (موجاهیدینی گەل)یش کـە پێـڕەوی ڕیبـازی کۆمـاری ئیسـلامی ئێرانی دەکرد لەرووی سیاسەت و کۆمەڵگە و ئابوورییەوە و لە شێوەی شانەی نهێنی لە ساڵی (١٩٨٠)وە لە تورکیا درێژەی بەچالاکیەکانی دابوو، دەنواند، وەك: هاویشتنی نارنجۆك بۆ نـاو دەزگا ئەمریکاییەکان لـە تورکیـا و کوشـتنی دیپلۆماتکـارێکی عێراقـی لەئەنکـەرە سـاڵی ١٩٨٦. ڕێکخراوی ناوبراو چالاکییەکانی بە زۆری لەناوچەکانی ڕۆژهەڵات نزیك سنووری ئێران بەئەنجام دەگەیاند، نەخوازە لە ناوچەی (دەرسیم- ئیجل) کەزۆرینەی دانیشـتوانی لـە کـوردی شیعە مەزەبن و توانی لە ٤ی ئاداری ساڵی ١٩٩٠ (٤) خۆپێشاندان لە شارەکانی: مـووش و کاربوران و گەلانە بۆ پشتگیری لەکۆماری ئیسلامی ئێـران لـە شـەڕی کەنـداودا سـاز بـدات (١٩/١٩).

شەپۆلی رادیۆیی ڕۆژئاواش لە دەنگی (ئەڵمانیای ڕەش)ەوە دەهات، ئەمیشیان جەماوەری تورکیای هان دەدا بۆ شۆڕش لە دژی هزری کـەمالیزم بـە ڕێگـەی ئـەو وتـارە ئاگرینییانـەی لەلایەن موفتی پێشوو (جەمالەدین قاپلان)ی نیشتەجێی شاری کۆلۆن لەئـەڵمانیا پێشـکەش دەکرا. قاپلان لە ئوسوڵییە سوننەکان بوو و کاسێت و شریتی ڤیدیۆیی لـە چەشـنی ئەوانـەی (خومەینی)ی دەنارد بۆ تورکیا و بانگەشەی بـۆ یـاخیبوونی ئـایینی دەکـرد بـۆ لـەناوبردنی کەمالیزم لەتورکیا. حکوومەتی تورکیا چەندین کەڕەت داوای لە بۆن کرد تەسلیمی بکەنەوە، بەڵام ئەڵەمانەکان ڕەتیان کردەوە، چونکە یاسای ئەڵمانی ڕێگـە نـادات ئەمـە بکـەن. بۆیـە حکوومەتی (ئوزال)یش ڕەگەزنامەی تورکی لەقاپلان سەندەوە.

خودی (ئوزال)یش کە دواتر بووە سەرۆکی کۆمار- هەرچەند موسـڵمانێکی ئـایین پـەروەر بوو، بەڵام موسڵمانێکی میانڕەو و بڕوای بە دیموکراتی لیبراڵی هەبوو و بەرهەڵستی لە هەموو بزوتنەوەیەکی توندڕۆیی لەتورکیا دەکرد. ئوزال لەم لایەنەوە و بە بۆنـەی ڕۆژی (منداڵ)یـەوە، لە وەڵامی پرسیارێکی پەیامنێرێکی بیانی سەبارت بەئیسلام، دەڵێـت: "ئیسـلام ڕێگایـەکی مامناوەندە لەنێو ئایینە ئاسمانییەکانی تر، جا ئەگەر ڕۆژئاوا نیگەرانە ئەگەری ئەوە هـەبێت بزوتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا کردەوەی توندڕۆییانـە و تیرۆریسـتی وەك ئـەوەی لـە وڵاتـانی

هەژاری جیهانی سێیەمدا هەیە ئەنجام بدات، ئەوە تورکیا لەم توندڕۆییەوە دوورە، چونکە کەشی گشتی لە تورکیا یارمەتی ئەو بارە نادات، سەرەڕای ئەو ئازادییەش کە تورکیا بۆ گشت بیر و راو هزرێك فەراهەمی کردووە، ئەمە خۆی ئەو توندڕۆییە لەناودەبات پێچەوانەی نهێنیبوون و ستەم و زۆرداریە کەهەمیشە دەبنەهۆی توندڕۆیی"(١/٢٠).

ئوزال لە ئاخر و ئۆخری هەفتاکانی سەدەی رابوردوو، کاتێك بووە راوێژکاری ئابووری و پلانڕێژی سیاسەتە ئابوورییەکانی حکوومەتی سلێمان دیمیراڵ، یەکەم مۆرکە ئابووری دووەمیش مۆرکە سیاسییەکانی خۆی بە سەر ئەو ساڵانەوە بەجێ هێشت، پاشانیش کە لە دوای کوودەتای ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ بووە جێگری سەرۆك وەزیران و ئەنجا لە ساڵی ١٩٨٣ کە بووە سەرۆك وەزیران دوایش لەساڵی ١٩٨٩ بە سەرۆکی کۆمار، سیاسەتمەدار و ئابووریزان و هزرڤانانی تورکیا لە رووی بەڕێوەبردنی کاوربـاری دەوڵەتەوە باسیان لەبارەی پرەنسیپەکانی ئوزالیزمەوە دەکرد بەهەمان شێوەی باسکردنیان لەمەڕ ئەو پرەنسیپە کەمالیزمانەی کە زەمەن بەسەریاندا تێپەڕی وکۆن بوون. بەڵام ئابووریزانی میانڕەو (تورگۆت ئوزال) نەیتوانی شەمەندەفەرە تورکییەکە بخاتە سەر سکەی دروست و راستەقینەی خۆی تا مەسەلەکە لە نێوان هەردوو هزرەکە یەکلا بکاتەوە: هزری تورکیای رۆژهەڵاتی، واتە بەشێك لە رۆژهەڵاتی ناوینی ئیسلامی و هزری تورکیای رۆژئاوایی ئەورووپی کەمستەفا کەمال ئەتاتۆرك هەوڵیدا بەرەو ئەم ئاقارە بیبات.. تورکیاش لەنێوان هەردوو هزردا، نە ئەوەتە بووە وڵاتێکی ئەورووپی رۆژئاوایی و توانی روخساری خۆی و کلتووره رۆژهەڵاتییەکەی بپارێزێ سەرەڕای ئەو هەوڵانەی لە ئێستا دەدرێن بۆ گەڕاندنەوەی پێناسە راستەقینەکەی بە تواندنەوەی هەردوو ژیارییە رۆژئاواییە رۆژهەڵاتییەکە لە ویژدانی تورکدا و لە سۆنگەی بزربوونی لە نێوان هەردوکیاندا.

بەڵام (ئوزال) مرد و بەئاواتی خۆی نەگەیشت دەوڵەتێکی تورکیای گەورەی خاوەن تێکەڵەی عیلمانی- ئیسلامی- هاوچەرخ دابمەزرێنێ و دوای خۆی سلێمان دیمیراڵ دەسەڵاتی گرتە دەست.

هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥ واقیعێکی نوێیان لە تورکیا هێنا کایەوە، کاتێك حیزبی گەشەپێدانی ئیسلامی لە کۆی (٥٥٠) کورسی (١٥٥) کورسی لە پەرلەمان دەستەبەرکرد. بەم سەرکەوتنەشی بووە تاکە حیزبی سیاسی لە پەرلەمان کەوا دەخوازێ سەرۆکی کۆمار،

سەرۆکی حیزبی ناوبراو راسپێرێ بە پێی دەقەکانی دەستوور کابینــەی تــازە پێکبهێنــێ و بــە پێکهێنانی ئەم کابینەیەش حکوومەتی (٥٣) هەمینی تورکیا دابمەزرێت.

وێڕای مانۆرەکانی حیزبە عیلمانییەکان و هاوکــاری نــەکردنیان لەگــەڵ نەجمــەدین ئەربــەکان رابەری حیزبی گەشەپێدان بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ، بەڵام هاوپەیمانی نێوان حیزبی نیشــتمانی دایك و حیزبی رێگای راست، (٦) مانگ زیاتری نەخایاند، ئەوەبوو وەزارەت رووخا و شوێنی لــە بەردەم ئیئتیلافی هەردوو حیزبی گەشەپێدان و رێگای راست بۆ سەرۆکایەتی ئەربەکان چۆڵ کــرد بۆ پێکهێنانی حکوومەتی (٥٤) هەمینی تورکیا. لە١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦.

یەکێك لە گرنگترین دەستکەوتەکانی حکوومەتەکەی ئەربــەکان، (٥) پەرلــەمانتاری نــاو هەردوو حیزبی هاوپەیمانی دەسەڵات، پێوەندییان بە پارتی کرێکــارانی کوردســتانەوە کــرد بــە ئامانجی بەردانی (٨) سەربازی تورك بە لایانەوە گیرابوون یان رفێنرابوون.

بەڵام، رووکردنی یەکجارەکی ئەربەکان بەگشتی بەرەو رۆژهەڵات و هەوڵی دوورکەوتنەوەی لە رۆژئاوا بەو سەردانەی بۆ ئێران بەئەنجامی گەیانــد، نــەخوازە ژەنراڵــەکانی ســوپا ئێرانیــان تۆمەتبار دەکرد بە یارمەتیــدانی پــارتی کرێکــارانی کوردســتان و هانــدان بــۆ دامەزرانــدنی کۆماری ئیسلامی تورکیا بە ناردنی ئایدیۆلۆژییەکانی بــۆ ئــەم وڵاتــە، ئەمــە بــووە مایــەی تووڕەیی بە لای هێزە چەکدارەکانی تورکیاوە لە دژی حکومەتی ئەربــەکان. بۆیــە ئەنجومــەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە دانیشتنی ئاسایی مانگانەی رۆژی ٢٨ی شوباتی ســاڵی ١٩٩٧، (١٨) بڕیاری بە ئامانجی دژایەتیکردنی ئوسوولییە ئایینییەکان لە تورکیا دەرکرد و ئەربەکانیش بەو پێیە سەرۆکی وەزیرانە لەگەڵ ئەو دوای ئەندامانی ئەنجومەنی ناوبراو، واژۆی لە سەر بڕیارەکان کرد. ئەربەکان بەم واژوکردنەشی حوکمی خنکاندنی بە سەر خــۆی و حیزبەکەیــدا دا. چــونکە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە، واتا ئەربەکان فێرگەکانی ئیمام و وتاربێژان و خولەکانی فێرکردنی قورئانی پیرۆز دابخات و سەرپۆشــیش لەخوێندنگــە و فەرمانگــەکانی تــری دەوڵــەت قەدەغــە بکات، ئەمەش ئەو بڕیارانە بوو کە بەگوێرەیان (ووراڵ ساواش)ی داواکــاری گشــتی کۆمــاری داوای بەرزکردەوە بۆ داخستنی حیزبــی (گەشــەپێدان= روفــاه). چــونکە: "بۆتــە مۆڵگەیــەك هەموو ئــەو کەســانەی تیــا کۆبوونەتــەوە کــە دژایــەتی هــزری کــەمالیزمی دەکــەن و بۆتــە ئامرازێکیش بۆ رووخاندنی رژێم لە پێناو دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی لە تورکیا بە رێگەی ئەو وتارانەوە کەسەرانی حزبەکە لە کۆبوونەوەکانیاندا بڵاویان کردنەوە و سەرۆکی حیزبەکــەش بانگهێشتی شێخانی تەریقەتە ئایینییەکانی کــرد بــۆ ئاهــەنگی رۆژووشــکاندن لەئەنجومــەنی

وەزیران لە ساڵی ١٩٩٧، ئەمەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ ئەو مەسەلەیە". ئەمە لە کاتێکدا روویدا حیزب هێشتا لە دەسەڵات و ئەربەکانیش سەرۆکی وەزیران بوو.

لەبەر ئەوەی ئەربەکان، لەگەڵ (تانسۆچیللەر)ی سەرۆکی حیزبی رێگای راست و جێگری سەرۆك وەزیران رێككەوتبوو لە سەر ئاڵوگۆڕکردنی پێگەکەیان دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بە سەر پێکهێنانی وەزارەت، بۆیە ئەربەکان دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بە سەرۆکی کۆمار سلێمان دیمیراڵ کرد وەك رێگا خۆشکردنێك بۆ راسپاردنی خاتوو چیللەر بەسەرۆکایەتی وەزیران، بەڵام دیمیراڵ بەگوشاری هێزە چەکدارەکانی تورکیا بۆ پێکهێنانی وەزارەت چیللەری رانەسپارد، بەڵکو بوڵەند ئەجەویدی رابەری حیزبی چەپی دیموکراتی راسپارد وەزارەتی نوێ پێکبهێنێ بەو پێیە حیزبەکەی سێهەمین حیزبی سیاسییە لە پەرلەمان، بەمەش ئەربەکان دەستی لە هەگبەکە دەرچوو، دوای ئەمەش دیمیراڵ (ئەجەوید)ی سەرۆکی سێیەمین حیزبە سیاسییەکانی لە پەرلەمانی راسپارد حکوومەتی (٥٦) هەمینی تورکیا پێکبێنێ، بەڵام ئەو هەڵبژاردنانەی لە ١٨ی نیسانی ساڵی ١٩٩٩ بەڕێوەچوون، هاوسەنگیی هێزە سیاسییەکانی بە شێوەیەك گۆڕی، حیزبی چەپی دیموکراتی لە پێشەوەی حیزبە سیاسییەکانی ناو پەرلەمان بێت، ئەمەش وایکرد (ئەجاوید)ی سەرۆکی ئەو حیزبە راسپێردرێ حکوومەتی (٥٧) هەمینی تورکیا بە هاوپەیمانی لەگەڵ هەردوو حیزبی بزوتنەوەی نەتەوەیی و حیزبی نیشتمانی دایك پێکبێنێ کە تا ئەم مێژووە دەسەڵاتی لە دەست بوو.

## دووەم/ ململانێی ئابووری– لەنێوان پەرەپێدان و قەرزداریدا:

لەگەڵ ئەوەی ٦٥٪ی هێزی کار لەتورکیا بەستراوە بە بواری کشتوکاڵییەوە، چونکە (٦٠٪)ی دانیشتوان بەکشت و کاڵییەوە خەریکن، کەچی تورکیا بە وڵاتێکی پیشەسازی دادەنرێ بەو سیفەتە ئەندامە لە رێکخراوی گەشەپێدان و هاوکاری ئابووری (ئوسید) کە (٢٤) وڵاتی پیشەسازی و سەرمایەداریی پێشکەوتووی لەخۆگرتووە. بەڵام تورکیا بەپێی پێوەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە چوارچێوەی وڵاتانی خاوەن دەرامەتی مامناوەند ریزبەند کراوە کە تیادا دەرامەتی تاك لە (٥٠٠) دۆلار زیاترە.

ئەگەرچی داهاتی گشتیی نەتەوەیی لەماوەی ساڵانی ١٩٧٨-١٩٨٠ لەگەڵ هەمان شێوە دابەزین لە رێژەی بەشی تاکی تورکیا لەم داهاتە دابەزی، ئەوا لە پاش ساڵی ١٩٨٠ بە بەردەوامی سەری کرد و گەیشتە ٢١٤ بلیۆن لیرەی تورکی لە ئاکامی شەڕی عێراق- ئێران و

بەهۆی زیادکردنی هەناردەکانی تورکیا بۆ ئەو دوو وولاتە بە ڕێژەی ١٥٪، سەرەڕای بڵاوبوونەوەی هێزی کاری تورکی لە وڵاتانی عەرەبی بەتایبەت لە لیبیا (١٤/٢٤).

تێبینی کرا، گرنگی ڕێژەیی پیشەسازی لە پێکهاتنی داهاتی نەتەوەیی زیادی کرد لەگەڵ پاشەکشەیەکی ڕێژەیی لە گرنگی پیشەسازی کشتوکاڵی کەهۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتە ئابوورییە نوێیەی حکوومەتی تورکیا بەپێی بەرنامەکەی ئوزال پێڕەوی کرد کە بەرجەستەبوو لە زیادبوونی پشکی وەبەرهێنان لە پلانە ئابوورییە ساڵانەکانی کەرتی پیشەسازی، سەرەڕای بەپیشەسازیکردنی کشتوکاڵ و پەرەپێدانی بەئامێری کشتوکاڵی نوێ تا بتوانێ ئەو خزمەتگوزارییانە دەستەبەر بکات کە پیشەسازییەکانی خۆراك و چنین پشتی پێ دەبەستن.

بە پێی خەمڵاندنەکانی دەزگای پلانی دەوڵەت DPE کە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ بڵاو کراونەتەوە، ڕێژەی گەشەکردنی ڕاستەقینەی داهاتی نەتەوەیی لە ساڵی ١٩٨٤ بە ڕێژەی ٥,٦٪ چووە سەر و گەیشتە ١٧,٥ هەزار بلیۆن لیرەی تورکی، لە کاتێکدا لەساڵی ١٩٨٣ ڕێژەکە ٣,٢٪ بوو. ژمارەی ئەو کۆمپانیا تورکیانەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین و لیبیا کاردەکەن، بریتییە لە ١٣٨ دەزگا و کۆمپانیا و نوسینگە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئابووری تورکیا پێشتر و ئێستاش بە دەست دیاردەی هەڵاوسانەوە دەناڵێنێ، لەم لایەنەوە بانقی نێودەوڵەتی لە ڕاپۆرتی ساڵانەی بۆ ساڵی ١٩٨٣ تاکیدی کردووە کە ڕێژەی ساڵانەی هەڵاوسان لە تورکیا لە میانەی ساڵەکانی ١٩٧٠-١٩٨١ گەیشتە ٣٢٪ لەکاتێکدا ئەم ڕێژەیە ٣٠٪ ئەو دەمە بوو کە ئوزال لەساڵی ١٩٨٣ بووە سەرۆکی وەزیرانو توانی بۆ ٢٥٪ ڕێژەکە دابەزێنێ (١٤/٢١). وەلێ ئەمڕۆ ڕێژەکە گەیشتۆتە ٨٠٪ بە شێوەیەکی وا خەڵکی هەموو بەیانییەك بە هەواڵی باجی تازەتر لە خەو ڕادەچەڵەکێن و ئەمە وایکردووە گوزەرانیان سەخت و ناخۆش بێت. سەرباری دابەزینی لیرەی تورکی لە چاو دۆلاری ئەمەریکی، دەبینی لە ساڵی ١٩٨٢ دۆلارێکی ئەمریکی ١٦٨ لیرەی تورکی بوو، پاشان ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٩١ بەرز بۆوە تا گەیشتە نزیکەی (٤٠٠٠) لیرەی تورکی و لە ساڵی (٢٠٠١)یش نرخی یەك دۆلاری ئەمریکی گەیشتە نزیکەی یەك ملیۆن لیرەی تورکی، لە دەرەنجامی ئەمەشدا نرخی بەرهەمە سەرەتاییەکان بەراددەیەکی وا فڕی تورکیا پێشتر لە وێنەی بەخۆوەی نەبینیبوو.

دیاردەی هەڵاوسان، ماك و ریشەی ئەو کێشە سەرەکییانەیە ئابووری تورکیا گیرۆدەی بووە، چونکە هاوردەی تورکیا لە شت و مەك و کاڵای سەرمایەداری دروستکراو و ئەو ماددە خاوانەی پیشەسازی تورکیا پێویستی پێیانە، وایکردووە بەشێك لە دیاردەی هەڵاوسانی جیهانی

بگوازێتەوە بۆ تورکیا، جگە لەوەش هەڵاوسان خۆی لە ڕیشەدا لە تورکیا هەیە، لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان: دابەزینی بەردەوامی نرخی لیرەی تورکی و دووەمیشیان: هەڵکشانی بەردەوامی تێچووی هاوردەکانی تورکیا لە نەوت وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ وزەی جێگرەوە.

هەرچی کێشە ئابوورییە سەرەکییەکەی ترە لە تورکیا، ئەوە کێشەی قەرزارییە دەرەکییەکانی تورکیایە. بە نموونە قەرزی دەرەکی سەر تورکیا لە ساڵی ١٩٨٣ گەیشتە ٢٢,٤ ملیار دۆلار، قازانجی ساڵانەی ئەو قەرزانەش لە ساڵی ٢٠٠٠ گەیشتە نزیکەی ٢٢ ملیار دۆلار، هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانییەوە (٢٠٠) ملیار دۆلاری بۆ تورکیا خەرج کرد (١٠/٢٢)، چونکە قەیرانی ئابووری هەموو ئەو کۆمەکە داراییە خێراییانەی وەبادا کە لە ساڵی ١٩٨٠ وزەیەکیان بەخشییە ئابووری تورکیا، کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە پێی ڕێککەوتننامەی هاوکاری بەرگری و ئابووری (٥٥٠) ملیۆن دۆلاری دایە تورکیا لە بەرامبەر نرخی بەگەڕخستنەوەی بنکە سەربازییەکانی ئەمریکا لە تورکیا، حکومەتی فەرەنساش وادەی دانەوەی ئەو قەرزەی لەسەر تورکیا کە بەبڕی ٦٥ ملیۆن دۆلار و دەبوو لە ساڵی ١٩٨٠ بیداتەوە بە فەرەنسا، درێژکردەوە. سەرەڕای ئەوەش فەرەنسا قەرزێکی تری بۆ تورکیا بە بڕی ١٠٠ ملیۆن دۆلار زامن کرد وەك بەشداربوونێك لەو ١,٦ ملیار دۆلارەی کە ڕێکخراوی گەشەپێدان و هاوکاری ئابووری (OCED) داینابوو بۆ یارمەتیدانی تورکیا. شانشینی عەرەبی سعوودیەش بڕی (٢٥٠) ملیۆن دۆلاری لە شێوەی قەرزی سووکە قازانج دایە تورکیا. بە لایەنی خۆیشیانەوە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵێکی بێوچانیاندا سندووقی دراوی نێودەوڵەتی قەناعەت پێ بێنن زیاتر لە ٣ ملیار دۆلار بەدرێژی (٥) ساڵی داهاتوو لەساڵی ١٩٨٠ و لە چوارچێوەی هەوڵی بەردەوامی ڕۆژئاوا بۆ بوژاندنەوەی ئابووری تورك، بدات بە تورکیا (٤١/٢٣).

شایەنی گوتنە قەرز وەرگرتنی تورکیا کاری کردووەتە سەر ئەو قەرزە ماوە درێژانەی کە بۆ بوژانەوەی ئابووری تورکیا بە ڕێگەی وەبەرهێنانیان بۆ ئەو پڕۆژانە بەکار دەبرێن کە چالاکی بەرهەمیان ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت، لەم لایەنەوە دەوڵەت سەدان پڕۆژەی ئابووری هەیە، بەڵام لە تورکیا تەنها (٤٠) پڕۆژەی ئابووری سەرەکی هەیە، ئەو پڕۆژانەش کە زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆ ساڵەکانی بیستی سەدەی بیستەم، یان بریتییە لە پڕۆژەی پیشەسازی خۆیان، یان بەرهەمهێنانی وزە، یان ڕێگاوبان، یان سیستمی بانقی. لەم پڕۆژانەدا لەساڵی ١٩٨٣ (٥٦٠) هەزار کرێکار کاریان دەکرد و بەشداریکردنی پڕۆژەکان لە داهاتی نەتەوەیی گەیشتە

١١٪، کەچی وێڕای ئەوەش حکوومەت بڕیاری دا ژمارەیەك لەو پڕۆژانە بەکەرتی تایبەت بفرۆشێت بە پێی پلانە ئابوورییەکەی ئۆزال (١٣/٢٤).

ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٧٧ گەنجینەی تورکیا گەیشتە لێواری ئیفلاسبوونێکی نائاشکرا، کاتێك کە هاوردەکانی تورکیا گەیشتنە پتر لە (٥) ملیار دۆلار لەکاتێکدا هەناردەی ئەم وڵاتە لە ١,٧ ملیار دۆلاری تێنەپەڕاند، بەڵام قەرزی دەرەکی سەر تورکیا لەو مێژووەوە زۆر بەخێرایی کەڵەکە دەبوون تا لەم ڕۆژگارەدا گەیشتە ١٢٠ ملیار دۆلار، چونکە زۆربەی ئەو کۆمەکانە بۆ ئابوورییەکی ئیستیهلاکی دەچوون کە تا ڕادەیەك بە بێ بیناگەلی پیشەسازی وەبەرهێنان بوو، سەرەڕای بوونی ١٦٪ هێزی کاری تورکیایی بێکار، ئەوەدەمە ڕێژەی بێکاری بەپێی ئامارە ڕەسمییەکان گەیشتە نزیکەی (٢) ملیۆن بێکار، لەکاتێکدا بازاڕی کار ساڵانە پێشوازی لە نیو ملیۆن بێکاری نوێ دەکات کە قەوارەکانی پڕۆژەکانی تورکیا لەتوانایاندا نییە ئەم هەموو زیادەیە لە هێزی کار بگرنەخۆ (٤١/٢٣).

جا، ئایا ئۆزالیزم بۆ بارودۆخی داڕووخاوی ئابووری لە تورکیای کەمالیزم و ناوەندی عیلمانی چ ڕێکارێکی گرتەبەر دوای ئەوەی دیاردەی هەڵاوسان لەم وڵاتە پەرەی سەند و قەرزەکانی سەری زیاتر و بێکاریش تەشەنەی کرد؟!

تورگۆت ئۆزال ئەو دەمەی لە ساڵی ١٩٨٠ جێگری سەرۆك وەزیران بوو و بەرنامە سەقامگیرییە ئابوورییەکەی داڕشت، ناویان لێنا (ئابووریزانی سیحرباز) نەخوازە پاش ئەوەی توانی خشتەسازییەك بۆ قەرزەکانی تورکیا بکات بەرێگای ناسیاوەکانی لەناوەندە دارایی‌و ئابوورییە جیهانییەکاندا، بەڵام لەساڵی ١٩٨٢ کاتێك بەرنامە ئابوورییەکەی بووە هۆی ئیفلاسبوونی چەندین پرۆژەی وەبەرهێنان، لەوانە بوو ڕووبەڕووی دادگاییکردن ببێتەوە. وەلێ بە چالاکی بەرنامەکەی ئۆزال، هۆیەکیش بوو بۆ زیادبوونی دەرامەتی تاکی تورك ساڵانە لە ٨٠٠ دۆلارەوە لەساڵی ١٩٨٢ بۆ ١٤٠٠ دۆلار ساڵانە لە ١٩٨٩، ئەگەرچی خەرجکردنی گشتیی لە تورکیا کەمکردەوە (٤/٢٥).

تورکیا، بە دەردی هەموو دەوڵەتە سەرمایەدارییە پەراوێزخراوەکانی، وەك: بەرازیل و کۆریای باشوور و چینی نیشتمانی (فەرمۆزا)، لە میانەی هەردوو دەیەی رابوردوو بە ئاراستەی پەرەسەندنی خێرای سەرمایەداری تەکانی بە خۆیدا و سەرمایەداریی بیانی ڕژانە ناو وڵاتەکەی و پیشەسازییەکانی فراوان بوون و شارەکانیشی گەورە بوونەوە. ئەمانە هەموو سەدان هەزار لە ئامێری بەکارهێنانی سەرمایەدارییان هەڵمژی. ئێستاش تورکیا ئەم باجە

دەداتەوە، سەرەتا بە پشك بۆ دانەوەی ئەو قەرزانــەی پەیــدای کــردن، یــان ســوودە زۆرەکــان، ئەمەش بە بارێکی گران دادەنرێ بۆ ســەر بودجەکــەی، دوای ئــەوەی قــازانجی لــە (١٠٪)ەوە لەساڵی ١٩٧٤ بەرەو (٦٠٪) لەساڵی ١٩٩٠ زیادی کرد (٣٠/٢٦).

ئیمــڕۆیش، حکوومــەتی تورکیــا بــەم هەنگاوانــەی لای خــوارەوە، هــەوڵ دەدات بــارە ئابوورییەکەی، چارەسەر بکات (١٤/٢١):

١- پشتگیریکردنی لەو کۆمپانیایانەی لە رۆژهەڵاتی ناوین کار دەکــەن، بــە دابینکردنــی پاراستنی ئابووری بۆیان، وەك کەمکردنەوەی نامەی پاڵپشتی (رسائل الاعتماد) بە تایبەت بۆ ئەو کۆمپانیانەی لە لیبیا کاردەکەن و لەوێ بــەهای کارەکانیــان لــە ســاڵی ١٩٩٠ گەیشــتە نزیکەی یەك ملیار دۆلار.

٢- هاندانی هەناردەی قووتووبەند و گۆشت و کــاڵای دروســتکراو و قومــاش بــە رێگــەی ئاسانکاری دڵنیایی لە ئاستێکی بەرز بۆ هەناردەکارانی تــورك و هانــدانیان بــۆ وەبــەرهێنانی سەرمایەکانیان بە دراوی قورسی تورکی و لەناو خودی تورکیاش.

٣- دنەدانی بازرگان و پیشەسازیکارانی تورك بەرەو هاوکاری لەگەڵ دەزگــای پلانــدانانی دەوڵەت و کەمنەکردنەوەی ئەو پاڵپشتییانەی (ئیعتماد) بۆیان تەرخان کراوە.

٤- خولْقاندنی جۆرێك متمانە لە نێــوان جــەماوەر و دەوڵــەت، ســەرەڕای دەســتێوەردانی دەوڵەت لە دانانی نرخ لە سەر کاڵاکان، چونکە سیاسەتی بازاڕی ئازاد کە دەوڵەت جێبــەجێی کرد بە رێگەی ململانێی ئەو کۆمەڵانەی مامەڵەی تیا دەکەن، سەردەکەوێت (٤/٢٥).

ئوزال، کە لە ساڵی ١٩٨٩ خۆی بۆ سەرۆکایەتی کۆمار کاندید کــرد، دروشمــی ئــەم ســێ ئازادییەی بەرزکردەوە: ئازادی هزر، ئازادی بازاڕ و ئازادی بیر و باوەڕ، بەڵام پاش ئــەوەی لــە هەڵبژاردنەکان سەرکەوت نەیتوانی هەموو خواست و ئارەزووەکانی دەســتەبەر بکــات، بــەڵکو تەنها بەشێکی کەمیان نەبێت. چونکە بە وتەی دیمیراڵ- یەکێك لە رابــەرانی ئۆپۆزســیۆن لــە رۆژگاری دەسەڵاتی ســەرۆك ئــوزال- "رژێمــی دەســەڵاتداری تورکیــا نــەیتوانی پەرەســەندنی نەتەوەیی فەراهەم بکــات"(٤/٢٥). بۆیــە ئــوزالیزم لــە گەشەســەندنێکی رێــژەیی بــەولاوە، گەشەسەندنێکی راستەقینەی لە تورکیا بەئەنجام نەگەیاند، چــونکە تــاوەکو ئێســتاش ٦٠٪ی گەلی تورك هەژار و کەم دەرامەتە.

تورکیا پێویستی بەئازادیی سیاســی و دیمــوکراتی راســتەقینە و ســەقامگیری نیشــتمانی هەیە، ئەمانە مەرجی بنەڕەتیی گەشەپێکردنە لەوڵاتدا، پێویستی بەحکوومــەتێکی بــەهێز و

چاوەترس و خاوەن بەرنامەیەکی نیشتمانی و سیاسی و ئابووری هەیە تا بتوانێ وڵات لەباری هەژاری و بێکاری و قەرزباری و تیرۆر و پەرتبوونی سیاسی رزگار بکات.

لەگەڵ ئەوەی شەڕی کەنداوی یەکەم ۱۹۸۰-۱۹۸۸ گێڕانەوەی هاوسەنگیی ئابووری بۆ تورکیا دەستەبەرکرد لە دەرەنجامی هەناردەی بۆ عێراق و ئێران و چالاکبوونی بازرگانی سنووری نێوان و نێوان ئەم دوو وڵاتە و دراوسێیەکانی تری دەوروبەری، بەڵام شەڕی کەنداوی دووەم ۱۹۹۱ و راگرتنی هەناردەی نەوتی عێراق و وەستانی هەناردەی تورکیا بۆ عێراق و وڵاتانی کەنداو بە هۆی دەستدرێژیکردنی عێراق بۆ سەر دەوڵەتی کوێت، وایکرد تورکیا بە بڕی (٤٠) ملیار دۆلار زەرەرمەند بێت. جا، ئەگەر ئەو (١٠) ملیار دۆلارەشی بخەینە سەر کە تورکیا ساڵانە بۆ شەڕی ناراگەیەندراوی دژ بە PKK لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە تا ساڵی ٢٠٠٠ خەرجی کردووە، سەرباری ئەو قەرزانەش کە لە بانقی نێودەوڵەتی و سندووقی دراوی نێودەوڵەتی پەیدای کردووە و تا مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠١ گەیشتۆتە نزیکەی (٢٢) ملیار دۆلار، ئەوە دەزانین تورکیا ئەمڕۆ لە چ قەیرانێکدا دەژی و هەموو حکوومەتەکانی تورکیاش دوای مردنی ئۆزال لە ساڵی ١٩٩٣ نەیانتوانی چارەسەری بکەن لەبەر بڵاوبوونەوەی گەندەڵی ئیداری و سیاسی لە وڵات و لە سۆنگەی زاڵبوونی گرووپەکانی تاوانی بەردەوام (مافیا) لە هەموو لایەنەکانی ژیان لە تورکیا. دەبینی ویڕای ئاشکراکردنی (٤٦) تۆڕی مافیای شارەزا لە بڕینی بانق و بەتاڵان بردنیان و پاشان بڵاوکردنەوەی ئیفلاسبوونیان و جگە لە ئاشکراکردنی مافیاکانی بازرگانی تلیاك و چەك و قۆڵبڕین و کوشتنی سیاسی و تیرۆر تاوەکو ساڵی ٢٠٠١، ئەوا دەزگا رەسمییەکانی تورکیا جەخت لە سەر ئەوە دەکەن کە هێشتا لە تورکیا زیاتر لە ١٢٠ تۆڕی مافیای تر هەن و دزەیان کردۆتە نێو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی تورکی.

## سێیەم/ ململانێی کۆمەڵایەتی: کێشەی کەمایەتییەکان لەتورکیا:

کێشەی کەمایەتییەکان لە تورکیا لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی عوسمانی دەستیپێکرد، کاتێك ئەو هۆزەی (عوسمان) سەرۆکایەتی دەکرد، توانی ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە دابمەزرێنێ گەلانی عەرەب و کورد و فارس و ئەرمەن و چەرکەس و بولگار و رۆمان و سرب و یۆنان و ئەوانیتر لە دەوڵەتێکی مۆزاییکی فرە رەگەز لە رووی نەتەوە و زمانەوە لە خۆبگرێ. بەڵام بیرۆکەی یەکێتی عوسمانی داتاشراو، چەترێکی پان و پۆڕی لە سەرەوەدا پێدادابوو، دەوڵەتەکە بەدیمەن وا دەهاتە پێش چاو لە رووی ئیدارییەوە هاوڕەگەزە، وەلێ پێکهاتە جیاجیاکانی ناوەوەی بە نهێنی و بە ئاشکرا بە درێژی پێنج سەدەی رابوردوو لە تەمەنی دەوڵەتی عوسمانی،

تێدەکۆشان لە پێناو بەدەستهێنانی پێناسە نەتەوەییەکانیان. کە بزوتنەوەی کەمالیزمیش لەو پارچە بچووکەی نێوی (ئەنادۆڵ) و پاشماوەی خاکی بەرین و گەورەی دەوڵەتی عوسمانی بوو، سەری هەڵدا پاش ئەوەی هاوپەیمانەکان میراتی پیاوە نەخۆشەکە (دەوڵەتی عوسمانی)یان دابەشکرد، سێ نەتەوەی جیاواز لەرووی رەگەز و زمان و کلتوورەوە لە وڵاتی ئەنادۆڵ لەگەڵ تورك دا دەژیان، ئەوانیش بریتی بوون لەعەرەب و کورد و ئەرمەن، سەرەڕای چەند نەتەوەیەکی تر کە لە رووی رەچەڵەکی نەتەوەیی و زمانەوە لەگەڵ تورکدا هاوبەش بوون، وەك: چەرکەس، لاز، قازاق و داغستان و ئەوانیتر.

بەڵام هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب چەکیان هەڵگرت و دایانە پاڵ بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال پاشا بۆ بەرگریکردن لە وڵاتی ئەنادۆڵ لە دژی داگیرکەری بیانی بە هیوای شادبوونیان بە ئۆتۆنۆمی پاش ئەوەی وڵات سەربەخۆیی وەردەگرێ. بۆ هەقیقەت و بۆ مێژوویش دەڵێین: ئەرمەنەکان لە هەموو گەلان زیاتر پەرۆشی سەربەخۆیی و پاراستنی پێناسە نەتەوەییەکەیان بوون، بۆیە هاوکاری بزووتنەوەکەی مستەفا کەمالیان نەکرد، بەڵکو پردی لێکحاڵیبوونیان لەگەڵ هاوپەیمانەکان درێژ دەکردەوە، بە تایبەتی دوای دامەزراندنی کۆماری ئەرمینیای سۆڤێتی وەکو هەوڵێك لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی لە وڵاتی ئەنادۆڵ و دوای ئەوەش دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمینیای گەورە لە ناوچەکە.

هەرچی عەرەبەکانی دانیشتووی لیوای ئەسکەندەرۆنە و ناوەندی هەردوو ویلایەتی سعرد و ماردین (١٩/٢٨) و ئەو بەشانەی نزیکی سنووری سوریا لە ویلایەتەکانی دیاربەکر و غازی عێنتاب و ئەدەنەش بوون، ئەوا نەیانتوانی پێناسە نەتەوەییەکەیان بپارێزن بەتایبەت ریفۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی ئەتاتۆرك بەوە رازی بوون لە ناو خۆیاندا بە شێوەزارە عەرەبییە سوورییەکە باخێون، بە تایبەتی پاش ئەوەی لیوای ئەسکەندەرۆنە بە تورکیاوە لکێندرا بە بێ ئەوەی ئەلفبای عەرەبی یان نووسینی عەرەبی بزانن چونکە میدیایەکی عەرەبی تایبەت بەخۆیان شك نەدەبرد، لە نێویانیشدا لە پاش دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیای تازە ئیجاد، هیچ بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی جوداخوازیی یان هیچ بزوتنەوەیەك بۆ سەربەخۆییبوونیان لە تورکیا سەری هەڵنەدا، چونکە روویانکردە ژیانی نوێیان بە تایبەت لە بواری بازرگانی.. نەك هەر ئەوە، بگرە زمانە عەرەبییەکەشیان لەبیرکرد. لێرەشەوە، جگە لە دوو بزووتنەوەی نەتەوەیی کە ئەوانیش: بزووتنەوەی ئەرمەن و بزووتنەوەی کورد بوون و تێدەکۆشان لە پێناو مافی چارەنووسی خۆیان، ئەوا تورکیا رووبەڕووی هیچ بزووتنەوەیەکی تر نەبۆوە.

## ١- بزوتنەوەی ئەرمەنی:

دوای نیوەی سەدەی نۆزدەهەم، شنەبای ڕابوونی نەتەوەیی لە ئەوروپاوە بەرەو ڕۆژهەلاّت، هەڵیدەکرد. ئەوددەمە، رۆحی نەتەوەیی- وەك هەموو کەمایەتییەکانی دیکەی دەوڵەتی عوسمانی- بەلای ئەرمەنییەکانیشەوە جۆشی سەندبوو بە گەڕانەوە بەرەو سەرچاوەکانی کلتووری نەتەوەیی خۆیان، هەر چەندە ئەوان دابەش بووبوون بە سەر سێ دەوڵەت: ئەرمینیای رووسی، ئەرمینیای ئێرانی، ئەرمینیای تورکی و بەشێکی زۆریشیان لە ولاّتانی تری جیهان پەرت و بلاّوبووبوونەوە. بەلاّم ئەرمەنییەکان پەرۆشی یەکگرتن بوون و هەستیان بە گرنگی ئەم مەسەلەیە لە ژیانیاندا دەکرد.. (ئەردزرۆنی) لە رۆژنامەکەی بەناوی (میشاك)ەوە نووسیویەتی دەڵێت: "دوێنێ ئێمە تەنها تایفەیەکی ئەکلیرکی بووین، سبەینێش نیشتمانێك بنیات دەنێین"(٦٣/٢٩).

ئەم بزوتنەوە سەربەخۆییەی ئەرمەن، گومانی بە لای سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە هورووژاند و تووڕەیی و نیگەرانی خۆی لەم بارەیەوە دەردەبڕی. نووسەرێکی ئەرمەنی دەڵێت: "ئەرمینیا هەمووی لە نێوان هەردوو ساڵی ١٨٩٤-١٨٩٦، نوقمی لافاوی خوێن بوو، ئەو دەمەی سەدان خێزان بە شێوازێکی وەحشیگەرانە قەتڵ و عام کران بە تەرحێکی وا ئەمریکا و ئەوروپا بەریسوابوون و مەترسی گەورە ناویان برد، دەوڵەتە گەورەکان بۆ راگرتنی ئەم کوشتارە هاتنە وەلاّم، بەلاّم دەستێوەردانیان تەنها بریتی بوو لە هەڵوێستی مەبدەئی.. وەلێ هەرەشەکان وایانکرد سوڵتان عەبدولحەمید پڕۆژە جەهەندەمییەکەی لەمەڕ قڕکردنی ئەرمەنییەکانەوە رابگرێ. بە نموونە ئەو جەنگاوەرە ئەرمەنییانەی کە ترسێکی زۆریان لێنیشتبوو، لەمانگی ئابی ساڵی ١٨٩٦ هەوڵیاندا دەستبگرن بە سەر بانقی عوسمانی لە قوستەنتینیە و هەڕەشەیان کرد: ئەگەر بێت عوسمانییەکان دەست لە پلانی خۆیان بۆ قڕکردنی ئەرمەن هەڵنەگرن، ئەوا بینایەی بانقەکە بە دینامێت تەخت دەکەن. وەلێ باڵیۆزی رووسیا (م. مەکسیمۆف) بە ناوی دەوڵەتانی زلهێزەوە توانی بەوە چارەسەری کێشەکە بکا، بەڵێنی لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرت لەم بارەیەوە چاکسازی بکات، بەلاّم بەڵێنەکان جێ بەجێ نەکران و درۆینەی دواین پاژی کارەساتی ئەرمەنییەکان لە دەوڵەتی عوسمانی، (٣٠٠) هەزار قوربانی بوو" (٦٣/٢٩).

ئەگەرچی ئەرمەنییەکان وەکو هەموو کەمە نەتەوایەتییەکی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی، بە گەشبینییەوە پێشوازییان لە کودەتای عوسمانی ساڵی ١٩٠٨ کرد، بەلاّم حیزبی (ئیتحاد و

تەرەقی) دوای ئەو قۆناغە شۆڕشگێڕییەی کە جەماوەر لە میانەی خۆپێشاندانەکانی فێرگەی جەنگی و ریپێوانەکانی گۆڕەپانی تەقسیم، پێدا تێپەری، لە هەموو ئەو پرنسیپە رزگاریخوازییانەی لە سەروبەندی شۆڕش بڵاوی کردبوونەوە پاشگەز بۆوە، بەتایبەتیش پاش ئەوەی دروشمی (تورکیا تەنها بۆ تورکەکان)ی بەرزکردەوە. ئیدی بە شێوەیەکی وا دەستیاندایە ستەم و زۆرداری و کپکردنی ئازادی و چەوساندنەوەی کەمە نەتەوایەتییەکان، تەنانەت لەم کردەوانەیاندا سوڵتان عەبدولحەمیدیان بەزاند.

کاتێکیش ئیتحادییەکان لە شەری جیهانی یەکەم بڕیاریاندا بچنە پاڵ ئەڵمانیا و نەمسا، حکوومەتی عوسمانی داوای لە ئەرمەنییەکان کرد ئەوانیش شان بەشانی هاوڵاتییانی ئیمپراتۆرییەتەکە چەك هەڵبگرن، بەڵام کەلەشەڕی (ساری گامیش) شکان، لۆمەکەیان هەموو خستە ئەستۆی سەربازەکانی ئەو تیپە ئەرمەنییانەی لە سوپای عوسمانیدا شەڕیان دەکرد، لە دەرەنجامی ئەمەدا بەرەو سنوورەکانی رووسیا دوور خرانەوەو پاشان لە ئاداری ساڵی ١٩١٥ چەکەکانیان لێ سەندرایەوە، نەك هەر ئەمە، بەڵکو وەزیری جەنگ ئەنوەر پاشا لە ٢٠ی مایسی ساڵی ١٩١٥ مەرسوومێکی مەترسیداری بە ناوی کۆمیتەی تورکیای گەنجەوە بڵاوکردەوە تیادا فەرمانیدا بە دوورخستنەوەی هەموو ئەرمەنییەکان لە ویلایەتەکانی ئەرمینیا و ئەنادۆڵ و کیلیکیا بەرەو ئەو بیابانە عەرەبییانەی کەوتوونەتە باشووری هێڵی بەغدا، ئەم دوورخستنەوەیە لە جینۆساید بەولا چیتری نەدەگەیاند، ئەویش بەسێ قۆناغ بەڕێوەچوو: قۆناغی کوشتارگە، قۆناغی کاروانەکان، قۆناغی ئۆردوگاکانی بیابان (٢٩/٦٣).

ئەرمەنییەکان پێیان وایە: ئەم پرۆسە قڕکردنە بووە هۆی گیان لەدەستدانی یەك ملیۆن هاوڵاتی ئەرمەنی، بەمەش کۆی ئەو هاونیشتمانییە ئەرمەنییانەی عوسمانییەکان لەناویان بردن، گەیشتە یەك ملیۆن و نیو ئەرمەنی. ئیمرۆیش بزوتنەوەی ئەرمەنی کار دەکات بۆ ئەوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانو تورکیاش دان بنێن بە هەقیقەتی ئەم کوشتارگەیەی کە لە ساڵی ١٩١٥ گەلی ئەرمەنی تیادا بووە قوربانی، ئەمە دوای ئەوەی کە پتر لە ٨٠ ساڵ تێدەپەڕێ بەسەر پەیمانی لۆزان کە بە پێی مادەکانی ئەرمینیای لێکترازان و دابەشی کردن بە سەر هەرسێ دەوڵەتی دراوسێ: یەکێتی سۆڤێت و تورکیا و ئێران.

لۆبی ئەرمەنی لە فەرەنسا (لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠١) توانی قەناعەت بەپەرلەمانی فەرەنسا بینێت دان بنێ بە هەقیقەتی رووداوی قەتڵ و عامی ئەرمەن لەساڵی ١٩١٥ و زەروورەتی دانپێنانی تورکیا بەو مەسەلەیە، جگە لەوەش بڕیاریدا بەدانانی

پەیکەرێك بۆ یادی قوربانییەکانی ئەرمەن لە ناو جەرگەی شاری پـاریس، چـەند دەوڵـەتێکی دیکەش ئامادەکاری دەکەن بۆ دەرکردنی دانپێنانی لەم جـۆرە، ئەگەرچـی تورکیـا سـەبارەت بەمە ناڕەزایی دەردەبڕێ و بلاّوی دەکاتـەوە کـە هـەر دەوڵـەتێك دان بـەوەدا بنـێ پێوەنـدی ئـابووری لەگـەڵ رادەگـرێ و ئەمـەش ئـەو سیاسـەتەیە میـدیاکان رەخنـەی لێ دەگـرن و بەسیاسەتێکی بێهوودەی دادەنێن لە سەردەمی جیهانگیری و مافی مرۆڤ.

وا زانراوە، بزوتنەوەی نوێی ئەرمەنی کە داوای تۆڵـە و سـەربەخۆیی دەکـات، لـە سـاڵی ١٩٧٥ لە (بورج حەممود) لە لوبنان دامەزرا، ئەو دەمەی نەوەی سـێیەمی لاوانـی ئەرمـەنی، پێشمەرگەکانی فەڵەستینیان بە باشترین یارمەتیدەرزانی بۆ خۆیان لەرووی مەشق و راهێنان و چـەکەوە و رێکخراوێکـی نهێنییـان دامەزرانـد، ناویـان لێنـا سـوپای نهێنـی ئەرمـەنی بـۆ رزگـارکردنی ئـەرمینیا و بـەکورتی بـەرێکخراوی (ئاسـالا) ناسـرا. ئـەم رێکخـراوە چـەند هاوپەیمانییـەکی لەگـەڵ بزووتنـەوە رزگاریخوازییـەکانی رۆژهـەڵاتی نـاوین بەسـت، کاتێـك کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسی هاوبەشی لەگەڵ پارتی مارکسی کـورد لەسـاڵی ١٩٨٠ سـازدا و تیادا هەردوولا جەختیان کردە سـەر خـەبات لـە پێنـاو دامەزرانـدنی سیسـتمگەلی میللـی لەناوچەکە، رێکخراوی (ئاسـالا) چـەندین چـالاکی لـە دژی کەسـایەتی و بەرژەوەندییـەکانی تورکیا ئەنجامدا. بەنموونە: لە ساڵی ١٩٨٢ تەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی (٥) دیپلۆماتکاری تورك لەناو ببات. لەپاش هاتنەسەر دەسەڵاتی (ئیمـام خومـەینی)ش لـە ئێران "کۆڕی رێکخراوە میللییە خەباتگێڕەکان لەپێناوی مافی خۆیان لە جیهـان" لـە تـاران گرێ درا و رێکخراوی (ئاسالا) تیادا بەشدار بوو، پاشـان نوسـینگەیەکی تایبـەتی لـە تـاران کردەوە.

وادیارە، ئیمام خومەینی ویستی یاری بەکارتی ئەرمەنییەکانەوە بکـات لـەدژی تورکیـا، چونکە تورکیا رێگەی بەژمارەیەك لە نەیارانی رژێمی ئێران دابوو چالاکی لەناو تورکیـاوە بـە ئەنجام بگەیەنن بە تایبەتی لـەو ناوچـە سـنوورییانەی کەنیمچـە کراوەیـەك بـوون لـە پـێش بەرهەڵسـتکارانی ئێـران و ئەوانـەی دەیانویسـت لـەم وڵاتـەوە هـەڵبێن، بـەهۆی رێگـەدانی دەسەڵاتدارانی تورکیا (١٩/٣٠).

کاتێك ئەم سێ رێکخراوە ئەرمەنییانە: رێکخراوی سوپای نهێنـی ئەرمـەنی مارکسـیزم و رێکخراوی سوپای شۆڕشگێڕی ئەرمەنی- کە چەندین کردەوەی سـەربازی لـە دژی دەزگاکـانی فەرەنسا بەئەنجام گەیاند- و رێکخراوی رادیکاڵییە ئەرمەنییەکان، لە شـاری لـۆزان لـە ٢٠-

٢٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٣ دووەمین کۆنگرەی ئەرمەنییان گرێ دا، کۆنگرەی ناوبراو بەرنامەی خۆی بۆ ماوەیەکی کورت بەم شێوەیەی لای خوارەوە دیاری کرد: (٩٥/٩٢)

١- ئەو کۆمەڵە ئەرمەنییانەی لە دەرەوە نیشتەجێن و نزیکەی (٣) ملیۆن کەسن و تائێستا رێك نەخراون، بکرێن بەهێزێکی سیاسی کاریگەر.

٢- دەستەبەرکردنی پێناسەیەکی رەوا بۆ ئەو ئەرمەنییانەی لە دەرەوەن، سەرەڕای دانپێنانی دیپلۆماسی بەنوێنەرە ناحکومییەکانیان.

٣- بە هەموو شێوازێکی سیاسی و دیپلۆماسی خەبات بکرێ لە پێناو دانپێنانی بە مافی جێگیری گەلی ئەرمەنی و رزگارکردنی ئەو خاکەی لە بن دەستی دەسەڵاتی تورکدایە.

٤- بەرگریکردن و پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندی و مافەکانی رابوردوو و ئێستا و داهاتووی گەلی ئەرمەنی کە لە دەرەوەی وڵات نیشتەجێیە.

ئەگەرچی، سوپای نهێنی ئەرمەنی، ئەرمینیای سۆڤێتی بەنیشتمانی نەتەوەیی دادەنێت، وەلێ (تاشناق)ەکان متمانەیان بەسۆڤێت نەدەکرد، کەچی ئەرمەنییەکانی بەیروت بانگەشە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی دەکەن تا ببێ بەبەشێك لە جیهانی سێیەم، لەبەر ئەمە (جیمس کەرنوسیان)ی کاهین، کۆنگرەی (لۆزان)ی بە "کۆنگرەی زۆرینەی ئەرمەنی بێدەنگ" ناو برد (٥٩/٢٩). بۆیە ئەم کۆنگرەیە نەیتوانی بگاتە دەرەنجامی زانستییانە بۆ خزمەتکردنی کێشەی ئەرمەنییەکان هەرچەندە هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەبواری وەگەرخستنی توانای ئەرمەنییەکان تاببنە هێزێکی کاریگەر تا ماوەیەکی زۆر مادامێك هێشتا نەیانتوانیوە دانپێنانی رەسمی نەتەوە یەکگرتووەکانیان بەرامبەر بە قەتڵ و عامی ئەرمەنییەکان دەستەبەر بکەن، ئەو قەتڵ و عامەی کە بەرپرسانی تورك نایانەوێ گوێیان لێ بێ، یاخود بە سەر زمانیاندا بێت. لەم لایەنەوە وەزیری دەرەوەی تورکیا لە ئاخاوتنێکدا رەخنەی لە فەرەنسا گرت، "چونکە بەبڵاوکردنەوە پروپاگەندە هانی تیرۆریستانی ئەرمەنی دەدات لە دژی تورك"، بەر لەمەش باڵیۆزی تورکیا لەفەرەنسا (عەدنان بولاق)، تەلەفزیۆنەکانی فەرەنسای تۆمەتبار کرد و گوتی: "بەش بەحاڵی خۆم وەك کەسێك پشتاوپشت لە عوسمانییەکانەوە هاتوومەتە خوارێ، هیچ شتێك لە تورکیا رووی نەداوە، لە شێوەی قەتڵ و عام (جینۆساید) بچێت" (٥٩/٢٩). لەلایەکی ترەوە، (کەنعان ئیڤرین)ی سەرۆك کۆماری تورکیا، لە وتارەکەی بەبۆنەی جەژنی وەرزش و لاوانەوە، لە رۆژی ١٩ی مایسی ساڵی ١٩٨٤ تاکیدی کرد و گوتی: "تورکیا کە ٦٥ ساڵ لەمەوبەر لە پێناو سەربەخۆیی و رزگارکردنی خاکەکەی لەچنگی

داگیرکەران خەباتی کرد، نابێت بستە خاکێکی دەستی لێ هەڵبگیرێ بۆ ئەوانیتر. ئەو دوژمنانەی تورکیاش کە لە ناوەوە و دەرەوە هەوڵ دەدەن بۆ دابەشکردنی وڵات و لاوازکردنی بە ڕێگای تیرۆر وەك ڕێگا خۆشکردنێك بۆ تێکدانی و سڕینەوەی لە بوون و وجوود لە تۆڵەی شکستی ٦٥ ساڵەی بەر لە ئێستایان، لە هەوڵەکانیاندا سەرکەوتوو نابن، چونکە ئەتاتۆرك ئەم نیشتمانەی بە ئەمانەتێك سپاردە ئەو لاوانەی کە لە توانایاندایە بیپارێزن" (٦/٣١).

لە کاتێکدا توندوتیژی ئەرمەنییەکان لە لایەن سوپای نهێنی ئەرمەنییەوە، ڕووی لە پەرەسەندندایە، دەبینی حیزبی تاشناق- دیارترین حیزبە سیاسییە ئەرمەنییەکان- هەڵوێستی ناڕەزایی دەربڕین وەردەگرێ لەهەمبەر کردەوەی توندوتیژی کوێرانە و پێی وایە: "سوپای نهێنی ئەرمەنی خەیانەتی لە کێشەی ئەرمەنی کردووە و وەك کۆمەڵی (ئەبو نچال)ی فەلەستینی بۆتە ڕێکخراوێکی تیرۆریستی پەتی و بەتەواوی خۆی هاویشتۆتە باوەشی یەکێتی سۆڤێتەوە" (٦٢/٢٩). ئەم حیزبە بەپێی (هنری باباسیان)ی وتەبێژە فەرمییەکەی، بڕوای بەچارەسەری سیاسی و دیپۆماسی کێشەی ئەرمەنییەکان هەیە، یانی چارەسەری ئاشتییانەی کێشەکە. بە نموونە دوای کردەوەکەی (ئۆرلی) لەساڵی ١٩٨١ یەکێك لە ئەندامانی سوپای نهێنی ئەرمەنی بە ناوی (خاچیك ئانادیسیان) دەستگیرکرا. لە دەرەنجامی ئەم ڕووداوە، سوپای نهێنی ئەرمەنی، چەندین کردەوەی لە دژی دەزگاکانی فەرەنسا بە ئەنجام گەیاند لێرەشەوە، حیزبی تاشناق داوای لە فەرەنسا کرد: "هەوڵە دیپلۆماسییەکانی چالاك بکاتەوە لە پێناو دانپێنانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەهەقیقەتی ئەو کوشتارەی گەلی ئەرمەنی لە ساڵی ١٩١٥ دووچاری بۆوە.."، وتەبێژی بەناو حیزبەکە جۆرێك لە ڕێگەچارەی دانوستاندن ئامێزی بڵاوکردەوە بریتی بوو لەدووبارە دابەشکردنی ئەرمەنییەکان لە ئاسیای بچووك... و دانانی بەمافی کەمایەتییەکانی وەك ئەرمەنی و کورد.. و ئەرمەنییەکان دەخوازن بە شێوەیەکی سەربەخۆ و ئازاد لە (ئەرمینیا) بژین، تەنانەت ئەرمینیای سۆڤێتیش بگرێتەخۆ" (٦٢/٢٩).

جا، ئەگەر وتارەکەی (ئیڤرین) لە ساڵی ١٩٨٤ وەڵامدانەوەیەکی ناڕاستەوخۆ بوو بێت بۆ داخوازی ئەرمەنییەکان: بە دابڕینی بەشێك لە ئەنادۆڵ و لکاندنی بە (ئەرمینیای گەورە)وە، یان دەمەزراندنی ئەو (دەوڵەتە خەونە) لە سەر ئەو پارچەیە، ئەوا ئەرمەنییەکان کەژمارەیان بەگوێرەی خودی سەرچاوە ئەرمەنییەکان دەگاتە نزیکەی (٧) ملیۆن ئەرمەنی و بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر ڕەگەزی (تراکۆ- فیریجیان)ی کۆن کە لە سەدەی سیانزدەهەمی پێش زایین لە (بان)ی ئەرمەنی دەژیان و دوایی توخمە ئوراراتی و ئاشووریو کلدانییەکان تێیاندا توانەوە،

ئەوە تاوەکو ئێستاش ئەم گەلە وەك زۆربەی کەمایەتییە دابەشکراوەکانی جیهان، درێـژەی بـە خەباتی خۆی لە پێناو بەدیهێنانی پێناسەی نەتەوەیی و یەکێتی نیشتمانەکەی.. دەدات ئەگەر گەمەی گەلان رێگەی ئەوەی پێ بدات.

## ٢- بزوتنەوەی کورد:

رۆژنامەنووسی ئەمریکایی جۆزێف کرافـت، دەڵێـت: دوای دیدارەکـەی لەگـەڵ سـەرۆکی تورکیا (کەنعان ئیڤرین) لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٤، رەشنووسی ئەم دیـدارەی پێشـانی کۆنـە باڵیۆزێکی ئەوروپی لە ئەمریکا کە شارەزای هەموو کون و کەلێنێکی پرسی تورکیـا بـوو، دا بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆی لەمەڕ مەسەلەکە دەرببڕێ، باڵیۆزەکە گوتی: تـورك حـەز ناکـەن دان بنێن بە کەمایەتی جیاجیای وەك کورد و ئەرمەنی و ئایینزای جیاجیاش لە نێوانیانـدا هـەن. چونکە تاکیدکردنیان لە سەر ئەو جیاوازییانە لە تورکیا بە مانای کردنەوەی رێگایە لـە پـێش کەرت و پەرتبوونی زێدەتر... و ئەوانیش بواری ئەم شتە نادەن. تورکەکان هێشتا کەمێك لـە هەستی داب و نەریتی ئەو ئیمپراتۆرییەتەیان لاماوە کە لـە سـەروبەندی عوسمانییەکانـدا زاڵ بوو (٣٢/٩٤).

هەقیقەتی ئەم جۆرە راوبۆچوونانە هەرچۆنێك بێت، ئەوە رژێمەکانی تورکیـا لەسـەردەمی ئەتاتۆرکەوە، نایانەوێ دان بنێن بە بوونی نەتەوەیی کەمایەتییەکانی تری دانیشتووی تورکیـا بە تایبەت کوردو ئەرمەنییەکان، ئەگەرچی رەوشـی کـوردی تورکیـا و خـەباتی نەتـەوەییان، جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەوەی تایبەت بە ئەرمەنییەکانە، لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە:

١- بزوتنەوەی گەلی کورد لە تورکیا، داوای جۆرێك لـە حـوکمی نامەرکـەزی ئیـداری و پاشان لـە دەسـتپێکی سـەدەی نۆزدەهەمـەوە داوای ئۆتۆنـۆمی (خودموختـاری) کـرد. ئـەم داخوازییە تەنها لە دوای هەشتاکانی سەدەی رابوردوو (بیستەم)ەوە بەرەو داوای سـەربەخۆیی پەرەی سەند، ئەویش لەئاکامی ئەو سیاسەتە لەناوبردنەی هێزەکانی تورك لـە دژیـان پیـادەی کرد. کەچی بزوتنەوەی گەلی ئەرمەنی لە پـاش شـەڕی یەکـەمی جیهـانی و لـە دەرەنجـامی بڕیارەکانی کۆنگرەی لۆزان، دەستییێکرد.

٢- بزوتنەوەی گەلی کورد لە ناو تورکیا و لە سەر خاکی بـاو بـاپیران و لـەو شـوێنانەوە بەهەموو کون و قوژبنێکی شارەزایە، خەبات دەکات. بەپێچەوانەی بزوتنەوەی ئەرمەنییـەکان

کە دەیانەوێ شەڕی تورك و بەرژەوەندییەکانی تورکیا لــە دەرەوەی وڵات و لــە شــوێنەیلێکەوە بەهەزاران میل لە نیشتمانی دایکەوە دوورن، بکات.

٣- بزوتنەوەی کورد لە تورکیا، هەردوو کوردستانی عێراق و ئێران بەقووڵاییە ستراتیژی و شەڕگەییەکەی خۆی دەزانێ بە رادەیەك رژێمە دەسەڵاتدارەکانی تورکیا تــا ئێســتاش وێــڕای هاوپەیمانییان لەگەڵ رژێمە دراوسێیەکانی تورکیا، نەیانتوانیوە ئــەم قووڵاییــە ســتراتیژییە پــڕ بکەنەوە، چونکە لەوێدا لە کوردستان بە (هەرسێ بەشەکەیەوە) یەکێتی خەباتی چارەنووسساز لەئارادایە. کەچی دەبینین ئەرمەنییەکان لەم قولاًییە ستراتیژی و خەباتە چارەنووسسازەی نێوان هەرسێ بەشەکەی ئەرمینیا، بێبەشن. چونکە لە ناو خاکی تورکیا هیچ بنکەیەکی سەرەکییان نییە لێوەی درێژە بەخەباتیان بدەن.

٤- ئەو کەشە دیموکراتی و نیمچە فرەییــەی لــە تورکیــا هەیــە و داواکردنــی رۆشــنبیر و هزرڤانانی تورك بــۆ زەرووڕەتــی دانپێنــانی بــە بــوونی نەتــەوەیی گــەلی کــورد لــە تورکیــا، گوڕوتینێکی بەخشــیوەتە بزوتنــەوەی کــورد بــۆ بــەردەوامبوون لــە ســەر خــەبات لــە پێنــاو دەستەبەرکردنی مافەکانی. کەچی ئەرمەنییەکان لــەم پشــتگیرییە ناوخۆییــە بێبەشــن، وەلێ ئەوانیش وەکو کــورد هاوســۆزی ژمارەیــەك لــە دەوڵەتــەکانیان بــۆ لای خۆیــان راکێشــاوە و ژمارەیەکیش لەو دەوڵەتانەی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ ئەم بزوتنەوانە گونجاون، پشــتگیرییان دەکەن.

لێرەشەوە، بزوتنەوەی گەلی کورد لە تورکیا، هەوڵ دەدات پێوەندییەکانی لەگەڵ بزوتنەوەی کورد لە کوردستانی گەورە لە لایەك و لەگەڵ بزوتنــەوە پێشــکەوتووخواز و دیموکراتییــەکانی تورکیا لە لایەکی ترەوە، پتەو بکات، سەرەڕای هاوکاریکردنی لەگەڵ هــەموو بزوتنەوەیــەکی رزگاریخوازی لە جیهاندا. بەمەش ئەم بزوتنەوەیــە تــوانی بایــەخ و گرنگــی پێــدانی بزوتنــەوە پێشکەوتووخوازەکانی تر لە ناوەوە و پشتگیری کوردی ناوچەکە و هاوسۆزی ناوەندە ئازادیخواز و دیموکراتییەکان لە جیهان دەستەبەر بکات. بۆیە ئەو هێزە پێشکەوتووخواز و دیموکراتخوازانە توخمگەلێکی فشاریان پێکهێناوە یاخود بوونەتە هێزی فشاری سیاسی (لۆبی) لە سەر تورکیــا لە پێناو دانپێنان بە بوونی نەتەوەیی کورد لە تورکیا و هەروا دانپێنانیش بە مافی نەتــەوەیی کەمایەتییەکانی تر. لەبەر هەموو ئەم فاکتەرانە تورکیا کەوتــە خــۆی و ئــەوەبوو لــە ســاڵی ١٩٨٨ کۆمپانیای توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەشاری واشنتۆن بەناوی (دەستەی رێنماییکــارانی نێو نەتەوەیی) دامەزراند بە ئامانجی نزیکخستنەوەی بیر و بۆچوونەکانی هەردوو حکوومــەتی

تورکیا و ئەمریکا لەگەڵ یەکتر سەبارەت بەکاروباری رۆژهەلاّتی ناوین و کێشەکانی تورکیا (۱۹/۳۳) و لە پێناو بەرەنگاربوونەوە لەو فشارە سیاسییە دەرەکییانەی دەخرێنە سەر تورکیا. جگە لەوەش، وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە ساڵی ۱۹۹۰ دۆسییەیەکی تایبەت بەناوچەی باشووری رۆژهەلاّتی ئەنادۆڵ ئامادەکرد تابیخاتە بەردەم ئەو دەوڵەتە رۆژئاواییانەی فشاریان خستۆتە سەر تورکیا لە سۆنگەی پێشێلکردنی بەرامبەر بەمافی مرۆڤ لە ناوچەی کوردنشیندا (۱/۳٤).

جا، لە حاڵێکدا (ئوزال) پێی وایە رۆژگار کێشەی کورد چارەسەر دەکات (۲۵/۳۵)، ئەوە بەم وتەیەی ئاماژە بەنیوەی ئەم هەقیقەتە دەکات کە دەڵێت: تورکیا ئەگەر خوازیارە ببێتە ئەندامێك لە یەکێتی ئەوروپا، پێویستە لە سەری کێشەی کورد چارەسەر بکات، چونکە جیهانی رۆژئاوا تورکیایەك لە ریزی خۆی وەرناگرێت کە وێڕای پەرلەمان و فرە حیزبییەکەی، سەراپای پڕە لە پێشێلکاری مافی مرۆڤ و بوونی حوکمی لەسێدارەدان لەنێو یاسای سزاکانیو کاروباری دەوڵەتیش بەرێگەی ئەو بڕیارە ئیدارییانەوە بەڕێوە دەبات کە هێزی یاسایان هەیە.

بۆیە، تورکیا لە سێ لاوە لە سەر ئاستی ناوخۆیی و دەرەکی رووبەڕووی فشارگەلێکی سیاسی و فشاری دەستە و دەزگا پێوەندیدارەکانی مافی مرۆڤ بۆتەوە، فشارەکانیش لەلایەن، ئەمانەوە پیادە دەکرێن:

### یەکەم- بزوتنەوەی دیموکراتی تورکی:

ئەو دەمەی کوودەتای ۱۲ی ئەیولی ساڵی ۱۹۸۰ رووی دا و باری نائاسایی لە تورکیا بلاّوبۆوە لە دەرەنجامی جێبەجێکردنی حوکمی عورفی و سانسۆری سەر رۆژنامەکان، سەرەڕای ئەو مافە ڤیتۆیەی بەسەرۆکی کۆمار بەپێی دەستووری ساڵی ۱۹۸۲ دراوە، ۱۲٦٤ نووسەر و هونەرمەند و رۆژنامەنووس و پارێزەر و مامۆستای زانکۆ لە ۱٥ی مایسی ساڵی ۱۹۸٤ یادداشتێکیان بەرزکردەوە بۆ دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار تێدا داوایانکرد بە زەرووەرەتی پیادەکردنی مومارەسەی تەواوی دیموکراتی لە ولاّت و گۆڕینی چەند بەندێکی دەستووری نوێ و هەڵوەشاندنەوەی ئەو رێکارانەی کەلەدژی دیموکراتین و هێشتا لە تورکیا کاریان پێدەکرێ، ئەگەرچی حوکمی مەدەنی لە تشرینی دووەمی ساڵی (۱۹۸۳)وە گەڕاوەتەوە بۆ ولاّت. بەلاّم لە بری ئەوەی دەوڵەت بەدەنگی داخوازییەکانی ئەو هزرڤانانەوە بێت، دادگای سەربازی لەئەنکەرە لە دوای دانیشتنی یەکەمی، بڕیاریدا لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکات کە

نوێنەرایەتی سەرکردەکانی هزر و رووناکبیری و رۆژنامەگەری و یاسا دەکەن لە وڵاتدا. بەمەش رووبەڕووی سەپاندنی حوکمی دادگا بوونەوە بە سزای بەندکردن لە ٣ مانگەوە بۆ ساڵێك بەتۆمەتی "پابەند نەبوون بەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرکردایەتی سەربازی ئەنکەرەی تایبەت بە رێکخستنی پروپاگەندەی سەربازی" (٢٥٤/٣٦). لە سەرووی ئەو بیرمەندانەشەوە، هەریەك لەم نووسەرانە بوون: رۆماننوسی ناوداری تورکیا(عەزیز نەسین) سەرۆکی سەندیکاکانی ئەدیب و نووسەرانی تورك، (بەهرام ئوغلۆ)ی شاعیر، (سەندالچی)ی هونەرمەند و (محەمەد عەلی ئیبار)ی نووسەر و چەند رووناکبیرێکی تر.

گۆڤاری (ئیکۆنۆمیست)ی بەریتانی، رەوانەکردنی ئەو (٥٦) هزرڤانە تورکییەی کە یاداشتەکەیان واژۆکرد، بۆ پێش دادگای عورفی سەربازی لەئەنکەرە، بە نموونەی ئاشکرای ناکامڵبوونی دیموکراتی لەم وڵاتە لە قەڵەمدا کە هێشتا فرە کون و کەلێنی تاریکی شاردۆتەوە"(٩/٣٧).

وەلیٚ، دیموکراتیخوازانی تورك تەنها بە بەرزکردنەوەی ئەم یاداشتە وازیان نەهێنا، بەڵکو لە زۆربەی ئەو کار و چالاکییانەش بەشدارییان کرد کە لە ئەورووپا رێکخران بە ئامانجی ئاشکرا کردنی رووی راستەقینەی دەسەڵاتی سەربازی لە تورکیا و داوایانکرد بۆ ئازادکردنی ئەندامانی هەوادارانی ئاشتی لەتورکیا: باڵیۆزی پێشوو مەحموود دیکردین و پارێزەر ئۆرهان بیلین و ئاتائۆل بەهرام ئۆغلۆی شاعیر و (٥) ئەدیبی ناسراوی تر کە لە ساڵی (١٩٨٢)ەوە لەبەندیخانە لە ئەستەموولٚ بەبیٚ دادگاییکردن بەند کرابوون و هەریەکە چاوەڕیٚ بوون بۆ ماوەی ٥-١٠ ساڵ حوکمیان بەسەردا بسەپێنریٚ (١٠/١٧). ئەدیبانی تورك لەساڵی ١٩٨٤ بەشداریشیان لەکۆنگرەی نووسەرانی ئەورووپا کرد و لە کۆنگرەکەدا نارەزایی خۆیان بەرامبەر بە سانسۆری دەوڵەت و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دەربڕی بە تایبەتی لە ناوچە ناسەقامگیرییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا و بەرامبەر بەبوونی ٣٥ هەزار بەندکراوی سیاسی تورکیا کەتۆمەتبار کراون بەبڵاوکردنەوەی ئاژاوە لەوڵات و بە بەرهەڵستکاریکردنی دەوڵەت و داوای دەرکردنی لێبوردنی گشتییان بۆ (٢٠) هەزار گیراوی تورك کرد، کە تۆمەتی تیرۆریستیان خرابووە پاڵ (٩/٣٧).

گۆڤاری (بەرەو ساڵی ٢٠٠٠)ی مانگانە، ئەرکی بەرگریکردنی لە مافی کوردی لە تورکیا، گرتە ئەستۆ و شان بە شانی ناوەندە دیموکراتیخوازەکانی تورکیا بەشداری لە هەڵمەتی ئاشکراکردنی سیاسەتی (حیزبی نیشتمانی دایك)ی دەسەڵاتدار لە تورکیا کرد، لە رێزی

پێشەوەی ئەو هەڵمەتەش نووسەری پێشکەوتووخوازی تورك (عەزیز نەسین) بوو کە لەو کتێبەی لە ساڵی ١٩٨٩ دەرچوو و بەناوی (تورکی بولگاریا و کوردی تورکیا)وەیە، تاکیدی کردووە، دەڵێت: "مادامێك (٣٪)ی هاولاتیانمان لە رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی تورکیا زمانی تورکی نازانن، چونکە بە کوردی داخێون، بەمەش مەحاڵە بتوانن بۆ خواست و مەرامەکانیان ئەم دەوڵەتە حاڵی بکەن کەوا خۆشی (واتە: دەوڵەت) توانای لێکحاڵیبوونی لەگەڵیاندا نییە و مادامێکیش دەوڵەت ئەو کۆمەڵە خەڵکە لە هاولاتیانی بە بەشێك لە گەلی تورك دانانێت، بەڵکو ئەوان بەشێکن لەگەلێکی تر و مادامێك دەسەلاتدارانی فەرمانڕەوا لەو ناوچەیە بۆیان هەیە خۆیان رایانبگوێزن، یان بە دەرکردنی فەرمانگەلی (بیگرە و بیکوژە) یان بەتوندکردنیان لەگرتووخانەکاندا و جۆرەها شێوازی ئازار و ئەشکەنجەدان بەکاربێنن- بەنموونە بەپێی راپۆرتی کۆمیتەی مافی مرۆڤ لە گرتووخانەی دیاربەکردا (٣٢) بەندکراو لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەستدا- ئەوا هەر قسەیەك لەوێدا هێز و مانای لەدەست دەدات و باسکردنیش لە بارەی کێشەکانەوە هەمووی دەبێتە جۆرێك لە بێهوودەیی، چونکە تۆ ئەگەر لە ناو ئەم کەش و بارودۆخەدا، شەو و رۆژ گۆرانیت بە بەژن و بالای یەکێتی ولات و بەشداریکردندا چڕی، ئەوە نەیەکێتی ولات و نە بەشداریکردن دێنەدی، چونکە ئەم رەوشە دەرەنجامی تەنها تۆڵەسەندن و کوشتن و بڕینی بێبەزەییانەی کورد و تورك لە نێو خۆیاندا بووە، ئەمە ئەوەیە کە روویدا و ئێستاش لە تورکیا، روودەدات"(٧١/٣٩).

لەدەستپێکی ساڵی ١٩٨٦ یەکێتی کرێکارانی تورك (تورك ئیش)- یەکێتی کرێکارانی موحافیزکار و لایەنگری حیزبی دەسەلاتدار بوو- بۆ یەکەمین جار دوای تێپەڕبوونی ١٦ ساڵ، خۆپیشاندانێکی لە شاری ئەزمیر سازدا، (١٠) هەزار کەس تیادا بەشداربوون و ئەم دروشمانەیان بەرزکردەوە: (نا بۆ دەستوور، بەڵێ بۆ تورکیای دیموکراتی، گرتووخانەکان خاڵی بکەن، داوای دەرکردنی لێبوردنی گشتی دەکەین، ئازادی بۆ رۆژنامەگەری، ئازادی بۆ دیسك Disk= یەکێتی کرێکارانی چەپی شۆڕشگێڕ کەدوای کوودەتای ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ قەدەغەکرا-). سەرکردەی سیاسی کوهەن گورگان کە نووسەرێکی ناسراوی بەرەگەز کورد و یەکێك بوو لە سەرکردەکانی پێشووی پارتی دیموکراتی میللی بوو، لە پێش خۆپێشاندەران وتارێکی خوێندەوە، جەماوەر هوتافیان بۆ کێشا و داوایان کرد ببێت بە سەرۆکی وەزیران، بۆیە تورگۆت ئوزال سەرۆك وەزیرانی ئەو دەمە (ئایدن کوهەنی)ی بەوە تۆمەتبارکرد کە هانی کۆمەلانی خەڵك دەدات ماوەی ئەو بۆشاییە دەسەلاتە بگەڕێتەوە کە لە پێش ساڵی ١٩٨٠ لە

تورکیا هەبوو، لە بەرامبەریشدا (کوهەن) حکوومەتی بەمە تۆمەتبارکرد کە زیاتر رەفتاری فاشیزمی گرتۆتەبەر (١٣/٤١).

میدیای ئەمریکاش بۆ رای گشتی ئەوروپا وێنای کرد کە مەحاڵە تورکیا بتوانێ دیموکراتی و مافی مرۆڤ لە وڵات پراکتیزە بکات بە هەمان ئەو ئاستەی لە ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکان هەیە. رۆژنامەنووسێکی تورکیاش لێدوانی لە سەر ئەمەدا و گوتی: "رۆژئاوا توانی وێنەی چەمکێکی دیاریکراو بۆ دیموکراتییەکی نوێ بکێشێ، ناوی دیموکراتی تورکییە" بە چاوپۆشی لەوەی کە بە هاگەلی دادوەری و ئازادی و دیموکراتی هەموو یەك جەستەن و دابەش نابن (٥/١٧). لێرەشەوە، تالیقوانی سیاسی ئیسماعیل جەم زنجیرە وتارێکی لە رۆژنامەی (گوینش- رۆژ) سەبارەت بە پرسی دیموکراتی بڵاوکردەوە، لە کۆتاییدا دەڵێت: ئەگەر لەوێڕا شتێك هیچ جێگرەوەیەکی نەبێت، ئەوە دیموکراتییە" (٢٨/٤٢).

کاتێك ئەردال ئینونۆ سەردانی هەرێمی (ماردین- مدیات)ی کرد لەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن، رووی دەمی کردە جەماوەر و گوتی: پێویستە کار بۆ بەرقەراربوونی سەقامگیری لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بکرێ، گەرەکە کارێکی وایش نەکەین دیموکراتی بکەینە قوربانی ئەوەی کە تیرۆر لەم ناوچەیە هەیە.. و وتیشی: من متمانەم بە گەل هەیە و هێزی لێ وەردەگرم بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوو و کە دەسەڵاتیشمان وەرگرت سیستەمی پارێزگاری گوندەکان، واتە دەزگای ئەو کوردانەی هاوکاری دەوڵەت دەکەن- هەڵدەوەشێنینەوە، چونکە ئەم سیستەمە نە لە سیستەمی دیموکراتی و نە لە سیستەمەکانی دەسەڵاتی سەردەمدا جێگای دەبێتەوە"(٣/٥٢).

بۆ ئەوەی بزانرێ تا چەند پێشێلکاری لە تورکیا بەرامبەر بەدیموکراتی دەکرێ، وا لە خوارەوە دەقی تەواوی ئەو بەیاننامەیەتان بۆ تۆمار دەکەین کە هزرڤانی گەورەی تورکیایی (عەزیز نەسین)[١٣] بڵاوی کردەوە و لەو کۆنگرە رۆژنامەوانییەدا خوێندییەوە لە ئەنکەرە سەر لە بەیانی رۆژی ٩ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٩ بەستی و ناونیشانی: (بانگهێشتێك بۆ بەدەنگەوەنەچوونی بانگهێشتەکەی ئیڤرین) بوو، گوتی: (٢١١/٣٩).

---

١٣- لەپاڵ عەزیز نەسین و هاورێکانی ئیسماعیل بێشکچی یەکێکە لەو رۆشنبیرە تورکانەی کە بە پەرۆشەوە داکۆکی لە مافی رەوای کورد کردووە و لەو پێناوەدا قوربانیەکی زۆری داوە.(وەرگێر و پێداچۆرەوە)

"سەرۆکی کۆمار کەنعان ئیڤرین بانگهێشتی ٦٧٠ وەرزشوان و زانا و هونەرمەندی کرد لەگەڵیان لەکۆشکی جانقایا- کۆشکی سەرۆکایەتی کۆمار- لە کاتژمێر حەوت و نیوی ئێوارەی رۆژی ٩ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩ کۆببێتەوە، من پێم وایە ئەوە دەرەنجامی هەڵسەنگاندنێکی هەڵەیە، چونکە بۆ منیش داوەتنامەیەك نێردرابوو بۆ ئەوەی لەو کۆبوونەوەیە ئامادەبم. ئەم بانگهێشتە هەلێکی مێژووییە بۆ هزرڤانانی تورك تاکو رای خۆیان لە بەرامبەر ئیڤرین دەربخەن، بۆیە هیوادارم بیرمەندانی دیموکراتیخوازی تورکیا ئەم هەلە مێژووییە بە باشترین شێوە بقۆزنەوە. بیروبۆچوونی ئەوانەی بەدیموکراتیخواز ناوبراون بەچەپ و راستیانەوە هەرچۆنێك بێت، ئەوا لێرەدا من پێم خۆشە جەخت لەوە بکەم کەبانگهێشتەکەم بۆ رەتکردنەوەی بانگهێشتەکەی کەنعان ئیڤرین، شەخسی نییە، بەڵکو بانگهێشتێکی کۆمەڵایەتی گشتییە، چونکە بە بەشدارنەبوونیان لەو کۆبوونەوەیەدا جەخت دەکەنەوە کە مرۆڤی تورك شایستەی دیموکراتییە و هزرڤانی تورکیش سەرکردەیەکە لناو کۆمەڵگاکەیدا، لێرەشەوە پێشنیارم بۆ وەرزشوانان و هونەرمەندان و بیرمەندانی تورك ئەوەیە بە پیر بانگهێشتەکەی ئیڤرینەوە نەچن، لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە:

١- وەك دەزانن و وەك دیوتانە و لە ناو رووداوەکانی ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ ژیاون، ئەم کوودەتا سەربازییە ناچاری کردین بکەوینە سەر یەك ئاراستە و ئەو تاکە ئاراستەیەی بۆ دارشتین، بەمەش ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری و سیاسی و ئەخلاقیمان وەها داڕووخان لە مێژووی کۆماری تورکیا وێنەی نەبوو، ئەم داڕووخانەی کە بە کوودەتا سەربازییەکەی ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ دەستیپێکرد و هێشتا بەردەوامە، وازیاتر پەرە دەسێنێ و گشتگیر دەبێت.

ئەوانەی ئەمڕۆ بانگهێشت کراون بۆ کۆبوونەوەی (جانقایا)، بە نەچوونیان بۆ کۆبوونەوەکە، تاکید لە وەستانیان دەکەن دژی هەر کوودەتایەکی سەربازی لە داهاتوودا، بگرە پەندێکی لەبیرنەکراو دەدەن بەهەموو ئەو کەسانەی خۆیان ئامادە دەکەن کوودەتایەکی سەربازی تر ئەنجام بدەن.

٢- ئەو دەستووورە نادیموکراتییەی کوودەتاکەی ١٢ی ئەیلوولی (١٩٨٠)ی دایڕشت و ئەو یاسایانەش لێوەی سەرچاوەیان گرتووە تاکە ئاستەنگە لە پێش گواستنەوەی تورکیا بەرەو دیموکراتی، جا چەند ئەم دەستوورەی کە ئیڤرین بە یەکەم ئەندازیاری دادەنرێ بوونی هەبێت، مەحاڵە وەرچەرخانی دیموکراتی لە تورکیا بێتەدی، چونکە خودی کەنعان ئیڤرین بەڵێنی دا ئەم

دەستووره بپارێزێ و دەستکاری نەکات یاخود بیگۆڕێ، بەمەش وەکو یەکەمین کەسی سیاسی کە بەڵێنی داوه دەستوور نەگۆڕێ، ناوی چووه مێژووەوه. بەڵام ئـەو ئیمـڕۆ دوای ئـەوەی (٧) ساڵ بە سەر بەیاساکردنی دەستووری ناوبراو تێپەڕیوه، ڕەزامەندی خۆی دەردەبڕێ بۆ گـۆڕینی هەندێ لە مادەکانی دوای ئەوەی بەڵێنی خۆی لەبیرکرد، بگرە ئەمڕۆیش ڕەخنە لەو دەستووره دەگرێ کە دوێنێ خۆی داینا.

بەدەنگەوه نەچوونی بانگهێشتکەران بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەکەی جانقایا، جەختکردنە لە سەر وەستانیان لە دژی ئەم دەستووره نادیموکراتییە و لەدژی خودی زامنکەرانی و ئەوانەش لە ئاییندەدا ئامادەگی خۆیان دەردەبڕن بۆ زامنکردنی دەستوورەکانی داهاتوو.

٣- کوودەتا سەربازییەکەی ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ کە ئیڤرین سەرکردایەتی کرد، هەموو دامەزراوه گەورەکانی لە تورکیا تێك و پێکدا: دامەزراوەی دەستوور، دامەزراوەی ڕێکخـراوه سیاسییەکان (حیزبەکان)، ڕێکخراوه دیموکراتییەکان (سـەندیکا و کۆمەڵـە و یەکێتییـەکان)، دامەزراوەی زانکۆ و ئەوانیتر..

کردەوەی (ئیڤرین) بە شێوەیەکی دوور لە یاسا و بە بڕیاری خودی خۆی بە داخستنی کۆڕی زمانەوانی تورکی و کۆڕی مێژوویی.. ئەو دوو دامــەزراوه گەورەیــەی ئـەتاتۆرك بــە مــوڵکی تایبەتی خۆی و بە شێوەی وەقفی تایبەت دایمەزراند- وایکرد بەر نەفرەتی مێژوو بکەوێت.

بانگهێشتکەران بەرەتکردنەوەی ئامادەبوونیــان لــە کۆبوونــەوەی جانقایــا، بــۆ نــەوەکانی دواڕۆژ جەخت دەکەنەوه: تاك تاکەکانی کۆمەڵگە هەرچەند پلــەی یــان پێگەکــەی بــەرزبێت، نابێت لەسەرووی یاساوه بێت و کـۆڕه دامەزراوەییــەکانیش بــە ئـارەزووی ئــەو تاکــە کەســە دابڕووخێن یاخود تێك و پێکبدرێن.

٤- کوودەتا سەربازییەکەی ١٢ی ئەیوولی ١٩٨٠ مڵکداری تاکە کەسی نەهێشــت، ئــەو مافەی کە تاكو کۆمەڵگە بەدرێژایی مێژوو خەباتیان کردووه لە پێناو بەدەستهێنانی. ئەمەش ئــەو دەمــە روویــدا کوودەتاچــییەکان دەســتیانگرت بەســەر مــاڵ و ملکــی گواســتراوه و نەگواستراوەی ئەو حیزبە سیاسییانەی قەدەغەکران، نە وەك بــەبڕیاری دادگـا یــان دامــەزراوه دەستوورییەکان یان مەرجەعە یاسابیەکان، بەڵکو بە ئارەزووی شەخسی خۆیان.

لای ئەم خاڵەش، ئێمە لە کاتێکدا بە دەنگ بانگهێشــتنەکەی (ئیڤــرین)ەوه ناچــین، ئــەوا جەخت دەکەینەوه سەر ڕێز و حورمەتمان بۆ مافی مڵکداری و ئــارەزووی خۆمــان بــۆ دووبــاره نەبوونەوەی ئەم جۆره گاڵتەجاڕییە لەوڵاتەکەمان لەپاشەڕۆژدا.

٥- لە کاتی گواستنەوەی وڵات بەرەو دیموکراتی، ئەگەر بکرێ ئەو کۆڕە دامەزراوەییانەی کوودەتاچییەکان لە ١٢ی ئەیوولی ١٩٨٠ تێکیاندا، دووبارە بنیاتبنرێنەوە، ئەوە دووبارە بنیادنانەوەی زانکۆ کاتێکی زۆری دەوێت. بەڕێوەبردنی زانکۆکانیش بەهزر و ئەقڵییەتی سەربازگەکان، یاخود دانانیان بەکارگەگەلێك بۆ بەرهەمهێنانی تەنها کاڵایەك و تاکە نموونەیەك و بەیەك مۆرك‌و نیشانە، ئەمە ڕێك ئەوەبوو دەزگای فێرکردنی باڵا YOK لەتورکیا بەئەنجامی گەیاند و دواجار بەگران لەسەر تورکیا دەکەوێت.

بە ڕەتکردنەوەی ڕۆیشتن بۆ جانقایا، دەتوانین بە دامەزرێنەران و کارگێڕانی دەزگای فێرکردنی باڵای تورکیا ڕابگەیەنین کە بەڕێوەبردنی زانکۆکان جیاوازی هەیە لەگەڵ بەڕێوەبردنی سەربازگە و کارگەکان.

٦- ئەو قۆناغەی ئیڤرین لە میانەیدا وەك سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی کۆمار حوکمڕانی کرد، خراپترین قۆناغی دەسەڵات بوو لە مێژووی تورکیا لە ڕووی زوڵم و زۆر و ئەشکەنجەدان و دژایەتیکردنی هزرڤان و ڕۆشنفکران و شکاندنی کەرامەت و مافیان، بە شێوەیەك زۆربەی ئەو بیرمەندانەی لە خەستەخانەکانی ئەورووپا لە ڕووی تەندروستی جەستەیی و ئەقڵیەوە چارەسەر دەکران خەڵکی تورکیا بوون، ئەمە جیهانی پێشکەوتووی ناچارکرد لە دژی کردەوە وەحشیگەرییەکانی حکومەتی تورکیا، وەك: ئەشکەنجەدان و لەسێدارەدان بوەستن و داوای لێبکەن ڕێز لە واژۆی خۆی لەسەر ئەو بەڵگەنامەو دیکیۆمێنتانەی ئەو مۆمارەسانە قەدەغە دەکەن، بگرێت. ئیڤرین بۆ وەڵامی ئەم داوایە لەرادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی تورکیاوە بەم شێوەیە دوا و گوتی: ئەورووپاییەکان کاتێك داوامان لێدەکەن حوکمی لەسێدارەدان جێ بەجێ نەکەین، ئەوە بەم کارەیان دەست لە کاروبارمان وەردەدەن، لە حاڵێکدا ئێمە دەستمان لە کاروباریان وەرنەداوە، چونکە لەوانمان نەپرسیوە، ئەی ئێوە بۆ مرۆڤ لەسێدارە نادەن؟" یەکێك لە گوتە مێژووییەکانی (ئیڤرین)یش، ئەمەیە کەدەڵێت: گەر نایانەوێ لەسێدارەیان بدەین.. باشە، داوای چیمان لێدەکەن؟ نان و ئاویان بدەینێ و قەڵەویان بکەین؟"

ئەگەر ئەوە ڕاست بێت مێشکی مرۆڤ ئالوودەی نەخۆشی لەبیرچوونەوەیە، وەلێ لەبیرچوونەوەش پێویستی بە تێپەڕبوونی هەندێ کات هەیە.. بەڵام ئێمە هێشتا لە ناو ئەو ڕووداوانەدا دەژین، کەچی ئەو (ئیڤرین)ەی لاری نەبوو چەند مادەیەك لەدەستووری خۆی داینا و پاراستی، بیگۆڕێت، سەبارەت بە حوکمی لەسێدارەدانیش ئیلتیزامی بەقسەی خۆیەوە نەکرد، بەڵام ئەمەیان نەك لە تورکیا، بەڵکو لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کاتێك تاکیدی لەوە کردەوە

و گوتی ئەو لە دژی سیستمی لەسێدارەدانی مرۆڤە لەبەر هەر هۆیەك بێت، هەر لە ئەڵمانیاشەوە جەختی کردەوە و گوتی: دەکرێ حیزبێکی شیوعی لە تورکیا دابمەزرێ.

ئێمە لە کاتێکدا بەشداری لە بانگەوازی جانقایا نەکەین، تاکید دەکەینەوە سەر رەتکردنەوەمان بەرامبەر مەینەتییەکانی ئەو رۆژگارانەی تێدا ژیاین و ئێستاش تێدا دەژین و لەپاشەرۆژیشدا رەتیاندەکەینەوە.

٧- لە کاتێکدا مرۆڤی تورك لە سۆنگەی بێکاری و گوزەرانی سەخت لە بیابانەکانی سعوودیاوە تا وڵاتە ساردەکانی باکوور دەرگای کار دەکوتن لە پێناوی پارووە نانێك و لە کاتێکدا هاوڵاتیانمان دوور لە زێدی خۆیان بۆ خزمەتکردنی بێگانە کاردەکەن و دەوڵەتیش پڕوپاگەندە بۆ کەمکردنەوەی منداڵبوون دەکات بۆ رووبەڕووبوونەوە لە رێژەی زیادبوونی دانیشتوان، دەبینین ئیڤرین لە میانەی سەردانەکەیدا بۆ پاکستان رەزامەندی خۆی دەردەبڕێ بۆ کۆچکردنی ئەو ئەفغانیيانەی پێی وایە بەرەگەز تورکن بۆ تورکیا ئەگەرچی زمانی تورکی نازانن و فریان بەسەر کاروباری تورکیاوە نییە، ئەمەش لەبەر خاتری (زیائولحەق) بە بەخشینی خانووی نیشتەجێ کردن و بڕینەوەی مووچەی مانگانە بۆیان لەبەر ئەو کۆت و بەندانەی سەپێنراون بە سەر رۆژنامەگەریدا کەسێك نەیتوانی رەخنە لەو مەسەلەیە بگرێ و ئەوەیان تەنها وەك رێکارێکی دیموکراتییانە شرۆڤە کرد.

٨- ئەو یاسا تایبەتەی کە کوودەتا گێڕان بە پشتبەستن بە مادە (١٥)ی دەستوور دەریانکرد و وایکرد هەموو ئەو کار و کردەوە و حاڵەتە مڵکدارییانەی کە ئیدارییەکان لە رۆژی کوودەتاکەوە لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ تا کاتی بەرێوەچوونی یەکەم هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی لە تورکیا ئەنجامیاندا، ببنە کارگەلێك یاسا یان دەستوور لێپرسینەوەیان لەسەر نەکات بەنموونەیەکی زەقی یاسای نادیموکراتی دادەنرێ لەجیهاندا.

دەرکردنی یاسایەکی تایبەت لە لایەن پیاوی ئیدارییەوە جەخت لە نەبوونی بەرپرسیارێتی دەکات دەرهەق کارەکانی و روونی دەکاتەوە تاچەند ئەو کەسە ئیدارییە هەست بە بەتاڵبوون دەکات. بەدەستەواژەیەکی تر: تاچەند ئەو کەسە ئیدارییە قەناعەتی بە راستی و هەقانەتی ئەو کارانەی نییە کە بە ئەنجامی گەیاندوون.. ئەو کارانەی (١٠) ساڵ پێشتر یاسایی بوون و کەسانێك بە ئەنجامیان گەیاندووە تەمەنیان لەنێوان ١٦ و ١٧ ساڵان بووە، ئیمڕۆ بە تاوانگەلێك دەژمێردرێن یاسا سزایان لە بارەوە دەردەکات. لەم روانگەیەشەوە ئەو یاسایانەی

ئیدارییەکان بۆ لابردنی بەرپرسیارێتی لە سەر کردەوە نایاساییەکانیان دەریانکرد، پێچـەوانەی دادوەری و هەق و لۆژیکن.

ئەو هۆیانـەی باسمـان کـردن لـە مـەڕ ڕەتکردنـەوەی بانگهێشـتەکەی کـەنعان ئیڤـرین و بەشدارینەکردن لە کۆبوونەوەی جانقایا، دەکرێ دەیان هۆی تریـان بخەینـەپاڵ. بـەڵام وا دیـارە ئیڤرین بە ڕازیبوونی لە سەر گۆڕینی دەستوور و جێ بەجێنەکردنی حوکمی لەسێدارەدان و بـە ئەگەری دامەزراندنی پارتێکی شیوعی لە تورکیا و بە قەدەغـەکردنی سـەرپۆش بـۆ کچـانی زانکۆ و بە بانگهێشتکردنی زانا و هونەرمەند و وەرزشوانان و پێشـوازیکردنیان لـە کۆشـکی کۆماری، گەرەکی بوو خۆی لە جەماوەر نزیك بخاتەوە و ئیشارە بدات کە لەوێ دا گۆڕانکـاری گەورە لە تورکیا ڕوودەدەن. وەلێ ناکرێ ئەم گۆڕانکارییە درۆزنانەیە بە بەشێك لە پەرەسەندنی مێژوویی لە تورکیا دابنێین، چونکە ئامانجی هەوڵی خۆنزیکخستنەوەی ئیڤرین لە کۆمەڵگە بۆ ئەنجام دانی گۆڕانکاری نییە لەم وڵاتە، بەڵکو بە نیازی ئارەزووی دووبارە هەڵبژاردنییەتی بـۆ پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار و دەرخستنی خۆی وەك مرۆیەکی بێتاوان لە پێش دادگای مێژوو و بەدیمەنی دیموکراتیخوازیش لە پێش خەڵکی بیانی.

لە پێناو هەموو ئەمانەدا، داوا لە گشت بانگهێشتکەرانی جانقایا دەکەم، ئەو بانگهێشتە ڕەتبکەنەوە، چونکە ئەم هەڵوێستەمان تەنها بـۆ ئیمڕۆمـان نییـە، بـەڵکو بـۆ دواڕۆژیشـە و بەهیوام ئەم هەلە بقۆزینەوە.. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم".

لە کاتێکدا ئەم بانگەوازەی هزرڤانی گەورەی تورکیا عەزیز نەسین بـۆ بـایکۆتکردنی ئـەو کۆبوونەوەیەی سەرۆکی کۆمار بانگەشەی بۆ کرد، گوزارشتی لە زەنگی مەترسـیدار کـرد کـە هەموانی وەئاگا هێنا بـۆ کـردەوە نادیموکراتییـەکانی تاقمـە سـەربازییەکەی تورکیـا، ئـەوا هەڵسەنگاندنەکانی نووسەری ناوبراو بەرامبەر بە بارودۆخی تورکیا، هاوئاهەنگ بوون لەگـەڵ هەڵسەنگاندنەکانی نووسەری بەرەگەز کورد (دوغۆ بیرنجیك) سـەبارەت بـە هـەمان بـارودۆخ، ئەوەبوو، بیرنجیك سەروتارێکی بە ناونیشانی ناکرێ ئوزال ببێ بە دیکتاتۆر) بڵاوکردەوە، تیادا گوتی: "ئەوانەی چاوەڕوانی یارمەتی لە سوپا دەکەن، خەیاڵیان خاوە، چونکە سوپای تورك لە گەمەی گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ سیسـتمی تورکیـا وەڕس و بێـزار بـوو، پـاش ئـەوەی ئـەم هاوسەنگییە بۆ چەندین جار سەنگەلا بوو. لە بەرامبەر ئەمـە نابێـت بـۆ گۆڕانکـاری پشـت بەهێزی سەربازی ببەسترێت.

بەش بەحاڵی ئۆپۆزسیۆنی سەرەکیش کە بریتییە لە حیزبی دیموکراتی سوشیالیستی میللی SHP، ئەوا (دوانە)ی (ئوزال)ی سەرۆکی کۆمار و (بایکال)ی ئەمینداری گشتی حیزبی دیموکراتی میللی، هەرچەندە لە بیروبۆچوونیاندا جیاوازییان هەیە، بەڵام بڕوایان بە وەدیهێنانی سەقامگیری- بە ڕێگەی بازدان بە سەر تەنگژەکان و شروڤەنەکردنی ڕووداوەکان بە شێوەیەکی زانستییانە- هەیە.

بە نموونە، کاتێك حیزبی دیموکراتی سوشیالیستی میللی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٩ و دوا بەدوای ئەو تەنگژە سیاسییەی ڕووبەڕووی حیزبی نیشتمانی دایك بۆوە، پشتگیری لە گۆڕینی سیستمی هەڵبژاردنەکە کرد، نیازی ئەوەبوو (ئوزال) بە سەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرێ وەك پاشقولێك بۆ کێبڕکارەکەی (بولەند ئەجەوید)ی خەنیمی شەخسی ئەردال ئینونۆی سەرۆکی حیزبی SHP بەمەش ئەو حیزبە لەوساوە چارەنووسی خۆی گرێدا بە چارەنووسی (ئوزال)ەوە.

ئەگەرچی، (دیمیرال)ی سەرۆکی حیزبی ڕێگای ڕاست نەکەوتە ئەو هەڵە تاکتیکییانەوە کەوا (ئەردال ئینونۆ) تێیان کەوت- هەرچەندە تاکتیك شێوازێکە بۆ سەرکەوتنی ئەو حیزبانەی ستراتیژێکی ڕوونیان هەیە - حیزبی دیمیرالیش ئەمەی بە لاوە نییە و ئاتاجی بە هێزێکی سیاسی هەیە پێوەی بتوانێ ئامانجەکانی جێ بەجێ بکات- دەی کەوا بوو، دیمیراڵ چی پێ دەکرێ بە نموونە بتوانێ کێشەی ئاڵۆزی کرێکاران لە تورکیا چارەسەر بکات؟ یان ئایا دیمیراڵ سوپایەکی تایبەت شك دەبات بە هۆیەوە بتوانێ کێشەی کورد چارەسەر بکات؟

هێزە سیاسییە لاوازەکان و کەمینە حیزبییەکان ناتوانن کێشە گەورەکان بجووڵێنن، لێرەشەوە پێیان ناکرێت کێشە کۆمەڵایەتییە گەورەکان چارەسەر بکەن.

هەرچی، چەپی سوشیالیستی ڕادیکاڵی تورکیشە، ئەوە چاوەڕێی بەخشندەی سەرۆك (ئوزال) دەکات بە لابردنی هەردوو مادەی (١٤١ و ١٤٢) لە یاسای سزاکانی تورکیا وەك بەخششێك، بەمەش لە دەسەڵات ڕازی بوو و لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٩)وە بە ڕاشکاوی گوتی: لەوێدا تەنگژەیەکی سیاسی لە تورکیا بوونی نییە، ئەوە بزوتنەوەی کرێکاری بەرەو کزی دەڕوات و لەولایشەوە بزوتنەوەی کورد لەدەرەنجامی کۆتایی هاتنی شەڕی عێراق- ئێران، تەخت دەکرێ بەبێ ئەوەی جارێکی تر هەڵسێتەوە سەرپێ.

تورکیا ئەمڕۆ بە قۆناغێکی زۆر سەختدا تێدەپەڕێ، چونکە ئەوی دەسەڵات بە نایاسایی دایدەنا، بۆتە یاسایی و بەپێچەوانەشەوە، بەڵکو کۆمەڵگەی تورکی زیاتر ڕێز لە

نایاساییبوونی واقیع دەگرێ تاوەك ئەوەی رێز لەیاساییبوونی دەسەڵات بگرێ، پاش فرە بوونی سەرچاوەکانی ئەو دەسەڵاتەی دەیەوێت پرنسیپگەلێکی نوێ بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی لە تورکیا دابنێت. ئەمەش ئاماژە بەوە دەدات کە تورکیا بەرەو گۆڕانکاری گەورە دەڕوات، ئەو گۆڕانکارییانەی هێزە بزوێنەرەکانیان پەرەیان پێ دەدەن... ئەم رژێمە لاوازەی ئێستاش، لاوازترین کەسی هێنایە سەر لوتکەی دەسەڵات. لێرەشەوە، ئەو هات و هاوارانەی دەڵێن (ئوزال دەبێتە دیکتاتۆر) مایەی پێکەنینن، چونکە دیکتاتۆر یان دەسەڵاتدار، بە رێگای هەڵبژاردن، یاخود بە شێوازی یاسایی رەوا، نابێت بە دیکتاتۆر و فەرمانڕەوا، بەڵکو بەرێگای هێزەوە دەبێت. جا، چونکە ئوزال هێزی نییە، بۆیە بەرەو کۆشکی کۆماری سەرکەوت لە پێناو ئەوەدا بکەوێت، بەڵام ئوزال ئا لەوێوە بە رێگای دیمیرال یان ئینونۆوە ناکەوێت، بەڵکو هێزە دینامیکییە دیموکراتییەکان- هێزە بزوتنەوە دیموکراتیخوازە میللییە پەرەسەندووەکان لەوێوە دەیهێننە خوارەوە". (٧/٤٣).

(عەبدوڵڵا ئوجەلان)ی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانیش لە میانەی دیدارەکەی لەگەڵ گۆڤاری (بەرەو ساڵی ٢٠٠٠) سەبارەت بە قەیرانی دیموکراتی لە تورکیا، دەڵێت: "دیموکراتی تورکی لەسەر بناغەیەکی پتەو دانەمەزراوە بەڵکو هێزی خۆی لە ژەنراڵەکانی سوپای تورکیاوە، وەردەگرێ، بە شێوەیەك مەسەلەی رێزگرتن لە پاشاکان (ژەنراڵەکانی سوپا) بۆتە نەریتێك لە نەریتەکانی خێزان و کۆمەڵگەی تورکی، بگرە بۆتە دابێکی نەتەوەی تورك کە لەو پیاوە سەربازییانەدا نموونەی مرۆڤی کامڵ دەبینن، بە نموونە: خێزان بۆ ئەوە مناڵ پەروەردە دەکات لە پاشەرۆژدا ببێ بە ژەنراڵێك وەك پەندە تورکییەکە دەڵێت. کۆمەڵگەش زیاتر رێز لە ژەنراڵی سەربازی دەگرێ نەك لە سەرکردەی حیزبە سیاسییەکان، بۆیە کاتێك ژەنراڵ داوا لە رابەرانی حیزبە سیاسییەکان بکات واز لە سیاسەت بێنن، وازی لێ دێنن.

ئەم دووفاقییە کۆمەڵایەتییە- سیاسییە، رەنگی داوەتەوە لە سەر بارودۆخی تورکیا، دەبینی لە کۆی (٦) سەرۆکی کۆمار لەوەتی کۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ دامەزرا تا کوودەتای ١٢ی ئەیوولی ١٩٨٠ (٥) ژەنراڵ هاتوونەتە سەر کورسی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی کۆمار، بە شێوەیەك بڕیارەکە وایە سوپاسالار هەمیشە دوای تەنگژەکان ئەرکی سەرۆکی کۆماری گرتۆتە ئەستۆ.

ژەنراڵەکانی سوپا- بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخ- و دوای تێکچوونی هاوکێشەی سیاسی، لە میانەی ساڵەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧١ و ١٩٨٠ سەرکردایەتی سێ کوودەتای سەربازیشیان کرد،

ئێستاش ئەو پاشا تورکانە گوزارشت لە شمشێری دیموقلیس دەکەن بە سەر سەری دیموکراتییە گەنجەکەی تورکیاوە. چونکە حیزبە سیاسییەکان هێشتا نەیانتوانیوە بە ڕێبەرایەتیکردنی بزوتنەوە میللییەکان یان ڕێکخراوە سیاسییە تێکۆشەرەکان پرنسیپێکی دیموکراتییانەی روون بچەسپێنن، لێرەشەوە هەرسێ حیزبە سیاسییە گەورەکانی ناو پەرلەمانی تورکیا: حیزبی نیشتمانی دایك ANAP و حیزبی دیموکراتی سوشیالیستی میللی SHP و حیزبی ڕێگای راست DVP حیزبگەلێکی نادیموکراتین، چونکە دیموکراتی ئەو کاتە دەستەبەر دەبێت بڕوامان بە سەروەری گەل و میللەت هەبێت لە ڕێگەی نوێنەرە راستەقینەکانی و خەباتی گەل لە پێناو پاراستنی پرنسیپەکانی دیموکراتی. جا، ئایا (ئوزال)ی سەرکردەی (حیزبی نیشتمانی دایك)ی دەسەڵاتدار یان (دیمیراڵ)ی سەرۆکی حیزبی ڕێگای راست یان (ئەردال ئینونۆ)ی رابەری حیزبی دیموکراتی سوشیالیستی میللی لەپێش هێز و زۆرداری ژەنراڵەکاندا، خۆڕاگربوون؟ نەخێر.. چونکە دیمیرال شەپقەکەی هەڵگرت و لە پاش دوو کوودەتای سەربازی لە دژی لە نێوان ساڵانی ١٩٧١ و ١٩٨٠ گۆشەگیر بوو، (ئوزال)یش لە پێش ژەنراڵەکانی کوودەتای ساڵی ١٩٨٠ داچەمی بۆ ئەوەی دواتر ببێتە سەرۆکی وەزیران و پاشانیش سەرۆکی کۆمار، هەرچی (ئەردال ئینونۆ)یشە، هێشتا پێی وایە ژەنراڵەکانی کوودەتای ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ خۆیان بوون دیموکراتییان بۆ گەلی تورکیا هێنا و تا وەکو ئێستاش پارێزگاری لێ دەکەن.

لێرەشەوە، ئەم حیزبە سیاسییانە، چ دەسەڵاتدار و چ ئۆپۆزسیۆن، دژایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان PKK دەکەن. چونکە بە بزوتنەوەیەکی دیموکراتی جەماوەری و بقەی دەزانن بۆ سەر قەوارە و دوارۆژی خۆیان، هەرچەند لە مێژەوە خەبات دەکات لە پێناوی دیموکراتی لە تورکیادا. بۆیە ئێمە لەو بڕوایەداین لەوێدا پیاوی سیاسی واقیعبین لە تورکیا نییە، وەك ئەوە چۆن ژەنراڵەکانی سوپای تورك- وەکو هەموو ئەو پیاوە سەربازییانەی لە جیهانی سێیەم دەستیان لە سیاسەت وەرداوە- خاوەن مێشکی وشك و هزری خێڵەکی و چەشنگەلێکی رووکەشین سەبارەت بە زۆرێك لە کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکانی تورکیا.

فامنەکردنی رۆحی سەردەم لە لایەن سیاسەتوان و ژەنراڵەکان و ناواقیعیبوونیان بەرامبەر بارودۆخەکانی تورکیا، دوو فاکتەری قەیرانی دیموکراتی پێکدێنن لە تورکیای هاوچەرخ کەوا لە شەستەکانەوە (واتە: شەستەکانی سەدەی رابوردوو) بە دوای سەرکردەیەکدا دەگەڕێت لێهاتوو و واقیعبین و شارەزای رەوتی رووداوەکان و گیانی سەردەم بێت.. و بتوانێ بڕیاری

گونجاو بدات بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییانـەی رووبـەڕووی کۆمەڵگەی تورکی بوونەتەوە"(٤٣/٢٠).

بەڵام وێڕای هێزی دامەزراوەی سەربازی تورك و رۆڵی لـە ژیـانی گشـتی تورکیـادا، کەچـی هێشتا توانای ئەوەی نییە رێگەچارە بۆ کێشە سەختەکانی تورکیا بدۆزێتەوە. ئەگەرچـی تورکیـا بۆ چەند ساڵێکی بەردەوام لە (١٩٤٥-١٩٥٦) و لە دەرەنجامی فرە حیزبـی و بەدەنگەوەچـوونی زۆربەی داخوازییە دیموکراتییەکانی جەماوەر، ژیانێکی دیموکراتی راستەقینە و دروستی بـەخۆوە بینی، وەلێ دامەزراوەی سەربازی دوای ئەم مێژووە، لە ساڵی ١٩٦٠ بەدوا نزیکەی (١٠) سـاڵ جارێك هەر وەختێك هاوکێشەی سیاسی سەنگەلا بووایە دەستی لە ژیانی گشتی تورکیا وەردەدا بە شێوەیەك چاودێرانی سیاسی وایان وێنا دەکرد بێجگە لـەم چـارە سـەربازییە، چـارەیەکی تـر نییە.

بەڵام نماکردنی هێزە فشارە دیموکراتخوازەکان لە تورکیـا و گۆڕانکارییـە نێودەوڵەتییـەکانی سەر گۆڕەپانی جیهان و ئارەزووی دەسـەڵات لـە تورکیـا تـا خـۆی وەك دەوڵـەتێکی بەدیمـەن ئەوروپایی هاوچەرخ پێشان بدات، وا دەکەن ئەم چارە سەربازییە لەوە بە دوا ئەگەری روودانـی دووربێت.

**دووەم: فشارەکانی ئەنجومەنی ئەوروپی:**

دوای کوودەتاکەی ١٢ی ئەیوولی ساڵی ١٩٨٠، مشت و مڕێکی گەرم لە نێو میـدیاکانی رۆژئاوا و کۆمەڵە و رێکخراوەکانی تایبەت بە مـافی مرۆڤـی ئـەوروپی و جیهـان لـە بـارەی ئایندەی دیموکراتی لە تورکیا بەڕێوەچوو، پاش ئەوەی کوودەتاچییەکان لـە تورکیـا ئـازادیی دامەزراندنی حیزبە سیاسییەکانیان قەدەغەکرد و مافی سەندیکاکانیان بـۆ مومارەسـەکردنی کـاری سیاسـی هەڵوەشـاندەوە و تـاقمی سـەربازی دەسـەڵاتدار جۆرەهـا شـێوازی ئـازار و ئەشکەنجەدانی لە دژی و بەندکراوەکانی بەکاربرد.

هەرچەندە ژەنراڵەکانی کوودەتاکە و حکوومەتی تورگۆت ئوزال لەو دەمە، وایان بـە بـاش دەزانی پلە بەپلە دیموکراتی بگێڕدرێتـەوە بـۆ وڵات بـە شـێوەیەکی وا لـە سـنووری کـۆنترۆڵ دەرنەچێت پاش ئەوەی قۆناغێکی گواستنەوە بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ دیـاری کـراو پاشـانیش هەڵبژاردن کرا و رێگا بەسێ حیزبـی سـەرەکی درا تیـادا بەشـداری بکـەن و لـەئاکامی ئـەم هەڵبژاردنە حیزبی نیشتمانی دایك بە سەرۆکایەتی ئوزال هاتە سەر کورسی دەسەڵات.. بـەڵام

پەرلەمانی ئەوروپی لە ستراسبورگ لە ١٨ی نیسانی ١٩٨٥ بڕیارێکی تایبەت بەمافی مرۆڤ و تیۆری خوێناوی لە تورکیا، دەرکرد.. لێرەدا پەرلەمانتارانی ئەوروپا رژێمی تورکیایـان وا لـە قەڵەمدا کە بە شێوەیەکی بـەردەوام هەڵمـەتی لـەناوبردن لـە دژی کەمایەتییـەکانی تورکیـا مومارەسە دەکات. بە نموونە لەو دواییەدا حـوکمی لەسـێدارەدان بەرامبـەر بـە (٣٠) کـەس لەشۆڕشگێڕانی کورد لە دیاربەکر دەرچووە، (١٣) کوردی دیکـەش بـە هـەمان شـێوە حـوکم دراون، دوانیان کەم ئەندامن.

بڕیارەکەی پەرلەمانی ئەوروپی ئاماژەی بەوەشدا کە هەردوو شـانۆکاری جیهـانی ئـارپهر میللەر و هارۆڵد بینتەر نارەزایی خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر بـە رژێمـی دەسـەڵاتداری تورکیـا چونکە ئازادی هزر و بیروڕا بە ئازار و ئەشکەنجەدان سەرکوت دەکات و داوایانکرد سـنوورێك بۆ ئەو حوکمە خنکاندنانە دابنرێ کە دادگا سەربازییەکانی تورکیـا دەریـانکردووە و بوونەتـە "مایەی بێزاریو هورووژاندنی تووڕەیی عادیلانەی رای گشتی نێو دەوڵەتی" و ئەو فـەرمانی لە سێدارەدانانەی دەرچوونە، هەڵبوەشێنرێنەوە. داواشیان کرد دەسەڵاتدارانی تورکیا سنوورێك دابنێن بۆ ئەو بارودۆخە نامرۆییانـەی رووبـەرووی گـیراوە سیاسـییەکان دەبنـەوە بەهـەڵس و کەوتی نالەبار و دەست بەسەرکردن و ئەو لێکۆڵینەوەیانەی لەگەڵیاندا دەیانکەن.

لە لایەنی خۆیشییەوە (فرەنسـیس فـۆرتز)ی پەرلـەمانتاری فەرەنسـی داوای لـە (جۆلیـۆ ئەندریۆتی)ی سەرۆکی ئەنجومـەنی ئـەوروپی کـرد هۆکـاری جـاردانی رەزامەنـدی کۆمەڵـەی ئەوروپی دەربـارەی مـافی مـرۆڤ ئاشـکرا بکـات و لەبەرچـی تورکیـا لـەم رووەوە هـەڵاوێرد (ئیستیپنا) کراوە ئایا ئەنجومەن بەنیازە چ بڕیارێك سەبارەت بـە تێکچـوونی رەوشـی مـافی مرۆڤ لەتورکیا، بدات؟!

ئەندریۆتی لەوەڵامی ئەمەدا، روونی کردەوە کە لەبارەی ئەم بابەتەوە پێوەندی بە تورکیاوە کراوە و بەگوێرەی ئـەو هەوڵانـەی دراون پێمـان وایـە هـەلی ئـەوە هەیـە وردە وردە بارەکـە بگەڕێتەوە دۆخی سروشتی خۆی.

بەڵام ئەنجومەنی نیشتمانی ئەوروپی لە سـەر فشـارەکانی بۆسـەر تورکیـا بـەردەوام بـوو لەپێناو گەڕانەوەی خێرای بەرەو دیموکراتی و پابەندبوونی بەمافی مرۆڤ. دەبینی ئـەو دەمـەی راپۆرتی ساڵانەی ئەنجومەنی ئەوروپی لە کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٨٩ دەرچـوو، رەوشـی تورکیای لـە دوو لاوە تـاوتوێکرد: پێگـەی تورکیـا لـە نـاو کۆمەڵـەی ئـەوروپی و کێشـەی کەمایەتییەکان لە تورکیا، سەرەڕای لێکۆڵینەوەی لایەنەکانی ئابووری و سیاسـی و کلتـووری

لەتورکیا وەك ڕێ خۆشکردنێك بۆ وەرگرتنی لە کۆمەڵەی ئـەورووپی لەسـاڵی ١٩٩٣، لێـرەدا ڕاپۆرتەکە ئاماژەی بە کێشەی کورد لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا لە میانـەی باسـکردنی مەسەلەی تیرۆر لەو ناوچەیە و ئەو کردەوە نادیموکراتییانەی ڕژێمی دەسەڵاتداری تورکیا لـەوێ پیادەی دەکەن (١٩/٤٥)، بە شێوەیەك ئەم ڕاپۆرتە کاردانەوەی توندی لە ناوەندە ڕۆژنامەوانی و سیاسییەکانی تورکیادا نایەوە، لە کاتێکدا (تورگـۆت ئـوزال)ی سـەرۆك کۆمـار ستایشـی ڕاپۆرتەکەی بەم شێوەیە کرد و گوتی: " لەوە چاکتر بـوو کـە خۆمـان پێشـبینیمان دەکـرد"، کەچی سلێمان دیمیرال سـەرۆکی حیزبـی (ڕێگـای ڕاسـت)ی بەرهەڵسـتکار ڕەخنـەی لێگـرت بەجۆرێك لەدەستێوەردانی دانا بۆ کاروباری ناوخۆی تورکیا، چـونکە باسـی لەکێشـەی کـورد کردووە لەتورکیا و بانگەشەی کردووە بۆ چارەسەرکردنی بەگیانێکی دیموکراتییانە. لە لایـەکی ترەوە (نەجمەدین ئەربەکان)ی ڕابەری ئیسلامی و سەرۆکی حیزبی (گەشەپێدان) گوتی: چوونی تورکیا بۆناو ئەنجومەنی ئەورووپی بەدگۆڕانێکە بۆ پێناسە ئیسـلامییەکەی و هەوڵێکیشـە بـۆ کردنی بـەئامرازێك لەبەرژەوەنـدی ئیمپریالیزمـدا. هەرچـی (ئـەردال ئینونـۆ)ی سـەرکردەی ئۆپۆزسیۆنیش بوو، لەبارەی مەسـەلەکەوە، گـوتی: نابێـت چـوونی تورکیـا بۆنـاو کۆمەڵـەی ئەورووپی لەسەر حسێبی بەرژەوەندییەکانی و ئەو مافە ڕەوایانەی بێت کە پێویستە پارێزگاریان لێ بکرێ. ئەو فشارە سیاسییانەش کـە خراونەتـە سـەری لـە پێنـاو ئـەم بەئەندامبوونـەی، ڕەتیاندەکەینەوە (١٩/٥٤). بەڵام (ئۆکتای ئاکشی)ی لێدوانڤانی سیاسی و سەرۆکی کۆمەڵەی نووسەران لە تورکیـا لـە گۆشـە ڕۆژانەکـەی (وتـاری ئـەمڕۆ) لـە ڕۆژنامـەی (حوڕییـەت)ی بەناوبانگ وتارێکی بڵاوکردەوە، تیادا گوتی: "ئەگەر لەوێڕا زەرووڕەتێك هەبێ بۆ باسـکردنی کێشەی کەمایەتییەکان لە تورکیا، پێویستە بەر لە هەموو شتێك تەماشای کێشەیەکی گرنگ بکرێ، ئەویش: ئەوە کێیە سیفەتی هاوڵاتیبوونی تورکیایی لە تورکیا ڕەت دەکاتەوە؟!.

دەوڵەتی تورکیا، هەموو ئەوانەی لە تورکیا نیشتەجێن بە هاونیشتمانی تورکی دادەنێـت. هەندێ کەسیش- واتە هەندێك لەنوێنەران- کە خۆیان بە ڕەگەزێکی تر حسێب دەکـەن، ئـەوە مەسەلەیەکی ئاساییە. هەر ئەم هەندە کەسەش کە ناوی خۆیان بە کورد یان لاز یان چەرکەس دەبەن و داوای پاراستنی زمان و کلتوورەکەیان دەکەن، ئەوە مـافێکی سروشـتییە و دەوڵـەتی هاوچەرخ زامنی دەکات. بەڵام کورد کاتێك ئەم جیاوازییە ڕەگەزی یـان زمانییـە بـە هۆیـەك بزانێ بۆ جیابوونەوە یان دووبەرەکی ڕەگەزی، ئەمـەیان کـارێکی نامـاقووڵ و قەبووڵنـەکراوە (١/٤٥)."

ناوبراو نارەزاییشی دەربڕی بەرامبەر بە راپۆرتەکە و بەجۆرێك لە چاودێریکردنی سیاسی بۆ سەر تورکیا لە قەڵەمی دا و لە درێژەی وتارەکەیدا گوتیشی: "لە کاتێکدا ئەو راپۆرتە باسی بابەتی کەمایەتی کوردی لە تورکیا کردووە، ئەی بۆ کۆمەڵەی ئەوروپی باس لە بارەی کەمایەتی باسك لە ئیسپانیا یان کەمایەتی تورك لە تەراقیای رۆژئاوای یۆنان ناکات و کۆمەڵەش هەردوو دەوڵەتی ناوبراوی بەئەندام وەرگرتووە"؟! (١٩/٥٤).

بۆ ئەوەی فشاری ئەنجومەنی ئەوروپی لە سەر خۆی کەم بکاتەوە، تورکیا رێککەوتننامەی پاراستنی مافی مرۆڤی واژۆکرد کە لە ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ لە لایەن ئەنجومەنی ئەوروپییەوە دەرچوو. تورکیا بەڵێنیدا دەقەکانی ئەم رێککەوتننامەیە لە سەر هەموو کێشە پەیوەندیدارەکان جێ بەجێ بکات و بەرپرسیارێتی هەر دەرەنجامێکی لەم بارەیەوە بگرێتە ئەستۆ (١٤/٤٦). لێرەشەوە ئەنجومەنی ئەوروپی بەوپەڕی نیگەرانییەوە پێشوازی لەو بڕیارە ئابوورییانە کرد کە هێزی یاسایان هەیە و حکوومەتی تورکیا لە بارەی ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا)وە دەریکردوون.

نوێنەرەکانی یەکێتی ئەوروپا لە (٤٢)هەمین کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکەیان کە لە ٧ی نیسانی ساڵی ١٩٩٠ گرێ درا، جەختیان کردەوە کەبڕیارە ئیدارییەکانی تورکیا- سەبارەت بە ناوچە کوردنشینەکان= وەرگێڕ- پێچەوانەی ماددە (١٠)ی رێککەوتننامەی مافی مرۆڤی ئەوروپییە کە دەوڵەتی تورکیاش واژۆی لە سەرکردووە، جەختیشی کردەوە: ئەو بڕیارانەی کە حکوومەتی تورکیا بەگوێرەیان دەتوانێ چاپەمەنییەکان دابخات و رۆژنامەکان هەڵبوەشێنێتەوە و هاونیشتمانییەکان رابگوێزێ، بە زەبرێکی توند دادەنرێ بەرامبەر بەو دیموکراتییەی لە تورکیا نما دەکات. چونکە ئەم بڕیارانە بوار نادەن لایەنە پێوەندیدارەکان رەخنە و بەرهەڵستکارییان لێبکەن. لەبەر ئەمە ئەنجومەنی ئەوروپی گوێ لە سکاڵای ئەوانە دەگرێ کە لە ئاکامی ئەو بڕیارانە تووشی ستەمکاری و زەرەر و زیان بوونە، بەبێ ئەوە رای حکوومەتی تورکیا بەهەند وەربگیرێ" (١٩/٤٧).

(ئەردال ئینونۆ) سەرکردەی ئۆپۆزسیۆنی تورکیا و سەرۆکی پارتی سوشیالیستی میللی لە گەڕانەوەیدا بۆ ئەستەموول لە کۆبوونەوەی حیزبە سوشیال دیموکراتییەکانی ناو کۆمەڵەی ئەوروپی لە برۆکسیل، لە فڕۆکەخانەی ئەستەموول بۆ رۆژنامەنووسان گوزارشتی لە ترس و گومانی ئەنجومەنی ئەوروپی کرد بەرامبەر بەو شێوازە دیموکراتییەی رژێمی دەسەڵاتداری تورکیا پراکتیزەی دەکات و گوتی: چەندین دیدار و چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمانی

ئەوروپی ئەنجام داوە، ناوبراو بە تاکیدەوە پێی گوتم: کۆمەڵەی ئەوروپی تا ساڵی ١٩٩٣ ئەندامی نوێ بۆ ناو ریزی خۆی وەرناگرێ، هەڵوێستی ئەو دەوڵەتەش دەیەوێ بێتە ریزییەوە، خۆی مەسەلەی بەئەندامبوونی لە ناو کۆمەڵەکە دیاری دەکات" ئینونۆ لەم رووەوە زیاتر گوتی: ".. من لە میانەی قسەکانیدا لە هەڵوێستە سەلبی و نەرێنییەکەی لەمەڕ بەئەندامبوونی تورکیا لە ناو یەکێتی ئەوروپا، تێگەیشتم.. ئەمەش مانای وایە ئەوروپاییەکان بیر لە چوونی تورکیا بۆ ناو ئەنجومەنەکە لە داهاتوویەکی نزیکدا، ناکەنەوە" (١/٤٨).

بەڵام ئەم هەڕەشە ناڕاستەوخۆیە بووە هەڕەشەیەکی ئاشکرا بۆ سەر تورکیا، کاتێک پەرلەمانی ئەوروپی داوایکرد بە زەرووڕەتی داپێنانی حکوومەتی تورکیا بە بوونی نەتەوەیی کورد لە تورکیا. بە نموونە: (کریستیان دیلامالین) ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپی لە لێدوانێکیدا گوتی: "ئەگەر تورکیا بە راستی بیەوێت ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا، پێویستە لە سەری دان بنێت بە بوونی نەتەوەیی کورد لە تورکیا". لە لایەکی ترەوە (یورگۆ رۆمیوس) رۆژنامەنووسی یۆنان و ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپا داوای لە حکوومەتی تورکیا کرد بە زەرووڕەتی رێزگرتنی لە مافی هاونیشتمانییەکانی و کۆتبەندنەکردنی رۆژنامەگەری و گوتیشی: تورکیا ئەمڕۆ تاکە دەوڵەتە لەو جیهانە ئازادەی کە لە بەندیخانەکانیدا (٧٥) رۆژنامەنووس گیراون بە تۆمەتی ئەوە رەخنەیان لە رژێمی دەسەڵاتدار گرتووە.. و گوتی: ئەم کارە دەسەلمێنێ تورکیا لە هەموو دەوڵەتەکانی جیهان زیاتر پێشێلی ئازادییە دیموکراتییەکان دەکات"(١/٤٩).

هەموو ئەم فشارانەی کە یەکێتی ئەوروپا خستنیە سەر تورکیا لە سۆنگەی پێشێلکردنی لە مافی مرۆڤ و هەڵوێستی لە هەمبەر کەمایەتی کورد، وایانکرد وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە نیسانی ساڵی ١٩٩٠ دۆسیەیەکی تایبەت بە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) ئامادە بکات بۆ ئەوەی بیخاتە پێش چاوی دەوڵەتانی پەیوەندیدار، بە کێشەی تورکیا و لەسەر سێ ئاستدا" (٩٠/٥٠):

"١- ئەم دۆسیەیە دەخرێتە پێش حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەگەڵ ئەم روونکردنەوەیەی لای خوارەوە:

ڕێککەوتننامەی هلسنکی ڕێگری لـە تـیرۆر و بزوتنـەوەی جیـاخوازی و ڕەگەزپەرسـتیی کردووە لەبەر ئەوەی ئەو بزوتنەوەیـەی لەناوچـەی باشـووری ڕۆژهـەلاتی ئـەنادۆڵ هەیـە[١٤]، بزوتنەوەیـەکی تیرۆریسـتی ڕەگەزپەرسـتی جیاخوازییـە، بۆیـە تورکیـا داوا لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات لە کۆڕ و کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکاندا پشتگیری بکات.

٢- تورکیا ئەم پرسیارەی لای خوارەوەی، ئاراستەی یەکێتی ئەوروپا کرد:

ئایا ئێوە پشتگیری لە تیرۆر یاخود ئاشتی لە تورکیا دەکەن؟ ئەو بزوتنەوەیەی لە باشـووی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ لە ئارادایـە، بزوتنەوەیـەکی تیرۆریسـتی ڕەگەزپەرسـتی و جوداخوازییـە، هەندێ لەو دەنگانەش کە نارەزایی بەرامبەر تورکیا دەردەبڕن سەبارەت بـە پێشـێلکردنی بـۆ مافی مرۆڤ بزانن یان نەزانن لایەنگری ئەم بزوتنەوە تیرۆریسـتییە دەکـەن لـە تورکیـا، بۆیـە تورکیا داوا لە دەوڵەتانی ئەوروپی دەکات کە پێویسـتە مشـت و مـڕ و لێکۆڵینـەوە لەسـەر بارودۆخی ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ لەم چوارچێوەیەدا بکرێت.

٣- تورکیا داوای لە دراوسێیەکانی خۆی بەتایبـەت لـە ئێـران و عێـراق و سـووریا کـرد پێویستە لەسەر مێزی گفتوگۆ کۆببنەوە بۆ چارەسـەرکردنی کێشـە بنەڕەتییـە هاوبەشـەکانی ناوچەکە، بۆ ئەوەی ئەم وڵاتانە وەك چڕنووکی پشیلە بەکارنەبرین بۆ لێدانی یەکتر، چونکە ئەو بزوتنەوەیەی لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ بوونی هەیە پێوەندییـەکی پتـەوی هەیـە لەگـەڵ سەرلەبەر کێشەکانی ڕۆژهەلاتی ناوین و پێویستە بە گیـانێکی بابەتییانـەوە و لـە ڕوانگـەی بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی ناوچەکەوە لێیان بکۆڵدرێتەوە".

بەڵام ئەنجومەنی ئەوروپی، فشارەکانی بۆ سەر تورکیا تەنها بۆ ئەوە نییـە دان بـە بـوونی نەتەوەیی کورد بنێت، بەڵکو داواشی لێدەکات مافی هەموو هاونیشتمانییەکانی بپارێزێ. بـە نموونە کاتێك سەرکردە گیراوەکانی حیزبی شیوعی تورکیا: (حەیدەر قوتلـو، نیهـاد سـاغرین، ئەحمەد قاچار و هاوڕێیەکانیان لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ لـە بەندیخانـە مانیـان لـە خـواردن گرت، پەرلەمانی ئەوروپا (٣) دادوەری بەسیفەتی لیژنـەی دۆزینـەوەی ڕاسـتییەکان ڕەوانـەی تورکیا کرد بە ئامانجی بینینیان و تاوتوێکردنی بارودۆخیان لەگەڵ بەرپرسانی تورکیا.

ئەگەرچی دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە (٥)ی مایسـی سـاڵی ١٩٩٠ ئـەو گیراوانـەی لـە بەندیخانە بەردا، بەڵام ئەنجومەنی ئەوروپی پێی وایە: تورکیا هێشتا ڕێگایەکی دوور و درێـژی

---

١٤- مەبەستی لەبزوتنەوەی چەکداری کوردە لە باکووری کوردستان (وەرگێڕ).

له پێشه تا بگات به دیموکراتییه‌کی راسته‌قینه، چونکه ئه‌نجومه‌ن جارێ نه‌گه‌یشتۆته ئه‌و قه‌ناعه‌ته‌ی دیموکراتییه‌کی دروست له تورکیا به‌رێوه‌بچێت و پێشی وایه تا ئێستا پێشێلکارییه‌کی زۆر له تورکیا به‌رامبه‌ر به مافی مرۆڤ پیاده ده‌کرێت، ئه‌مه‌ش شایسته‌ی ده‌وڵه‌تێکی ئه‌وروپی نییه له کاتێکدا پێ ده‌نێینه ناو سه‌ده‌ی بیست و یه‌که‌مینه‌وه. لێره‌شه‌وه (کۆنته‌ر فیراوگن)ی کومیساری ئه‌وروپی به‌رپرس له فراوانبوونی بازنه‌ی یه‌کێتی ئه‌وروپا له ١٤ی تشرینی دووه‌می ساڵی ١٩٩٩ و له تورکیاوه، داوای له تورکیا کرد که‌وا پێویست ده‌کات (په‌یمانی کاری نیشتمانی) تاوه‌کو شوباتی ساڵی ٢٠٠٠ ئاماده بکات بۆ مه‌سه‌له‌ی به‌ئه‌ندامبوونی تورکیا- له‌گه‌ڵ ١٢ وڵاتی ئه‌وروپی تر- له‌یه‌کێتی ئه‌وروپا، ئه‌و په‌یمانه‌ی که‌وا ده‌خوازێ چوارچێوه‌ی پلانه‌کانی ده‌وڵه‌تی تورکیا دیاری بکات بۆ ده‌سته‌به‌رکردنی چاره‌سه‌ری ئاشتیانه و دیموکراتییانه‌ی کێشه‌ی کورد و پاراستنی مافی مرۆڤ به رێگه‌ی هه‌موارکردنی ده‌ستووری و دیموکراتی و به ئه‌نجامگه‌یاندنی چاکسازی ئابووری پێویست بۆ چاره‌سه‌رکردنی ئه‌و قه‌یرانه سه‌خته‌ی که بینه قاقای حکوومه‌ته‌کانی تورکیای گرت.

وه‌لێ، حکوومه‌ته هاوپه‌یمانییه‌که‌ی ئه‌جه‌وید- به هۆی ناکۆکی نێوان سه‌رکرده‌کانی هه‌رسێ هاوپه‌یمانه‌وه- نه‌یتوانی کێشه‌ی به‌ئه‌ندامبوونی تورکیا بۆ ناو یه‌کێتی ئه‌وروپا یه‌کلا بکاته‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بزوتنه‌وه‌ی حیزبی نه‌ته‌وه‌په‌رست (تۆرانیزم) پێی وابوو چوونی تورکیا بۆناو ئه‌و یه‌کێتییه: "ده‌بێته هۆی دابه‌شبوونی تورکیا، چونکه ئه‌وروپا به‌م رێگایه‌وه ده‌یه‌وێت په‌یمانی سیڤه‌ر جێ به‌جێ بکات"، بۆیه بوڵه‌ند ئه‌جه‌ویدی سه‌رۆکی حکوومه‌ت له ئاماده‌کردنی کارنامه‌ی به‌شداربوون له یه‌کێتی ئه‌وروپا سستی نواند، ئه‌مه وایکرد یه‌کێتی ئه‌وروپا چاو بخشێنێ به‌خشته‌ی وه‌رگرتنی ١٢ ده‌وڵه‌ته ئه‌وروپاییه‌که بۆ ناو ئه‌نجومه‌ن و ئه‌و مه‌سه‌له‌یه دوابخات بۆ ساڵی ٢٠١٠ به‌بێ ئه‌وه ئاماژه به بابه‌تی تورکیا بدات. ئه‌م کاره زۆری نه‌مابوو ببێته هۆی هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی هاوپه‌یمانی سێکوچکه‌ی ده‌سه‌ڵات له‌به‌ر پێداگرتنی (ده‌وڵه‌ت باغچه‌لی) سه‌رکرده‌ی حیزبی بزوتنه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌په‌رست له‌سه‌ر هه‌ڵوێستی خۆی، به‌ڵام ده‌ستێوه‌ردانی مه‌سعوود یه‌لماز جێگری سه‌رۆك وه‌زیران و به‌رپرس له پێوه‌ندییه‌کانی وڵاته‌که‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌وروپا وایکرد قه‌ناعه‌ت به (باغچه‌لی) بێنێت و کاربکرێ بۆ ئاماده‌کردنی په‌یمانی کارنامه‌ی نیشتمانی به ئامانجی چوونی تورکیا به‌ره‌و ریزی یه‌کێتی ئه‌وروپا تا ساڵی ٢٠٠٤ له‌سه‌ر پێشنیاری فه‌ره‌نسا.

**سێیەم: فشارەکانی دەستە و ڕێکخراوەکانی پێوەندیدار بەمافی مرۆڤ:**

لەکاتێکدا ڕۆژنامەی (گاردیان)ی بەریتانی، لە ناوەڕاستی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨١ پرسیاری خۆی ڕووبەڕووی دیموکراتییە خۆرئاواییەکان و یەکێتی ئەوروپا کردەوە و گوتی: هەتاکەی دەستە و ڕێکخراوەکان بەچاو بەستراوەیی دەمێننەوە بەرامبەر ئەوەی لەتورکیا ڕوودەدات؟! ئەوا، ئەو هەواڵانەی لەتورکیاوە دەگەیشتن ئاماژەیان بەوە دەدا کە تاقمە سەربازییە کوودەتاچییەکەی ١٩٨٠ لە چوارقوڕنەی تورکیادا مومارەسەی تیرۆری بەکۆمەڵی دەکات (٢٥/٥٣).

ئەگەرچی، چەندین دەستە و ڕێکخراوی ئەوروپایی سەردانی تورکیایان کرد، وەلێ ڕۆژنامەگەری ڕۆژئاوا هەڵمەتێکی ڕۆژنامەوانی نەپساوەیان لەدژی ئەو دیکتاتۆرییە سەربازییەی تورکیا بەرپاکرد کەوا دیموکراتی سەربڕی و مافی مرۆڤیشی وا بەفیڕۆدا، لق و پۆپەکانی مافی مرۆڤ لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا ئەو کردەوانەیان ڕیسوا و شەرمەزارکرد بەڵکو ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی لە ڕاپۆرتی ساڵانەی بۆ ساڵی ١٩٨٥ تاکیدی کردەوە کە: "کردەوەی ئەشکەنجەدان و سەرکوتکردن خەڵکانێکی ئاسایی گرتۆتەوە ناکرێ لە چوارچێوەی بەندکراوە سیاسییەکاندا دابنرێن و خودی هەندێ لە بەرپرسە سیاسییەکانی تورکیش جەخت لەسەر ئەم لایەنە دەکەنەوە، ئەو کردەوانە پیاوانی ئاسایش لە گرتووخانەکاندا و لە هەموو ناوچەکانی تورکیا بەبێ هیچ سانسۆرێك مومارەسەیان دەکەن بەگرتووخانە سەربازییەکانیشەوە لەدیاربەکر و ئەرزروم و ئەنکەرە و ئەستەموڵ و تەنانەت لە گرتووخانەی مەلاتیەی تایبەتیش کە تایبەتە بە گیراوە سیاسییەکان و قاچاغچییانی چەك"(١٠/٥٤).

کە بزوتنەوەی گەلی کورد لە تورکیا ڕووناهی کەوتەسەر و لە شێوەی هێزێکی پوخت و ڕێکخراو و کاریگەر لە سەر گۆڕەپانی سیاسی تورکیا و لە سەر دەستی پارتی کرێکارانی کوردستان سەری هەڵدا، دەم و دەست کۆمەڵە و ڕێکخراوە جەماوەرییە ئەوروپاییە چەپەکان لە ڕووی مادی و مانەوییەوە پشتگیرییان لێکرد. بەنموونە: (کۆمەڵەی جەنگاوەرانی دژە فاشیزم)ی یۆنانی‌و بەرەی ژینگەپارێزی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و کۆمەڵەی بەرگری لە مافی گەلان و تێکۆشان لەپێناو ڕزگارییاندا کە بارەگاکەی لە پاریس بوو، لە ساڵی ١٩٨٦ دەستپێشخەرییان کرد بۆ کۆکردنەوەی پیتاك لە پێناو دامەزراندنی ئێستگەی دەنگی کوردستان کە لەکێوەکانی جوودی و بە چاودێری و سەرپەرشتی پارتی کرێکارانی کوردستان دەنگی خەباتی گەلی کوردی دەگەیاندە هەموو جیهان (٣/٥٥).

حکوومەتی تورکیاش لە هەوڵێکیدا بۆ خۆگێلکردن لە بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان و هەڵمەتی ئەو پارتە لە رزگارکردنی ناوچەی کێوەکانی جوودی، لە ساڵی ١٩٨٩ گرێبەستێکی لەگەڵ کۆمپانیای (پیترۆل شیڤرۆن)ی ئەمریکایی واژۆکرد بۆ دۆزینەوەی نەوت لە چیاکانی جوودی. بەڵام بزوتنەوەی کورد (مەبەستی: بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان، وەرگێڕ) نەیهێشت کۆمپانیاکە لەو ناوچەیە دۆزینەوەکانی بە ئەنجام بگەیێنێت، کۆمپانیای ناوبراویش گرێبەستەکەی لەگەڵ حکوومەتی تورکیا هەڵوەشاندەوە و چۆن هاتبوو ئاوەهاش گەڕایەوە بۆ ئەمریکا. دوای ئەمە (مۆریس ئەمیتای) وتارێکی لە گۆڤاری (واشنتۆن جویش) بڵاوکردەوە تیادا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە "ئیمڕۆ (٢٠) ملیۆن کورد لە هەریەك لە ئێران و تورکیا و سووریا وەکو براکانیان لەعێراق تێدەکۆشن لە پێناوی (ئۆتۆنۆمی)دا، بۆیە بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوین بەبێ دانپێنان بەمافی چارەنووسی کورد، سەقامگیری بەخۆیەوە نابینێ"(١٩/٥٦).

لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٩ بەدوا، دەستە و کۆمەڵە و رێکخراوە مرۆییە جیهانییەکان، برەویان بە کار و چالاکیەکانیاندا بە بەستنی کۆڕ و کۆنگرە بۆ لێکۆڵینەوە لە رەوشی کوردان: بێ باوکەکانی جیهان- وەك چۆن رۆژنامەی "لۆمۆند"ی فەرەنسایی ناوی لێنان- ئەم بزاڤە لە پاش رووداوەکانی هەڵەبجە و ئەو هەڵمەتە جینۆسایدە هات کە هێزە سەربازییەکانی تورك لە دژی کورد لە تورکیا ئەنجامیاندا- فەرەنسا چاودێریی یەکەمین کۆنگرەی جیهانی لەمەڕ دۆزی کورد لە پاریس لە رێکەوتی ١٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ کرد بە سەرپەرشتی (وەقفی ئازادییەکانی فەرەنسا) و بە هاوکاری ئینستیوتی کورد لە پاریس PKE و لەو کۆنگرەیەدا رۆژهەڵاتناسان و زانایانی کورد، سەرەڕای نوێنەرانی بزوتنەوە رزگاریخوازییە کوردی و جیهانییەکان بەشدارییان کرد.

نووسەری کوردی پێشکەوتووخواز (دوغۆ بیرنجیك) لە کۆنگرەکەدا وتاری پارتی کرێکارانی کوردستانی خوێندەوە و گوتی: کێشەی گەلی کورد هەمان کێشەی گەلی تورکە. وەك چۆن تورك و جەماوەری تورکیا تێدەکۆشن لە پێناو رۆژێکی باشتر لە دژی ئەو زوڵم و زۆردارییەی تورکیا مومارەسەی دەکات، ئاوەهاش ئێمەی کورد تێدەکۆشین لە پێناو پاراستنی قەوارە و بوونی نەتەوەیی خۆمان، لێرەشەوە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە چەمکە گشتییەکەی، واتا: چارەسەرکردنی کێشەی تورکیاش، چونکە ئێمەی هەردوو گەلی کورد و تورك هاوبەشی هەمان ئێش و ئازار و هەمان خواست و ئاواتین.

گەلی کورد ئیمڕۆ بە هەردوو باڵەکەیەوە: یەك ملیۆن کرێکاری کورد و چارەگە ملیۆنێك جەنگاوەر، لەپێناو مافی چارەنووس و بۆ ئەوەی خۆی دەسەڵاتی خۆی بەڕێوەببات، چەکی هەڵگرت پاش ئەوەی تەنگژەکانی دەسەڵات لە تورکیا زیاتر و دووفاقییەکانیشی توندتر بوون بەتایبەت لەناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، ئەمە پاڵی بەجەماوەری کوردەوە نا مومارەسەی مافی خۆی بکات بۆ بەرگریکردن لەخۆی و کلتوور و پێناسەکەی و ئەوانیتریش ناچاربن دان بنێن بە مافی چارەنووسی (٤٢/٤٣).

لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ کۆنگرەی واشنتۆن لەژێر دروشمی (گەلێك لەمەترسیدایە: کورد)، بەچاودێری ئەنجومەنی مافی مرۆڤی ئەمریکی و بەهاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ مافی مرۆڤی فەرەنس ە بەسترا. لە شاری لەندەنیش لەماوەی نێوان ١٩-٢٠ی ئابی ساڵی ١٩٨٩ کۆنگرەی نێونەتەوەیی کورد بە سەرپەرشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بە هاوکاری لیژنەی مافی مرۆڤی بەریتانی گرێ درا. لە ماوەی نێوان ٢-٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠یش لەکۆبنهاگن کۆنگرەی مافی کەمایەتییەکان و رەوشی باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا بەسترا و ئامادەبووانی کۆنگرەکە داوایان لە حکوومەتی تورکیا کرد دان بە بوونی کورد لە تورکیا بنێت بە زمانی تایبەتی خۆیان باخێون لەپێناو پاراستنی کلتوور و بوونی نەتەوەییان (١٩/٥٧).

لە ساڵی ١٩٩٠ لە ستۆکهۆڵم کۆنگرەیەك لە هاوشێوەی کۆنگرەی پاریس بە چاودێری مافی مرۆڤی سویدی بۆ تاوتوێکردنی کاروباری گەلی کورد لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین، بەسترا. دوابەدوای ئەمەش کۆنگرەی نێونەتەوەیی کورد لە مۆسکۆ لە سەرەتای مانگی ئابی ساڵی ١٩٩٠ لە ژێر دروشمی (مافی کەمە نەتەوایەتییەکان لەجیهاندا) گرێ درا.

لەگەڵ ئەوەی فەرەنسا لە دوای ساڵی ١٩٨٥ وەکو پارێزگاری گەلی کورد و وەك بەرگریکارێك لە ماف و بوونی نەتەوەیی کورد هاتە مەیدان، وەلێ تاوەکو ئێستاش ئەم ئەرکەی بۆ بەریتانیا و سویسرا- کە هەوڵیاندا هەمان رۆڵ بگێڕن- بەجێ نەهێڵا. دەبینین سەرەڕای هەڵوێستە مرۆڤایەتییەکانی بەرامبەر بەکورد، کەسایەتییە سیاسی و پێشکەوتنخوازەکانیشی لە پێشکەشکردنی یارمەتی مادی و مانەوی بۆ گەلی کورد بەشدارییان کرد. بە لای کوردیشەوە ئەو کەسایەتییە فەرەنسەییانە رێز و حورمەت و پایەیەکی بەرزیان هەیە، تەنانەت بەشێکیان نازناوی (دۆستی گەلی کورد)یان پێ دەڵێن، وەك: دکتۆر برنارد کوشنێر کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی خوێندکارانی بزوتنەوەکەی مایسی

ساڵی ۱۹٦۸ لە فەرەنسا، پاشان بووە وەزیری کاروباری مرۆڤایەتی لە حکوومەتی فەرەنسا لە ساڵی ۱۹۸٦. کوشنێر دیارترین هاوڕێی سەرکردەی کوردی ئێرانی کۆچکردوو عەبدولرەحمان قاسملو بوو، چونکە پێش ئەوەی ببێتە وەزیر وەك پزیشکێك لە چیاکانی کوردستان کاری کردووە، بەم کارەشی بووە دۆست و هاوڕێی گەلی کورد- دکتۆر کوشنێر ئەو دەمەی وەزیر بوو، لە سەر داوای حکوومەتی فەرەنسا لە لای دکتۆر قاسملو نێوبژیوانی کرد بۆ ئەوە (قاسملو) ئیشارە بەمام جەلال تاڵەبانی بدات پرۆسەی سەربازی لەدژی حکوومەتی عێراق رابگرێت تاعێراق لە ژێر گورزەکانی ئێراندا نەڕووخێت، ئەوەبوو هەردوو سەرکردەی کورد بەدەنگی داواکاریی فەرەنساوە چوون، بەڵام کارەساتەکەی هەڵەبجە وایکرد کوشنێر لەساڵی ۱۹۸۸ وەك نارەزاییدەربڕینێك بەرامبەر بەئەنجامدانی ئەو کارەساتە دەست لەکار بکێشێتەوە (٤٣/٤٤).

خانمی یەکەمی فەرەنسا خاتوو (دانیال میتران) دووهەمین کەسایەتی فەرەنسایە کە بە کارامەیی و لێهاتوویی‌خۆی شایستەی نازناوی دۆستی گەلی کوردە. خاتوو دانیال لە ساڵی ۱۹۸۸ بە سەرپەرشتی خۆی هەڵمەتێکی بەڕێوەبرد بۆ کۆکردنەوەی پیتاك بۆ دروستکردنی بینایەیەکی تایبەت بە ئینیستیوتی کورد لەپاریس کە لەساڵی ۱۹۸۳ لە فەرەنسا دامەزرا و بەهەوڵ و کۆششی شەخسی خۆی توانی بینایەکە لە ساڵی ۱۹۸۹ تەواو بکات کە ئیمڕۆ ئینیستیوتەکە تێدا جێگیرە.

خاتوو دانیال میتران لە ساڵی ۱۹۸۸ سەردانی خێوەتگەکانی پەنابەرانی کوردی لە تورکیا کرد کە پەنایان بۆ تورکیا هێنابوو و لە ناوچەی (سیرا) دانرابوون و ژمارەیان لە ۲۹ی نیسانی ۱۹۸۹ گەیشتە ۳٦ هەزار پەنابەر. بەمیوانیش، سەردانی پێشمەرگەکانی کوردستانی کرد بەو سیفەتەی سەرۆکی (وەقفی ئازادییەکان)ە کە بەتایبەت تێدەکۆشی لە دژی ئەو رژێمانەی پێشێلکاری مافی مرۆڤ لە فەرەنسا و جیهان دەکەن. لە ئەنکەرەشەوە بەڕێزی لەبارەی پەنابەرانی کوردەوە، لە لێدوانێکیدا، گوتی:

کاری کردەنی نییە خەباتی گەلی کورد لەبیر بکرێ، ئەو گەلەی ۲٦۰۰ ساڵ لەمەوبەر سەربەخۆیی لێ زەوت کرا و حاشایان لە مومارەسەکردنی زمان و پەرەپێدانی کلتوورەکەی کرد و ناچارکرا ڕەوبکات و پەنا بۆ ئێرە و ئەوێ ببات و لێبگەڕێن لە نێوان کۆیلایەتی و مردندا بژی.. ئەم گەلە مەحاڵە لەبیربکرێت.. چونکە گەلی (یەلماز گۆنەی)ی رۆماننوس و هونەرمەند و دەرهێنەری فیلمی (یۆڵ= رێگا)یە"(٢١/٥٨).

دانیال میتران کۆمەکی خۆراك و کەرەستەی پزیشکی پێشـکەش بـە پەنابـەرانی کـوردی عێراق لە ئێران و تورکیا کرد پاش ئەوەی لە ٢١ی نیسانی ساڵی ١٩٩١ سەردانی ناوچـەکەی کرد و چاوی بە سەرکردەکانی کورد کەوت لە هەریەك لە ئێران و تورکیا.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشەوە دەنگەکان بەرزبوونـەوە بـۆ پشـتگیریکردن لـە بوونی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، بە تایبەتی پاش ئەوەی شاندەکانی وڵاتانی ئـەورووپی بـەرەو کۆبوونەوەکانی سوشیال ئەنتەرناشنال لە برۆکسیل رێککەوتن لە سەر وەرنەگرتنی تورکیـا لـە یەکێتی ئەوروپا ئەگەر تورکیا دان نەنێت بە بوونی نەتەوەیی کورد و مافی کلتووریی کورد لە تورکیا (٢٠/٤٨) و دوای ئەوەش کە راپۆرتی رێکخراوی لێبـوردنی نێودەوڵـەتی کـە لـە ٣٦ لاپـەڕە پێکهـاتبوو سـەبارەت بەپێشـێلکارییەکانی مـافی مـرۆڤ لـە تورکیـا... گۆڤـاری (نیوزویك)ی ئەمریکایی لە ١٩٩٠/٥/١٥ توێژینەوەیەکی دەربـارەی تورکیـا بـە ناونیشـانی (تورکیا بـۆ پێناسـەکەی دەگـەڕێ) بڵاوکـردەوە، لەسـەر بەرگەکـەی نەخشـەیەکی تورکیـای دانابوو.. بەشێکی زۆر لە لاپەڕەکانی توێژینەوەکە بۆ رەوشی تورکیـا تـەرخانکردبوو و تیـادا باسی لە دەستکەوتەکانی تورکیا و پەرەسەندنی دیموکراتی لەم وڵاتە لە میانـەی (٧٠) سـاڵی رابـوردوو کـردووە، دەڵێـت: لـە لایـەك تورکیـا هـزری عیلمـانی وەرگرتـووە، لێ زۆربـەی سیاسەتوانانی تورك لە مەڕ ئایینی ئیسـلام و کاریگـەری لـە سـەر کۆمەڵگـە داخێـون، لـە کاتێکیشدا تورکیا سیستمی دیموکراتی و فرە حیزبی پیادە دەکات، کەچی دان نانێت بـەبوونی نەتەوەیی کورد کە رێژەیەکی وا لـە دانیشـتوانی تورکیـا پێکـدێنن. نکـۆڵی لێنـاکرێ.. لـە کۆتاییشدا دەڵێ: رۆژئاوا پشتگیری لەدانپێنان بە بوونی نەتەوەیی کورد لـە تورکیـا دەکـات، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نییە کورد لەم وڵاتە جیابێتەوە، یـاخود دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی کـوردی دابمەزرێنێ.

(ریچارد چێنی) وەزیری بەرگری ئەمریکا لـە لێدوانێکیـدا بـۆ رۆژنامـەی (حورییـەت)ی تورکی، دەڵێت: "داخستنی هەردوو بنکە سەربازییەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە تورکیا لە لایەن حکوومەتی ئەمریکاوە بە مانای ئەوە نایـەت گۆڕانکارییـەك لـە سیاسـەتی ئـەمریکا بەرامبەر بە تورکیا روویدابێت، چونکە تورکیا هێشـتا لـە سیسـتمی بـەرگری رۆژئـاوادا بـە ئەندامێکی کارا دادەنرێت، جگە لەوەش ئەمریکا هێشتا پابەندە بـەو بەڵێنانـەی بـەتورکیای داوە لەمەڕ پارێزگاری لە یەکێتی خاکی وڵاتی تورکیا" (١٩/٥٩).

لە لایەنی خۆیشییەوە (مارك كرۆسمان) یاریدەدەری باڵیۆزی ئەمریكا لە ئەنكەرە لە میانەی سەردانەكەی بۆ ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بە ئامانجی ئاشنابوونی لە بارودۆخی ناوچەكە و دوای كۆبوونەوەی لەگەڵ پارێزگاری ناوچەی حوكمی عورفی والی خەیری قۆساقچی ئۆغلو لە بینایەی پارێزگا، لە لێدوانێكیدا گوتی: حكوومەتی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە رەهایی لایەنگری لە دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی لە رۆژهەڵاتی ناوین یان لە توركیا ناكات، چونكە ئەوە بە مەترسییەكی گەورە دادەنرێ بۆ سەر ئاسایشی توركیای هاوپەیمانمان. لێرەشەوە، ئەو كردەوە خوێناوییانەی بزوتنەوەی پارتی كرێكارانی كوردستان لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ئەنجامیان دەدات و گەیشتوونەتە ئاستی مومارەسەی كوشتارگەی خوێناوی بە كردەوە گەلێكی تیرۆریستانە لە قەڵەم دەدەین، لە هەمان كاتیشدا ئێمە لەگەڵ ئەوەداین كوردیش وەكو هەموو گەلان بەزمانی خۆیان باخێون و پیادەی مافی خۆیان بكەن لە پاراستنی كلتووری نەتەوەیی و رۆشنبیری خۆیان بەرێگەی بڵاوكردنەوە و میدیاوە"(١/٥٩).

لە سۆنگەی ئەم فشارە سیاسییانەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی تورك و یەكێتی ئەورووپا و دەستە و رێكخراوە پێوەندیدارەكانی مافی مرۆڤ لە جیهان خستییانە سەر توركیا، حكومەتی توركیا ناچار بوو دان بنێت بە مومارەسەكردنی كورد بۆ زمانەكەیان و مادەكانی (١٤٠ و ١٤١ و ١٦٣)یش لە یاساكانی سزاكانی توركیا هەڵبوەشێنێتەوە. بە مەش نزیكەی (٣٠) هەزار بەندكراوی كورد لە كۆی ٤٣ هەزار بەندكراو لە گرتووخانەكانی توركیا ئازاد كران، بێجگە لەوە حوكمی لەسێدارەدانیش لە یاسای سزاكانی توركیا هەڵوەشێنرایەوە. بەڵام ئەم بڕیارانەی كە لەساڵی ١٩٩١ دەرچوون گوزارشت لە كەمترین خواست و ئاواتە دیموكراتی و ئایندەییەكانی هەردوو گەلی تورك و كورد دەكەن. لێرەشەوە دوا رۆژی دیموكراتی لە توركیا بەستراوە بە چارەسەركردنی كێشەی كورد لەم وڵاتە و هەڵوەشاندنەوەی حوكمی عورفی لەناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، سەرەڕای رێزگرتن لە پرنسیپەكانی مافی مرۆڤ كە ئەنجومەنی ئەورووپی داوایان دەكەن بۆ ئەوەی توركیا شایستە بێت لە سەرەتای هەزارەی سێیەم ببێتە ئەندام لە یەكێتی ئەورووپا.

## باسی سێیەم

## کورد و تورکیای ئەورووپی

کورد لە کۆنترین چاخەکانی مێژووەوە و پێش نزیکەی ٣٠٠٠ هەزار ساڵ بەر لەم رۆژگارەمان، دانیشتووی وڵاتی ئەنادۆڵ و بەشەکانی خۆرئاوای ئێران و باکووری عێراق بوونە. لەوساوە، خێڵ و هۆزەیلی جیاجیای کورد توانیویانە حکوومەتەکانی لۆلۆیی و گۆتی و کوشی (کشی) و سوباری و کوردائی دابمەزرێنن کە بەرای زۆرینە ناوی ئەم حکوومەتانە بە ناوی سەرۆکانی خێڵ و هۆزە کوردییەکان یان بە ناوی ئەو خواوەندانەوە هاتوون کە دەیانپەرستن. کورد لە رۆژگاری بابلییەکانەوە بەهێز و نەبەردی ناویان دەرکردووە بە نموونە: تەورات باسی لە هێز و قارەمانێتی کوش (کشییەکان) و حۆرییەکان (کەلقێکن لەسوبارییەکان) کردووە، واژەی (کورد)یش لە زمانی ئاشووری بە مانای بەهێز هاتووە. بۆیە کورد سەرکردایەتی زۆرێك لە گەلانی دانیشتووی چوارگۆشەی نێوان دەریاچەی (ورمێ) لەرۆژهەلات و شاری (ئەنکەرە) لەرۆژئاوا و نێوان شاری ئەرزروم لە باکوور و شاری بەسرە لە باشوور و لەم لاشەوە بە هێڵی سنوورەکانی نێوان عێراق و ئێران کردوون بۆ دامەزراندنی چەندەها دەوڵەت لە ناوچەی رۆژهەلاتی نزیکی کۆن. بەلام ئەم دەوڵەتانە بە هۆی ناکۆکی نێوانیان یەکتریان لەناوبردووە. بە شێوەیەك ئیدی لەسەدەی (٥) پێش زایینەوە کورد لەژێر دەسەلاتی فارسەکاندا بوون و پاشان عەرەبە موسڵمانەکان و دوایەش تورکەکان، تەنانەت لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠ز (٢٣) میرنشینی کوردی لە کوردستاندا حوکمڕان بوون ئەو دەمەی سوڵتان سەلیمی عوسمانی داوای لەزانای کورد مەلا ئیدریسی بدلیسی کرد، کورد سەرۆکێك یان پاشایەك یان سوڵتانێك بۆ خۆیان دەستنیشان بکەن تا ببێت بە هاوشانی و پەیمانێکی دۆستانەی لەگەڵ گرێ بدا بۆ بەگژداچوونی شا ئیسماعیلی سەفەوی، بەلام مەلا ئیدریسی بدلیسی بەسوڵتان سەلیم دەڵێت: گەورەم وا باشترە خۆتان ئەو سەرۆکە دابنێن، چونکە کورد ناتوانن لەسەر ئەمە رێك بکەون لەبەر ناکۆکی و دووبەرەکی خێلایەتی نێوانیان، بەو جۆرە ئەوەی سوڵتان سەلیم دەیویست، بۆی هاتەدی (١٧/٤٣)[١٥].

---

١٥- شاد رەوان مام هەژاری موکریانی لەپەراوێزی کتێبی شەرەفنامە لاپەڕە (٦٥٢) دەڵێت: "... پێش زەمانی سوڵتان سەلیم ٤٦ میرنشینی کورد هەبووە، کەلەسایەی پێشنیاری مەلا ئیدریسەوە زۆربەیان

ئەو ناتەبایی و دووبەرەکییە خێڵەکییانە لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ئەم رۆژگارە لای کورد خاڵی لاوازی و فاکتەری سەرەکی بوون بۆ شەڕ و کوشتاری نێوان کورد چ بۆ حیسابی خۆیان یان بۆ حیسابی ئەوانیتر بە تەرحێك ماوەی نەداون مشووری خۆیان و کلتوورەکەیان بخۆن بە ئامانجی تۆمارکردنیان تاببی بە تۆمارگەیەك بۆ دیرۆك و نەبەردی و ژیارییەکەیان، خاڵی کوشندەش بوونە بۆ خواست و ئاواتەکانیان بە درێژایی مێژوو و لەم خاڵەشەوە ستەمکاران و فەرمانڕەوایانی کۆنەپەرست لەدێر زەمانەوە تائێستا دزەیان کردووە بۆ ئەوەی کورد بەدەستی کورد بدەن بەکوشت لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە کەسانی نەفس نزم و خۆفرۆشی ساویلکە لە نێو کورد بدۆزنەوە تا بیانکەن بە ئامرازێك بۆ ناپاکیکردن لەگەڵ برای کوردی هاوڕەگەزی، ئەم جۆرە کوردە ناپاکانە ئەسپی تەروادە بوون لە هەمبەر هیوا و ئاواتی گەلی کورد بۆ یەکێتی و رزگاربوون لە کۆیلایەتی و زوڵم و زۆرداری داگیرکەران.. بە نموونە: مەلا ئیدریسی بدلیسی یەکەمین خیانەتکاری کێشەی گەلەکەی بوو ئەو دەمەی توانی دڵی کوردان نەرم بکات بۆ پشتگیری سوڵتانی عوسمانی لە شەڕ و ململانێیەکانیدا لەگەڵ شا ئیسماعیلی سەفەوی لە بری ئەوەی هەوڵ بدات بۆ چەسپاندنی سەربەخۆیی میرنشینە کوردییەکان لە ناوچەی ئەنادۆڵ.

---

لەناوچوون! دوای ئەوە کەمەلا ئیدریس بەشیرینکاری خۆی کوردستانی والێکرد، هەر بەدەستی خۆی تەپڵ و ئالای بەناوی سوڵتانەوە بەسەر میرەکاندا بەشییەوە. مەلیك خەلیلی یادگاری بەرەی سەلاحەدینی ئەیوبیش لەو دەهۆڵ و ئالا پیرۆزانەی پێ برا. مەلا ئیدریس ببووە دەرزی بەرکۆژەی سوڵتان و لەئەندازە بەدەر خۆشەویست ببوو. کەسوڵتان لەئێران دەهاتەوە و کەدەچووە میسریش مەلای هەر دەگەڵ بوو.

کوردستانی وا سەخت و بەهێز بەخوێنڕشتنێکی زۆر کەم و بەبێ شەڕی گران و بەخۆشی و رەزامەندی کوردان سەر بۆ حوکمی عوسمانی بچەمێنێ؟ ئەمە لەمێژوودا وێنەی نەبووە. کوردستان هەرگیز بۆ هیچ داگیرکەرێك تەواو نەهاتۆتە بەرکەمەند. هەر لەزەمانی ئاشوورەوە هەتا ئێستاش زۆر بەتوندوتیژی دەگژ داگیرکەرانی راچووە، ئاشووری، ئێرانی، پەرتی، رۆمانی، یۆنانی بۆ سەرکوتکردنی کوردان و داگیرکردنی کوردستان لەشکری زۆریان هێناوە. بەڵام هیچیان وەك مەلا ئیدریسی بلیمەتیان پێ نەکراوە. ئەو پیاوە بەوریایی و سیاسەتزانی خۆی کارێکی وایکرد عوسمانی بیگرنە ناو پەنجەی خۆیانەوە و ئەو بەهرە گەورەیان پێ بگەیێنێ.

شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی

وەرگێڕانی هەژار

١٩٧٢ (وەرگێڕ)

میرنشینی ئەردەڵانیش یەکەمین گورزی گورچکبڕی خۆی لەیەکێتی کوردان دا کاتێك لایەنی شا ئیسماعیلی سەفەوی گرت و کاتێك چووە شەڕ لەگەڵ بـرا کوردەکـانی لـە ریـزی ئـەو عوسمانییانەی کە سیاسەتی (پەرت کە زاڵ بە)یان لەگەڵ میرنشینە کوردییەکان بەکاربرد تا بۆیان لوا خود موختاری و سەربەخۆییە ناوخۆییەکەیان ریشەکێش بکەن.

رەنگە ئەوە شتێکی سـەمەرەبێت عەشـیرەتێکی وەکـو عەشـیرەتی قۆچـگیری کـە لـە بیستەکانی سەدەی رابوردوو شۆڕشە کوردییـەکانی (دەرسـیم و ئـاگری داغ)ی هەڵایسـان، ئەمڕۆ ببینین رۆڵی ناپاکی بگێڕێ بەرامبەر بەگەل و نەتەوەکەی خـۆی بـەرێگای سیسـتمی پارێزگارانی گوندەکانەوە و تاکەکانی ببنە چاوساغ و ئالقە لەگوێی سوپای تورك لەدژی بـرا کوردەکانیان لەبزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان، تا کار گەیشـتە ئـەو رادەیـەی لـە مانگی مایسی ١٩٨٩ رۆژانە (٢٥) کەس لە هەردوو لایان بکوژرێن (١٧/٦٠).

ئەگەرچی گەلی کورد لەو سەروبەندانەوەی کە سەروساختی لەگەڵ گەلانی تر پەیدا کرد، نەخوازە دوای لەشکرکێشییەکەی سەرکردە و هزرڤانی یۆنانی زەینەفۆن بەرەو رۆژهەڵات لە سەدەی (٥)ی پێش زایین، بەوە ناسرابوو گەلێکی ئازا و قارەمانە و هەوڵ دەدات ئـازادی و سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ هەرچەندە هەردوو هێزە مەزنەکەی ناوچەکە.. ئیمپراتۆرییـەتی ئێران و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە سەدەی شانزدەهەمەوە پیلانیان دەگێڕا بۆ دابەشکردنی و بەکارهێنانی هێز و تواناکانی بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان. بەڵام راپەڕینەکانی ئەم گەلە قارەمانە لـەدژی داگیرکـاری و دابەشـکردن و راگواسـتن بوونـە بـەردێکی پـۆڵایین هـەموو هەوڵەکانیان لە سەری ورد و خاش بوون.. بە شێوەیەك هەولەکانی راگواستن و بەتورك کردن بوونە شمشێرێکی دوو لایەنە. لەوڕا گەلی کورد توانی ئەو هەوڵانە پووچەڵ بکاتەوە و هەموو ئاواتێکی دوژمنانیش بۆ داگیرکردن و سڕینەوەی پێناسەی نەتەوەیی ئەم گەلە بەفیڕۆچوون.

چارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد بـە رێگـەی سـەرکوتکردن و تـیرۆرەوە لـە سـەردەمی عوسمانییەکانـەوە، هەرەسـی هێنـا و بۆیـان روون بـۆوە کـە سیاسـەتی توانـەوەی هـەر کەمایەتییـەك چ وەك نەتـەوە یـان خـێڵ یـان تایفـە لـەم سـەردەمەدا مەحاڵـە بێتـەدی. چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەرێگەچارەی تایفەگـەری تەسـك و هەنووکـەییش نایەتـەدی بـەڵکو بـە شـێوەیەکی دیموکراتییانـەی بنـەڕەتی و لـە سـەر چـەمکێکی نـوێی مـافی هاونیشتمانیبوون و یەکێتی کۆمەڵایەتی دەبێت، ئـەو چـەمکەی کـەوا دەخـوازێ هـەموو هاوڵاتیان لەخاکی نیشتماندا بگرێتەخۆ.

ئەگەرچی یەکێتی ئەوروپا بەتایبەتی و خۆرئاوا بەگشتی نارەزایی لە هەمبەر ئەو کردەوە تیرۆریستییانە دەردەبڕن کە بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان لە تورکیا مومارەسەی دەکات، بەلام کۆنگرەکی نێودەولەتیش دەبەستێ (واتە: ئەوروپا) بۆ تاوتوێکردنی مافی کورد و ئەو زولم و زۆرەی رووبەرووی کورد بۆتەوە.. ئەوا ئەو کەسایەتییە تورکیانەی هاوسۆزییان لەگەڵ کێشەی کورد هەیە و هەروا ژمارەیەکیش لە رێبەرانی کورد لە دەرەوەی تورکیا رەخنە لەو مومارەسە تیرۆریستییانە دەگرن.. لەم لایەنەوە مەسعوود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە رێگایەوە بەرەو کۆبوونەوەکانی سوشیالیستی نێو نەتەوەیی کە لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٩ لە ستوکهۆلم بەسترا و دوای ئەوەی لەگەڵ ئەردال ئینونو سەرۆکی پارتی دیموکراتی سوشیالیستی میللی تورك کۆبۆوە، لە لێدوانێکیدا بۆ پەیامنێری رۆژنامەی (حورییەت)ی تورکیایی، گوتی: من خۆم بە دۆستێکی تورکیا دەزانم، بۆیە ئەوپەڕی خێر و پێشکەوتنی بۆ دەخوازم و حەز ناکەم دەست بخەمە ناو کاروبارییەوە. بەلام من وەکو کوردێك بەدواداچوونی ئەو رووداوانە دەکەم کە لە ناوچەی رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی تورکیا روودەدەن. زانیومە حکوومەتەکەتان هەندێ بڕیاری ئیداری سەبارەت بەکێشەی کورد لەتورکیا دەرکردووە، بەلام ئەم بڕیارانە کێشەکە چارەسەر ناکات، بەلکو زیاتر ئالۆزی دەکات. لەوێرا رێکخراوێکی کوردی لە تورکیا هەیە بە ناوی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە، لە دژی رژێمی دەسەلاتداری تورکیا خەباتی چەکداری دەکات، وەلێ خەبات بە رێگەی کوشتنی رۆلەکانی گەل یان تۆقاندنیان نایە تەدی.. من لە دژی ئەم جۆرە خەباتەم، چونکە وا پێویست دەکات لە سەر رێکخراوە خەباتگێرەکان لەگەڵ میللەتدابن نەوەك لەدژی"(٤٨/٢٠).

جیهان لە کۆنگرەی هلسنکی و رێککەوتننامەی ڤیەننا، تیرۆر بە هەموو شێوەکانی: گلدانەوەی بارمتە، رفاندنی فڕۆکە، کوشتن لە سەر پێناسە، زەوتکردن چ مادی یان سیاسی، بەکاربردنی خراپی مافی رەوای بەرگری و داخوازییە نیشتمانی و نەتەوەییەکان لە لایەن دەولەت و تاکەکان و کۆمەلەوە.. ئەمانەیان هەموو ریسوا و شەرمەزارکرد. لێرەشەوە دەولەتانی ئەنجومەنی ئەوروپی- لە پێش هەمووشیانەوە فەرەنسا- پشتگیری لە کێشەی کورد دەکەن و دەخوازن مافی نەتەوەیی و کلتوورییان بدرێتێ. بەلام بیرۆکەی دامەزراندنی دەولەتی سەربەخۆ بۆ کورد رەتدەکەنەوە و هەموو شێوەکانی ئەو تیرۆرەش ریسوا دەکەن کە

هەندێ لە بزوتنەوە کوردییەکان- بە تایبەت پارتی کرێکارانی کوردستان- مومارەسەی دەکەن بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی بەرێگەی پرنسیپی (لێبدە و راکە) کە بەرامبەرەکەی ئەم پرەنسیپە تورکییەیە، دەڵێت (بیگرە و بیکوژە) ئەمە دوو پرەنسیپی رەتکراوەن لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەگشتی و دەوڵەتانی یەکێتی ئەوروپاش بەتایبەتی کەبیروبۆچوونیان کۆکە لەسەر وەرنەگرتنی تورکیا لەئەنجومەنی ئەوروپی ئەگەر دان نەنێت بە بوونی نەتەوەیی و مافە کلتووری و پەرلەمانییەکانی گەلی کورد سەرەڕای قوربانی نەدان بە دیموکراتی بەبیانووی ئەوەی کە تیرۆر لە ناوچە کوردنشینەکە هەیە ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە یەکێتی ئەوروپا پشتگیری لەدانپێنان بە بوونی نەتەوەیی کورد دەکات، بەڵام هەم بەرهەڵستی لە جیابوونەوەی کورد لە تورکیا دەکات و هەم بەرهەڵستیش لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لە ناوچەکە دەکات.

جیهان ئەمڕۆ بەرەو سیستمێکی نێونەتەوەیی نوێ هەنگاو دەنێت تیادا ئاسایش و سەقامگیری بەرقەرار بێ و رق و کینە و دەمارگیری کوێرانەی هزری و رەگەزپەرستی وەلاوە بنرێ بۆ ئەوەی مرۆڤ- لەهەر کوێیەك بێت لە سەر ئەم گۆی زەمینە- چاوی بە برای مرۆڤی خۆی لەسەر هەر بیروراو رەگەزێك بێت بکەوێت بۆ ئەوە دایالۆگی راستەقینە و بنیاتنەری لەگەڵدا بکات لەپێناو خودی مرۆڤ و ئایندەی گەش و پڕشنگداری، بۆیە هەردەبێ دابڕانی کورد و تورك یەکەم هاوتەریب بێت و پاشان بەرەو دۆستایەتی و نیازپاکی مل بنێت دوای سەدە زەمەنێك لە رق و کینە و رەگەزپەرستی کوێرانە کە وایکرد هەردوو گەلی تورك و کورد بگەنە ئەم چارەنووسە خوێناوییە، چونکە هەر یەکەیان جگە لە خۆی و ئەو بیر و هزرانەی بڕوای پێ بوون، ئەویتری نەدەبینی وەك حەتمییەتی ئەو چارەنووسەی کەنەوەگەلێکی لەهەردوو گەل بەرەو هەڵدێری وەحشیگەری و دڵڕەقی رەش و تاریك وەکێش کرد دوور لە گیانی لێبوردەیی و دراوسێیەتی و خزمایەتی و مێژوو و مرۆڤایەتی.

گەلان، یاخود ئەو زۆرینانەی رێز لە خۆیان و مافیان دەگرن، وا دەخوازێ بە چاوی ئەو برا گەورەیەی چۆن بەمیهرەبانی و سۆز و چاودێرییەوە دەڕوانێتە برا بچووکەکانی، ئەوانیش ئاوەها تەماشایان بکەن، ئەوەش بەوە دێتەدی مافی نەتەوەیی و کلتوورییان پێ بدەن تا بتوانن بەئازادی و بەویستی خۆیان بیروڕایان دەربڕن و بە شێوەیەکی راستەقینە و چالاکانە لە گەشەسەندنی نەتەوەییدا بەشداری بکەن. کاتێکیش هەر دەوڵەتێك مافی نەتەوەیی بە کەمایەتییەك لە هاونیشتمانییەکانی دەدات، ئەوە هەرگیز بە مانای دابەشکردنی دەوڵەت

یان گەیاندنی خراپەیەك نییە بۆ مافی زۆرینەی وڵاتەکە یان خواردنی مافی ئەوانیتر، بەڵکو ئەمەیان ئەو چارەسەرە دیموکراتییەیە کە دەوڵەتانی سەردەم پێڕەوی دەکەن لە چوارچێوەی ئەو چەمکە سیاسییە نوێیەی بانگەشە دەکات هەموو هاونیشتمانییان- بەجیاوازی رەگەز و زمان و ئایینیان- مومارەسەی ئازادی خۆیان بکەن لە چوارچێوەی ئەو دامەزراوە دیموکراتییانەی بڕوای پتەو و چەسپاویان بە فرەیی نەتەوەیی و سیاسی و کلتووری هەیە لەیەك وڵات و لە روانگەی دەوڵەتی دایکی میهرەبان و بەبەزەیی و دادپەروەر بەرامبەر بە هەمووان لە رووی ماف و ئەرکەوە.. کە ئەویش پێچەوانەی روانینی دەوڵەتی باوکسالارییە لە چەمکی سیاسی نوێیدا کە ئەمەش دەوڵەتی ستەمکار و کەڵەگا و نادادپەروەرە.

جیهانی سەدەی بیست و یەکەمین بە پێی سیستمی نوێی جیهانی دوور لە هەر زوڵم و زۆرداری و داگیرکارییەك و لەچوارچێوەی ئەو هاوگونجانە سیاسییانەی کە بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو بە هەند وەردەگرێ- بە پێی تیۆری یۆنسکو کە جیاوازە لەگەڵ تێڕوانینی ئەمریکا بۆ سیستمی نێودەوڵەتی نوێ-، دەبێتە سەردەمی گەشەسەندنی دیموکراتی، لەمەودوا چیتر رێگە نادرێ بە دەوڵەتەکان بەتایبەتی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم گەل و نەتەوەکانیان یان ئەو کەمایەتییانەی لە ناویاندا دەژین ، بچەوسێننەوە. چونکە نەتەوە یەکگرتووەکان. بە گوتەی برنارد کوشنێر وەزیری پێشووی کاروباری مرۆڤایەتی فەرەنسا- لەبەر هۆی پێشێلکاری مافی مرۆڤ لە دەوڵەتانی پێوەندیدار، دەست بخاتە کاروباری ناوخۆی هەر دەوڵەتێك. بەڵکو ئەم پرەنسیپە زیاتر چەسپاو رەهەند گەلێکی نێو نەتەوەیی گرتەخۆ کاتێك حەوت دەوڵەتە پیشەسازییەکە لە کۆبوونەوەیاندا لە لەندەن لە ١٦ی تەمووزی ١٩٩١ بڕیاریان دا بەزەرورەتی دانانی کەسایەتییەکی نێو نەتەوەیی ناسراو بە یاریدەدەری ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی ببێتە بەرپرس لەمەڕ پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ و سەرکوتکردن و رووداوی کارەساتئامێز تا رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە رێگەی هێزی سەربازی نێودەوڵەتییەوە تا بتوانێ دەست تێوەردات بەئامانجی یارمەتیدانی لێقەوماوان و ستەملێکراوان.

بەڵام ئەم دەستێوەردانە لە دژی تورکیا جێ بەجێ ناکرێ، لەبەر دوو هۆ:

یەکەم/ تورکیا لە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمین کە دەبێتە دەوڵەتێکی ئەورووپی بە تەواوی ئەندامبوونی لە یەکێتی ئەورووپا، تەواوی مافە نەتەوەیی و پەرلەمانییەکان

بەکورد دەدات، یانیش یەکێتییەکی فیدراڵی لە نێوان هەردوو نەتەوەی تورك و کورد لەم مێژووەوە لە تورکیا دادەمەزرێت.

دووەم/ دیموکراتی لە تورکیا کامڵ دەبێت بە شێوەیەك هەڵدەکشێ بەرەو ئاستی دیموکراتی ئەوروپا. لێرەشەوە ئایندەی کورد لە تورکیا زامن و چانسیشی زیاتر دەبێت، نەخوازە ئەگەر کورد بتوانێت هێزە فشارێك دروست بکات تا ڕۆڵی خۆی لە دارشتنی داهاتووی دیموکراتی لە تورکیا بگێڕێت.. ئەو دیموکراتییەی کە لەمیانەی ئەم فاکتەرە ئایندەییانەدا چوارچێوە دەگرێ:

١- هەڵبژاردنە ناوچەییەکانی ساڵی ١٩٨٩ سەلماندیان نەچەپەکان تیادا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا نەبەرەی راست، بەڵکو دەرەنجامەکانی ئەو هەڵبژاردنانە لە دژی تورگۆت ئوزال بوون، هەرچەندە پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری لە تورکیا بەدەستهێنا.

٢- ئەگەر ئەردال ئینونۆ سەرۆکی پارتی سوشیالیستی میللی و بولەند ئەجەوید سەرۆکی پارتی دیموکراتی چەپ توانییان بەرەیەکی پێشکەوتووخواز یاخود پارتێکی سوشیالیستی بە دەست و برد پێکبێنن، ئەوا لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوو سەرکەوتوو دەبن بەڵام ناکۆکییە شەخسییەکانی نێوانیان رێگری لەوە دەکەن.

٣- ئەگەر تورگۆت ئوزال توانی هاوپەیمانییەك لەگەڵ دیمیراڵ سەرۆکی پارتی رێگای راست گرێ بدات، ئەوا پارتێکی راستڕۆی موحافیزکار پێکدێنن، دکارێت خولی داهاتووی هەڵبژاردنە نوێنەرایەتییەکان دەستەبەر بکات. بەڵام دیمیراڵ کە پێی وایە ئوزال خەیانەتی لە دۆستایەتییەکەی کردووە و دوای کوودەتاکەی ١٩٨٠ وازی لێهێنا، بگرە دەستیشی لەگەڵ ئەوانە تێکەڵ کرد کە کوودەتایان کردە سەری و گرتنیان، ئەمانە دەبنە رێگر لە پێش بە ئەنجامگەیاندنی ئەم رێککەوتنە.

٤- سوپای تورکی خاوەن هزر و پرەنسیپی بەرێباز عیلمانی بۆ دەستێوەردان لە کاروباری دەوڵەت دەست هەڵدەگرێ لەپێناو برەودان بە پرۆسێسی دیموکراتی عیلمانی لە سەر رێبازی رۆژئاوا. چونکە تورکیا دەبێتە دەوڵەتێکی ئەوروپی دیموکراتی هاوسەنگ و بەپێوەری ئەوروپییانە، ئیدی پێویست ناکات کوودەتای سەربازی بەرپا بکات لە پێناو گێڕانەوەی هاوسەنگی سیاسی بۆ وڵات.

٥- هاوبەندییە حیزبییەکان و حکوومەتانی کەمایەتی لاواز لە ماوەی دوو دەیەی داهاتوو بە حوکمڕان لە تورکیا دەمێننەوە تا ئەو دەمەی دامەزراوە دیموکراتییەکان لەم

وڵاته دەچەسپێن لەحاڵێکدا ئەگەر حیزبێکی سیاسی بەهێز دەرنەکەوێت، چونکه ئەگەر لەحاڵێکدا ئەمە رووبدات ژیانی حیزبایەتی له تورکیا بەرەو ئەو ئاقاره دەڕوات له دوو جەمسەری سەرەکی جێگیربێت به رێگەی دوو حیزبی بەهێز له دەسەڵات و له ئۆپۆزسیۆن و بەپێی چەشنی ئەوروپی له نێوانیان ئاڵ و گۆڕی دەسەڵات دەکەن.

دابڕانی چارەنووسی نێوان هەردوو گەلی تورك و کورد له پاش ساڵی ۱۹۹۱ بەرەو دوو چارەنووسی هاوتەریب گۆڕا، کاتێك حکوومەتی تورکیا ناچار بوو دان بنێت بەمومارەسەکردنی زمانی نەتەوەیی بۆ کوردی ئەم وڵاته و دەیەها هەزار بەندکراوی کوردی له گرتووخانەکانی حوکمی عورفی له ناوچه کوردنشینەکه بەردا و حوکمی لەسێدارەدانیشی له یاسای سزاکانی هەڵوەشاندەوە. بزوتنەوەی پارتی کرێکارانی کوردستانیش له لایەنی خۆیەوە داخوازییه نەتەوەییەکانی له (سەربەخۆییبوون)ەوە سووك کردەوە بەرەو دانپێنان بەبوونی نەتەوەیی و ئۆتۆنۆمی، بگره بۆ ئەنجامدانی راپرسیش له سەر ئەم داخوازییه رازی بوو ئەگەر زەرورەت ئەوە بخوازێ، تەنانەت عەبدوڵڵا ئوجالان سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانیش بانگهێشتی حکوومەتی تورکیای کرد بۆ دانوستان لەگەڵ بزوتنەوەکەی سەبارەت به هەمان مەسەله. جا ئایا ئەم دوو چارەنووسه هاوتەریبه کەی بۆیان دەلوێ له سەر زەمینەی دۆستایەتی و لێکحاڵیبوون به یەکتر بگەن؟!

ئێمه لەو بڕوایەداین، ئەمه زۆر نزیکه بەر له ساڵی ۲۰۱۰ دێتەدی، چونکه هەلومەرجی نێودەوڵەتی و پێگەی تورکیا و پەرەسەندنی دیموکراتی لەم وڵاتە، سەرەڕای ئارەزووی تورکیا بۆ بەئەندامبوونی له ناو ئەنجومەنی ئەوروپی، ئەمانه هەموو وا دەکەن خێراتر ئۆتۆنۆمی بۆ کورد له چوارچێوەی یەکێتی تورکیا دەستەبەر بێت. هەرچی مافی چارەی خۆنووسینی کوردیشه، ئەوه زەمەن خۆی دیاری دەکات.

وا دیاره رەوتی رووداوەکان له تورکیا رووه و بەدیهاتنی پێشبینییەکەی عەبدوڵڵا ئۆجالان لەمەڕ کێشەی کورد بەم سیناریۆیه، دەڕوات:

سوپاسالار له راپۆرتێکیدا بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا جەخت دەکاته سەر ئەوەی که سەرکردەکانی سوپا زۆر هەست به نیگەرانی دەکەن، چونکه شەڕ له دژی کورد هیچ دەرەنجامێکی ئەوتۆی وەدەست نەهێناوه. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیاش له لایەن خۆیەوه تاوتوێی بابەتەکه دەکات و پاشان دەینێرێته پەرلەمان و پەرلەمانیش چەند

دانیشتنێکی رووکەشی بۆ گرێ دەداو لە دواییدا بەیاننامەیەك دەردەکات، تیادا جەخت دەکاتە سەر بڕیاری مێژوویی خۆی بە دانپێنان بە هەندێك لە مافەکانی گەلی کورد.

بەڵام من پێم وایە کورد لە تورکیا بە هەموو مافەکانی خۆیان لە چوارچێوەی یەکێتی تورکیا شاد دەبن، چ بە دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانیان، یان بە رێگەی دامەزراندنی یەکێتییەکی فیدراڵی لە نێوان هەردوو نەتەوەی تورك و کورد وەکو فیدریالیزمی سویسری. بەمەش بەشداری لە پەرەپێدانی دیموکراتی لە تورکیا دەکەن بەرێگەی دامەزراوە دەستوورییەکانی وڵات و ئۆتۆنۆمییەکی نموونەیی بەدەست دێنن دەبێتە جێی سەرنجی هەموو کورد لە ناوچەکە و پاڵیش بە رژێمە دیکتاتۆرییەکان لە رۆژهەڵاتی ناوینەوە دەنێن دان بەمافی نەتەوەیی کورد بنێن لە ئۆتۆنۆمییەکی راستەقینەدا.. بەوەش هاوکاری دەکەن لەپەرەسەندن و تەکاندان بەبزووتنەوەی گەلی کورد بەگشتی بەرەو سەرکەوتنی زێدەتر لە پێناوی رزگاری و دیموکراتیدا.

## سەرچاوەکانی بەشی حەوتەم


١- محەمەد ئەمین زەکی: خلاصە تاریخ الکرد وکوردستان، ترجمە محمد علی عونی- بغداد ص٢، ١٩٦١,

٢- ئەولیا چەلەبی سیاحەتنامەسی ج٤ ئەستەموول ١٣١٤,

٣- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، بەرگی١، سلێمانی ١٩٦٠,

4- Hurriyer gazetesi, 27-6-1990

٥- بڕوانە زنجیرە وتارە رۆژانەکانی رۆژنامەی (العراق)ی بەغدا کەبەناونیشانی (الشخصیە الکردیە من خلال امپالها) ، بەتایبەت ئالقەی هەشتەم کەلە ١٩٩١/٥/١١ بلاوکراوەتەوە.

٦- محەمەد ئەمین زەکی، تاریخ السلیمانیە وأنحائها، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی محەمەد جەمیل رۆژبەیانی بەغدا ١٩٥١,

٧- احمد الخانی، مم وزین، ترجمە محمد سعید رمچان البوگی، دار العلم للملایین، بیروت ١٩٨٥,

8- Hurriyer gazetesi, 10-5-1990

9- Hurriyer gazetesi, 27-6-1990

10- Milliyet gazetesi, 29-6-1990

11- Tercuman gazetesi, 29-6-1990

12- Gunes gazetesi, 29-6-1990

13- Hurriyer gazetesi, 30-6-1990

١٤- چەند بەشێك لەکتێبی (الاسلام والدولە) نووسەری بەریتانی ئیدوارد مورتیمر، رۆژنامەی (الوگن)ی کوێتی، ژمارەی رۆژی ١٠ی نیسانی ١٩٨٤,

15- Husnu Aktas: Medeni Vahset, 4. Baski, Ankara 1982

١٦- گۆڤاری (الافق) ژمارە ١٣٦ رۆژی ١٩ی شوباتی ١٩٨٧ دەرچووە.

١٧- رۆژنامەی (الرأی العام)ی کوێتی رۆژی ١٩٨٦/٣/٥ دەرچووە.

١٨- رۆژنامەی (الوگن)ی کوێتی رۆژی ١٩٨٧/١/٣١ دەرچووە.

19- Hurriyet gazetesi, 17-3-1991

20- Hurriyet gazetesi, 24-4-1990

21- Hurriyet gazetesi, 7-4-1989

٢٢- رۆژنامەی (الٲهالی) قاهیرە ١٩٨٥/٥/٢٩ دەرچووە.

٢٣- گۆڤاری (الوگن العربی) ژمارە ١٧٧ لە ١٩٨٦/٧/١٤ دەرچووە.

25- Hurriyet gazetesi, 25-4-1990

٢٦- گۆڤاری (الدستور) ژمارەی رۆژی ١٩٨٠,/٩/٢٩

٢٧- گۆڤاری (أخر ساعە) قاهیرە ژمارەی رۆژی ١٩٨٩,/٤/٥

28- Hurriyet gazetesi, 24-7-1990

٢٩- گۆڤاری (الاسبوع العربی) ژمارەی رۆژی ١٩٨٣/٩/٥.

٣٠- گۆڤاری (الدستور) ژمارەی رۆژی ١٩٨٣,/٩/٥

31- Milliyer gazetesi, 19-5-1984

٣٢- گۆڤاری (الصیاد)ی لوبنانی، ژمارەی رۆژی ١٩٨٤,/١١/٢٨

33- Hurriyet gazetesi, 19-7-1989

34- Hurriyet gazetesi, 2-5-1990

35- Nokta Dergisi, Yil 7, Sayi 50 17-12-1989

٣٦- د. ئیبراهیم داقوقی، الصحافە فی ترکیا، توێژینەوەیەکە لەکتێبی (ترکیا المعاصرە) بڵاوکراوەتەوە لەلایەن، سەنتەری لێکۆڵینەوەی تورکی، زانکۆی موسڵ، ١٩٨٧,

٣٧- رۆژنامەی (الأنباو الکویتیە) ژمارەی رۆژی ١٩٨٤,/٨/٢٨

38- Aziz Nasim: Bulgaristanda Turkler Turkiyede Kurtler, Istanbul, 1989

39- Abdi ipekci: Liderier diyor ki, yayinlari 28, Istanbul

40- Cumhuryet gasetesi, 22-4-1985

٤١- رۆژنامەی (القبس)ی کوێتی ژمارەی رۆژی ١٩٨٦,/٧/١٤

42- Ismail Cem: Gacis donemi Turkiyesi Istanbul 1989

43- 2000e dugru dergisi sayi 44, 29-10-1989

٤٤- رۆژنامەی (النداو)ی لوبنانی، ژمارەی رۆژی ١٩٨٥,/٤/١٩

45- Hurriyet gazetesi, 21-12-1989

46- Cumhuriyet Gazetesi, 27-12-1986

47- Hurriyet gazetesi, 26-4-1990

48- Hurriyet gazetesi, 30-4-1990

49- Hurriyet gazetesi, 15-5-1990

50- Hurriyet gazetesi, 23-5-1990

51- Hurriyet gazetesi, 5-5-1990

52- Tan gasecesi 2-5-1990

٥٣- گۆڤاری (الدستور) ژمارەی رۆژی ١٩٨١/٧/٢٢.

٥٤- رۆژنامەی (الأنباو)ی کوێتی، ژمارەی رۆژی ١٩٨٥,/٧/٣٠

٥٥- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد (کردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی) بەغدا ١٩٧٥ بەکوردی.

56- Tercuman gasetesi, 7-4-1989

57- Hurriyet gazetesi, 19-7-1990

58- Hurriyet gazetesi, 6-6-1990

59- Tempo dergisi, sayi, yil 2, 29-6-1990

60- Hurriyet gazetesi, 29- 6-1990

61- Hurriyet gazetesi, 26-5-199.

ساڵی ١٩٩٣ خاڵی وەرچەرخان بوو لـە مێـژووی کـوردی تورکیـا، ئـەوەبوو خوالێخۆشـبوو (تورگۆت ئوزال) سەرۆك کۆماری تورکیای ئەو دەمـە بیرۆکـەی فیـدرالیزمی تـورك — کـوردی خستە بەر باس و گفتوگۆ، کە ئەمیشیان، بیرۆکەی کۆمـاری دووەمـی لێکەوتـەوە کەبانگەشـە دەکات بۆ زەروورەتی چاوخشاندنەوە بەو هزرە کەمالیزمییانـەی کـۆن بـوون و زیـاتر لـە (٧٠) ساڵیان بەسەردا تێپەڕی بۆ ئەوەی پەرەیان پێبدرێ و ڕێگاش خۆش بکرێ لە پێش بەرزکردنـەوەی ئاستی دیموکراتی و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و دانپێنان بە پێناسەی کەمە نەتەوەییەکانی تورکیـا بۆ دەوڵەمەندکردنی کلتووری ژیاری و بواردان بەدەربڕینی رای ئەویتر(١).

عەبدوڵڵا ئۆجەلان سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانیش لە سۆنگەی ئەمەدا، یەکلایەنە ئاگربەستی ڕاگەیاند وەك چاوەڕوانییەك بۆ دەرەنجامەکانی باس و لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلەی فیدریالیزمی واتا سیاسییەکەی (کۆماری دووەم)ە، بە ئامانجی ڕۆشنبوونەوەی ڕایەکی گشـتی تورکیایی پشتگیری بکات لە دانپێنان بە مافی کلتووری و پەرلەمانی کـورد لـە چوارچـێوەی یەکێـی وڵاتی تورکیا، ئەمە ئەو بانگەشەیە بوو ڕووناکبیرانی تورك لە ڕوانگەی پشـتگیرییان لە بیرۆکەی دامەزراندنی کۆماری دووەم، لەو ساڵەدا سەرکردایەتییان کرد(٢).

جگە لەوەش ساڵی ١٩٩٣. ساڵی تیرۆری سیاسی بوو لە تورکیـا. بـە نموونـە: ڕۆمـاننوس و ڕۆژنامەڤانی کورد مووسا عەنتەر بە ڕۆژی نیوەڕۆ تیرۆرکـرا، (٨) کـوردی دیکـەش لـە گـەورە پیاوانی کار لە تورکیا تیرۆرکران تائەوانیش بچـنە پـاڵ ئـەو زنجـیرە تیرۆرکردنانـەی لـە تورکیـا بەتیرۆرکردنی (ئەشراف بدلیس) سەرکردەی هێزەکانی جەندرمە دەستپێکرد. کوشتنی ئەشـراف بەهۆی تێکدانی کۆپتەرەکەیەوە ڕوویدا. ناوبراو بەرەو کۆبوونەوەیەکی گرنگ دەچوو سەبارەت بـە کێشەی کورد کە لە ڕۆژی ١٧ی شوباتی ساڵی ١٩٩٣ لە شاری دیاربـەکر- پایتـەختی ناوچـەی کورد لە تورکیا- بەسترا، ئەوەبوو کۆپتەرەکەی لە نزیك ئەنکەرەی پایتـەخت کەوتـە خـوارەوە.. بەبێ ئەوە لێکۆڵینەوەکان لە بارەی ڕووداوەکەوە هیچ دەرەنجامێکی ڕوونیان لێبکەوێتەوە (٣).

هەر لەو سەروبەندەشدا، ڕێکخراوی حیزبوڵڵای تورکی سەری هەڵدا، ئـەم حیزبـە خـەباتی خۆی بە شەڕی دژ بە ڕێکخراوی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناوچەی باشـووری ڕۆژهـەڵاتی تورکیا دەستپێکرد، بـە شـێوەیەکی وا دەکـرێ بڵـێین وەك دژە شـۆڕش بەرامبـەر بـە پـارتی کرێکارانی کوردستان کاری دەکرد، بەڵکو گەلێ جاریش شان بەشانی هێزەکانی جەندرمـە لـە

ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکاندا لە دژی PKK و چالاکییەکانی لە ناوچەکە بەشداربوو. لێرەشەوە ژمارەیەك لە شرۆڤەکارانی سیاسی وای بۆچوون بڵـێن: (ڕێکخـراوی حیزبـوڵڵای تـورکی لـەو کۆمەڵە چەکدارە ئیسلامییانەوە دامەزرا کە لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا چالاکییان دەنواند. ئەم ڕێکخراوە بە سەرپەرشـتی و ڕێنمـایی (ئەحمـەد جـەم ئەرسـۆمەر) بەڕێوەبـەری دەزگای هەواڵگری سەر بـە هێزەکـانی جەندرمـە (کەئەمیشـیان لەسـاڵی ١٩٩٤ تیرۆرکـرا) چالاکییەکانی لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان جێ بـەجێ دەکـرد. بـەڵام (حیزبـوڵڵا) لـە ساڵی ١٩٩٠ پاش ئەوەی دەستیکرد بە مەشقپێکردنی کادیرەکانی، بووە هێزێکی چەکداری وا گەمەی پێ نەدەکرا، بۆیە بانگەشەی بۆ دامەزراندنی (کۆماری ئیسلامی لەتورکیا) دەکرد. لە سـۆنگەی ئەمــەدا هێزەکـانی تورکیـا لـە پـاش سـاڵی ١٩٩٥ زۆر بەتونـدی هەوڵیانـدا بـۆ قەڵاچۆکردنی و گرتنی کادیرە چالاکەکانی بەو سیفەتەی ڕێکخراوێکی ئیسلامی ئوسـوولییە، مەترسی پێکدێنێ بۆ سەر سیستمی عیلمانی دیموکراتی لەتورکیا و هەوڵیش دەدات بەشێك لە تورکیا دابڕێت بە ئامانجی دامەزراندنی ئەو سیستمەی لە پێناویدا تێدەکۆشێت)(٤).

بەڵام دکتۆر (ماهیر قایناق) بەڕێوەبەری پێشووی (Mit) تورکیایی لـە چـاوپێکەوتنێکدا لەگەڵی سازدرا لە پاش کوشتنی (حوسێن وەلی ئۆغلـو)ی ڕێبـەری ڕێکخـراوی حیزبـوڵڵا لـە ئەستەمووڵ لە ١٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠ جەختی لەوە کردەوە کە: (دەوڵەت ئەگەر خۆی حیزبولڵای دروست نەکردبێ، ئـەوا لێـی گـەڕاوە هـەردوو هێـزە گەورەکـە لـە ناوچـەی ڕۆژهەڵاتی تورکیا، واتە: پارتی کرێکارانی کوردستان و ڕێکخراوی حیزبولڵای تورکی لە یەکتر بدەن، بەپێی نۆرمی (لێگەڕێ سەگگەل یەکتری بخۆن). لێرەشەوە من پێم وانییـە پێوەندییـەك لەنێوان ئەو تیرۆرکردنە سیاسـییە بکـەرە نەناسـراوانە لـە تورکیـا- بەتایبـەت لـە ناوچـەی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ- کە لە ساڵی ١٩٩٠ نزیکـەی ٧٠٠٠ قوربـانی لێکەوتـەوە و لـە نێـوان حیزبولڵا هەبێت، چونکە ئەو کردەوانە چەند ڕێکخراوێکی تر پێوەندییان بـە بیانییـەوە هەیـە (یاخود ئەوەی پێ دەڵێین دەوڵەتی شاراوە) ئەنجامیانداوە، چونکە دەوڵەت ویستی ڕێکخراوەکە (حیزبولڵای تورك) لە ناو ببات کە خۆیشی دروسـتی کردبـوو بـۆ بەگژداچـوونی PKK دوای ئەوەی بـووە مەترسـی بەسـەر دەوڵـەت و ئـەمن و ئاسـایش لـەوڵات، نـەخوازە ڕۆژنامـەی (حوڕییەت) لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠ تاکیـدی کـردەوە کـە: ئـەو دوو کـادیرە گەورەیەی حیزبولڵا کە لەگـەڵ ڕێبـەرە کوژراوەکـەی ڕێکخراوەکـە دەسـتگیر کـران تائێسـتا شتێکیان لە بارەی ئەم بابەتەوە نەدرکاندووە، هەرچەندە ژەنراڵ (تیومـان کرمـان) سـەرکردەی

هێزەکانی دەریایی لە رۆژی خانەنشینکردنی لە بەرواری (١٩٩٨/٨/٣) تاکیدی کرد کە حیزبوڵڵا هاوکاری لەگەڵ جەندرمە کردووە لە شەڕی دژ بە (PKK)(٥).

لە لایەکی ترەوە، شرۆڤەکاری سیاسی حەسەن جەمال ئاماژەی دا کە: (دەوڵەتی نهێنی شوێنەواری خوێنی قوربانییەکانی حیزبوڵڵا دەسڕێتەوە کەخۆی (واتە دەوڵەت) ئەو حیزبەی لە ساڵی ١٩٩٠ لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دروست کرد بۆ بەگژداچوونی PKK و چەندین کردەوەی کوشتنی ئەنجامدا لە پارێزگای باتمان و دەوڵەت چاوپۆشی کرد لە کردەوەکانی لە دژی PKK لەو ناوچەیە)(٦).

جا، ئایا ئەم دەوڵەتە نهێنییە چییە کەوا خۆی رێکخراو گەلی نهێنی و ئاشکرا لە تورکیا دادەمەزرێنێ لە دژی یەکتر و لەپاشان لەناویان دەبات، بۆ ئەوەی شوێنەواری تاوانەکانی (واتە: تاوانەکانی دەوڵەتی نهێنی) لە تورکیا، بسڕێتەوە؟!

زۆربەی چاودێرانی سیاسی پێیان وایە، تۆوی ئەم دەوڵەتە نهێنییە لە تورکیا لە ناو وەزارەتی ناوخۆ بوونی هەبوو، ئەو دەمەی رێکخراوی پەیمانی ئەتڵەسی لە ساڵی (١٩٥٠)وە رێکخراوەکانی گلادیو (Gladeo)ی سەر بە دەزگای هەواڵگری ئەمریکا (CIA) دامەزراند لە وڵاتەکانی ژێر چەتری پەیمانی ناتۆ بە ئامانجی بەربەرەکانیکردنی کۆمۆنیستی لەو وڵاتانە لە سەروبەندی شەڕی ساردی نێوان هەردوو جەمسەری سۆشیالیستی و سەرمایەداریدا. لێرەدا بولەند ئەجەوید رێبەری حیزبی گەلی کۆماری کە لە ساڵی ١٩٧٤ بووە سەرۆك وەزیرانی تورکیا ئاماژەی بە بوونی هۆبەیەك لە ناوەندی هەواڵگری ئەمریکا کرد لە ناو فێرگەی مەشقی سەربازی ئەو دەمە بە پێی پرۆتۆکۆلێکی ئەمنی نێوان تورکیا و ئەمریکا کە لە پەنجاکانەوە مۆریانکرد.

ئەگەرچی، شاری ئەستەموولی پایتەختی رۆشنبیری و میدیایی و بازرگانی تورکیا، بووە بەهەشتی هەواڵگرییە ئایدیۆلۆژیا زاڵبووەکان لەو ناوچەیەی کە لەگەڵ یەکتر هاوکاری و هەماهەنگی دەکەن، وەك: (Mit)ی تورکی و (CIA)ی ئەمریکی و (مۆساد)ی ئیسرائیلی و (ساڤاك) لە سەردەمی شادا، یان ئەمیان لە دژی ئەویتر شەڕی دەروونی دەکەن و تیرۆری بێبەزەییانە لە دژی دوژمنانیان ئەنجام دەدەن، ئەوا ئەو پێکهاتە هەواڵگرییەی کە هاوکاری یەکتر دەکەن و بەناوەندە کاریگەرییەکانی هێزەوە لە تورکیا هاوبەندن (واتە: بە هێزە چەکدارەکان و رێکخراوە نەژادپەرستە شۆڤێنیستییەکانەوە) بۆ پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری رژێم لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە بۆ بەگژداچوونی هەموو بزوتنەوەیەکی توندڕۆ یان چەپ یان ئیسلامی و پێیان وایە مەترسییان هەیە بۆ سەر رژێم، بە کۆڵەگەکانی ئەو دەوڵەتە نهێنییە

دەژمێردرێ لە تورکیا کە پسپۆری هەواڵگری ماهیر قایناق و شرۆڤەکاری سیاسی حەسەن جەمال و ئەوانیتر دەربارەی قسەیان کرد. لێرەشەوە کێشەی کورد لەتورکیا، یەکەم بەستراوە بە ئاسایشی نەتەوەیی سیستمی عیلمانی تورکیا و دووەمیش بەستراوە بە بەرژەوەندییەکانی ئایدۆلۆژیا زاڵبووەکان لەناوچەکەدا. ئەمە وایکردووە دەرهاویشتەی سیاسی و ئەمنی بخولقێت و کۆمەڵەکانی تاوانی بەردەوام (مافیا) لە هەموو لایەنەکانی ژیان لە تورکیا گەشە بکات پاش ئەوەی رووداوی (سوسورلك) لە ٣١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٦ دەریخست پیاوانی سیاسی و ئاسایش لەگەڵ کۆمەڵانی (مافیا) لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات- وەك ئەوە لە ئیتاڵیا رووی دا- لە بوارەکانی بازرگانیکردن بە مادده هۆشبەرەکان و چەك و کۆیلەی سپی و تیرۆرکردنی بکەری نەناسراو و پەرەپێدان بەکاری سیخوڕی و تیرۆر و زەوتکردن و دەستدرێژیکردنە سەر ناموس، لەسەر هەردوو ئاستی نێوخۆیی و نێو دەوڵەتی، هاوکاری دەکەن.

هەرچەندە ناوەندە رەسمی و سەربازییەکانی تورکیا لە دوای گرتنی (ئۆجالان) سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان، خۆی و پارتەکەی(٨) بە تۆمەتی بازرگانیکردن بە مادده سڕکەرەکان و تیرۆرکردنی بکەری نەناسراو و جوداخوازی بە رێگەی هەوڵی دامەزراندنی کۆمارێکی کۆمۆنیستی لە تورکیا تۆمەتبار دەکەن، وەلێ زۆربەی شرۆڤەکارانی سیاسی جەخت دەکەنەوە کە: (ئەم تۆمەتانە تەنها و تەنها هەوڵدانە بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو فەزیحەتە دارایی و دزین و بەرتیلانەی کە ئەو ناوەندانە موماڕەسەیان دەکەن)(٩)، نەخوازە پاش ئەوەی رۆژنامەکانی تورکیا هەواڵیان بڵاوکردەوە لە بارەی دەستگیرکردنی گەورە ئەفسەرێك لە هێزە چەکدارەکان دەستی هەبووە لە بەرتیل وەرگرتن بۆ گرێدانی چەند بۆندێکی کڕینی چەك لە دەوڵەتەکانی ئەوروپای رۆژهەڵاتەوە.

لێرەدا، ئەم پرسیارە ماقوولە لە مێشکماندا خۆی هەڵدەقورتێنێ: ئایا بیرۆکەی دامەزراندنی کۆماری کوردی ماویزمی- ئاماژەیە بۆ ماوتسی تۆنگ- لە سای ئەم بارودۆخە ئاڵۆزە ناوخۆییانەی تورکیا و ئەو گۆڕانە سیاسییە نێودەوڵەتییانەی رۆژهەڵاتی ناوین.. چۆن لە مێشکی ئۆجالاندا چەکەرەی کرد؟ و ئایا ئاییندەی کێشەی کورد لە تورکیا چییە؟ ئێمە، وەڵامی ئەم دوو پرسیارە لە میانەی ئەم سێ باسەی لای خوارەوە دەدەینەوە:

## باسی یەکەم

## کۆماری کوردی لەنێوان خەون و واقعیدا

ئەو کوردانەی لەسێگۆشەی سنووریی هەڵکەوتەی نێوان تورکیا و عێراق و ئێران نیشتەجێن، لە هەزارەی یەکەمی بەر لە زایینەوە، -واتە: دوو هەزار ساڵ بەر لەوەی تورکەکان وڵاتی ئەنادۆڵ داگیر بکەن و بیکەن بە نیشتمانی خۆیان- تێکۆشاون بۆ دامەزراندنی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەیی خۆیان لەو سێگۆشەیەی کە بنکەکەی دەکەوێتە لای سەروو بۆ ئەوەی لایەکەی لە تونجلی (دەرسیمی پێشووە)وە بە لای خۆرئاوا درێژ بێتەوە بەرەو ناوچەی (لاچین) لە ئەرمینیا بەلای خۆرهەڵات و لێرەشەوە لایەکەی سێگۆشەی خۆرئاوا لە (تۆنجلی)یەوە شۆڕدەبێتەوە بەرەو ئازیغ (عەزیز) و دیاربەکر و ماردین و زاخۆ و ئامێدی و ئەنجا هەولێر و سلێمانی و پارێزگای کەرکووك و کەلار و خانەقین بۆ ئەوەی سەری سێگۆشەکە لە سەر شاری (کووت)ی عێراق کۆتایی بێت. کەچی لایەکەی سێگۆشەکەی خۆرهەڵات لە (لاچین)ەوە بەرەو (یەریڤان)ی پایتەختی ئەرمینیا شۆڕدەبێتەوە لێرەشەوە بەرەو قەرەباغ لەکۆماری ئازەربایجان شۆڕدەبێتەوە، پاشان بەرەو مەهاباد و سنە و کرماشان بۆ ئەوەی لەگەڵ لایەکەی خۆرئاوا یەك بگرێتەوە. لێرەشدا، نەخشەی کوردستانی گەورە لەگەڵێك رووەوە لەنەخشەی ئەفەریقیا دەچێت[١٦] بەڵام بوون و هەڵکەوتەی کورد لە ناوچە ململانێیەکانی دەوڵەتانی گەورە و ئیمپراتۆرییەتەکانی میدی و ئاشووری و حیپیەکان لە لایەك و ململانێ و بگرە و بەردەی

---

١٦- مامۆستا هەژار موکریانی لەشەرەفنامە بابەتی بەرایی لێدوانێ بەدانستە، (تازەترین بیرورا دەربارەی کورد و کوردستان)، پوختەی سنووری کوردستان بەم شێوەیە دیاری دەکات:

لەشیمالەوە: کۆماری ئەرمەنستانی بەردەستی رووس.

لەرۆژهەڵاتەوە: ئازەربایجانی ئێران و عێراقی عەجەم و مەڵبەندی فارس.

لەجەنووبەوە: خۆزستانی ئێران و عێراقی عەرەب و چۆڵی شام (لیوای دێرزۆر).(وەرگێڕ)

لەخۆرنشینەوە: چۆمی فورات و بڕێك لەویلایەتی شەرقی ئەنادۆڵ.

لاپەڕە- نەوەد و هەشت- شەرەفنامە. (وەرگێر)

خێڵ و هۆزە کوردییەکان لە لایەکی ترەوە، بوونە ڕێگر لە پێش دامەزراندنی قەبارەی سەربەخۆی نەتەوەیی گەلی کورد. بۆیە جارێك ملکەچی دەسەڵاتی ئامۆزاکانی خۆیان بوون لەو ئیمپراتۆرییەتە پان و بەرینەی ڕۆژهەڵاتی ناوینی گرتبۆوە و جارێك ملکەچی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری بوون لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکە و جارێکیش لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکاری ئیمپراتۆرییەتی حیسییەکان بوون لە وڵاتی ئەنادۆڵ و هەندێ جاری دیکەش لە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتییەکان بوون(١٠).

وێڕای ئەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی کورد کە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەرپایان کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لە دەستدرێژی داگیرکەران یان لە پێناو پاراستنی قەوارەیان، یاخود پاراستنی سەربەخۆیی میرنشینەکانیان، وەلێ ململانێی نێوان ئێرانی و عوسمانییەکان بۆ دەستبەسەراگرتنی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە ڕێگەی بگرەو بەردەی نێوان شا ئیسماعیل سەفەوی شای ئێران و سوڵتان سەلیمی سێیەم سوڵتانی عوسمانی لە سەدەی شانزدەهەم، وایکرد کورد ببن بە دوو بەشەوە، پاشان شەڕی جیهانی یەکەم هەڵایسا بۆ ئەوە هەمیسان وڵاتی کوردان بکات بە چوار لەتەوە، سەرەڕای بوونی چەند شوێنێکی کوردنشین لەهەردوو کۆمارە سەربەخۆییەکەی ئەرمینیا و ئازەربایجان.

کێشەی هاوچەرخی گەلی کورد دەگەڕێتەوە بۆ سەروبەندی شەڕی جیهانی یەکەم دوای بەرپابوونی شۆڕشی مەزنی ئوکتۆبەری سوشیالیستی لەساڵی ١٩١٧ و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بۆ دەوڵەتۆکە نەتەوەییە تورکی و عەرەبی و ئەرمەنییەکان لە پاش ساڵی ١٩١٨، لێرەدا کوردیش چاویان بڕیبووە دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان چ لە جیهانی سوشیالیستی یان لە جیهانی سەرمایەداری، بە تایبەت لە دوای جاڕدانی پرەنسیپەکانی سەرۆکی ئەمریکا ویلسون کە جەختیان کردۆتە سەر مافی گەلانی ژێر دەستە لە بارەی بڕیاری چارەنووسیان)، ئەوەبوو شاندێکی کوردی لە وتووێژەکانی ئاشتی لە پاریس ساڵی ١٩١٩ بەشداربوو. ئەوسا، دەقی مادە (٦٢) لە پەیمانی سیڤەر تاکیدی کردە سەر: (دانانی لیژنەیەکی نێودەوڵەتی بە چاودێری کۆمەڵەی گەلان حوکمی زاتی (ئۆتۆنۆمی) بۆ کوردستان دیاری دەکات لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا و ئەو شوێنەی کە لە نێوان ڕۆژهەڵاتی چۆمی فوراتدایە تا سنوورەکانی تورکیا لەگەڵ ئێران). بەڵام مستەفا کەمال پاشا ڕێبەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی میللی ئەم پەیمانەی ڕەتکردەوە کەوا جەخت دەکاتە سەر دابەشکردنی وڵاتی ئەنادۆڵ بۆ چەند دەوڵەتۆکەیەك و بەستنەوەی خاکیان بە ئەرمینیا و ئەو وڵاتە عەرەبییانەی تازە سەربەخۆییان وەرگرتبوو(١١). بۆیە مستەفا کەمال لەگەڵ سەرکردەکانی

کورد لە ناوچەکە گەیشتە ڕێککەوتنێك کە بە گوێرەی کورد هاوکاری لەگەڵدا دەکەن بۆ دەرکردنی ئەو هێزە فەرەنسی و یۆنانییانەی ڕۆژئاوای وڵاتی ئەنەدۆڵیان داگیرکردووە، لە بەرامبەر ئەم هاوکاریکردنەش کورد لە دەسەڵاتدا لەگەڵ تورکەکان بەشداری دەکەن(١٢). ئەمە ئەو مەسەلەیە بوو مستەفا کەمال لەچاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ ڕۆژنامەنووس ئەحمەد ئەمین یالمان لە پاش ڕزگارکردنی شاری ئەزمیر لە چنگی یۆنانییەکان لە ساڵی **١٩٢٣**، تاکیدی لە سەر کرد کاتێك گوتی: (هاونیشتمانییانی کورد لە وڵات و لە دەسەڵاتدا هاوبەشمانن، بەو تەرحەش ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیا (پەرلەمان) لەوان (واتە لەکورد) و تورك پێکدێت)(١٣). بەڵام پەیمانی لۆزان لە ساڵی **١٩٢٣** کاتێك دانی بەو سنوورە نێودەوڵەتییە نا کە ئیمڕۆ تورکیا هەیەتی، هیچ دەقێکی لە بارەی کوردەوە تیا نەبوو، ئەگەرچی جەختی کردە سەر: (بەتەنگەوە هاتنی تورکیا بەرامبەر بە مافی کلتووری و ئایینی کەمایەتییەکانی ناو دەوڵەتی تورکیا)، ئەمە وایکرد ئەو کەمایەتییە بە مانا ئاینییەکەیان لێکبدرێنەوە، وەك ئەو جوولەکە و نەسرانی و ئەرمەنییانەی کە قوتابخانە و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی خۆیان بۆ دەستەبەرکرا. کەچی کوردیان بە (تورکی شاخاوی؟) لەقەڵەمدا وەك پاشگەزبوونەوەیەك لەدانپێنان بە مافی کلتووری و پێناسە نەتەوەییەکەیان.

کێشەی مووسڵ کە پەیمانی لۆزان دەڵێت ئینگلیز و مستەفا کەمال ئەتاتۆرك وتوێژی لە بارەوە دەکەن بۆ ئەوەی بە ڕەزامەندی دانیشتوانەکەی، بڕیار لە سەر چارەنووسی بدرێ، لە ساڵی **١٩٢٥** هەلێکی زێڕینی بۆ کورد ڕەخساند کاتێك ئینگلیزەکان بڕیاریاندا دەوڵەتی کوردستان لەباکووری عێراق دابمەزرێ و سلێمانی بکرێت بەپایتەختی و شێخ مەحموودیش بە مەلیکی دەوڵەتەکە، ئەمەش وەنەبێ لەبەر خۆشەویستی کورد بووبێت، بەڵکو ئینگلیز لەمەدا گەلێك ئامانجی هەبوو: ئاماژەیەك بەکورد بدات کەوا بەڵێنی خۆی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ کورد بەجێ گەیاندووە لە بەرامبەر هاوکاریکردنیان لەگەڵی دژی دەوڵەتی عوسمانی و فشاریش بخاتە سەر شا فەیسەڵی یەکەم بۆ ئەوە مەرجەکانی لەو پەیمانەی پێشنیار کراوە لە نێوان خۆی و دەوڵەتی عێراقی تازە دامەزراو قەبووڵ بکات، هەروا پەیامێکیش بگەیەنێت بە مستەفا کەمال تێیدا بڵێ کورد سوورن لە سەر دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لە وڵاتی خۆیان (کوردستانی گەورە) کە بەشێکیش لە کۆماری تورکیا دەگرێتەخۆ ئەگەر بێت و تورکیا دەست لە ویلایەتی مووسڵی عوسمانی هەڵنەگرێ بۆ ئەوە بلکێنرێت بە عێراقەوە، پاش ئەوەی بیرە نەوتییە دەوڵەمەندەکانی تیا دۆزییەوە. ڕاپرسی لە هەموو ویلایەتی مووسڵ بەخێرایی ئەنجامدراو دەرەنجام، عەرەب و

کورد و تورکمان و ئاشووری له بەرژەوەندی چوونه پاڵی مەملەکەتی عێراق دەنگیانـدا، بەمـەش پێویستی نەدەکرد حکوومەتی کوردستانی عێراق بوونی هەبێت.

له سەروبەندی شەڕی یەکەمی جیهانی، کاتێك ڕۆژڤڵت سـەرۆکی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا پرەنسیپەکانی له مەڕ مافی بڕیاری چارەنووسـی گـەلان جـاڕدا و لـە هـەمان کـاتیش (لینین) ڕێبەری یەکێتی سـۆڤێت تاکیـدی لەسـەر پرەنسـیپی مـافی چارەنووسـی گـەلان کـرد، کۆمەڵێك له ڕووناکبیرانی کورد پێگە و ڕەوشە سیاسییەکەی خۆیان تاوتوێ کرد له ناو یەکـەمین دەوڵەتی سوشیالیستی لەجیهان و هەموو ئەو ڕووناکبیرە کوردانە کۆك بوون له سـەر زەرووڕەتـی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی خاوەن ئۆتۆنۆمی له ناو کۆماری ئازەربایجانی سۆڤێتی. لێـرەدا، ئا. بوکشابان دەڵێت: (کوردەکان به سەرۆکایەتی گـۆئی حـاجییێف لـە ٧ی ئایـاری سـاڵی ئـەو ١٩٢٣ داواکارییەیان دایه ئەنجومەنی باڵای سـۆڤییێت تیـادا بـە ڕەزامەنـدی (لیـنین) سـەرۆکی یەکێتی سۆڤێت داوایانکرد مافی دامەزراندنی کۆماری کوردستانی سووری خاوەن ئۆتۆنۆمی بـە کورد بدرێ، ئەم کۆمـارە کوردییـە سـاوایە چـوار ناوچـەی کوردنشـینی گرتـەخۆ: کولبیجـار، کۆبالیسکی و بەشێك له ناوچەی جبراییل و لاچین و بەکۆماری لاچینیش ناوی هاتووە(١٤).

لەبەرئەوەی کۆماری ئازەربایجان لەساڵی ١٩٢٩ دووبارە سنوورەکانی خـۆی داڕشـتەوە بـە شێوەیەك (کۆمـاری کوردسـتانی سـوور)یش بگرێتـەوە، ئەمـە کاردانـەوەی تونـدی بـە لای کوردەکانی سۆڤێتەوە دروستکرد و (گۆئی حاجییێف)ی سەرۆکی (کوردستانی سـوور)ی خـاوەن ئۆتۆنۆمی له بەرامبەر ئەو ڕێکارە- که مانای وابوو کۆمـارە کوردییەکـە هەڵدەوەشـێتەوە و دەخرێتە سەر خاکی ئازەربایجان- ناڕەزایی خۆی گەیاندە باکۆ و مۆسـکۆ. بـەڵام مۆسـکۆ بـە (حاجییێف)ی ڕاگەیاند که چیتر پێویست به بوونی ئەم کۆمارە ناکات چونکه ئازەربایجان وەکـو کۆمارێك گەڕایەوە ژێر چـەتری یـەکێتی سـۆڤییێت پـاش ئـەوەی لـە سـاڵی ١٩٢٦ هەوڵیـدا سەربەخۆیی له یەکێتی سۆڤێت جاڕ بدات)(١٥).

کوردی عێراق- لەپاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق- لـەڕووی هۆشـیارییەوە لـە کـوردی ئێران و تورکیا پێشـکەوتووتر بـوون، هەرچـەندە ئـەوانیش وەکـو براکانیـان لـەو دوو وڵاتـە دراوسێیەی عێراق، زیاتر پابەندبوون به ڕێبـەرانی ئـایینی و بـەها خێڵەکییەکانیانـەوە بۆیـە دەبینین مستەفا بارزانی- کەسێك لەرابەرانی ئایینی و سەرۆکی عەشیرەتی بـارزان- لەسـاڵی ١٩٣٧ ڕاپەڕینێکی بەرپاکرد لەدژی ئەو باجە قورسانەی که حکوومەتی عێراق سـەپاندبوونی به سەر جووتیارانی کورد، له پاشان ئەم ڕاپەڕینە پەرەی سەند و بووە شۆڕشـێکی گـەورە لـە

پێناو مافی کلتووری و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردی عێراق. شۆڕشی بارزان کە دواجار بووە شەڕی پارتیزانی لە باکووری عێراق تاوەکو ئاخر و ئۆخری شەڕی جیهانی دووەم درێژەی کێشا و لێرەشدا، واتە: لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥ بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتانی هاوپەیمان وای دەخواست ئەو شۆڕشە دامرکێت، بۆیە مستەفا بارزانی و کۆمەڵێکی زۆر لە پێشمەرگەکانی پەڕینەوە بۆ کوردستانی ئێران و لە ساڵی ١٩٤٦ بووە فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی کۆماری کوردستان لە مەهابادی سوشیالیستی کوردی کە بە پشتیوانی یەکێتی سۆڤێت دامەزرا[١٧] و لەپاش رووخانی ئەو کۆمارە کوردییە مستەفا بارزانی لەگەڵ کۆمەڵێك لەجەنگاوەرانی روویانکردە یەکێتی سۆڤییێت[١٨].

رۆشنبیرانی کورد و ئەفسەرەکانیان بەشدارییان لەشۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بەسەرکردایەتی زەعیم روکن عەبدولکەریم قاسم کرد کە لە دەستووری عێراقی کاتیدا تاکیدی کرد: (عەرەب و کورد لەنیشتمانی عێراقدا هاوبەشن) بۆیە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە باکووری عێراق بەدەستهات[١٩] و لێبوردنی گشتی بۆیان دەرچوو و سەرکردەی کوردیش مستەفا بارزانی لەساڵی ١٩٦٠[٢٠] بە پێشوازییەکی رەسمی و میللی پڕ شکۆوە گەڕایەوە بەغدا، بەڵام بەهۆی

---

١٧- راستە دامەزراندنی کۆماری کوردستان لەمەهاباد و کۆماری ئازەربایجانیش لەتەوریز بەپشتیوانی سۆڤێت بوو، بەڵام هەر یەکێتی سۆڤێتیش لەبەر تەماحی دانی ئیمتیازی بەشێك لەنەوتی ئێران بەرووس سەبەبکاری گەورەی رووخانی ئەو دوو کۆمارە ساوایە بوو. (وەرگێڕ)

١٨- لەناوەڕاستی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ رابەری کورد مستەفا بارزانی لەگەڵ نزیکەی ٥٠٠ کەس لەهەڤاڵەکانی لەئاوی ئاراس بەرەو خاکی یەکێتی سۆڤێت پەڕییەوە و حکوومەتی سۆڤێت دالدەی پێدان و بەپەنابەری سیاسی وەریگرتن. (وەرگێڕ)

١٩- راستییەکەی سەرکردەی کورد خوالێخۆشبوو پێشەوا مستەفا بارزانی لە (٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨ لەگەڵ هەردوو خوالێخۆشبوو میرحاج و ئەسعەد خۆشەوی گەیشتنەوە بەغدا. لەرۆژی ١٩٥٩/٤/١٨یش (٨٥٣) کەسی ئاوارەی بارزانی لەپاش ١١ ساڵ گەیشتنەوە وڵات. (وەرگێڕ)

٢٠- ئەگەرچی هیچ ئۆتۆنۆمییەك بۆ کوردی عێراق دوابەدوای شۆرشی ١٤ی تەمووز بەرابەرایەتی خوالێخۆشبوو عەبدولکەریم قاسم نەهاتەدی، بەڵام ئەو ئازادی و کەش و هەوا دیموکراتییە خۆش و هەنگاوە ئەکتیڤانەی شۆڕش لەسای ئەودا فەراهەم بوو مایەی خۆشحاڵی گەلی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی بوو.. وەلێ لایەنە شۆڤینییەکانی عەرەب توانییان بەچەنەها شێوازی چەواشەکاری و فرت و فێڵ ئەو رابەرە لەخشتە

ناکۆکییەکانی لەگەڵ عەبدولکەریم سەبارەت بەپرەنسیپەکانی دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد ناچار بوو شۆڕشی دووەم لە ١٩٦١ دەستپێبکات لە دژی دەسەڵات لە عێراق [٢١].

لەساڵی ١٩٨٤ عەبدوڵڵا ئۆجالان (ئاپۆ) شۆڕشی چەکداری لـە دژی هێـزە چـەکدارەکانی تورکیا بەرپاکرد. شۆڕشەکەی ئۆجالان بە خێرایی هـەموو ناوچـەکانی کوردسـتانی تورکیـای تەنییەوە. سوپای تورك هێزی گەورە و گرانی نارده سەر ئـەم بزوتنەوەیـە کـە لەگـەڵ رەوتـی رۆژگاردا گۆڕا بۆ شەڕی پارتیزانی و لە ناوچەیەکی شاخاوی سەختدا کـە تاکـە جـەنگاوەرێك ئەگەر ئازووخەی تەواوی شەڕی پێ بێت، دەتوانێت لە پشتی بەردێکەوە بـەرەنگاری تیپێکـی نیزامی سوپا بێتەوە، بۆیە بزوتنەوەکەی ئۆجالان کە ژمارەی گەریلاکانی لە میانـەی سـاڵانی ١٩٨٥-١٩٨٨ گەیشتە (١٥) هەزار جەنگاوەر(١٦) ، رێکخراوەکانی لاوان و ژنان و پیاوانی کار و بانقو کەناڵی تەلەفزیۆنی لە شارە گەورەکانی ئەوروپا دامەزراند، ئیدی بزوتنەوەکە بـە شێوەیەك پەرەی سەند تێچووی لە سەر تورکیا ساڵانە گەیشـتە پـتر لـە (١٠) ملیـار دۆلاری ئەمریکی(١٧).

ئەگەرچی، هەموو دەوڵـەتانی پێوەندیـدار و ئایـدۆلۆژیا زاڵبووەکـان بـۆ دەسـتەبەرکردنی هێندێك لە بەرژەوەندییەکانیان لە بزوتنەوەکەی ئۆجالان سـوودمەند بـوون، لێ روونـاکبیرانی کورد ئەم بزوتنەوەیە بە بەرفراوانترین بزوتنەوەی کوردی دادەنێن کـە لـە پێنـاو دانپێنـان بـە پێناسەی کورد لە رۆژهەڵاتی ناوین و بۆ بڕیاردان لەسەر مافی چارەی نووسـی گـەلی کـوردی دابەشکراو سەری هەڵدا و جگە لەوەش تاکە بزووتنەوەیەکی کوردییـە کـە لـە مـاوەی (١٤) ساڵی رابـوردوودا (٢٥) هـەزار[٢٢] قوربـانی بەخشـیوە و زیـاتر لـە (٨٠) هـەزار برینـدار و شوێنبزری هەبووە. ژمارەی قوربانییانی سیڤیلیش (٣٠) هەزار کوژراو بوو، سەرباری ئـەوەش (٧) هەزار هاونیشتمانی تورك و کورد لە کەسانی رۆشـنبیر و سیاسـەتوان و پیـاوانی کـار و سەرکردەکانی بزوتنەوە دیموکراتی و پێشکەوتووخوازەکان و رۆژنامەنووسان بە رێگەی تـیرۆری

---

بیەن و هانی بدەن بۆ دژایەتیکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد و لەپاشانیش هەر ئەو شۆڤێنستییانە خۆیان بەغەدر لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ لەناویاندا. (وەرگێڕ)

٢١- راپەڕینی یەکەمی بارزان لەساڵی ١٩٣١-١٩٣٢ بوو. شۆڕشی بارزان ١٩٤٣-١٩٤٥ بەردەوام بوو. لە ١١ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ شۆڕشی ئەیلوول دەستپێکرد و تا ساڵی ١٩٧٥ بەردەوام بوو.(وەرگێڕ)

٢٢- مەبەستی نووسەر لەلێکەوتنەوەی ئەو قوربانییانە تا دەوروبەری ساڵی (١٩٩٨)ە (وەرگێڕ).

سیاسییەوە لەسالآنی ١٩٨٩ تا ١٩٩٨ بەو ڕووداوانەی کە لـە مێـژووی تورکیـای هاوچـەرخ ناویان نابوو (تاوانی بکوژی نەناسراو)، تیرۆرکراون.

لـە سـاڵی ١٩٩٣ کـە تانسـۆ چـیللەر جڵـەوی سـەرۆکایەتی حیزبـی (ڕێگـای ڕاسـت)ی گرتەدەست و بووە سەرۆکی وەزیران، بۆ ئەوەی لە نیسانی ساڵی ١٩٩٤ پلانێك بە ڕێككـەوتن لەگەڵ دەزگای هەواڵگری Mit میت ئامادە بکات، ژەنراڵ ئەرتوغرول گوان دەستنیشان کرا بۆ لەناوبردنی ئۆجالان، ئەو پلانە وای دەخواست ئۆجـالان بەزیندوویـەتی یـان بـەمردوویی(١٨) بیهێنرێتە پێش چیللەر. لەبەر ئەمە چیللەر بەهاوکاری (محەمەد ئاغـار) بەڕێوەبـەری گشـتی ئاسایش لەساڵی ١٩٩٥ ڕێکخراوێکی ئەمنی نهێنی بە ناوی (گروپی چالاکییە هاوبەشـەکان) لەناو دەزگای هەواڵگری سەربازی سەر بە ئەنجومەنی وەزیـران پێکهێنـا بـۆ داڕشـتنی پلانـی کوشتنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بە پشتبەستن بە هەواڵگرییـەکانی ئیسـرائیل (مۆسـاد). بـۆ ئـەم نیازەش چیللەر جانتای خۆی پێچایەوە بەرەو ئیسرائیل بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەکە بە ڕێگـەی پتەوکردنی پێوەندی وڵاتەکەی لەگەڵ ئیسرائیلدا. گرووپی چالاکییە هاوبەشەکان لـە کـانوونی دووەمی ١٩٩٥ پلانێکی تۆکمەی داڕشت بۆ تیرۆرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجالان، بـەڵام دزەکردنـی زانیاری لە بارەی پلانەکەوە بەرەو ڕۆژنامەکانی تورکیـا، وایکـرد چاوپۆشـی لێ بکـرێ و لـە ئاکامی ئەمەشدا (١٤) بەرپرسی هێزەکانی ئاسایش کە پێوەندییان هەبوو بە دزەپێکردنی ئەم زانیارییانە لە کارەکانیان دەرکران و پلانەکە سەری نەگرت (١٩).

ئەم هەوڵە نەزۆکە وایکرد چیللەر متمانەی بە (گروپی چالاکییە هاوبەشـەکان) نـەمێنێ. بۆیە بە هاوکاری لەگەڵ محەمەد ئاغاری بەڕێوەبەری ئاسایش- کە لە دوایيـدا دەبێتـە نوێنـەر لەسـەر لیسـتی حیزبـی ڕێگـای ڕاسـت و وەزیـری نـاوخۆ- ڕێکخراوێکـی نهێنـی تایبـەت، بەسەرپەرشتی خۆی و سەرۆکایەتی محەممەد ئاغار دامەزراند بەئامانجی داڕشـتنی پلانێـك بـۆ لەناوبردنی ئۆجالان(٢٠).

چیللەر بۆ ئەم نیازە پارەیەکی زۆری لە دەرماڵە نهێنییەکان- نزیکەی (٥٠) ملیۆن دۆلار- دایە هەندێ کەسان و کۆمەڵەکانی مافیا و دەزگای (مۆساد)ی ئیسرائیلی لە پێناو چوونە ناو هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥ بەسەرکەوتنی لەناوبردنی ئۆجـالان ئەمــەش بـۆ بەرزکردنـەوەی ڕەسیدی خۆی لەناو ئەو هەڵبژاردنەدا.

بەڵام دامەزراندنی قورقوماز گوکسال بەراوێژکاری دەزگای میـت Mitی تـورکی وایکـرد چـیللەر هەمیسـان متمانـە بکـات بـەگرووپی چـالاکییە هاوبەشـەکان بـە تایبـەتی دوای

دامەزراندنی محەمەد ئیمور بە بەڕێوەبەری دەزگای قەڵاچۆکردنی تیرۆر لە ناو گرووپەکە کەلێرەدا ئەرکی ئامادەکردنی پلانی (مارسیدس)ی گرتە ئەستۆ بۆ کوشتنی ئۆجالان، ئەرکی جێ بەجێکردنی ئەم پلانەش کەوتە ئەستۆی (مەحموود ییلدیرم) ناسراو بە (یێشیل) کەیەکێك بوو لە ئەندامە سەرەکییەکانی دەزگای قەڵاچۆکردنی تیرۆر و بە گەلێك لەو کردەوە تیرۆرە سیاسییانەش تۆمەتبار بوو کە لە تورکیا بە (تاوانەکانی بکوژی نەناسراو) ناویان دەبرد، ئەوە بوو ناوبراو ئۆتۆمبیلێکی جۆری (Van) ڤانی داخراوی پڕ لەمادەی (C4)ی ئامادەکرد بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام ئۆجەلان بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر لەم تەقینەوەیە رزگاری بوو.

هەوڵی دووەم بۆ لەناوبردنی ئۆجالان لە سەردەمی حکوومەتی نەجمەدین ئەربەکان بەڕێوەچوو. ئەربەکان لە پاش دەستلەکارکێشانەوەی حکوومەتەکەی مەسعود یەلماز- کە بەهۆی ئاڵ و گۆڕکردنی تۆمەتی بەکاربردنی دەسەڵات بۆ دەوڵەمەندبوونی ناڕەوا روویدا- مەسعوود یەلمازی سەرۆکی (حیزبی نیشتمانی دایك)ی بە بەکارهێنانی پێگەی بۆ دەوڵەمەندبوونی تورگۆت یەلمازی برا ملیۆنێرەکەی تۆمەتبار دەکرد، لەکاتێکدا مەسعوود یەلمازیش (چیللەر)ی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە دەرماڵە نهێنییەکانی دەوڵەتی بەکاربردووە بۆ دەوڵەمەندبوونی شەخسی خۆی و تەخشان و پەخشانکردنی ئەو دەرماڵانە بۆ ئەو کردەوە نهێنییانەی (مافیا)ش تیادا بەشداربوون و کار گەیشتە ئەوەی هەریەکەیان داوا بەرزبکاتەوە بۆ سەرۆکایەتی پەرلەمان بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەسەلە گەندەڵییە وەك رێکخۆشکردنێك بۆ گواستنەوەی بەرەو پێش دادگا.

ئۆجالان، لە دەستپێکی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ پێشنیاری ئاگربەستی دووەمی راگەیاند لە پێناو بەرقەراربوونی ئەمن و ئاسایش لەوڵات و پەرەپێدانی ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا- کە هەروا بە دواکەوتوویی ماوەتەوە- تا پەرەبسەنێ و بگاتە ئەو ئاستە پێشکەوتووەی ناوچەکانی تر لە خۆرئاوا و باکووری وڵات هەیانە(٢٢).

بەڵام حکومەتی مەسعوود یەلماز کە خۆی لە ئاست ئاگربەست گێل کردبوو، لە رۆژی ٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد و لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٩٦ کابینەی نوێ بە سەرۆکایەتی نەجمەدین ئەربەکان شوێنی گرتەوە. وەلێ ئەربەکان تا بینە قاقای نوقمی نێو کێشە نێوخۆیی و ململانێ حیزبییەکان بوو بوو. لە پاشان حیزبەکەی- حیزبی گەشەپێدان- داخرا و خۆیشی هەواڵەی دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە دیاربەکر کرا و

دادگا بە ساڵێك حوكمی ئەربەكانی دا، بەڵام حوكمەكە جێ بەجێ نەكرا لەبەر پیری ناوبراو لە دواییشدا لێبوردنی گشتی لە ساڵی ٢٠٠١ گرتییەوە و بەمەش نەچووە بەندیخانەوە.

(تۆنجانەی ئوزكای) دانەری كتێبی (پیلان) تاكید دەكات و دەڵێت: "پاژی دووەمی چیرۆكی (مارسیدس) لەرۆژی ٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٦ كە هاوكات بوو لەگەڵ یادەوەری دامەزراندنی پارتی كرێكارانی كوردستان، دەستیپێكرد، بەڵام لەبەر ئەوەی ئۆجالان ئەوكات لەوێ نەبوو، بۆیە پیلانەكە جێ بەجێ نەكرا و پاژی دووەمی پرۆسێسی (مارسیدس) لەرێكەوتی ئەو مێژووەوە بۆ ساڵێك دواخرا(٢٣)".

ساڵی ١٩٩٨ خاڵی وەرچەرخان بوو لەخەباتی پارتی كرێكارانی كوردستان لەدوو لایەنەوە: یەكەمیان ئەو گۆڕانكارییانەی لە سەركردایەتی هێزە چەكدارەكانی توركیا لە مانگی ئابی ئەو ساڵە ئەنجام دران، وایانكرد تاقمی سەربازییە توندڕەوەكان سەركردایەتی هێزە چەكدارەكانی توركیا بگرنە دەست، ئەوە بوو ژەنراڵ حوسێن قیوریق كە تا دوا هەناسە بڕوای بە چارەسەری سەربازی كێشەی كورد هەبوو، بووە سوپا سالاری توركیا. لە لایەكی دیكەشەوە ژەنراڵ ئەتیلا ئاتاش سەركردایەتی هێزەكانی وشكانی وەرگرت، ئەم كەسە بە درێژایی (١٠) ساڵی رابوردوو لە شەڕدا بوو دژی پارتی كرێكارانی كوردستان چونكە سەركردەی فەیلەقی حەوتەم بوو كە تا ئێستاش ئەو ئەركەی لەئەستۆیە[٢٣]. ژەنراڵ (تەحسین ئەرسین)یش بووە سەركردەی هێزەكانی ئاسمانی، ئەمە یەكێك بووە لەو ژەنراڵانەی بانگەشەی دەكرد بۆ ئەنجامدانی تازەگەری لە هێزی ئاسمانی توركیا بە هاوكاری لەگەڵ ئیسرائیل و پێی وابوو پێویستە سوود لە ئەزموونی ئیسرائیل وەربگیرێت بۆ قەڵاچۆكردنی چالاكییەكانی پارتی كرێكارانی كوردستان لەسەر ئاستی ناوخۆ و نێودەوڵەتیدا، سەرەڕای زەرورەتی وەرگرتنی رای ئیسرائیل سەبارەت بەچۆنییەتی لەناوبردنی ئۆجالان رێبەری بزوتنەوەكە و تێكشكاندنی ئەو بزوتنەوەیە لەناوەوەی وڵات.

---

٢٣- واتە تا كۆتایی ساڵانی نەوەت.

## باسی دووەم

## پیلانە نێودەوڵەتییەکە: دەرهاوێشتەکانی گرتنی ئۆجالان و کاریگەرییان لەسەر کێشەی کورد

لە ٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٨ عەبدوڵڵا ئۆجالان بڕیاری دا باروبنەی بپێچێتەوە بەرەو رووسیا، دوای ئەوەی نوێنەری PKK لەرووسیا بەرێککەوتن لەگەڵ رێبەری رووسی راستی توندڕۆ (جیرونۆفسکی) کەئۆجالانی بانگهێشت کردبوو بۆ مۆسکۆ(٢٤)، گوندێکی بچووکی لەدووری (٢٠٠) کیلۆمەتر لەمۆسکۆوە بۆ کرِیبوو تابیێتە بارەگای حەوانەوەی ئۆجالان.

ئۆجالان، دوای دەستگیرکردنی، لەئیفادەکەیدا بۆ لێکۆڵەرەوەکانی تورك سەبارەت بەرووداوەکانی ئەو رۆژە تاکید دەکات و دەڵێت: "ساڵی ١٩٩٣ هەلێکی مێژوویی بۆ ئێمە و تورك و کۆماری تورکیا پێکرِا رەخساند، ئەوکات خوالێخۆشبوو تورگۆت ئوزال بیرۆکەی فیدرالیزمی کورد- تورکی خستەبەر باس بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەشێوەیەکی ئاشتییانە، ئێمەش یەکلایەنە بۆ یەکەمین جار ئاگربەستمان راگەیاند بۆ ئاسانکردنی ئەم ئەرکەی ئوزال، هێزە چەکدارەکانی تورکیاش (لەسەر زاری سوپاسالاری ئەو دەمە ژەنرال دۆغان گونش) نیازیان بەرامبەر بەکورد ئاشکرا کرد، لێ مردنی ئوزال لە ٧ی نیسانی ١٩٩٣ زنجیرەی ئەم رووداوانەی پساند بۆ ئەوەی هەمووان فرِێ بداتە نێو بۆتەی شەرِێکی کاولکار لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا. بەڵام من لە بروسکەی پرسە نامەکەمدا بۆ خانەوادەی ئوزال جەختم کردەوە کە: رووداوەکانی ئاینده بۆ هەموو جیهان دەردەخەن تا چ رادەیەك خوالێخۆشبوو ئوزال بەرامبەر بەکێشەی کورد راستگۆ و دووربین بووە، بۆیە ئاگربەستی دووەمم لە ١ی ئەیلوولی ١٩٩٨ جارِدا و داوام لەحکوومەتی یۆنان کرد مافی پەنابەری سیاسیم پێ بدات، یان رێگەم بدا لە وڵاتەکەیدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو نیشتەجێ بم، بەڵام بەرپرسانی یۆنان لەسەر ئەمە رازی نەبوون، جا منیش ناچار بووم فرِۆکەیەك بەکرێ بگرم و لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ رووبکەمە رووسیا"(٢٥).

ئاژانسی هەواڵگرییەکانی ئەمریکا (CIA) و (مۆساد)ی ئیسرائیلی کە لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە چاودێری جمو جۆڵەکانی ئۆجالانیان دەکرد(٢٦)، دوو سەرچاوەی سەرەکی بوون

کە بۆ تورکیا تاکیدیان کرد: ئۆجالان لـە رۆژی ٩ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٩٨ شـوێنی خـۆی بەجێ هێڵاوە. لێرەدا رۆژنامــەی (میللییــەت)ی تــورکی بـەربڵاو ئامــاژەی داوە بــەهاوکاری (مۆســاد)ی ئیســرائیلی و هەواڵگرییــەکانی ئــەمریکا لەگــەڵ هەواڵگرییــەکانی تورکیــا لەمەسەلەی: "چەسپاندنی چۆنێتی دەرچوونی ئۆجالان رێبەری پارتی کرێکارانی کوردسـتان پاش رێککەوتنیان لەگەڵ تورکیا بۆ قەڵاچۆکردنی تیرۆر لـە ناوچـەکە، ئەمــەش پرسـیارێکی زۆری هورووژان لەمەڕ چالاکییەکانی (مۆساد) لە تورکیا و رۆژهەڵاتی ناوین(٢٧)".

لێرەشــەوە پـارتی کرێکـارانی کوردســتان (کـۆنگرەی حەوتـەم) پێـی وایـە لـەوێڕا پیلانێکـی نێودەوڵــەتی لــەگۆردا بــوو بــە ئامــانجی فڕانـدنی ئۆجـالان و رادەسـتکردنی بـەتورکیا. (تۆنجـای ئۆزکای)یش لە کتێبەکەی کە بـە نـاوی (پرۆسـە)وەیە، تاکیـد لـەم هەقیقەتـە دەکـات و دەڵێـت: "نوێنەری ئاژانسی هەواڵگرییەکانی ئەمریکا سەر لە ئێوارەی رۆژی ٤ی شوباتی سـاڵی ١٩٩٩ لـە ئەنکەرە سەردانی بەڕێوەبەری (Mit) (شانگال ئاتاغۆسان)ی کرد و مەسەلەیەکی زۆر گرنگـی پـێ ڕاگەیاند کاتێك جەختی لەسەر ئەمە کردەوە کە: واشـنتۆن دەتوانـێ عەبـدوڵڵا ئۆجـالان رادەسـتی ئەنکەرە بکاتەوە بەڵام بـەو مەرجـە نـەکوژرێ، بـەڵکو بخرێتـە بـەردەم دادگایـەکی عادیلانـە بـۆ دادگاییکردنی- ئەتاسۆغان پاش ئەوەی پرسی بـە هەرسـێ سـەرۆکایەتییەکان: سـەرۆك وەزیـران و سەرۆکی کۆمـار و سوپاسـالار لەمــەڕ ئـەم بابەتــەوە کـرد، ئـەنجا هــەردوولا (نوێنــەری CIA و بەڕێوەبەری Mit) پرۆتۆکۆلێکی تایبەتیان لە نێوان خۆیانـدا سـەبارەت بەکێشـەکە مـۆرکرد، بـەو پێیەی تیمێك کاری ئەمریکایی- تورکی هاوبەش ئەرکی پرۆسەکە بگرێتە ئەستۆ(٢٨)".

بەو جۆرە گەورەترین پرۆسەی نهێنی لە پیلانێکـی نێودەوڵەتیـدا بـۆ بەدەسـتەوەدانی رێبــەری رێکخراوێکی خەباتی چەکداری بە دەوڵەتەکەی (واتە: بـەتورکیا) ئەنجامـدرا بـە مـەرجێك ژیـانی پارێزراوبێت، ئامانجی پیلانەکەش: کۆتاییهێنان بوو بە پرۆسە سەربازییەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا تا تورکیا هەلی بۆ بڕەخسێت ئـەو رۆڵـە بگێـڕێ کـە ئـەمریکا بـۆی دارشـتووە، ئـەویش: دەورەدانی (واتە ئیحتیواکردنی) هەریەك لە ئێران و عێراقە.. نەك هەر ئەوەش، بـەڵکو ژمارەیـەك لە شرۆڤەکارانی سیاسـی تـورك(٢٩) وای بۆچـوون: "لەوێـدا لێکحالێبوونێـك هـەبووە لـە نێـوان واشنتۆن و ئەوروپا و عەبدوڵڵا ئۆجـالان بـۆ دۆزینــەوەی رێگەچـارەی ئاشـتییانەی کێشـەی کـورد لەتورکیا". شرۆڤەکان، رووداوەکانی دوای ئەو پیلانە نێودەوڵەتییە وەك بەڵگەیەکی حاشا هەڵنــەگر دەهێننەوە بۆ رێککەوتنی پێشوەخت لە سەر وردەکارییەکانی دوای پیلانەکە: جەختکردنی ئۆجـالان لە میانەی بەرگریکردنەکەی لەدادگای ئیمیرالی لەســەر ئامــادەبوونی بـۆ خزمـەتکردنی دەوڵــەتی

توركیا بە دۆزینەوەی شێوازگەلی زامنكراو بۆ چارەسەری كێشەی كورد و جاڕدانی ئاگربەستی چوارەم بەشێوەی یەكلایەنە و داواكردنی لە شەڕكەرانی پارتەكەی توركیا بەجێ بهێڵن.

عەبدوڵڵا ئۆجالان لەپێش لێكۆڵەرەوەكاندا دركاندی كە ئەو "بووبوە ئامرازێكی گەورە و چەندین لایەنی نێودەوڵەتی لە دژی توركیا سازیان دەكرد، چونكە بە تەمای دامەزراندنی دەوڵەتێكی ئازاد و سەربەخۆ بوو لەناوچەكەدا، لەبەر ئەمە لە هەموو ئەو پرۆسێسانەی لەناوچەكە بەڕێوەچوون كەوتبووە دوای سۆز و عاتیفەكانی و گەلێك لایەنی نێودەوڵەتی لەوەدا سوودمەند بوون(٣٠).

پاش ئەوەی ئۆجالان لە بارەی كۆمەكە ماددی و مانەوییەكانی حیزبەكەیەوە بە تێر و تەسەلی قسەی كرد، ئەنجا "داوای بەخشینی لەدایكی ئەو شەهیدانە كرد كە لە شەڕەكەدا گیانیان لەدەستدا و دانی بەبەرپرسیارێتی خۆی نا لەبەرامبەر كوشتنی (٣٠) هەزار هاونیشتمانی خەڵكی توركیا لەشەڕدا". بۆیە دادگای دووەمی ئاسایشی دەوڵەت لە ئەنكەرە لە رۆژی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٩ حوكمی لەسێدارەدانی بۆ دەركرد. بەڵام دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپی كۆبووەوە و بڕیاری دەركرد بە زەرورەتی هەڵپەساردنی لەسێدارەدانی ئۆجالان بۆ كاتێكی تر"، ئەمە لە دوای ئەوەی دادگای ناوبراو پرۆتستۆكانی پارێزەرانی ئۆجالانیان لەسەر ئەو حوكمە بەهەند وەرگرت(٣١)". لێرەشدا بولەند ئەجەوید رێبەری هاوپەیمانی سێكوچكەی دەسەڵاتدار(٣٢) تاكیدی لەسەر رازیبوونی حكوومەتەكەی كرد لەسەر بڕیاری دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپی وەك چاوەڕوانییەك بۆ دەرەنجامەكانی رەخنەكانی پارێزەرانی ئۆجالان لەسەر حوكمەكە".

ئەگەرچی، ئەنجومەنی ئەوروپی لە ١١ی نۆڤامبەری ساڵی ١٩٩٩ رەتیكردەوە توركیا لەیەكێتی ئەوروپا وەربگرێت، چونكە مافی مرۆڤی پێشێل كردووە و ئەگەر بەراستی دەیەوێ بێتە ریزی یەكێتی ئەوروپاوە پێویستە لەسەری هەموو ئەو یاسایانەی كۆتبەندی دەخەنە سەر ئازادی هزر و بیروڕا هەموار بكات و هەڵوەشێنێتەوە و پێوەرە دیموكراتییەكانی (كۆبنهاگن)یش جێ بەجێ بكات"(٣٣)، بەڵام مەسعوود یەلماز جێگری سەرۆك وەزیران و سەرۆكی (حیزبی نیشتمانی دایك)ی هاوپەیمان لەگەڵ هەردوو حیزبی: چەپی دیموكراتی بەرێبەرایەتی ئەجەویدی سەرۆك وەزیران و بزوتنەوەی نەژاد پەرست بەسەرۆكایەتی دەوڵەت باغچەلی، بەتوندی وەڵامی بڕیارەكەی ئەنجومەنی ئەوروپای دایەوە و گوتی: "دیارە یەكێتی ئەوروپای مەسیحی نایەوێت وڵاتێكی موسڵمان لەئەندامێتی خۆی وەربگرێت، جا ئەگەر ئەوروپا ئاتاجی بەتوركیا نییە، ئەوە توركیاش ئاتاجی بەئەوروپا نییە(٣٤)" سەرۆك بولەند

ئەجەویدیش لێدوانێکی لەسەر بڕیارەکەی یەکێتی ئەوروپا راگەیاند و گوتی: "وادیارە ئەوروپا هەمیسان دەیەوێت پەیمانی سیڤەر لەدژی تورکیا جێ بەجێ بکات بە نیازی دابەشکردنی، وەلێ ئێمە تا هەتا لە دژی ئەم بیرۆکەیە رادەوەستین(٣٥)".

بەڵام جەختکردنی سمۆییل بێرگەر لەسەر گرنگی رۆژهەڵاتی ناوین- کە ٢/٣ی یەدەکی نەوتی جیهانی لێیە- نەك تەنها بەلای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، بەڵکو بەلای دۆست و هاوپەیمانەکانیشی لەجیهاندا نەخوازە رۆژهەڵاتی ناوین دەبێتە ناوچەی گۆڕانکاری و هەر وڵاتێکیش لەوڵاتەکانی پێوەندی بەبەرژەوەندییەکانمانەوە هەیە، بۆیە نەوەی تازە چاوەڕوانی پێکهاتنی روانینی نوێی خۆیەتی بەرامبەر بەژیان و خواستە سیاسییەکان، لەبەرئەمە پێویستە زەمینەی گونجاو فەراهەم بێت بۆ ئەنجامدانی چاکسازی پێویست(٣٦).

هەر لەم بارەیەشەوە (ستیڤن کالفن) لەوتارێکیدا بەناونیشانی (بەرەو ستراتیژییەتێکی ئەمەریکی- ئەوروپی هاوبەش بۆ رۆژهەڵاتی ناوین)، دەڵێت: ستراتیژییەتی ئەمەریکی- ئەوروپی هاوبەش لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین پێویستی بەتورکیاش هەیە، لەم رووەوە گەرەکە هەوڵەکانی ئەمریکا و ئەوروپا چڕ بکرێنەوە بەئامانجی هەژماردنی تورکیا وەك هاوبەشێکی ستراتیژی و دەکرێ لەبڕیارەکەی یۆنان کەتایبەتە بەلابردنی پرۆتستۆی لەسەر بەئەندامبوونی تورکیا لەیەکێتی ئەوروپی، سوود وەربگیرێت بۆ چاککردنی پێوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا کەلە (لوتکەی لوکسومبورگ) لەکانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٧)ەوە تێکچوون(٣٧).

لەروانگەی ئەم گرینگییەوە و ئارەزووی ئەمریکا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لەبەر رۆشنایی بەرژەوەندییەکانی خۆی و دۆست و هاوپەیمانەکانی، واشنتۆن گوشاری خستەسەر یەکێتی ئەوروپا بۆ دەرکردنی بڕیارێك لە ١٩٩٨/١١/١٨" بەوەرگرتنی تورکیا لەیەکێتی ئەوروپا بەمەرجێك کێشەکانی لەگەڵ یۆنان چارەسەر بکات. و دان بنێت بەپێناسەی نەتەوەیی کورد و پێوەرە دیموکراتییەکانی (کۆبنهاگن)یش پێڕەو بکات بۆ جێ بەجێکردنی چاکسازییە ئیداری و سیاسی و دەستوورییەکان لەوڵات"(٣٨).

چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا تەوەری ئەم وەرگرتنە بوو (واتە وەرگرتنی تورکیا لە ئەنجومەنی ئەوروپی= وەرگێڕ) کەوەکو کت و پڕییەك بوو بەلای تورکەکانەوە، بەڵام جەنگیز جاندار شرۆڤەکاری سیاسی لەرۆژنامەی (گونش)ی بەربلاو و پسپۆری کاروباری کورد و خەباتگێڕی تورك لەناو بەرەی رزگاریخوازی میللی فەلەستینی، ئەم کت و پڕییە لەشرۆڤە سیاسییەکەی لەمەڕ چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کورد لەتورکیا بەم وتانەی دەڕەوێنێتەوە،

کاتێك دەڵێت: "ڕۆژئاوا کەستراتیژییەتی خۆی بۆ بەدیهێنانی سەقامگیری لەسەدەی بیست و یەکەمین لەناوچەکە بەهەند وەرگرتووە، پێی وایە کێشەی کورد لەتورکیا یەکێکە لە ئەولەوییاتەکانی ئەو ستراتیژییەتە، چونکە ئەم کێشەیە هاوبەندە بە دەستەبەرکردنی ئەو سەقامگیرییە لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی تورکیا ببێتە وێستگەیەکی نێودەوڵەتی گەورە بۆ ڕەوانەکردنی نەوت و غازی ئاسیای ناوەراست و ڕۆژهەڵاتی ناوین بەرەو جیهان، بۆیە پێویستە تورکیا ترسی نەبێت سەبارەت بەجێ بەجێکردنی پەیمانی سیڤەر لە دژی لە لایەن ڕۆژئاوا و دان بنێت بە پێناسەی نەتەوەیی کورد"(٣٩).

بەڵام، ئەو مەسەلەیەی کەئۆجالان لە میانەی دادگاییکردنەکەی لە دوورگەی ئیمیرالی خستییەڕوو، کە: "ئەو دکارێت کێشەی کورد لە چوارچێوەی یەکێتی خاکی تورکیا لە ماوەی سێ مانگدا چارەسەر بکات، ئەگەر دادگا مافی ژیانی دایێ داوا لەگەریلاکانی بکات چەکەکانیان فرێ بدەن و رووبکەنە ناو ڕێکخراوێکی سیاسی ڕەوا"، ئەمە چەندین پرسیاری لەمەڕ کەسایەتی ئۆجالان و تەلیسمی گرتنەکەی و ڕاستگۆیی لە پاکانەکانیدا، هورووژاند. بەنموونە محەمەد بەرەکات لەو لێکۆڵینەوە ڕۆژنامەوانییەی بۆ گۆڤاری (الوگن العربی) نووسیبووی دەپرسێت: ئایا ئۆجالان پاڵەوانە.. یان بەکرێگیراو؟! لەوەڵامدا دەڵێت: "ئۆجالان، بەدیدی عەرەب و موسڵمانەکان پاڵەوانێك بوو، بووە قوربانی پیلانێکی پیس و بۆگەن، بۆیە بەزەییان پێدا هات و هاوسۆزییان لەتەکدا دەربڕی وەك بەشێك لەهاوسۆزییان لەگەڵ کێشەی گەلی کورد بەگشتی، بەڵام ئەوەی دواتر روویدا، هەموو هیوا و ئاواتێکی وەبادا، چونکە ئەم کەڵە پیاوە لەحاڵێکدا لەپشتی شیشە ئاسنینەکانەوە لەرووی دەروونی و مانەوییەوە بەرووخاوی ڕاوەستابوو، داوای روحم و بەزەیی پێهاتنەوەی لە دادوەرانی دەخواست و حاشای لەو تۆمەتانە دەکرد خرابوونە پاڵی و پاکانەی لەسەر پتر لە (٤) هەزار کەس لەپیاوەکانی خۆی کرد.. و پەردەی لەسەر هەموو پێوەندییە خاوێن و گوماناوییەکانی بەو دەوڵەتانەوە کەیارمەتییان دا یان بەو ڕێکخراوانەوە کەپشتیوانییان لێکرد، هەڵماڵی. ئۆجالان ئیدی داوای بەزەیی لەدادوەرەکانی دەکرد و دانی بەهەڵەکانی دەنا و بەڵێنی ئەوەی دەدا کەخۆی و پیاوەکانی لەمەبەدوا ڕێگایەکی ڕاست بگرنەبەر.. ئەم پیاوە بەشێوەیەکی دارووخاو بەدیارکەوت و لەچەند چرکەساتێکدا ڕما.. و هاکا تەنها بەرێگیراوێکە، نەپاڵەوانە و نە شایستەیە غەمی بۆ بخۆن"(٤٠).

بەش بەحاڵێ نووسەری کوردی عێراقیش ڕەشید ئاکرەیی، ئۆجالانی بەمرۆڤێکی کەللەڕەق و لووتبەرز و خۆبەزلزان بەسەر کورد ناوبرد، کاتێك تاکیدی کرد لەسەر پێداگرتنی ئۆجالان لەسەر

ئەوەی وا لەرێبەرایەتییەکەی بکات گەورەتر بێت لەکێشەکانی گەلەکەی، لێرەدا رێبەری کوردی تورکیا بەشێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ کوردی عێراق کرد بۆنی خۆبەزلزانین و لەخۆباییبوونی لێوەبێت بەهۆی ئەو سەرسەختییە بەردەوامەی کەلەگەڵ رەوتی رۆژگاردا زیاتر پەرەی سەند و بەهۆی کەڵەکەبوونی هەڵە و پێشێلکارییەکانی بەرامبەر بەمافە رەواکانی گەلی کورد و دانانی حەز و خواستە شەخسییەکانی خۆی لەسەرووی بەرژەوەندییە باڵاکانی گەلی کوردەوە.."(٤١).

لەکاتێکیشدا، دەبینین زۆربەی شرۆڤەوانییە سیاسییە بابەتییەکانی وەك: جەنگیز چاندار و مەتین تۆکەر و شاهین ئالبای و حەسەن جەمال و کونگور مەنکی، داوایان دەکرد بۆ زەروورەتی دانپێنانی تورکیا بەپێناسەی نەتەوەیی کورد بەجیاوازیکردن لەنێوان کێشەی ئۆجالان و حیزبەکەی- کەبەتیرۆر و ئەنجامدانی تاوانەکانی کوشتنی کورد و تورك پێکڕا تۆمەتبارن- و لەنێوان کێشەی ئەو هاوڵاتییە کوردانەی کەداوای مافی هاونیشتمانییەتی و ممارەسەکردنی زمان و کلتوورەکەیان وەك ئەوانیتر دەکەن، کەچی شرۆڤەکارە سیاسییە راستڕەو و نەژاد پەرستەکانی تورك عەبدوڵڵا ئۆجالانیان بە: (رابەری دێوەجامە) و (سەرکردەی تیرۆر و تاوان) و (هاوڕێی ژن) و (ئەو دیکتاتۆرەی فەرمان دەدا و فەرمانی بەجێیە) لەقەڵەمدا، بەڵکو (کەمال بۆرکای) سەرۆکی حیزبی سوشیالیستی تورکی (لەساڵی ١٩٧٥ ئەم حیزبەی دامەزراند) پێی وایە: ئۆجالان هزرێکی سیاسی روون نییە لەبارەی حیزبەکەی و ئاییندەی کاری سیاسی کورد، بۆیە (٢٠) ساڵ لەتەمەنی کێشەی کوردی بەفیڕۆدا، یەکەم بەبڕوابوونی بەمارکسیزم و دووەم بەگواستنەوەی بەرەو مەشاعییەتی کوفر و بانگەشەکردنی بۆ کۆماری دیموکراتی فیدراڵی. لەدوای گرتنەکەشی بووە کابرایەکی کەمالیزمی و شانازیشی پێوە دەکا و بگرە داوا لەشەرڤانانی خۆی و هەموو کوردیش دەکات چاوی لێبکەن بۆ خزمەتکردنی رژێمی تورکیای ستەمکار کەلەمێژەوە دەستی بەخوێنی کورد سوورە و خواست و ئاواتەکانی ئەم گەلەی ورد و پێشێل کردووە"(٤٢). لەلایەکی ترەوە، شەرەفەدین ئالچی، رێبەری ئەو فراکسیۆنە دیموکراتییەی کەلە ٢٦ی شوباتی ساڵی ١٩٩٩ بەتۆمەتی پڕوپاگەندەکردن بۆ کورد و لایەنگری بزوتنەوەی جوداخوازی داخرا، پێی وایە: "عەبدوڵڵا ئۆجالان بەتەواوی خۆی دا بەدەست ویستی ئەو جەللادانەیەوە کەئێستا وادەڵێن گوایە کێشەی کورد بەتەواوبوونی ئۆجالان وەکۆتایی هات، لەکاتێکدا حاشاکردن لەبوونی نەتەوەیی کورد، کێشەکە چارەسەر ناکات، بەڵکو زیاتر هەڵیدەگیرسێنێ و لەوانەیە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوە گەلێکی دیکەش کە نە لە بەرژەوەندی کورد و نە لە بەرژەوەندی تورکیش بێت، بۆیە ئێمە جەختمان

کردەوە سەر زەرورەتی خەباتی سیاسی بۆ سەندنەوەی مافی کورد لەبری خـەباتی چـەکداری، چونکە زۆرداری ئۆجالان بەرامبەر بەحیزبەکەی و بەکوردیش بووە هۆی سەرهەڵدانی حیزبوڵڵای تورکی و ئەو تاوانانەی کەبەلای هەموانەوە ناسراون". لەکاتێکدا نووسەری بەرەگـەز کـوردی تورکیـا نـزار ئـاگری پێـی وایـە: "خۆبەدەسـتەوەدانی ئۆجـالان عـەیب و عارێکـە زیـانی بەرێبەرایەتی کورد گەیاند. چونکە ئەو کەسەی قوربانی بە کاروان لـە دوای کـاروان گـەنجانی کوردی داوە، باشتر وایە بۆی قوربانی بەخۆی بدات لەپێناو کێشەکەیدا، نـەوەك لـە یەکـەمین ئەزموونـدا چۆك دابدات و بڕووخێت، نـەخوازە ئۆجـالان و حیزبەکـەی ئەوانـەیان بـە ناپـاکی تۆمەتبار دەکردن کەبەرێگای ئاشتییانە داوای مافی کوردیان بکردبایـە و حیزبەکەشـی هـیچ دوودڵییەکی نەدەکرد لەکوشتنی یان لێدانی یان ریسواکردنی ئەو کۆمەڵ و حیزبە کوردییانـەی کە بـەبێ خوێنڕشـتن و توونـد و تیـژی تێدەکۆشـان لـە پێنـاو چارەسـەری دیبلۆماسـییانەی کێشەکە"(٤٣).

(فەهد السرحان)یش، ئەگەر دەپرسێت: ئۆجالان.. ئایا تیرۆریستە؟(٤٤) بۆ ئـەوەی خـۆی وەڵامی ئەم پرسیارەی بەنەرێ بداتەوە و بڵێت: ئەو (واتە: ئۆجـالان) رێبـەری بزووتنەوەیـەکی رزگاریخوازی نەتەوەییە، ئەوا نووسەری بەرەگەز عەرەب (تورکی الحمـد)یش پێـی وایـە(٤٥): ئۆجالان لەرێبەرایەتی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە بوو بە سونبولی خەباتی گەلی کورد لـە دژی ستەم و زۆرداری و بووە هێمای خەبات و تێکۆشان لەپێناوی شادبوونی کـورد بەپێناسـە نەتەوەییەکـەیان". (رەزا لاری) نووسـەریش لـەو بڕوایەدایـە ئۆجـالان خـەباتگێڕە نـەوەك تیرۆریسـت، ئـەو بەتەسـلیم کردنـی لەلایـەن دوژمنەکانییـەوە، بـووە قوربـانی پیلانێکـی نێودەوڵەتی(٤٦).

عەبدوڵڵا ئۆجالان، لەمیانەی وتەکانیدا لەپێشـی دادگـا، رای گشـتی تورکیـای لـەبارەی کەسایەتییەکەیەوە کرد بەدوو بەشەوە(٤٧)، بەشی یەکەم: پێی وایە: "ناوبراو کەسـایەتییەکی راڕا و ترساوە، لەمیانەی داوای بەخشـینی لـەکارە تیرۆریسـتییەکانی و داوای ژیـان لـەپێناو خزمەتکردنی کۆمار و دەوڵەتی تورکیا، ئامانجی رزگارکردنی خۆیـەتی لـەمردن، لەکاتێکـدا بەشی دووەمیش: پێی وایـە ئۆجـالان لەدادگاییکردنەکەیـدا سـەلماندی رێبـەرێکی سیاسـییە دەیەوێ بەشێوەیەکی ژیرانە و بەپێی چەند تاکتیکێك کە چەندەها پرسیار دەربـارەی رەهەنـدە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکانەوە دەهورووژێنن، داکـۆکی لەئایدیۆلۆژییـەتی پـارتی کرێکـارانی کوردستان بکات". لێرەشەوە، (فیکرەت بیلا) بەڕێوەبەری نووسینی رۆژنامـەی (میللییـەت)

لەئەنکەرە، پێی وایە: لەوێدا، ئۆجالان دوو کەسایەتی هەیە، هەردووکیان لەدادگای ئاسایشی دووەمی دەوڵەت لەئیمیراڵی دادگایی دەکرێن، یەکەمیان: ئەو عەبدوڵڵا ئۆجالانە تیرۆریستەی کەئامادەسازی خۆی دەردەبڕێ بۆ جێ بەجێکردنی هەر فەرمانێك داوای لێبکەن بەرامبەر رزگارکردنی ملی لەپەتی سێدارە. دووەمیشیان: ئەو عەبدوڵڵا ئۆجەلانەی کەلەمیانەی پەیامە ئایدیۆلۆژییەکەی داوییەتی بەسەرۆکی دادگا دەیەوێت جەخت بکاتەسەر کەسایەتییە سیاسییەکەی بەسیفەتی رێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان کە تێدەکۆشێت بۆ وەدەستهێنانی یەکێتی دیموکراتی بەرێگای ئەو کۆمارە دیموکراتییە یەکگرتووەی کەتورك و کورد لەپەرلەمانێکی نوێ وەك ئەنجومەنێکی دامەزرێنەر و دەستوورێکی تازە بۆ کۆماری تورکیای دیموکراتی، بەشداری بکەن(٤٨).

سەرەتا، ئەگەر چاوێك بخشێنین بەوەڵامەکانی ئۆجالان لەسەر پرسیارەکانی سەرۆکی دادگا لەمیانەی دادگاییکردنەکەیدا، بۆمان ساغ دەبێتەوە بۆچوونەکانی (فیکرەت بیلا) بەڕێوەبەری نووسینی رۆژنامەی (میللییەت) تا چەند راستە. چونکە ئۆجالان لەیەکەمین دانیشتنی دادگاییکردنەکەیدا ویستی جەخت لەسەر ئەوە بکات کەئەو رێبەرێکی سیاسییە نەك تیرۆریستی، ئەمەش بەوەی کەدانی نا بەبەرپرسیارێتی بەرامبەر هەموو ئەو کردەوانەی ئەنجامی داوە، جگە لەوەش دانی پێدانا رەنگە پتر لەوەش کەئەوان دەڵێن کردەوەی جێ بەجێکردبێ. لەدووهەمین رۆژی دانیشتنەکانیشدا، ئۆجالان بلاّوی کردەوە کەزۆربەی رێبەرانی تورکیا، وەك: تورگۆت ئوزال و مەسعوود یەلماز و نەجمەدین ئەربەکان هەوڵیاندا وەك رێبەرێکی سیاسی و بەهۆی کەسانیترەوە پێوە پێوەندی پێوە بکەن لەپێناو ئاگربەست و چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەشێوەیەکی ئاشتییانە، ئەگینا چۆن دکارێ ئەو رێبەرانە و سەرەڕای چەندین لەو سیاسەتمەدار و رۆژنامەنووسانەی چاویان پێکەوتووە، قسە لەگەڵ تیرۆریستێکدا بکەن؟! ئەمەو لەسێهەمین رۆژی دادگاییکردنەکەشیدا، ئۆجالان هەوڵیدا جەخت بکاتەوە سەر سیفەتە سیاسی و رابەرایەتییەکەی لە پارتی کرێکارانی کوردستاندا بەرێگەی یارمەتی و کۆمەکی ماددی و لۆجستی و مەشقپێکردنی شەرکەرانی لەلایەن زۆربەی ولاّتانی ئەوروپییەوە، سەرەڕای پێوەندیکردنی ژمارەیەك لەپیاوانی سیاسی خۆرئاوا پێوەی بۆ راوێژکردن لەگەڵیدا دەربارەی کێشە نێدەوڵەتییە جیاجیاکان.

ئۆجالان بەو زانیارییانەی باسی کردن لەبارەی یارمەتیدانی لەلایەن ولاّتانی خۆرئاواوە ویستی ئەو کێشە زانراوانەی لەمەڕ ئەم مەسەلەیەوە کەپێشتر رۆژنامەکانی جیهان بلاّویان

کردبوونەوە، روون بکاتەوە. ئەمەش لەپێناو دوو ئامانج: یەکەم- وریاکردنەوەی ئەو دەوڵەتانە بە زەرووەتی پابەندبوون بە گفت و بەڵێنیان بۆ پاراستن و رزگارکردنی ئەگینا هەموو کارتەکانیان ئاشکرا دەکات، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە پەیامێکی نادیارە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: کە ئۆجالان تاوەکو نهۆ نەیویستووە ناوی بێنێ- بەزەرووەتی کارکردن بەوەی پێش گرتنەکەی لەنایرۆبی و دانەوەی بەئەستەموولْ، لەسەری رێککەوتن. لێرەشەوە بۆچوونێك بە لای زۆربەی ئەو تورکانەی کە بایەخیان بە کێشەی کورد داوە، هەیە جەخت لەسەر ئەوە دەکات: کەهەموو وتەکانی ئۆجالان لەو دادگایە پلانرێژی و لێتوێژینەوەیان بۆ کراوە بۆ وەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجگەلێکی دوور لەسەر هەردوو ئاستی ناوچەیی و نێودەوڵەتی(٤٩).

## باسی سێهەم
## چارەسەر: کۆمارێکی تورکیایی دیموکراتی فیدراڵی

ڕەنگە ئەوە کارێکی بەسوودبێت کێشەی گەلی کورد بخرێتە بەر باس و گفتوگۆوە، ئەو گەلەی کەتاوەکو ئێستا قەوارەیەکی سەربەخۆی سیاسی نییە، ئەگەرچی ژمارەی دانیشتوانی خاکەکەی لەزۆرێك لەژمارەی دانیشتوانی دەوڵەتە سەربەخۆکانی جیهان زۆرتر و خاوەنی مێژوو و پێناسەی نەتەوەیی و کلتوور و نەریت و زمان و خاکی خۆیەتی کەوا پێویست دەکات لەرووی تیۆری و واقیعەوە مافی ئەوەی هەبێت دەوڵەتێکی سەربەخۆی تایبەت بەخۆی لەسەر زێد و نیشتمانەکەی بۆ فەراهەم بێت.

لەگەڵ ئەوەی گەلی کورد دەیان شۆڕشی لەدژی داگیرکەران و چەوسێنەرەکانی بەرپاکردووە بۆ داکۆکیکردن لەخاکی نیشتمانەکەی و بۆ وەدەستهێنانی ئەو پێناسە نەتەوەییەی داگیرکەران و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش حاشایان لێکردووە دوای ئەوەی کێشەکەی بووە گەمەیەك بەدەست ئەو دەوڵەتە بچووك و گەورانەوە بۆ ئەوەی لەرێگەی ناکۆکییەکانی رێبەران و رێکخراوەکانیان وەکو کارتێکی سازش یان گوشار جارێك بەنواندنی پشتیوانی بۆ کێشەکە و جارێکیش بۆ دەستبەردان لێی بەپێی بەرژەوەندی و پلان و وارو وردەکانیان لەناوچەکە و لەجیهان بەکاری بێنن، ئەوا گەلی کورد هەمیشە بۆتە قوربانی ئەو سیاسەتە قۆناغبەندی و ستراتیژییە زاڵبووانەی سەر ناوچەکە و جیهان

بەڵام کێشەی کورد ئەمڕۆ تەنها گوزارشت لەمەحاڵبوونی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی ناکات، بەڵکو گوزارشت لەو ژیانە پڕ ئێش و کارەساتاوییەش دەکات کەکورد بەسەری دەبات لەسای ئەو دەوڵەتانەی خاك و دانیشتوانەکەیان دوو جاران دابەش کرد: جارێکیان لە سەروبەندی شەڕ و ململانێی سەفەوی و عوسمانییەکان لەساڵی ١٥١٤ ئەو دەمەی کوردەکان بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان لەئێران بوونە هاوپەیمانی شیعە سەفەوییەکان و بەشێکیشیان کە لە ویلایەتە عوسمانییەکان نیشتەجێ بوون پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی سوننەیان کرد. هەرچی دابەشکردنی دووەمیش بوو، ئەوا لەدوای شەڕی جیهانی یەکەمەوە روویدا ئەو کاتەی کە دەوڵەتە نەتەوەییەکان لەناوچەکە دامەزران و کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانیش دووبارە دابەش کران.

خراپترین هەڵسوکەوتیش ئەوەیە: کورد لە لایەن کاربەدەستانی تورکەوە دەبیینن، ئەم کاربەدەستانە هەربەوە نەوەستان هەموو شێوازێکی سەرکوتکردن و زۆرداری لە دژی کوردی ئەم وڵاتە بەکاربێنن، بەڵکو لەوەش زیاتر حاشا دەکەن گەلێك لەتورکیا بوونی هەبێت بە ناوی کوردەوە، یاخود پێناسەیەك هەبێت بە ناوی نەتەوەی کوردەوە، بگرە بە شێوەیەکی بەردەوام و رێك و پێکیش هەوڵ دەدەن بۆ سڕینەوەی هەموو ئاسەوارێکی مێژوویی گەلی کورد و کلتوور و تایبەتمەندییەکەیان بە شێوەیەکی وەها لە ناو بۆتەی دەوڵەتی تورکیا و کۆمەڵگەی تورکیدا بتوێنەوە. سوپای تورکیاش بۆ جێ بەجێکردنی ئەم سیاسەتەی کەوا ماك و ناوەڕۆکی لەلایەن (کەماڵ ئەتاتۆرك) دامەزرێنەری دەوڵەتی تورکیاوە دارێژرا، رۆڵی سەرەکی دەگێڕێت، چونکە ئەم سوپایە خۆی بە پارێزەری دەوڵەتی تورکیا و بەرپرسی یەکەم لە زامنکردنی یەکێتییەکەی و پاراستنی ئەو یەکێتییە دەزانێت(٥٠).

وێڕای ئەوەی کە زۆربەی شرۆڤەکارانی جیهان هۆی سەرنەکەوتنی ئەو بزوتنەوە کوردییە شۆڕشگێڕییانەی کە تێکۆشاون لە پێناو رزگاری و بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی گەلەکەیان، دەگێڕنەوە بۆ ململانێ نێوخۆییەکانیان لەلایەك و هەروا بۆ زۆری دوژمنانی کورد و کوردستان لەلایەکی ترەوە، ئەوا میرنشینە کوردییەکان لە سەدەی شانزدەهەمەوە لەشەڕ و ململانێدا بوون بە بێ ئەوە هیچ کامێکیان بە تەنیا بتوانێ دەستبگرێ بەسەر کوردستانی گەورەدا، یان بە هەموویانەوە بتوانن قەوارەیەکی سەربەخۆ پێکبهێنن، بە شێوەیەك وایلێهات ململانێ نێوخۆیی خێڵەکی- ئایینی یان لادێیی- مەدەنی یان عەشایەری- کلتووری یان چەپڕەوی- نەتەوەیی یاخود رەوتی کلاسیکی و رەوتی میللی بووە خەسڵەتی مێژووی کورد، چونکە سەرکردایەتییە خەباتگێڕییەکانی کورد خاوەنی ئەو هزرە رێکخستنە سیاسییە نەبوونە بڕوای بە دیموکراتییەتی ناوخۆیی و دیالۆگ و کراوەیی دیموکراتی هەبێت لەسەر ئاستی پێوەندییە دەرەکییەکان، چونکە ئەو سەرکردایەتییانە هەموو شتێکیان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خودی خۆیان و بۆ بەتەنگەوە هاتنی بەرژەوەندی و کاریگەری خۆیان بەکاربردووە.

لە ٢٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٨ عەبدوڵڵا ئۆجالان رێکخراوی پارتی کرێکارانی کوردستانی دامەزراند و لە ١٥ی ئابی ساڵی (١٩٨٤)یش چووە خەباتی چەکدارییەوە لە دژی هێزەکانی تورکیا لە پێناو دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی ماویزم لەناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا(٥١).

هەرچەندە ئەم ڕێکخراوە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا سەرکەوتن لـە دوای سـەرکەوتنی بەدەستهێنا، تاوەکو توانی لـە سـاڵی ١٩٨٦ ناوچـەی (ئـاگری) بـە ناوچـەیەکی ڕزگـارکراو ڕابگەیەنێت، وەلیّ هێزە چەکدارەکانی تورکیا هەموو قورساییەکیان خستەسەر ناوچەکەوە بـۆ قەڵاچۆکردنی ئەم ڕێکخراوە، بە شێوەیەکی وەها توانییان لە شوێنێکی شـاخاوی تەنگەبـەر و سەخت لە نزیك چیای جوودی ئابڵووقەی بدەن، بەڵام ڕێکخراوەکـە لـە لایەکـەوە پەیوەندییـە دەرەکییەکانی لەگەڵ زۆربەی وڵاتانی جیهـان بـەهێزکردبوو، لەلایـەکی تریشـەوە توانیبـووی هەموو ئەو بزوتنەوە کوردییە چەپ و ڕاستانە لەناوچەکە- بۆ چەسـپاندنی سـەروەری ڕەهـای خۆی- لەناو ببات، بۆیە کارێکی ئەستەم بوو بە لای هێزەکانی تورکیاوە بتوانن ئەم ڕێکخراوە لەناو ببەن، بە تایبەتی دەوڵەتانی دراوسیّ و یۆنان و ئەڵمانیاش لە ڕووی ماددی و مانـەوی و لۆجستییەوە یارمەتییان دەدا.

هەڵوێستی ئۆجالان لە دوای ڕووداوی فڕاندنەکەی و دەرەنجامەکانی تـەك ئـەم ڕووداوە، هــەمان پرسیاری هورووژاند: ئایا گەلی کورد شایستەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی هەیە بۆ خۆی؟!

نووسەر و سیاسەتمەداری کورد دکتۆر مەحموود عوسمان، وەڵامی ئـەم پرسـیارە بـەم شـێوەیە دەداتەوە: کورد خۆیان نەتەوەیەکی سەربەخۆن وەکو نەتـەوەی عـەرەب. چارەسـەری بنـەڕەتی و تەواوکاریش بەدیدی من، ئەوەیە: دان بنرێت بە مافی چارەی خۆنووسینی کـورد و دامەزرانـدنی قەوارەی سەربەخۆیان، چونکە گەلی کورد بەخۆی نەتەوەیەکی پێکهێناوە، وەك هەر نەتەوەیەکی تر تایبەتمەندییەکانی خۆی هەیە و ئەویش وەك گەلی عـەرەب بەپێچـەوانەی ویسـت و ئـیرادەی ڕۆڵەکانی دابەشکراوە، جارێکیان لەسەدەی شانزدەهەم لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتی عوسـمـانی و فارسی و پاشانیش لەدوای شەڕی جیهـانی یەکـەم لـەنێوان ئـەو دەوڵەتانـەی تیایانـدا دەژی، دابەشکراوە. کورد لەمافە ڕەواکانیان بێبەشن و وەکو هاوڵاتی پلە دوو هەڵسـوکەوتیان لەگەڵـدا دەکریّ و هەر کاتێـك داوای ئـەم مافانـەیان بکـەن تەنانـەت لەچوارچـێوەی ئـەو دەوڵەتانـەش کەدیموکراتی و حوکمی یاسایان تیا سەروەر نییە، هێز لەدژیان بەکار دەبەن(٥٢).

بەڵام تورگۆت ئوزال بۆ ڕۆژنامەنووس (حەسەن بولور) جەختی لەسـەر ئەمـە کـردەوە کـە "ئەو (واتە: ئوزال) خۆی بیرۆکەی فیدریالیزمی تورکی- کوردی بۆ یەکـەمین جـار لەمێـژوودا نەخستۆتە بەرباس، بەڵکو لەلایەن ئـەوانیترەوە ئـەو مەسـەلەیە خرایـە بـەرباس- مەبەسـتی عەبدوڵڵا ئۆجالان سەرۆکی (PKK) و لایەنگرانی بیرۆکـەی دامەزرانـدنی کۆمـاری دووەمـە

لەتورکیا-، منیش پێم گوت: ئەگەر بیرۆکەیەکی نوێیـان لـەبارەی فیدراڵییـەوە هەیـە، دەبـا بیخەنە بەر باس"(٥٣).

کەچی، مردنی کتوپڕی ئۆزال لە ١٩٩٣/٤/٧ هەموو ئەو هیـوا و هومیدانـەی پەیوەسـت بوون بە بەچارەسەری ئاشتییانەی کێشـەی کـورد، تـووڕ هەڵدایـە نـاو دەریـای مەڕمـەڕەوە، ئەگەرچی ئۆجالان یەکلایەنە ئاگربەستی جاڕدابوو بۆ رەخساندنی هەل لەپێش ئۆزال و ئەوانەی بڕوایان بەبیرۆکەی فیدرالیزمی هەیە بۆ باسکردنی.

لێرەشەوە، ساڵی ١٩٩٣ لەچاو کێشەی کورد، ساڵی گۆڕانکارییە هـزری و سـتراتیژییەکان بوو. ئەوسا، هەڵبژاردنی تانسۆ چیللەر- مامۆستای ئابووری لەزانکۆی ئەنکـەرە و ئەنـدامی دەستەی کارگێڕی حیزبی رێگای راست- بەسەرۆکی ئەو حیزبە لـەپاش هەڵبـژاردنی (سـلێمان دیمیریـل)ی سـەرۆکی پێشـووی بەسـەرۆکی کۆمـار لـەدوای مردنـی ئـوزال، وایکـرد هێـزە چەکدارەکانی تورکیا زیاتر کاریگەرییان هەبێت بەسەر کاروباری گشـتی لـەتورکیا لـەئاکامی پەیوەندی پتەوی نێوان هەرسێ سەرۆك: (سلێمان دیمیریل) سەرۆکی کۆمار و (چیللەر)ی سەرۆك وەزیران و (دۆغان گونش)ی سوپاسالار. ئەمە بووە هۆی وەشاندنی چـەند گـورزێکی کوشـندە لەدژی هێزەکـانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان لەلایـەك، لەلایـەکی دیکەشـەوە بیرۆکـەی داخستنی پارتی دیموکراتی ئازاد (DEP)ی کـوردی خرایـە روو کـە (١٥) نوێنـەری کـوردی لەسەر ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیـای لەپەرلـەمان هـەبوو، "بەتۆمـەتی هاوکـاری و یارمەتیـدانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتانی قەدەغـەکراو". لەهـەمان کـات ئـەو پرسـە دەستپێکرد کەناویان لێنا (پرسی ئەنکەرە)، ئەویش، ئەوەبوو کاتێك (چـیللەر) بانگهێشـتی هەردوو رابەری کوردی عێراق: مەسعوود بارزانی سـەرۆکی (پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان) و جەلال تاڵەبانی سەرۆکی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) کرد بۆ مەسەلەی ئاشتەوایی نێوانیان و دانـی پاسـەپۆرتی دیبلۆماسـی پێیـان و رێگـەی پێـدان بـۆ سـەفەر بـەرێی ئاسمانییـەوە لەفڕۆکەخانـەی دیاربـەکری تورکیـاوە، لەگەڵیانیشـدا رێککـەوت بـۆ بەگژداچـوونی پـارتی کرێکارانی کوردستان"(٥٤).

هەر لەو سـەروبەندەش، چـیللەر هەوڵیـدا چـەند رێککەوتننامەیـەکی سـەربازی لەگـەڵ ئیسـرائیل ببەسـتێ "و داوای ئەزموونـە هەواڵگرییەکـەی بکـات بـەئامانجی قەڵاچـۆکردنی چـالاکییەکانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان لـەتورکیا و هـەردوو جیهـانی عـەرەبی و ئیسلامی"(٥٥). پاشان ئەو زنجیرە تیرۆرکردنە سیاسییانە روویاندا کەپێیان دەگوت (کوشتنی

نەناسراو) و رووبەڕووی پیاوانی کاری کورد بوونەوە لەمیانەیاندا تیاچوون. هەر لەو رۆژگـارەی چیللەریشدا نێوبژیوانان داوای هێزە چـەکدارەکانی تورکیایـان لەمـەڕ بەرقـەراربوونی ئاشـتی لەناوچـەی باشـووری رۆژهـەلاتی تورکیایـان گەیانـدە عەبـدوڵلا ئۆجـالان سـەرۆکی PKK کەئەمیشیان درێژەی دابوو بەپابەندبوونی بەئاگربەست لەپێناو سەرکەوتنی پرۆسەی ئاشـتی و راشیگەیاند کەئەو وازی لەداوای خۆی بۆ سەربەخۆیی و دامەزراندنی کۆماری کوردی هێناوە، بەڵکو پێشی وایە بەرێگەی نوێنەرانی کورد لە پەرلـەمانی تورکیـا بچـێتە کـۆڕی وتووێـژەوە"(٥٦)، ئەمەش وایکرد دەسەلاتدارانی تورك نوێنەرەکانی پارتی دیموکراتی ئـازادی کـورد بەخیانـەتی گـەورە تۆمەتبار بکەن و حەسانەتی پەرلەمانییان لیّ وەربگرنەوە بەبەندکردنیان و دانیان بەدادگا و سـەپاندنی حوکمی بەندکردن بەسەر هەریەکەیان بۆ ماوەی نێـوان لـە ٦ سـالّ بـۆ (١٥) سـالّ. لەبەرامبـەر ئـەم کارەدا، عەبدوڵلا ئۆجالان پەیامێکی بـەرزکردەوە بـۆ ئەنجومـەنی ئـەورووپی و کـۆنگرەی ئاسـایش و هاوکاری ئەورووپی و نەتەوە یەکگرتوەکان و هەروا بۆ هەریەك لەویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و بەریتانیا و تیادا داوایکرد " سنوورێك بەرامبـەر پێشـێلکارییەکانی مـافی مـرۆڤ لـەتورکیا دابنـێن بەگرتنی نوێنەرە هەڵبـژێردراوە کوردەکـان و رەوانـەکردنیان بـۆ پێشـی دادگـا و جەختیشـی کـردەوە کەهەردوو گەلی تورك و کورد دەکـرێ لەچوارچـێوەی دەوڵـەتێکی یـەکگرتووی فیدراڵیـدا - وەك ئـەو سیستمەی لەئەمریکا یان سویسرا یان ئەسپانیادا بەڕێوەدەچێ- پێکەوە بژین"(٥٧).

هـەر لـەو ماوەیـە، کۆمـەڵێك لەپسـپۆر و مامۆسـتایان لـەزانکۆکانی تورکیـا، لـەپێش هەمووشیانەوە پۆفیسۆر دکتـۆر محەمـەد ئالتـان مامۆسـتای زانسـتە سیاسـییەکان لـەزانکۆی ئەنکەرە، بیرۆکەی (کۆمـاری دووەم)ی خسـتە بـەرباس، کـەواتا: "چاوخشـاندنەوە بـەهزرەکانی کەمالیزم بۆ ئەوەی لەگەڵ لۆژیکی سـەردەمدا بگـونجێن و هـەم ببنـە چـرایەك بۆمـان لـەژیانی نوێماندا دوور لەقەدەغە سیاسییەکان و هـەم بەدەسـپێکیش بـەرەو تێکـەڵبوون بـەو یەکێتییـە ئەورووپییەی کەتورکیا لەزووەوە هەوڵدەدات بچێتە ریزییەوە"(٥٨).

ئەم بیرۆکەیەی دکتۆر ئالتان دەنگدانەوەیەکی گەورەی هـەبوو لـەناو روونـاکبیران و میـدیاکاران و پیاوانی کار و ژمارەیەك لەسیاسەتمەدارانی تورك، لەم لایەنەوە(قورقۆرت ئوزال)ی برا ناوەنجی سەرۆکی کۆچکردوو تورگۆت ئوزال و یەکێك لەوەزیرانی ناوخۆی پێشووی تورکیـا بەلێـدوانێك رایگەیانـد کـە: "ئەو پێی وایە کاتی ئەوە هاتووە چاو بخشێنرێت بەزۆرێك لەپرنسیپەکانی ژیـانی سیاسـی و هزریمانـدا بەوەرگرتنی پرنسیپە دیموکراتییەکان بۆ ئەوەی لەگەڵ رەوتی سیستمی نێودەوڵەتی هاوچـەرخ بگـونجێن و ئەوە کارێکی خراپ نییە تاوتوێی ئەو بۆچوونە بکەین کـەئۆجالان بـۆ چارەسـەرکردنی ئاشـتییانەی

کێشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا[٢٤] خستوویەتییە بەرباس و ڕێگری دەکات لەخوێنڕشتن و ماڵ و سامانێکی زۆریش دەگێڕێتەوە و ئەمن و ئاسایشیش فەراهەم دەکات"(٥٩).

جگە لەوەش (ساقیب سابانچی)ی پیاوی ملیاردێر و کۆڵەگەی دووەمی کار لەدوای هەردوو جمکە پیشەسازی و ئابوورییەکەی (قوٚج)ی تورکی، پەرتووکێکی لەبارەی کێشەی کورد لەتورکیا بڵاوکردەوە، تیادا بانگەشەی کرد بۆ دانوستان و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کەسایەتییە کوردە ناسراوانەی کە بە پێناسە سەر بە پارتی کرێکارانی کوردستان نین، بە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی فیدراڵی لەچەشنی ئەو سیستمە فیدریالیزمەی لە ئەسپانیا هەیە.

لە ١٤ی ئابی ساڵی ١٩٩٤یشدا (جەم بۆینەر) سەرۆکی یەکێتی پیاوانی کاری تورك (توسیاد) و کەسێك لەپیشەسازیکارە ناسراوەکان، (بزوتنەوەی دیموکراتی نوێ)ی دامەزراندو دوای ئەوە بە مەبەستی پرۆپاگەندەکردن بۆ بزوتنەوە تازەکەی بەر لەوەی بیکات بەحیزبێکی سیاسی، خۆی و خێزانەکەی بە ئۆتۆمۆبیلێکی پاسی سەر بە کۆمپانیاکەی گەشتێکی بە هەموو وڵاتی ئەنادۆڵدا کرد و ئەوە مایەی کت و پڕییەك بوو بە لای رای گشتی تورکیاوە پێش ئەو هەڵبژاردنە گشتییانەی لەساڵی ١٩٩٥ بەڕێوەچوو، بەم لێدوانەی تاکید بکاتە سەر ئەوەی کە: "دەوڵەتێك وەك تورکیا لە گشت جیهاندا نییە بە درێژی (١٠) ساڵی رەبەق بۆمبی داباراندبێتە سەر خاکەکەی خۆیدا. دەبێ ئەوەش بزانین کەدانپێنانمان بە مافی کورد کارێکی شۆڕشگێڕییانە نییە، بەڵکو ئەمە شێوازێکە بۆ گێڕانەوەی ئەو مافەی لەم گەلەمان دزی کاتێك کۆمارەکەمان دامەزراند، نەخوازە کەمالیزمی مرد و تێپەڕی، بۆیە ئیمرۆ ئێمە بۆ سەر لە نوێ چاککردنەوەی بارودۆخەکان لە تورکیا پێویستمان بە (پیرۆسترویکا)یەکی تورکی هەیە"(٦٠).

بەڵام، ئەو ئەکادیمیزان و رووناکبیر و میدیاکار و سیاسەتوانانەی هاوسۆزییان هەبوو لەگەڵ کێشەی کورد باجێکی گرانیان لەئازادی خۆیان بەگرتن و دەربەدەری و بێکاری دایەوە ئەوەبوو حکوومەتەکەی (تانسۆ چیللەر) (پارتی کاری دیموکراتی DEP) داخست بە تۆمەتی "پشتگیریکردنی حیزبەکە لەناو ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیا (پەرلەمان) لە کردەوەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، دوای ئەوەی (لەیلا زانا) نوێنەری دیاربەکر لە سەر لیستی حیزبی ناوبراو پێی داگرت لە سەر سوێندخواردنە یاساییەکەی لە پەرلەمان بە زمانی کوردی کە ئەویش پێچەوانەی

---

٢٤- کێشەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، ئەم دەستەواژەیە بەرەسمی لەتورکیا بۆ کێشەی گەلی کورد لەم وڵاتە بەکاردەبرێت.(وەرگێڕ)

دەستووری تورکیایە بۆ ساڵی ١٩٨٢، وەك هەوڵێکی بۆ بڵاوکردنەوەی دوالیزمی- دوانەیی- زمان و جیابوونەوە لە تورکیا، سەرەڕای ئامادەبوونیان (واتە: نوێنەرە کوردەکان) لەکۆنگرەی پاریس ساڵی ١٩٩٣ کەتایبەت بوو بە باسکردنی ڕێگەچارەی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد(٦١). دوای ئەوەش بڕیاردرا بە داخستنی حیزبی کاری دیموکراتی DEP و حەسانەتی پەرلەمانیش لەنوێنەرە کوردەکان سەندرایەوە بۆ ئەوە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی نیمچە سەربازی دادگاییان بکات و ئەوە بوو دادگای ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٥ حوکمی بەندکردنی بۆ ماوەی جیاجیا بۆ هەریەکەیان لە ٦ ساڵەوە بۆ ١٥ ساڵ دەرکرد.

لەبەرامبەر ئەو هەموو ڕووداوە دراماتیکی و سیاسەتە ستراتیژییانەی دەوڵەت پیادەی کردن بۆ حاشاکردن لە بوونی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، پارتی کرێکارانی کوردستانیش کۆمەڵێك بۆمبی ئادەمی خۆی کەبریتی بوو لەکۆمەڵێك لە پێشمەرگە گیانلەسەردەستەکانی لە چەند شارێکی گەورەی تورکیا بڵاوکردەوە. ئەو پێشمەرگانە خۆیان لە ناو بنکەکانی پۆلیس و شوێنگەلی خڕبوونەوە سەربازییەکان لە وێستگەکانی شەمەندەفەر و گواستنەوەی ڕێبوارەکان تەقاندەوە. ئەم کارەش فەرتەنەیەکی سیاسی گەورەی لەناوەندە سەربازی و سیاسییەکانی تورکیا و ئەو ڕێکخراوانەش کەهاوسۆزییان لەگەڵ کێشەی کورد هەیە، نایەوە. دەبینین لەکاتێکدا (پارێزگاری حوکمی عورفی) لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕێ و شوێنی ئەمنی توندی گرتەبەر لە شار و شارۆچکە و گوندەکان و هاتوچۆی خەڵکی و گواستنەوەی شت و مەك و خواردەمەنی بۆ هەر (٨) ئەو پارێزگایانەی حوکمی عورفی دەیانگرێتەوە، کەئەوانیش: (دیاربەکر و مووش و تونجلی و عەزیز و باتمان و شەرناخ و بینگۆل و هەکاری) بوون، قەدەغەکرد، کەچی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی ئەوروپی، ئەو کارە تیرۆریستییانەیان شەرمەزارکرد کە بۆمبە ئادەمییە کوردییەکان جێ بەجێیان دەکەن و ژمارەیەکی زۆر قوربانی لە خەڵکی سیڤیلیان لێ دەکەوێتەوە و داوایانکرد سنوورێك بۆ ئەم کارەساتە مرۆییە دابنرێ و لە هەمان کاتیش داوایان لە حکوومەتی تورکیا کرد ڕێگەچارەیەکی ئاشتیانەی دیموکراتی بۆ دۆزی کورد لە تورکیا بدۆزێتەوە"(٦٢).

بەشی بەحاڵی (پارتی سۆشیالیستی کورد PSK)یش بەسەرۆکایەتی (کەمال بۆرکای)ی خەنیمی گەورەی ئۆجالان، ئەوا چونکە بۆرکای بۆ وەدەستهێنانی مافی سیاسی و کلتووری گەلی کورد لەتورکیا، بانگەشە بۆ خەباتی سیاسی دەکات، ئۆجالان شەڕێکی کوێرانەی لەدژی بەرپاکرد بەشێوەیەك ناوبراو چاری نەما ئەوە نەبێت بەرەو ئەڵمانیا کۆچ بکات و لەوێوە درێژە بەخەباتی ئاشتیانەی خۆی بدات بەم بەیاننامەیەی کەتیادا جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە: "تاقمی سەربازی

دەسەڵاتدار لەتورکیا کێشەی گەلی کورد لەم وڵاتە بەبزووتنەوەیەکی تیرۆریستی وێنا دەکات و لە میانەی شەڕێکی پیس و بۆگەناویدا کردەوەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکاتە پاساوێك بۆ جێبەجێکردنی پلانە داڕێژراوەکانی لەچۆڵکردنی هەزاران گوندی کورد لەدانیشتوانیان و راگوێستنی ملیۆنەها کورد لە زێد و شوێنی دانیشتنی خۆیان لە کوردستان بەرەو ناوچەکانی تر بەئامانجی تێکدانی هاوسەنگی لە نێوان هەردوو گەلی تورك و کورد لەلایەك و بۆ زاڵبوونی دەسەڵاتی هێزە کۆنەپەرست و شۆفینیست و عەسکەرتاریەتەکان بە سەر هێزە دیموکراتی و سۆشیالیستی هەوادارانی ئاشتییەوە لە کۆمەڵگەی تورکی لە لایەکی ترەوە. ئەمەش بۆتە هۆی لاوازبوونی ئەو هێزانەی کە-وەکو ئێمە- بانگەشە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتییانەی دۆزی کورد دەکەن و بۆتە هۆی رێگەدانیش بۆ هەڵکشانی ئەو هێزە سیاسییانەی توندوتیژییان کردۆتە ئامرازێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، وەك رێکخراوی PKK. ئەم رێکخراوە لەدوای دەسپێکی ١٥ساڵ لەمەوبەری بەکردەوە چەکدارییەکانی، دوور و نزیك ئاشنای ئەو هەڵانەی بوون کە دەرهەق بەخودی گەلی کورد ئەنجامی داون. لێرەشەوە، ئێمە پێمان وایە بزوتنەوەی گەلی کورد لە تورکیا- چ زوو بێت یان درەنگ- روو لە گرتنەبەری چارەسەری ئاشتییانەی سیاسی دەکات و رژێمی عەسکەرتارییەتی تورکیش دەبێ لە دواییدا ملکەچی ویست و ئیرادەی جەماوەری گەل بێت و دەست لەچارەسەری سەربازیی هەڵبگرێت کە کارێکی وایکردووە ئابووری تورکیا دابڕووخێت و کاروانی دیموکراتی لە وڵات زەبری بەربکەوێت و گەندەڵی و توندوتیژی و باندەکانی مافیا و بازرگانانی مادده سڕکەرەکان بڵاوببنەوە و تورکیاش لەو کۆمەڵگە شارستانییەتە دوور بکەوێتەوە کەڵێی دەخوازێت کێشەی کورد بەرێگەی دیموکراتی و ئاشتییەوە چارەسەر بکات.. ئەگینا تورکیا لەناو ئەو کۆمەڵگەیە جێی نابێتەوە"(٦٣).

جا، ئایا چوارچێوەی ئەم رێگەچارە دیموکراتییە ئاشتیانەی کێشەی کورد لە تورکیا چییە؟!

نووح ئاتەش، نووسەری بەرەگەز کوردی سەر بەحیزبی دیموکراتی میللی (HADEP)ی کوردی، جەخت لەمە دەکات کە: "دەستەواژەگەلی (واقیعی کورد) و (هاونیشتمانێتی دەستووری) و (مافی کلتووری) و (دانپێنان بەپێناسەی باڵا و پێناسەی نزم) و (کۆماری دیموکراتی) و (پێوەرە دیموکراتییەکانی کۆنهاگن)، ناشێ ببنە چارەسەرییەکی دیموکراتییانە و تەندروستی کێشەی گەلی کورد. چونکە ئەو چارەسەرییە تەنها پەیوەست نییە بەمافی تاکەوە، بەڵکو پەیوەستە بەهەموو ئەو مافە کۆمەڵایەتییانەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان دانی پێدا ناون، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە: ئەو دەستەواژانە نیوەی هەقیقەتە ناتەواوە کوردییەکە پێکدێنن، چونکە هەقیقەتە کوردییەکە بەتەواوی جەخت دەکاتە سەر دانپێنان بەمافی چارە نووسین گەلی کورد، ئەو مافەی کە هەموو

گەلانی جیهان پێوەی شادن لە (باسك)ەوە بگرە تــا (کاتــالان) و (گلــیچ) و (فــالۆن) و (فلامــان) و.. هتد. کەوا بوو لەبەرچی ئەم مافە بۆ کەمایەتی تورك لە (قوبرس) و ئەلبانەکان لە (کۆسۆڤا) و هــەروا بۆ فەلەستینییەکان و باسکەکانیش رەوا بێت، بەڵام بۆ کورد پاوان و قەدەغە بێت؟!"(٦٤).

لێرەشەوە، کە تانسۆ چیللەر لە ساڵی ١٩٩٣ بووە سەرۆك وەزیرانی تورکیا، لەسەر بەرزترین ئاست پێوەندییە سیاسییەکانی خۆی دەستپێکرد "بۆ ئەوەی ئۆتۆنۆمییەك لە شێوەی ئەوەی (باسك) هەیانــە بەکوردی تورکیا بدات"(٦٥)، بەڵام گوشاری هێزە چەکدارەکانی تورکیا و پێداگرتنیان لەسەر چارەسەری سەربازی دۆزی کورد لەتورکیا، وایانکرد (چیللەر) لەساڵی ١٩٩٤ لەم مەسەلەیە پاشگەز بێتەوە.

لەپاش هەڵوەشاندنەوەی پارتی کــاری دیمــوکراتی و زینــدانیکردنی پەرلــەمانتارەکانی، کوردەکــان حیزبێکی تریان بەناوی (حیزبی دیموکراتی میللی HADEP) دامەزراند و لە ٢٤ی کانوونی یەکــەمی ساڵی ١٩٩٥ لەژێر دروشمی: "دانی فراوانترین مافی کارگێڕی و ئابووری بەئیدارە ناوچەییەکان لــەپێناو زامنکردنی نامەرکەزی ئیداری" چووە ناو پرۆسێسە هەڵبژاردنە گشتییەکانەوە و تیــادا بــە (٥,٦٪)ی دەنگەکان سەرکەوت.

هەرچەندە (HADEP) بۆ زامنکردنــی نوێنــەرانی لــە پەرلــەمان نــەیتوانی لەســنووری (١٠٪) دەرباز بێت، بەڵام توانی سەرۆکایەتی (٣٨) شارەوانی بەدەست بێنێ، لەنێویاندا (٤) ویلایەتی گەورە لەباشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بوو کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن، ئەو (٤) ویلایەتەش بریتی بوو لە: دیاربەکر، مووش، تونجلی، باتمان. هــەروەها ســەرۆکایەتی زۆربــەی شارەوانییەکانی شارۆچکە کوردنشینەکانی: عەزیز (ئازیخ) و (ســعرد) و (شــیرناك) و (ئــادی یامان) و (هەکاری)یشی دەستەبەرکرد.

وەلێ، دادوەری گشتی کۆماری (ووراڵ ساواش) داوای لە دژی بەرپرسانی ئــەم حیزبــە بــۆ بــەردەم دادگای ئاسایشــی دەوڵــەت بــەرزکردەوە بــە نیــازی داخســتنی بــەبیانووی پشــتگیریکردنی لــەپارتی کرێکارانی کوردستان و تەرخانکردنی توانا ئیدارییەکانی بــۆ دامەزرانــدنی شــەڕکەرانی PKK لــەناو شارەوانییەکانی خۆی، سەرەڕای دامەزراندنی ئــەو ســەربازییانەی کــە لــە ســوپای تورکیــا لــە لایــەن حکوومەتەوە دەرکراون. بەڵام دادگا بڕیاری بێتاوانی بۆ بەرپرسانی حیزبەکە دەرکــرد، چــونکە نــاوبراو بەڵگەی تەواوی سەلمێنراوی بەدەستەوە نەبوو.

ئەو دەمەی نەجمەدین ئەربەکان رابەری (حیزبی گەشەپێدان)ی خاوەن رەوتی ئیســلامی هاوپــەیمانی لەگــەڵ حیزبــی رێگــای راســت بەســەرۆکایەتی خــاتوو چــیللەر لــە ١٥ی حــوزەیرانی ســاڵی ١٩٩٦ سەرۆکایەتیی حکوومەتی (٥٤)ەمینی لە تورکیا گرتە دەست، رۆژنامەنووسێکی بیــانی پرســیارێکی

ئاراستەکرد لەبارەی دید و بۆچوونی بەرامبەر بەکێشەی کورد و چـۆنیەتی چارەسـەرکردنی، ئەربـەکان لەوەڵامدا گوتی: کورد چەندەها ساڵە لـەتورکیا رووبـەڕووی مامەڵەیـەکی خـراپ بوونەتـەوە، ئەمـە وایکردووە کێشەکەیان ئاڵۆزتر بێت، نەخوازە دوای ئەوەی چاکسازی لەناوچەی رۆژهـەڵات و باشـووری رۆژهەڵاتی تورکیا پشتگوێ خرا، بەڵکو قسەکردنیشیان بەزمانی خۆیان لێ قەدەغە کرا بـە شـێوەیەك قسەکردن بە کوردی بە یاخیبوون دانرا، ئەمـەش کارەسـاتێکی گـەورەی خولقانـد لـەو ناوچـە پـان و بەرینە. وەلێ ئێمە بە چاوێکی ئیسلامییانەوە دەڕوانینە کێشەی باشووری رۆژهـەڵاتی تورکیـا، واتـا: رێگەچارەی ئیسلامی دەگرینەبەر بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە تورکیـا، چـونکە ئـەوان هـەم لـە رووی ئایین و هەم لە رووی بیر و باوەڕەوە برامانن. لێرەشەوە، کـورد لـەماف و ئەرکـدا لەگـەڵ تـورك یەکسانن، بۆیە پێویست بەوە ناکات داوای رەوشێکی نەتەوەیی جیـاواز بـۆ خۆیـان بکـەن مادامێـك لێبوردەییان لەگەڵدا دەکرێ لە چوارچێوەی ئـەو برایەتییـە ئیسـلامییەی کـەرێ بـە هـەموان دەدات مومارەسەی زمان و کلتووری خۆیان بکەن. لێ، ئەمە مافی ئەوەیان پێنادات خوێنـدن و بڵاوکردنـەوە بە کوردی پیادە بکەن"(٦٦). بەڵام تەمەنی حکوومەتەکەی ئەربەکان ئەوەندە درێژ نـەبوو تـا بتوانـێ پڕۆژەکانی و ئەو سیستمە دادپەروەرانەی کە ئەربەکان بانگەشـەی بـۆ دەکـردن، جـێ بـەجێ بکـات. ئەوەبوو لە ١٠ی مایسی ساڵی ١٩٩٧ رووخا، پاش ئەوەی سوپا کوودەتا سـپییەکەی لـە دژی ئـەنجام دا لـە دەرەنجـامی دەرکردنـی بڕیارەکـانی (٢٨ی شـوباتی ١٩٩٧) لەلایـەن ئەنجومـەنی ئاسایشـی نەتەوەییـەوە کـە تایبـەتبوون بـە ریشەکێشـکردنی چـالاکی ئیسـلامی ئوسـوولی کۆنەپەرسـتی و تیرۆریستی و جوداخوازی.

ئەگەرچی، ساڵی ١٩٩٨ لە چاو کێشەی گەلی کورد لـەتورکیا، سـاڵی رووداوە کـت و پڕییـەکان بوو، چونکە رووداو گەلێکی دراماتیکییانەی یەك لەدوای یەك بەسەریەکدا هاتن، وەك ئـەوەی بڵێیـت هێزێکی شاراوە لە ناوچەکە دەیانجوولێنێت.. دەبینین لـە لایـەك تورکیـا رێککەوتننامـە سـتراتیژییە سەربازیەکانی لەگەڵ ئیسرائیل گرێ دا کەرێگە بەئیسرائیل دەدەن بوارە ئاسمانییەکەی فراوانتربێـت بـۆ ئەوەی هەموو ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین بگرێتەوە، لە لایـەکی دیکەشـەوە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا دووبارە جەختی کردەوە سەر رۆڵی گرنگی تورکیا لـە ناوچـەکە "چـونکە تورکیـا لەسـەدەی داهاتوو[٢٥]، خۆی چارەنووسی ناوچەکە دیاری دەکات".

٢٥- مەبەست لەسەدەی بیست و یەکەمە (وەرگێڕ).

ڕۆژنامەڤانی بەرەگەز تورك (تایفۆن تالیب ئۆغلۆ) پێشتر لە ئیتالیا، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئۆجالان سازدابوو و هەمان ئەو پرسیارەی لێکردبوو کە لە دەستپێکی ئەم باسەماندا خستمانەڕوو، ئەویش: ئایا پوختەی چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کورد چییە؟ ئایا بە مانای فیدریالییە؟ ئۆجالان بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکەی دەداتەوە و دەڵێت: لە پاش ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٨ کەسایەتییەکی سیاسی گرنگی خاوەن باکگراوەندی سەربازی بە ڕێگەی چەند نێوبژیوانێکەوە پێوەندی پێوەکردم و پێشنیارگەلێکی بنیاتنەرانەی لەمەڕ چارەسەرکردنی کێشەی کوردەوە پێشکەش کرد. من، قەناعەتم بەو پێشنیارانە هێنا و لە یەکی ئەیلوولی ساڵی ١٩٩٨ بە شێوەی یەکلایەنە ئاگربەستم ڕاگەیاند، تاکو ماوە بدەم پێشنیارەکان لە سەر ئاگرێکی هێور پێبگەن، وەلێ دیارە تیمەکەی تر کەبانگەشە بۆ چارەسەرکردنی سەربازی دەکات- لەسەرووییەوە سەرۆکی کۆمار- توانی بەسەر ئەم ڕەوتە ئاشتیخوازەدا زاڵ بێت، خۆیشی (واتە: سەرۆکی کۆمار) کاتێك سەردانی نەمسای کرد تاکیدی کردەوە کە (لەتورکیا کێشەیەك بوونی نییە بەناوی کێشەی کوردەوە و هەموو کەسێك بە مافەکانیان شادن، بەڵام لەوێدا بزوتنەوەیەکی تیرۆریستی هەیە لەناوی دەبەین)، ئەمە لە کاتێکدا، جیهان هەموو دانی ناوە بەبوونی کورد و پێناسەی کورددا. بۆیە من دبێژم ئەم حاشاکردنە و ئەم هەوڵە بۆ سڕینەوەی گەلی کورد، خۆی بووە هۆی ئەوەی کورد دەستبداتە چەك بۆ داکۆکیکردن لە مافی نەتەوەیی خۆیان، وەلێ ئێمە سەرەڕای ئەوەش ئاگربەستمان ڕاگەیاند و داوای چارەسەرییەکی دیموکراتی ئاشتییانەی کێشەکەمان کرد- مستەفا کەمال، کاتی خۆی بە شێوەیەك لە شێوەکان بیری لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد کردەوە و لە دەستپێکی دامەزراندنی کۆماری تورکیا، بیرۆکە ئۆتۆنۆمی و بەشداربوونی کوردی لە دەسەڵات خستە ڕوو، بەڵام دواجار ئەم مەسەلەیە فەرامۆش کرا. ئیمڕۆیش ڕەوتی ڕووداوەکان بە هەمان ئاراستە دەڕوات پاش ئەوەی هەموو لایەك هاتە سەر قەناعەتێك کەئەوە کارێکی زەرووره سنوورێك بۆ ئەو شەڕە دابنرێ کە لە کوردستان هەڵایساوە و دەستبکرێ بەخەباتی سیاسی بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی دەمانەوێن(٦٧).

بەڵام ئۆجالان لەپاش دەستگیرکردنی لە بەرواری ١٥ی شوباتی ١٩٩٩ و لەمیانەی بەرگریکردنی لەخۆی لە پێش دادگای دووەمی ئاسایش لەدوورگەی ئیمیرالی، بیرۆکەی دامەزراندنی (کۆماری دیموکراتی لە تورکیا)ی خستەڕوو وەکو ئالتەرناتیڤێك (جێگرەوە) بۆ ئەو فیدریالیزمییەی کە لە ساڵی ١٩٩٧ خستبوویە بەرباس، پوختەی ئەم فیدریالیزمییەش لە لایەن نووسەری کورد (نووح ئاتەش) بەم شێوەیە شرۆڤە کرا، دەڵێت:(٦٨) "وڵاتی ئەنادۆڵ لە ڕووی جوگرافی و مێژووییەوە بە نیشتمانی هاوبەشی کورد و تورك و ئەو نەتەوانەی تر دادەنرێ کە لە بەرەبەیانی مێژووەوە تیا نیشتەجێ بوون،

چونکە وڵاتی ئەنادۆڵ دوای شەڕی (مەلاز کورد) لە ساڵی ١٠٧١ز بووە نیشتمانی نەتەوەیی تورکەکان، لێرەشەوە گوزەرانی ئیمڕۆیان و ئەوی لە ئایندەش چاوەڕێیان دەکات نەك تەنها بەستراوەتەوە بە ئارەزوویان لە ژیانی هاوبەشی پڕ برایەتی و دۆستایەتی و پاك و بێگەرد، بەڵکو وادەکات ئەو ژیانە زۆر پێویست بێت. بۆیە دامەزراندنی دەوڵەتێکی تاکە نەتەوەیی لەم جۆرە دیموگرافیا و رووداوە مێژووییە یەك لەدوا یەکانەی وڵاتی ئەنادۆڵ، نامۆیە و رەنگە ئەو (دەوڵەتە یەك نەتەوەییە) ببێتە هۆی دوژمنایەتی و دووبەرەکی و ئەو ململانێ و بگرە و بەردانەی کە دوور نییە شەڕ و شۆڕی کاولکاریان لێ بکەوێتەوە، ئەمەش دەبێتە مایەی ناسەقامگیری و چاندنی تۆوی گومان و خولقاندنی نادڵنیایی و بێمتمانەیی لە نێوان ئەو گەلانە و ئەنجاش لاوازی و دواکەوتن و دوایەش جیابوونەوە. کەچی سیستمی دەوڵەتی فیدریاڵی کە جۆرێك لەو دەوڵەتە میللییانە پێکدێنێ کە ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی جیهان لە چاخی ئەنتەرنێت و جیهانگیری و رێزگرتن لە مافی مرۆڤ پیادەی دەکەن، سیستمێکی لەبار و گونجاوترە بۆ ئەو دەوڵەتانەی چەند نەتەوەیەکی جیاجیا لەسەر خاکەکەیان دەژین، چونکە دەوڵەتی فیدراڵی بەو نەتەوە خاوەن فرە کەلتوورییانە، دەوڵەمەند دەبێ و دەبێتە ئامرازێکیش بۆ ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و یەکێتی ژیاری لە چوارچێوەی دەوڵەتی یاسا و دیموکراتی پەرلەمانی و فرەیی هزری، پاش ئەوەی رۆح و خوێنەکان ئامێتە و تێکەڵاوی یەکتر بوون و بەرژەوەندی و خواستە ئایندەییەکانیش یەکیان گرت. ئەمە تەنها بە رێگەی پێکهێنانی ئەنجومەنێکی دامەزراندنەوە پێکدێت بتوانێت دەستوورێکی کاتی بۆ وڵات دابڕێژێت بۆ ئەوەی بیخاتە پێش ریفراندومێکی جەماوەری دان بنێت بەماف و ئازادییەکانی هەموو نەتەوە و پێکهاتەکان لەوڵات و لێبوردنی گشتی دەربکات و پاشانیش ئەگەر بۆ جارێکیش بێت سەرژمێرییەك بەپێی ژمارەی نەتەوەکان و بەرێگای پێوەرەکانی زمان و ئینتیمابوونەوە بەئەنجام بگەیەنرێت. لەدوای تەواوبوونی ئەم هەموو رێکارانەش کۆنگرەیەکی گشتی بۆ نوێنەرانی هەموو پارتە سیاسییەکانی وڵات دەبەسترێت بۆ بڕیاردان لەسەر دەستووری هەمیشەیی و جێبەجێکردنی هەموو پێداویستییەکانی فیدریالیزم: پەسەندکردنی (نامەرکەزی ئیداری) و ئەنجومەنە ناوچەییەکان و ویلایەتەکانی خاوەن ئۆتۆنۆمی لە سیستمێکی سیاسی دیموکراتیدا، هەروا دانانی پەرلەمانێکیش کە لە دوو ئەنجومەن پێکدێت: ١- نوێنەرانی هەڵبژێردراو لەو هەڵبژاردنە گشتییەی کە هەر (٤) ساڵ جارێك بەڕێوەدەچێت. ٢- ئەنجومەنی نوێنەرانی ویلایەتەکان. هەردوو ئەنجومەنیش پێکەوە سەرۆکی کۆمار هەڵدەبژێرن و بڕیار دەدەن هەردوو زمانی تورکی و کوردی لە تورکیا ببنە زمانی فەرمی دەوڵەت و دانیش بەوەدا دەنێن هەموو نەتەوە و کەمایەتییەکانی تر مومارەسەی زمان و کلتووری خۆیان بکەن، سەرەڕای زامنکردنی دەوڵەت بۆ ئەو مومارەسەیە"(٦٩).

هەرچەندە، سیستمی نوێی جیهانی تـاك جەمسـەری کـە کـۆنترۆڵی هـەموو کاروبـاری جیهـانی کردووە و بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی، کار دەکات: یان بۆ یەکخستنی دەوڵەتەکان، وەك (قـوبرس)، یانیش کار دەکات بۆ هەڵوەشاندنەوە و لێکترازانیـان، وەك (یـەکێتی سـۆڤێت و یۆگۆسـلافیا)، ئـەوا ناوەندە سیاسییەکانی تورك- بە تایبەتی پاش ئەوەی یەکێتی ئـەوروپا لـە سـاڵی ١٩٩٧ ڕەتیکـردەوە تورکیا بە ئەندام لەناو ئەنجومەنەکەی وەربگرێ- پێیان وایە: خۆرئاوا بە نیازی جێبـەجێکردنی پـەیمانی سیڤەرە کە (مستەفا کەمال) ڕێبەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی میللـی لـە سـاڵی ١٩٢٠ ڕەتیکـردەوە، کار دەکات بۆ دابەشکردنی تورکیا- لێرەشدا، بۆڵەنـد ئەجەویـد سـەرۆك وەزیرانـی تورکیـا، جـەختی کـردەوە کـە: "ڕەتکردنـەوەی بەئەنـدامبوونی تورکیـا لـە یـەکێتی ئـەوروپا لـە لایـەن ئەنجومـەنی ئەوروپییەوە، تاکید لە سەر ئارەزووی دەکات بۆ لەتکردنی تورکیا بە پێی پەیمانی سیڤەری لـەگۆڕنراو، بەڵام ئێمە بەراشکاوی دەمانەوێ بڵێین: ئەگەر ئەوروپا ئاتاجی بە تورکیا نییـە، ئـەوا تورکیـاش هـیچ پێویستی و ئاتاجێکی بە ئەوروپا نییە، بۆیە تورکیا لەگەڵ دۆسـتەکانی خۆیـدا پلانڕێـژی دەکـات بـۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی لەجیهان و ناوچەکەدا"(٧٠).

لەلایەکی دیکەوە، مەسعوود یەڵماز ڕێبەری حیزبی نیشـتمانی دایـك و هاوبەشـی ئەجەویـد لـەو حکوومەتە کەمایەتییەی کە لە دەرەوەیـدا پشـتگیری دەکـرد تاکیـدی کـردەوە کـە: "ڕەتکردنـەوەی وەرگرتنی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا تاکیدبوونە لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەم یەکێتییـە بۆتـە کۆمـەڵێك دەوڵەتانی مەسیحی، بۆیە تورکیای موسڵمان لە ئەندامێتی خۆی وەرناگرێ"(٧١).

بەڵام، گوشارەکانی واشنتۆن- هاوپەیمانی تورکیا- بۆ سەر وڵاتانی ئەوروپی و هەوڵـدانی ئـەڵمانیا بۆ دەستەبەرکردنی پشتگیری تورکیا لە ململانێی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان لە ناوچەی ئاسیای نـاوین و هەروا دەرککردنی فەرەنسا بە گرنگی پێگـەی سـتراتیژی تورکیـا لـە ناوچـەی ئۆراسـیا، پـاڵی بـە کـۆنگرەی لوتکـەی سـەرانی یـەکێتی ئـەوروپاوە نـا جـارێ ئـەوە بـدات کـە تورکیـا لـە بـەرواری ١٩٩٨/١١/١ لەیەکێتی ئەوروپا وەردەگیرێت بەو مەرجە: "تورکیـا چاکسـازی ئیـداری و سیاسـی و ئابووری لە وڵات بەجێ بگەیەنێت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەرێگەی ئاشـتی و بـەپێی پێـوەرە دیموکراتییەکانی کۆپنهاگن و ناکۆکییەکانی لەگـەڵ یۆنـان یەکلابکاتـەوە و یاسـا گـەلێکیش دابنێـت هەموو ئەو حوکمانە هەڵبوەشێنێتەوە کە لە دژی مافی مرۆڤن و کۆت و بەنـد دەخەنـە سـەر ئـازادی رادەربڕین و چارەسەرکردنی تەنگژەی ئابووریش لە تورکیا بەشـێوەیەکی بنـەڕەتی"(٧٢). لێرەشـەوە، وادیارە تورکیا بۆتە بارمتەی کێشەی کورد، پاش ئەوەی پیاوانی سەربازی ئەم وڵاتە دەرکیـان کـردووە کە ئەم کێشەیە ناکرێ بە ڕێگەی سەربازی چارەسەر بکرێت. چـونکە تورکیـا ناتوانـێ لـەم ململانـێ

خوێناوییەدا تا هەتا بەردەوام بێت هەروەك ئەوە چۆن ئاپۆیش (عەبدوڵڵا ئۆجالان) لەوە تێگەییوە کە ڕێکخراوەکەی ناتوانێ بەسەر دووهەمین هێزی سەربازی لە پەیمانی ئەتڵەسی و پێنجەمین سوپا لە جیهان سەربکەوێت. ئەوروپاش قەناعەتی بە بۆچوونی واشنتۆن هێناوە بە زەروورەتی دەستەبەرکردنی پاڵپشتی تورکیا- کە (٥٠) ساڵە لە سیستمی بەرگری ڕۆژئاوا بەشداری دەکات- بۆ لای ڕۆژئاوا، تاوەکو ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات لە قەڵاچۆکردنی ئەو گرووپە توندڕەوە ئیسلامییانەی کە لە ڕێکخراوە ئیسلامییە چەکدارەکاندا خۆیان کۆدەکەنەوە، وەك: (حیزبوڵڵای تورکی و بەرەی ڕزگاریخوازی ئیسلامی و ڕێکخراوی جەنگاوەرانی ڕۆژهەڵات)، دەستەبەرکردنی ئەو پاڵپشتییەی تورکیاش لەلایەن ڕۆژئاواوە بەوە دێتەدی لەیەکێتی ئەوروپا وەربگیرێت. دیارە، خودی عەبدوڵڵا ئۆجالانیش قەناعەتی بە هەموو ئەو گۆڕانکارییانە هێناوە کە لە ناوچەکەدا هاتوونەتە پێشەوە، بۆ ئەوەی خۆی (واتە ئۆجالان) و ئاشنتۆن لەشانۆگەری پشیلە و مشکەکەدا لێکتێگەیشتنێك لەنێوانیاندا هەبێت لە پێناو دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ئاشتییانەی دیموکراتی دۆزی کورد بەجاڕدانی ئاگربەست لەلایەن ئۆجالان و ئەنجا فڕێدانی چەك و داواکردن لەگەریلاکانی بۆ بەجێهێشتنی تورکیا.

کۆنگرەی حەوتەمی پارتی کرێکارانی کوردستان کە لە نێوان ڕۆژانی ٢ تا ٢٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠ لە ئەشکەوتێکی گەورە لەچیای قەندیل بە بەشداربوونی ٣٨٦ نوێنەری حیزب کە لە هەموو لایەکی جیهانەوە ئامادەبوون بەسترا، دانی بە واقیعی نوێی بزوتنەوەی کورد نا بەدارشتنی ستراتیژییەتێکی نوێ بۆ ڕێکخراوەکە، بریتی بوو لە: پەسندکردنی دانانی چەك و گرتنەبەری خەباتی سیاسی دیموکراتی، گۆڕینی باڵە سەربازییەکەی حیزب ARGK بۆ (هێزی بەرگری میللی)، گۆڕینی ناوی بەرەی ڕێکخستنی خەبات ERNK بۆ (یەکە دیموکراتییە میللییەکان)، سەرلەنوێ هەڵبژاردنی ئۆجالان بەگشتی دەنگەکان بە سەرۆکی حیزب، هەڵوەشاندنەوەی کۆمیتەی ناوەندی حیزب بە پێکهێنانی دەستەی کارگێڕی حیزب، زیادکردنی ئەندامی سەرۆکایەتی حیزب لە (٧) ئەندامەوە بۆ (٩) ئەندام، دەبێ ئاڵای حیزبیش پێکبێت لەرەنگی سوور، ئەستێرەیەکی سووریش لە ناو ڕۆژی زەردی کوردستان لە گۆشەی چەپی لای سەرەوەی دانراوە، دوایەش ئامادەکردنی بەرنامەی ئاشتی کەپێکهاتووە لە (٧) ماددە(٧٣).

وەلێ، ستراتیژییە نوێیەکەی ئۆجالان کە خۆی لە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەو کۆمارە دیموکراتییە دەبینێتەوە تورك و کورد و کەمایەتییەکانی تر بە برایەتی و دۆستایەتی و تەبایی تێدا بژین، نایەتەدی مادامێك ژەنراڵەکانی سوپا نایانەوێ دان بنێن بە پارتی کرێکارانی کوردستان بە سیفەتی وتەبێژی ڕەسمی بەناوی کوردەوە"، هەرچەندە ئەنجومەنی نەتەوەیی تورکیا لە دانیشتنی مانگی شوباتی ساڵی

٢٠٠٠ دانی نا بە مافی خوێندن بە زمانی کوردی لەتورکیا بەشێوەی تاکی دوای ئەوەی کەرێگەی بەکورددا مومارەسەی زمانەکەیان لەژیانی رۆژانە و فێرکردن و بڵاوکردنەوەی تایبەتی بەو زمانە بەشێوەی تاکی بکەن لە چوارچێوەی رێگەدان بەو زمانانەی هاوڵاتیان لەژیانی رۆژانەیاندا پێیان داخێون بە مەرجێك ئەو زمانانە مافی سەروەرییان نەبێت بە سەر زمانی تورکییەوە کە بەزمانی فەرمی هەموو هاونیشتمانییەکی تورکیا دادەنرێ"(٧٤).

بەڵام دامەزراندنی پارتی دیموکراتی میللی HADEPی کوردی و بەدەستهێنانی ١,٢٣ ملیۆن دەنگ لە یەکەمین هەڵبژاردن کە لە ساڵی ١٩٩٩ تێدا بەشداربوو، بە سەرکەوتنێکی گەورە دادەنرێ بۆ بزوتنەوەی ئاشتیخوازی کورد و خەباتی سیاسییان بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانیان و هەم بۆ وەرگرتنی هاوسۆزی چەند کەرتێکی فراوانی رای گشتی تورکیا، ئەمە جەخت لەوە دەکات ئەم حیزبە بۆیە لەدایك بووە تا بمێنێ و ترسی ئەوەی نەبێت جارێکی تر دابخرێت، هەروا خۆیشی ئامادە بکات بۆ دەرەنجامی باشتر لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا، نەخوازە پاش ئەوەی یەکێتی ئەوروپا لە ئاخر و ئۆخری ساڵی رابوردوو (بەڵێننامەی بەشداربوون)ی دانا بۆ وەرگرتنی تورکیا لە ئەنجومەنی ئەوروپا و تورکیاش (پەیمانی کاری نیشتمانی) ئامادەکرد کەهێڵە پانەکانی ئامانجە ئایندەییەکانی تورکیای لەخۆ گرتووە بۆ: کراوەیی بە رووی دیموکراتی و بەجێگەیاندنی چاکسازی یاسایی و سیاسی و ئابووری لە وڵات بەپێی پێوەرە دیموکراتییەکانی کۆپنهاگن کە تورکیا وەك وەفادارییەك بۆ بەڵێنەکانی بەرامبەر بە ئەنجومەنی ئەوروپی لە ٢٦ی ئاداری ساڵی ٢٠٠١ دەیخاتە بەردەم (کۆنتەر فیرهاوگن) کۆمیساری ئەوروپی بەرپرس لە فراوانبوونی بازنەی ئەوروپی لە برۆکسێل، ئەمەش وادەکات حیزبی دیموکراتی میللی HADEP کە زووتر واتۆمەتبار دەکرا کە: "لەوەتی لەساڵی (١٩٩٤)ەوە دامەزراوە تاوەکو ئیمڕۆیش، سێبەری پارتی کرێکارانی کوردستانە"، لەئێستادا ببێتە دەمڕاستی کوردانی تورکیا، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە دانوستان لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان رەتبکرێتەوە ئەو پارتەی کەتوانی لەماوەی (١٥) ساڵدا خۆی دووبارە لەتورکیا و ناوچەکە کۆبکاتەوە بەشێوەیەکی ئەوتۆ بووە خاوەنی نوێنەرایەتی سیاسی لەزۆربەی پایتەختە گەورەکانی جیهان و هەروا خاوەنی رێکخراوە سیاسییەکانی خوێندڤانان و لاوان و ئافرەتانو پیاوانی کار و بانق و کۆمپانیاکانی (هوڵندنگ) و پەرلەمانە کوردییەکەی خۆی لەتاراوگە (بەلچیکا) بەسەرۆکایەتی نووسەری بەرەگەز کورد یەشار قایا، دیسا خاوەنی ئەو کۆنگرە میللییەشە کە بەوێنەی حکومەتی سێبەر وایە بۆ ئەم حیزبە لەتاراوگە (پاریس) بەسەرۆکایەتی زانای کوردی بەناوبانگ عیسمەت شەریف وانلی بەڵکو جەخت لەسەر ئەو هەموو متمانەیە دەکات کەرێکخراوە جیهانییە پێشکەوتووخواز و مرۆییەکان بەم

کێشەیەیان لەتورکیا داوە کـەپارتی کرێکـارانی کوردسـتان ڕێبەرایـەتی دەکـات وەك بزوتنەوەیـەکی ڕزگاریخوازی کوردی لەپێناو دانپێنان بەپێناسەی کورد و ئەو مافە نەتەوەیی و سیاسـییانەی هاوبەنـدن بەمرۆڤی کورد و بۆ دەستەبەرکردنی مرۆڤبوونی و تا دەگاتە پەرەپێدانی خودی ئەم مرۆڤە و کلتـوور و کۆمەڵگەکەی، تێدەکۆشێت. بۆیە دەستەی سەرۆکایەتی ڕێکخراوی پارتی کرێکـارانی کوردسـتان لـە ٢٧ی ئاداری ساڵی ٢٠٠١ بەیاننامەیـەکی دەرکـرد و بـۆ ڕۆژی دواتـر ڕۆژنامـەی ئوزگـور بولیتکـا (سیاسی ئازاد) زمانحاڵی ڕێکخراوەکـە کەلەهـەمان کـات لەبـەرلین- ئەسـتەموول بـەزمانی تـورکی دەردەچێت، ئەو بەیاننامەیەی بڵاوکردەوە، تیادا جەختی کردە سەر ئـەوەی کـە: "ڕێکخراوەکـە هـەر وەك چۆن پەیمانی سیڤەر بەبەندە جوداخوازییە- لەتکراو ئامێزەکانی بۆ وڵاتـی ئـەنادۆڵ ڕەتدەکاتـەوە، ئاواش ڕێککەوتننامەی لۆزان بەو ماددانەیەوە کەحاشا لـەبوونی کـورد و مافـە ڕەواکـانی لـەتورکیا دەکات، ڕەتدەکاتەوە و داوا دەکات (پەیمانی کاری نیشتمانی) بەڵێنێك بگرێتە خـۆ بـەوەی کـەتورکیا بڕیار بدات بەهەڵوەشاندنەوەی حوکمی لەسێدارەدان لەیاسـاکانی، سـەرەڕای هەڵوەشـاندنەوەی مـاددە (٨) لەیاسای حوکمی عـورفی و مـاددە (٣١٢) لەیاسـای سـزاکانی تورکیـا کەکۆتبەنـدی قورسـیان خستۆتە سەر ئازادی ڕادەربڕین لەتورکیا و ڕێگری لەکورد دەکـەن مومارەسـەی مافـەکانیان لـەرووی پـەروەردە و فێرکـردن و بڵاوکردنـەوە بـەزمانی خۆیـان بکـەن لـەپێناو پەرەپێـدانی کولتوورەکـەیان لەچوارچێوەی زامنکردنی دەوڵەت بۆ مومارەسەکردنی ئەو ماف و ئازادیانە لەلایەك و بۆ ڕەخسـاندنی هەل لەپێش هەموو کەمە نەتەوەیی و ئایینی و ئایینزاکان لەتورکیا بۆ ئـەوەی مومارەسـەی ئازادییـە گشتییەکان بکەن بەئامانجی پەرەپێدانی کلتوور و کۆمەڵگەکەیان لەلایەکی تر.

ئەم تێڕوانینە مرۆییە بازنە بەرفراوانە بەرامبەر بەمافی کەمایەتییەکان لەتورکیا- و لـەجیهان- و ئارەزووی ڕۆژئاواش لەچارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد بەرێگایـەکی ئاشـتییانەی دیمـوکراتی، لەگـەڵ خواستەکانی گەلی کورد لەتورکیا- کەژمارەی دانیشتوانی لـەنێوان ١٢-١٥ ملیـۆن کەسـە- بـەرەو دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە فیدریالیزمییە دیموکراتییە یەکگرتووە دەگونجێن کەتیادا هەموو کەمایەتییـە نەتەوەییەکان بەو مافانە شادبن کە بـە نەتـەوە زۆرینەکـە دراوە لـە لایـەك و لـە لایـەکی تریشـەوە بەزامنکردنی دەوڵەت بەرامبەر بە پیادەکردنی باشی ئەو ماف و ئازادییانە بە لایەنی کـەم لەمیانـەی (٢) یان (٥) ساڵی داهاتوو، ئەگینا پارتی کرێکارانی کوردسـتان جـاڕی حکوومـەتی کـوردی خـۆی لەتاراوگە- بەمەزەندەی زیاتر لەفەڕەنسا یان ئیتاڵیا- دەدات، بۆ ئـەوەی یـەکێتی ئـەوروپا بەرێگـەی هێزە دەستێوەردانە خێراکەیەوە کـەبڕیارە لـە سـاڵی ٢٠٠٣ دابمـەزرێ و بـەهاوکاری لەگـەڵ پـەیمانی ئەتڵەسی تورکیا ناچار بکات بەم چارەسەرییە ڕازی بێت: ئەمە لەبارێکدا ئەگـەر ژەنراڵـەکانی سـوپای

تورك لەسەر ئەم راوبۆچوونەی خۆیان سووربوون کەوا: دانپێنان بەمافی کلتووری و سیاسی کورد لەتورکیا، یاخود بەئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا، دەبنە هۆی دابەشبوونی تورکیا". چونکە ئەو ولاّتانەی چوونەتە ریزی یەکێتی ئەوروپاوە، دابەش نەبوونە بەسەر خۆیاندا، بەلّکو پتر پێشکەوتوون و پتریش بە دیموکراتی و سەقامگیری سیاسییەوە، شاد و بەختەوەرن. فیدرالیزمی ئەمریکاییش بە هەر (٥٠) ویلایەتەکانییەوە، ئیمڕۆ بەگەورەترین هێزی سیاسی و ئابووری و سەربازی دادەنرێ، بەلّکو بۆتە ئەو تاکە جەمسەرەی کە سیاسەتی نێودەولّەتی ئاراستە دەکات و ئایدیۆلۆژیا سەرکەوتووەکەی خۆی بە هەموو جیهاندا بلاّو دەکاتەوە. لێرەشەوە، عەبدوللاّ ئۆجالان رێبەری رێکخراوی پارتی کرێکارانی کوردستان لە پەیامی نەورۆزدا کە لە ٢١ی ئاداری سالّی ٢٠٠١ ئاراستەی گەلانی رۆژهەلاّتی ناوینی کرد، بانگەشە دەکات بۆ دامەزراندنی یەکێتی فیدرالّی نێوانیان، لە بەر پێویستبوون بە "زەرووڕەتی پێکهێنانی بەرەیەکی بەهێز لە گەلانی رۆژهەلاّتی ناوین بۆ بەرەنگاربوونەوە لەو مەترسییانەی رووبەڕوویان دەبنەوە، ئەویش بە سازدانی راپەڕینێکی سەرتاسەری لە پێناو بەدیهێنانی دیموکراتی لەولاّتەکانیاندا". (یووسف تووهاللی) ئەندامی دەستەی کارگێڕی پارتی کرێکارانی کوردستانیش، بیرۆکەکەی ئۆجالانی بەم شێوەیە روونکردەوە، دەلّێت: جیهان لە شۆڕشێکی بەردەوامدا لە دژی دواکەوتن و کلکایەتی و ئیمپریالیزمی نوێ بەرەو دیموکراتییەت مل دەنێت، ئەمەش وا دەخوازێ گەلانی رۆژهەلاّتی ناوین هاوکاری بکەن لە پێناو وەدیهێنانی چەشنەکانی پەرەپێدانی نیشتمانییان بە ئامانجی هەلّکشان و پێشڤەچوون لە هەموو روویەکی ژیان و بۆ تێکەلّبوون بە ژیانی دیموکراتی لە چوارچێوەی سیستمی نوێی جیهانیدا. لەبەر ئەوەی گەلانی ولاّتی ئەنادۆلّ و دۆلّی دوو رووبارەکە و رۆژهەلاّتی ناوین بەو سنووورە جوگرافیایەی کە تورك و کورد و عەرەب و فارس و تورکمان و ئاشووری و ئەرمەنی تیا نیشتەجێن، یەکەیەکی جوگرافی- مێژوویی تەواوکاری پێکهێناوە، بۆیە دامەزراندنی سیستمی یەکێتی فیدرالّی لە نێوان ئەم گەلانە چارەسەرییەکی نموونەییە بۆ هەموو ئەو کێشە و گرفتانەی کە نزیکەی سەدەیەکە بەدەردیانەوە دەنالّێنن. جا، ئەگەر لەوێڕا سەبەبکارێك نەبێ ئەم گەلانە دوژمنایەتی یەکتری بکەن، ئەوا هۆکاری زۆر هەن وابکەن یەکێتی فیدرالی دیموکراتی پێك بێنن لە پێناو پێشکەوتن و گەشەسەندندا، بە تایبەتی هەر هەموومان نەوەگەلی ژیاریی دۆلّی دوو رووبارەکە و ولاّتی ئەنادۆلّین"(٧٥).

# سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم

١- گۆڤاری ئایدینلك Aydinlikی توركی لە ١٩٩٤/١/١٤ دەرچووە.

٢- دیدارێك لەگەڵ د. ئیبراهیم داقوقی بەناونیشانی: چی دەزانی لەبارەی كوردی توركیاوە. رۆژنامەی (عێراق) بەغدا لە ١٩٩٣/٣/٢٣ بڵاوكراوەتەوە.

3- Miliyet gazetesi, 17-2-1994.

4- Ozgor Bakis, 23-1-2000.

5- Yeni Safak, 23-1-2000.

٦- ئەم رووداوە لەدەرەنجامی پێكدادانی ئۆتۆمۆبیلی مارسیدس- ٦٠٠ بەبارهەڵگرێكی گەورە لەسەر رێگای ئەزمیر- ئەستەموولْ لەنزیك بالیكسیر لەشوێنێك پێی دەگوترێ (سەرسولك) روویدا. مارسیدسەكە (سیداد بوجاق) نوێنەری ئورفای سەر بەحیزبی رێگای راست و سەرۆكی عەشیرەتی (بوجاق)ی كوردی و سەرۆكی رێكخستنەكانی پارێزگارانی گوندەكان (كەبریتین لەو جاشە كوردانەی لەساڵی (١٩٨٧)ەوە هاوكاری حكوومەت دەكەن لەدژی PKK، دەیئاژوت. لەدەرەنجامی رووداوەكە هەریەك لەم كەسانە تیادا گیانیان لەدەستدا: ١- محەمەد جاتلی یەكێك بوو لەگەورە پیاوانی مافیا و هاوكاری لەگەڵ دەوڵەتی نهێنی دەكرد و ئەنتەرپول بۆی دەگەڕا دەستگیری بكات. ٢- حسێن قەرەجاداغ بەڕێوەبەری پێشووی ئاسایشی ئەستەموولْ. ٣- بەڕێوەبەری فێرگەی تایبەتی پۆلیس (هێزەكانی دەستێوەردانی خێرا). ٤- ژنە سەماكار خولیای دۆستی محەمەد جانلی، بوجاق بەشێوەیەكی سەرسوڕهێن لەم رووداوە رزگاری بوو دوای ئەوەی تووشی هەندێ شكان هات. ئەم رووداوە پرسیارێكی زۆری هورووژاند لەبارەی هۆی كۆبوونەوەی بوجاق و ئەفسەری ئاسایش قوجاداغ لەگەڵ رێبەری مافیا محەمەد جانلی كە پۆلیسی نێودەوڵەتی بۆی دەگەڕا.

٧- وتاری ئەحمەد بانتو ئۆغلۆ، باڵیۆزی توركیا لەشانشینی عەرەبی سعوودی، بەناونیشانی: لەبەر ئەم هۆیانە راوەدوونانی ئۆجالانمان كرد، رۆژنامەی (الشرق الاوسط) ژمارە ٣٨٥ لە ١٩٩٨,/١/١٥

٨- ئوزگور پۆلیتیكا لە ٢٠٠١/٢/٢٦ و هەروا هەمان رۆژنامە لەژمارەی رۆژی ٢٠٠١,/٤/١٧

٩- د. ئیبراهیم داقوقی: کوردەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، گۆڤاری (الاصلاح) دوبەی ژمارە ٣٨٥ لە ١٩٩٨/١/١٥.

10- Akit gazetesi١٩٩٦,/٩/٢٩-٢٨ 

١١- دیدارێك لەگەڵ ئیبراهیم داقوقی سەرچاوەی ئاماژەپێکراو لەپەراوێزی (٢) سەرەوە.

١٢- هەمان سەرچاوە، لەپەراوێزی (٢) سەرەوە.

١٣- أ. بوکشابان: کوردەکانی ئازەربایجان، باکو ١٩٣٢ لاپەڕە ٥-٧ بەزمانی ئازەری.

١٤- د. ئیبراهیم داقوقی- کۆماری سووری کوردی، لینین دایمەزراند و ستالین رووخاندی و ئۆجالان زیندووی کردەوە، گۆڤاری (الاصلاح) دوبەی ژمارە ٤٣٨ لە ٢٠٠١/٣/١.

١٥- أوجلان، مجلة الاصلاح دبي ژمارە ٤٣٨ لە ٢٠٠١,/٣/١

16- Milliyetgazetesi, 28-11-1988.

17- sabahgazetesi 3-2-1998.

18- TuncayOzkan, Operasyon, Istanbul-200, sh51.

19- Millietgazetesi, 16-1-1995.

٢٠- تونجای اوزکان، المؤامرة، سەرچاوەی ئاماژە پێکراو ژمارە ٢١، لاپەڕە٥١.

٢١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ,٥٢

22- Sabah gazetesi, 2-6-1996.

٢٣- تونجای اوزکان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤-,٥٥

24- Hurriyet gazetesi, 22-10-1998.

٢٥- أوزکای اوزجان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە٦٩-,٧٠

26- Hurriyet gazetesi, 26-10-1998.

27- Hurriyet gazetesi, 26-10-1998.

٢٨- أوزکای اوزجان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە,١١

29- Sabah gazetesi, 22-2-1999.

٣٠- رۆژنامەی (الشرق الأوسط) ژمارەی رۆژی ١٩٩٩/٢/٢٦.

31- Hurriyet gazetesi, 10-1-2000.

٣٢- رۆژنامەی (الشرق الأوسط) ژمارەی رۆژی ٢٠٠٠/١/١٤.

33- Hurriyet gazetesi, 13-11-1997.

34- Milliyet gazettesi, 27-11-1997.

35- Sabah gazetesi, 25-12-1997.

٣٦- رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٨/١٠/٢٢.

٣٧- رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٨/١٠/١٣.

٣٨- رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٨/١١/٢١.

39- Sabah gazetesi, 29-11-1998.

٤٠- رۆژنامەی (الوطن العربي)، ژمارە ١١٦ رۆژی ١٩٩٩/٧/٩.

٤١- رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٩/١٠/١٠.

42- ilkei,uzun soluklu bir mucadele, koln 1999, sh. Yil. KemalBurkay, 25 39-59.

٤٣– رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٩,/١٠/١٣

٤٤– رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٩,/٣/٢

٤٥– رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٩,/٢/٢٨

٤٦– رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٩,/٢/٢٤

٤٧– رۆژنامەی (الشرق الأوسط)، ژمارەی رۆژی ١٩٩٩,/٦/٤

48- Milliet gazetesi, 4-6-1999.

٤٩– رۆژنامەی الشرق الأوسط =، العدد الصادر في ١٩٩٩,/٦/٤

٥٠– عمر أبو النصر، الأكراد والفلسطينيون واليهود، گۆڤاری الوطن العربي، **ژمارە ١١٤٨ لە ١٩٩٩,/٣/٥**

51- Milliyet gazetesi, 18-8-1984.

٥٢– هل يستحق الأكراد دولة كردية مستقلة؟ گۆڤاری (المجلة)- لندن، ژمارەی رۆژی، **في** ١٩٩٩/١/١٩.

53- Milliyet gazetesi, 7-12-1998.

54- Hurriyet gazetesi, 11-12-1993.

55- Sabah gazetesi, 28-12-1993.

bah gazetesi, 26-3-1993.

57- Sabah gazetesi, 4-6-1993.

58- Aydinlik gazetesi, 14-1-1994.

59- Milliyet gazetesi, 3-4-1994.

60- Hurriyet gazetesi, 21-8-1995.

61- Sabah gazetesi, 9-6-1994.

62- Sabah gazetesi, 16-3-1997.

٦٣- كمال بوركاى، ٢٥ ساڵ لەخەباتى دووردرێژ، كوان- ألمانيا ١٩٩٩، لاپەڕە٣٧-٥٧ (بەزمانى توركى).

64- NuhAtes, Federal cozum, Istanbul-2000, sh 73-77.

٦٥- إبراهيم الداقوقي، صورة العرب لدى الأتراك، منشورات مركز دراسات الوحدة العربية- بيروت، الطبعة الثانية- ١٩٩٩,

66- Sabah gazetesi, 4-2-1997.

٦٧- تونجاى اوزكان، هەمان سەرچاوە، ٢٠٦-٢٠٩,

٦٨- نوح آتش، الفيدرالية هو الحل للقضية الكردية، استنبول- ٢٠٠٠، لاپەڕە ٨٤.

٦٩- نوح ئ‌تش، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە، ٨٤-٨٩,

70- Milliyet gazetesi, 1-12-1997.

71- Sabah gazetesi, 6-12-1997.

72- Hurriyet gazetesi, 3-11-1998.

73- Ozgur Politija, 31-12-2000.

74- Milliyet gazetesi, 28-2-2000.

75- Ozgur Politija gazetesi, 21-3-2001